کورد

# دوژمنی خۆت بناسە



## بیرەوەری لێزانێکی موخابەرات

رەفیق پشدەری

بەرگی دووەم



بسم الله الرحمن الرحيم

## پێشەکی

ئەم کتێبەم پێشکەش دەکەم بە گیانی پاکی ئەو شەهیدانەی کەگیانی خۆیان لەپێناوی کورد و کوردستاندا بەخت کرد وەهەروەها بەو برا عەرەبانەی کە گیانی فیداکارییان تێدایە بەرامبەر گەل و نیشتیمانەکەیان وە باوەڕیان هەیە کە ئەبێ کێشەی کورد- جێبەجێ بکرێ هەروەها پێشکەش بەو سیاسەتمەدارانەی کورد کە بەرگریان لەمافە ڕەواکانی کورد کردوە چ بەچەك و چ بەقەڵەم.

کورد، دوژمنی خۆت بناسە ناونیشانی زنجیرە کتێبەکانمە کە لەم بەشەیاندا، باسی :

١.چەند ڕوونکردنەوەیەك لەسەر کتێبەکەی پێشووم.

٢.کورتە باسێکی بنەماڵەی خۆمان.

٣.بەشێك لەمێژووی خەباتی کورد لەو ڕۆژەوە کە بارزانی لەسۆڤیەتەوە هاتەوە بەغدا ئەوەندەی خۆم ئاگادار بم.

٤.هەوڵەکانم بۆ نەهێشتنی کورد کوژە لەساڵی ١٩٦٣وە هەتا ساڵی ٢٠٠٠ وە هۆکارەکانی ئەو شەڕانە.

٥.ڕاوو بۆچوونوو هەوڵوێستی دەوڵەتە ئیقلیمیەکان و عەرەبیەکان بەگشتی و هەر پێنج دەوڵەتە زلهێزەکان بەگشتی بەرامبەر بەکورد و کێشەکەی.

٦.بارودۆخی ئێستای کورد لەگەڵ ڕاوو بۆچوونی خۆمدا بۆ چارەسەرکردنی کێشەی کورد لەکوردستانی باشووردا.

دڵنیاتان دەکەم لەوەی هیچ گروپ و لایەنێکی سیاسی هانیان نەداوم کە ئەم کتێبە دەرکەم وەپەیوەندیشم بەهیچ ڕێکخراوێکەوە نیە وەدەرکردنی

ئەم كتێبە تەنها بڕیاری شەخصی خۆمەو هاوسەرەكەم (ئێران فیض الله بەگ و ڕووباری كچم و بازیان و ڕەوەزی كوڕم) هانیان دام بۆ دەست كردن بەنووسینی، بەو نیازەی كەهەستی نەتەوایەتیو نیشتیمان پەروەرێتی كورد بگێڕمەوە بۆ ڕۆژی ڕاپەڕینەكەی ١٩٩١ وەبۆ هەوڵدان بۆ تێك نەچوونی ئەم ئەزموونە بەهاریكاری سیاسەتمەدارو نیشتیمان پەروەرانی كورد لەدەرەوەو ناوەوەی وڵات وەیەك خستنەوەی كورد لەژێر ئاڵای كوردستاندا بەبێ جیاوازی ڕەنگو زمان، بەڵام هەموو كەسوكارەكەم ڕێگرییان لێ كردم لەبەر باری ئەمنییان تەنها جەمالی برام نەبێتو بۆیە هەر بەكوردیش نوسیومە چونكە باس لەكێشەی كورد ئەكات زۆرێك لەوانەی كەبەشی یەكەمیان خوێندبووەوە پرسیاریان لێ دەكردم مەبەستت چییە لەدوژمنی كورد..؟ وتم: ئەوەی باش كتێبەكەم بخوێنێتەوە بۆی دەردەكەوێت كەدوژمنی كورد بێگانە نییە بەتەنها..!

بەشی یەكەمم بەچل و پێنج ڕۆژ دەركرد بەڵام ئەم كتێبەم بەشەش مانگ بوو بەیارمەتی كەسێكی نزیكی خۆم دەركردووە، هانام بۆ چەند كەسێكی نووسەرو ڕۆشنبیربرد بۆ یارمەتی دانم بەڵام لەترسدا كۆمەكیان نەكردم، بەشی یەكەمم لە (١٧/تموزی ١٩٦٨)ەوە دەستی پێ كرد چونكە صدام لەڕوخاندایە هەر بۆیە حەزم كرد پێش سەرەمەرگی ئەو زانیارییانەی كە ئەیزانم لەسەر بەعس بڵاوی بكەمەوە وەوا بەتەما بووم لەبەشی دووەمدا كورتە باسێكی بنەماڵەی خۆمان بكەم و بەدوورو درێژی باس لە (أجهزي امني) دەزگا ئاسایشەكانی ڕژێم بكەم وەناوەڕۆكی ئەم بەشە ئێستا هی بەشی چوارەم بوو بەڵام لەبەر بارودۆخی ئێستای كوردستان بەپێویستم زانی كە بیهێنمە بەشی دووەمەوە نەوەك تیرۆرم بكەن یان بمفرێنن و نەتوانم ئەو ڕاستییانە لەگەڵ بۆچوونەكانی خۆمدا بگەینمە جەماوەر وەباسی دەزگا ئاسایشییەكان (الأجهزة الأمنية) لەگەڵ بەسەرهاتەكانی ١٩٦٣-١٩٨٤ لەبەشی سێیەمدا ئەكەم(انشاءالله) ئەگەر مردن

مۆڵەتی دام .

هەندێك لەو كەسانەی ئاگاداری من بوون كە ئەنوسم لێیان دەپرسیم ئایا تۆ بەپشتیوانی لێپرسراوێك ئەم زنجیرە كتێبە ئەنوسیت..؟ وتم: نەخێر گەورەترە..! ، وتیان حزبە..؟، وتم:نەخێر گەورەترە..!، وتیان كەواتە دەوڵەتە چ دەوڵەتێكە پێمان بڵێ..؟ وتم :نەخێر گەورەترە، خوایە..! (حسبي‌الله ونعم الوكيل) .

لەسەر بەشی یەكەم كوڕانی مەلا مصطفی بەنهێنی بڕیاری تیرۆر كردنیان دەركردم بەڵام پارتی دیموكراتی كوردستان پێیان وتم ڕاكە كوڕانی مەلا مصطفی ئەتكوژن ، بەهەمان شێوە ئافرەتێكی بەعسی كوردی دانیشتوانی هەولێر هات پێی ڕاگەیاندم كە صدام بڕیاری فڕاندنی دەركردویت، ڕاكە .

هەر بۆیە بەناچاری خۆم و هەردوو كوڕەكەم، سێ خێزان ڕامان كرد بۆ سلێمانی و ئێستا لەخانوویەكی كرێ دا دەژین وەژمارەمان (١٢) كەسە وەئەم بەشەم لەژوورێكدا تەواو كرد كەدرێژێكەی سێ مەترەو پانی‌یەكەی مەترو نیوێكە وەئەو مێزەی لەسەری ئەنوسم سی دیناری پێ دراوە لەمەزاد خانەكە، لەماوەی ئەم چەند مانگەدا كەسەرقاڵی تەواو كردنی كتێبەكە بووم زۆر بەكەمی چومەتە دەرەوە بۆ شوێنە گشتی‌یەكان وەبڕیارم داوە لەماڵ نەیەمە دەرەوە هەتا وەڵامی ئەو داواكاری‌یانەم نەدرێتەوە كەلەپشتی ئەم كتێبە نوسیومە وەئەگەر نەیان هێشت لێرەش دانیشم( ارض الله واسعة)، هەندێك لەو كورد پەروەرە بەڕێزانەی كە لە(لندن) دائەنیشن تەلەفونیان بۆ كردم وتیان وەرە بەشی دووەم لەلای ئێمە بنوسە یارمەتیت ئەدەین، وتم: یەكەمم لێرە نوسیوە گرفت نەهاتۆتە ڕێم وانشاءالله بۆ نوسینو بڵاوكردنەوەی دووەم و سێیەم و چوارەم و پێنجەمیشدا هەر لەسلێمانی دەبم و هیچ گرفتێكم تووش نابێ.

وەئەوەی جێی داخە ئەوەیە كەهیچ بەڵگە نامەیەكم نەماوە( المستمسكات) بەهۆی :

١.هەندێکی لەکاتێکداماڵەکەم ئەپشکنن لەساڵی ١٩٦٢دا لەلایەن رژێمی قاسمەوە کەدەست گیر کرابووم ئەکەوێتە بەر دەستیان و دەیبەن
٢.لەدوای ئەوەی کەشف بوو کەبەشدار بووم لەکودەتاکەی ناظم کزار دا دوای ئەوەی کەرام کرد بەخوالێخۆشبووی دایکم و براژنە سەبریم کەئێستا لە رانیە ئەژی راگەیاند هەرچیم داونەتێ لەبەڵگە نامە بەیانی بیسوتێنن، ئەوانیش هەموویان سوتاند.
٣.وەئەو بەڵگە نامانەی کە لەلام مابووەوە لەگەڵ دەمانچەیەکی *(کاتم صەوت)دا کەکاک مەسعود بۆی ناردبووم کەلە ١٩٧٦/٩/١٤دا گیرام ماڵەوەمان پێش ئەوەی ماڵەکە بپشکنن لەناویان بردبوون .

سوپاس بۆ یەزدانی مەزن کەگەیشتومەتە ئەم تەمەنەو هێشتا رووداوبەرووداوم لەبیر ماوە و دەیخەمە سەر کاغەز.

وەمن لەدنیا دا تەنها قەرزاری شەش کەسم ، یەکەم خوا گیان ،دووەم دایکم چونکە ئەو مێشکەی کەهەمە بەهی ئەوی ئەزانم، سێیەم ئەو بەرێزەی کەلەبەغداد پێی وتم حوکم دەدرێی بەئیعدام خۆت رزگار بکە، چوارەم ئەو برا پارتیەی کەپێی وتم راکە کورانی مەلا مصطفی دەتکوژن، پێنجەم ئەو خوشکە کوردە بەرێزەی ئاگاداری کردمەوەو لەبریاری فراندنی صدام بۆ من، شەشەم ئەو بەرێزەی لەژێر دەسەڵاتی پارتی دەری کردم، داواکارم کەخوای گەورە بەبەهەشتی بەرین پاداشتیان بداتەوە چونکە پاداشتی ئەوان لەتوانای مندا نیە.

زۆر سوپاسی هەرێمی کوردستان دەکەم کەتوانیومە بەهۆی ئەم ئازادیەی ئێرەوە تا ئێستا دوو بەش دەرکەم وەهیچ گرفتێکیان نەهێناوەتە رێم.

خزمەتکاری کوردو کوردستان

رەفیق پشدەری

---

* سوپاس بۆ یەزدان کەفەوتاو بەکارم نەهێنا چونکە ئەمرۆ هەواڵیان دەنارد بۆ کەسوکاری کوژراوەکان و دەیانوت رەفیق پشدەری کورەکەی ئێوەی کوشتووە.

بەڕێزان کەسانێکی یەکجار زۆر لەوانەی کتێبەکەی پێشومیان خوێندبـووەوە چەند پرسیارێك و ئامۆژگارییەکیان ئاڕاستە کردم لەسـەر ئـەو باباتانـەی کـە باسم کردوون کـە گوایـە ڕووداوەکـان ڕوون نـین وبەشێکیشیان بچر بچڕن و منیش هەوڵم داوە بەپێی توانا ئەو هەڵانە لەم کتێبەیاندا دووبارە نەبێتەوە. ڕاستە کە زۆر شتی نهێنی هەیە بەشاراوەیی بەجێم هێشتووە، بەڵام دڵنیاتان دەکەمە وە پەیمانتان ئەدەمێ کـە بـە دوورو درێـژی وبـە ئەمانەتـەوە ئـەوەی نەیزانم بیخەمە بەردەمی ئێوەی بەڕێزەوە، پەردە لادەدەم لەسەر زۆرێك لەو زاڵم و پیاو کوژو ئەوانەی کە خەزێنەی میللەتی (بیت المال) تاڵان دەکـەن لـە ژێـر دروشمـی کوردایــەتیدا چـەند کەسـانێك لەوانــەی پـەیوەندی ئاشـکراو نـهێنیان هەیـە بـە منـەوە بەشـێك لـە کتبەکـەی منیـان پەسـەند نـەکرد بــە پاساوی ئـەوەی کـە (صـدام حسـين) نـاروخێت و لەوانەیـە ڕۆژێــك لــە ڕۆژان بێتـەوە وپێیـان وتم نەبوایـە چاوپۆشـیت لــە هــەندێك ڕووداو بکردایـە کــە یەکێك لەوانە ئەوەیە کە لە ١٩٧٦/٩/١١دا (صدام حسين) داوای لێ کردبووم کە هەڵسم بە پیلان دانان بۆ تیرۆر کردنی (مام جەلال) وپێیان وتم پێویستی نە ئەکرد، لە دوای ئەم هەموو ساڵانە ئەم جۆرە ڕووداوانە بڵاو بکەیتەوە، بـەڵام پەیمانم داوە بە خوای خۆم کە هەرچی بەسەر هـاتێك ئاگـادار بـووبم دەبێتـە هۆی بەرچاو ڕوونی خەڵکی ئەم وڵاتە بێ ساحێبە لـە ڕاسـتیەکان لێـی بـێ دەنگ نابم و دەینوسـم لەسەر ڕوانگەی ئـەو فـەرمودە بەنرخـەی پێغەمبـەر ئـازدار (صلـی الله علیـه وسـلم) کـە دەفـەرمۆێت (السـاکت عــن الحـق شـیطان اخرس).وە ئێستاکە لەسـەر داواکاری ئەوانـەی نیشتمان پـەروەرن بـە دوایـی ڕاسـتیەکاندا وێڵـن بریـارم دا کــە زۆرێــك لــەوە زیـاتر بنووســم لەســەر ڕاستیەکان لەوەی کە بریارم دابوو هەروەها بەسەرهاتەکانی (کورد، دوژمنی خۆت بناسە) درێژە پێ بدەم و بە(٥)کتێب کۆتایی پێ بهێنم.

وەئەم پێنج کتێبە، بە پشتیوانی خودای گـەورە دەنوسـم، بـەبێ ئـەوەی بـە هیچ جۆرێك ترسی هیچ کەسێك و هیچ لایەنێك هەبێت لە دڵما.

لە کتێبی پێشومدا (کورد، دوژمنی خۆت بناسە) لە لاپەرەکانی (٢١و ٢٢و ٣٦) بەکورتی باسم لە ڕوداوەکانی نێوان (حزبی بەعس و صدام حسین) و(بارزانی) کردووە بۆیە لەم کتێبەیاندا بە دوورو درێژی ڕاستی ئەم ڕووداوانە ئاشکرا و ڕوون دەکەمەوە بۆ جەماوەری گەلی کورد و بۆ ئەوەی نەوەکانی دوارۆژ شارەزابن وئاشنابن بە دۆست و دوژمنی گەلەکەیان.

## ڕووداوەکان

چەند کەسانێك کە زۆر نزیك بوون لە حکومەتی (شا)وە لە دەوروپشتی بارزانیدا کارایان دەکرد، داوایان لە بارزانی کرد کە دۆستایەتی و پەیوەندی لەگەڵ حکومەتی رەزا شاو (CIA) وئیسرائیل نەپچڕێنێت، بەبیانوی ئەوەی کە(صدام حسین) پەیوەست نابێت بەو ڕێکەوتن نامەیەی کە مۆریان کردووە لە (١١)ی ئازاردا، هەروەها (CIA) ئەمریکاش نەی دەویست کەئەم ڕێکەوتننامەیە دەوری خۆی ببینێت وسەرکەوتوبێت هەر بۆیە (هیلمز) کە بەڕێوەبەری دەستگای سیخوری ئەمریکی (C.I.A) بوو کرا بە بالێوز لە بالێوزخانەی ئەمریکی لە (تاران) و لە ئەنجامدا دیاربوو ڕووداوەکان سەری بۆ پیادەکردنی ئەو پیلانەی کە C.I.A دایرشتبوو دەکێشا بەوەدا کە ڕۆژ بە ڕۆژ پەیوەندی نێوان بارزانی و C.I.A لەزیاد بون و توندو تۆڵ بوندا بوو لە چاو ئەو ڕۆژگارانەی پێش بلاوکردنەوەی ڕێکەوتن نامەکەی (١١ی ئازاری ١٩٧٠)دا، وە هەروەها نوێنەری (ئیسرائیل)یەکانیش بە شێوەیەکی ئاشکرا (لە حاجی ئۆمەران) لە خەیمەکاندا هاتوچۆیان دەکرد وەکو مانگی ١٤ دیاربوون وە ئەمانە ڕوودەدا لە کاتێکدا کە هەموو دەزگاکانی حزبی بەعس لە (ئاسایشی گشتی و دەزگای سیخوڕی گشتی وهەوالگری سوپا) بە پیلانێکی دارێژراو لە لایەن (صدام حسین)ەوە لەسەنگەردا بوون وئاگاداری هەموو هەڵسوکەوت و جموجۆڵێکی بارزانی بوون، بەبێ ئەوەی بارزانی ڕەچاوی ئەوە بکات کە ئەم پەیوەندییە گەرمەی لەگەڵ ئەو سێ لایەنەی کە ناوم بردووە

جێی نیگەرانیەکی زۆر زۆر دەبێت لەلایەن حزبی بەعسەوە وە ئاکامێکی زۆر ئاڵۆزو نادروستی لێ دەکەوێتەوە، ئەم ڕووداوانە لە کاتێکدا ڕوو دەدەن کە بارزانی و صدام حسێن لە لوتکەی خۆشی مۆر کردنی بڕوانامەکەدا بوون بەلای خەڵکەوە بەڵێ ئەمانە لە کاتێکدا ڕوو دەدەن کاتێك کە سەرکردەکانی بەعس بەتێکرایی گەیشتبونە ئەو باوەڕەی کە بارزانی بە هەموو باوەڕێکەوە ڕێکەوتن نامەکەی مۆرکردووە ومباوەڕی پێیەتی، هەر بۆیە کە سەرکردەکانی بەعس بە ئاشکرا بە منیان ڕاگەیاند وتیان (كذب اذا احنا نقول عند صديق، احن عندنا صديق واحد بين الاكراد روحوا كلكم التحقوا بالبارزاني قوة بارزاني قوة البعث) وهو ملامصطفى البارزاني واتە (درۆیە ئێمە بڵێین برادەرمان هەیە ، ئێمە تەنها یەك برادەرمان هەیە لە ناو کوردا کە ئەویش مەلا مصطفی بارزانییە ئێوە هەموتان بچن پەیوەندی بکەن بە بارزانییەوە هێزی بارزانی هێزی بەعسە.

ئەو پەیوەندیەی نێوان بارزانیو (ڕەزا شاو. C.I.A ومۆسادی ئیسرائیلی)بوو بە هۆی ئەوەی (دەزگای هەواڵگری) زۆر بە ووردی جێ پێکانی بارزانی هەلگرێت وە لە سەرانسەری عێراقدا ڕۆژانە بە ڕاپۆرت ئاگاداری حکومەتیان دەکردەوە لە جموجوڵی بارزانی وەدەست و دایرەکەی بۆ نمونە ئەفسەرێکی ئیسرائیلی بە هۆی (عبد الوهاب ئەتروشی)یەوە توانی بگاتە پارێزگای (رمادی)وە بە هۆی یارمەتی ئەمەوە جارێکی تر حەوت خێزانی جولەکە لە بەغداوە بەرێ دەکرێت بۆ ئێران. گەلێك لەم دەنگوباسانە و زیاتریش لەمە لە ڕاست و لە درۆ ئەگەیشتنەوە بەردەمی (دەزگای سیخوڕی)یەکان وتاکو کار گەیشتە ئەوەی بەشی زۆری قیادەی قەومی و قیادەی قطری بکەونە گفتوگۆ لەگەڵ (ئەحمەد حەسەن بەکر) و(صدام حسین) دا وە بە تایبەتی (صدام حسین) چونکە ئەو دەوری ڕاستەوخۆی هەبوو لەرێکەوتن نامەکەی (١١ی ئازاری ١٩٧٠)دا وە فشاریان بخەنە سەر بۆ ئەوەی هەڵوێستێکی توند پیشان بەن بەرامبەر ئەو کارانە ئەوەبوو (بکر و صدام) بڕیاری تیرۆرکردنی

بارزانی ئەدەن وداوا لە (ناظم كزار)ئەكەن كە ئەم ئیشە جیبەجێ بكات، ئەوەبوو ویستیان لەرێگای ئەو مەلا داماوانەوە تیرۆری كەن كە ئاگاداری هیچ نەبوون بەلام لە خوا بەزیاد بێت كارەكە سەركەوتوو نەبوو.

**تێبینی:**

رێكەوتننامەی ١١ی ئازار ١٩٧٠ گەورەترین رووداو بوو لە مێژووی كوردا، بەلام لەگەڵ ئەوەشدا خەلكێكی زۆر هەبوو پێیان ناخۆش بوو لەوانە (باڵی مەكتەبی سیاسی مام جەلال و ئەفسەرانی سوپاو سەرۆك جاشەكان و تێكرایی سیخورەكان) و بابا عەلی شێخ مەحمود بەم رێكەوتنە بە جۆرێك دلگران بوو كاتێك شەفیق ئەحمەد ئاغا ئەچێتە لای لە (بیروت) داوای لێ ئەكات بگەرێتەوە بۆ لای بارزانی، لەوەلامدا وتبووی (ئەگەر قولاپی ماسیشم لە لوت كەن ناگەرێمەوە بۆ لای بارزانی).

ئەوانەی باسم كردوون خۆشحاڵ نین بەرێكەوتن نامەی ١١ی ئازار نمونەشمان لەوكەسانەی كە لەناو دەسەلاتی رژێمدا پێیان ناخۆش بوو ئەم رێكەوتن نامەیە بە (عەمید تەها شكەرچی) دەهێنمەوە كە (قائد فرقە)دەبوو، نارەزایی پیشان دانی ئەم پیاوە لە ناو ئەفسەرەكاندا دەگاتەوە (صدام) و خودی خۆی دەنێرێت بە شوێنی دا كە هەر دەگاتە لای (صدام) جواب دانەوەی سەلامەكەی (بە زلەیەك) دەدرێتەوە وەپێشی دەلێت ئەگەر بێتو ئەم جارە ببیستمەوە كە نارەزاییت دەربریوە بەرامبەر بە بریارەكانمان ئەوا سەرت لە ملت دەكەینەوە، وە لە ماوەی (٢٤) كات ژمێردا دەبێت بەغدا بەجێ بهێلیت وەبچیت بۆ بالیۆزخانەی عێراقی لە هندستان لەبەشی سوپا دەست بەكاربیت، وەئەوانەی لەسەرەوە باسمان كردوون لەبەر ئەوەی هیچ دەسەلات و توانایەكیان نەبوو بۆیە خوازیار بوون كەسەریان سەلامەت بێت.

لێرەدا پرسیارێك دێتە پێشەوە ئایا (بارزانی وصدام حسین) كامیان توانیار بوون بە پوچەڵ كردنەوەی رێكەوتن نامەكەی ١١ی ئازار؟ لە وەلامدا ئەلێم

هەڵوێست و هەڵسوکەوتی هەر دوولایان بەپێی ئەوەندەی کە من ئاگادارم ئەخەمە ڕوو ئینجا بریاری کۆتایی دا ئەنێم بۆ خۆتان.

**شۆڕشەکەی بارزان:**

لە کاتێکدا باری ناوخۆی (الوضع الداخلي) بارزانی بەشێوەیەك بوو (پ.م)مکانی بالّی مەکتەبی سیاسی جەماعەتی مام جەلال تەقەی تفەنگەکانیان بە ئاسانی ئەگەیشتە بارەگاکەی بارزانی لاوازیەکی زۆر دیاربوو بە هێزەکەیەوە و زۆر بەکەمی وەلامی ئەو بەرەنگاری بونەوەیان بۆ ئەدرایەوە.

لە باری دەرەوەشدا واتە (الوضع الخارجي) سیاسەتەکان بە پیلانێکی زۆر تونوتوڵ دارێژرابوون لەلایەن (ڕۆژئاوا)وە ئەوە بوو تاران باس لە تاران کونحتا کردن بەسەر (خودی حوکمی بەعس)دا دەکرا کە ئەم پیلانە بە سەرۆکایەتی(شاە) وەدست بەکاربونی (عبد الغني الرواي) جێبەجێ دەکرا وە وا بڕیار درابوو کە دوای سەرکەوتنی کودەتاکە مەلا مصطفی بارزانی بنێرن بۆ (حەج)، دوای ئەوە بۆ خۆی بێتەوە لێرە نیشتەجێ ببێ، بە بیانوی ئەوەی کە کورد و عەرەب هەردوکیان موسلمانن حزبی بەعسیش نەما ئیتر کورد لەوە زیارتر چی دەوێت.

لە کاتێکدا کە روسیا دوور بە دوور چاودێری ئەو بارە ناهەموارەی دەکرد کەبەسەر حکومەتی بەعس وبارزانیدا هاتووە، زۆر ئاگادار بوو کە باری ناوخۆی عێراق بەرەو چ گێژاوێك سەردەکێشێت، هەر بۆیە کە بیرۆکەیەکی دەست کەوت لەو پیلانەی کە (ڕەزاشا) بە بۆ چونی (ڕۆژئاوا) کێشابووی دەست بەجێ یەکێك لەو رۆژنامەنوسەکانی خۆی دەنێرێت بۆ عێراق کە ناوی (پری ماکۆف) بوو بۆ ئەوەی قەناعەت بە حکومەتی بەعس بکات کە لەگەڵ کوردا دابنشێت بەسەرۆکایەتی بارزانی، ئەوە بوو وەکو هەموو لایەك ئاگادارن ڕێکەوتن نامەی (١١ی ئازار ١٩٧٠)ی پیرۆز مۆرکرا کە بو بەهۆی ئەوەی کە حکومەتی عیراقی لەکودەتاکەی کەبۆ لەناو بردنی دارێژرابوو

ڕزگار ببێت وەلەهەمان کاتدا پاڵپشتێك بوو بۆ خودی بارزانی بۆ ئەوەی باڵا دەست بێت لە کوردستاندا وە لە گێژاوەی کەتیی کەوتبوو و لاوازی کردبوو بێتە دەرەوە.

دوا بە دوای مۆرکردنی ڕێکەوتن نامەکە (حکومەتی بەعس) بە هەموو شێوەیەك هەوڵی دەدا کە نزیك ببێتەوە لە بارزانی وگەلی کورد، زۆر حەزی دەکرد بە هیچ شێوەیەك گومان و دووبەرەکی وپێکا هەڵپژان جارێکی تر دروست نەبێتەوە ونەمێنێت لە نێوانیان و بۆ دەربرینی پاکی وڕاستی هەڵوێستی خۆی خودی (صدام حسین)کە جێگری سەرۆك بوو داوای لە (بارزانی)کرد کە یەکێك لە کوڕەکانی بکرێت بە جێگری سەرۆك بەڵام بارزانی فەرمووی بنەماڵەی ئێمە (کارمەندی) حکومەت واتە (وظائف) پەسەند ناکات ئەوە بوو بارزانی پێشنیاری کرد (کە حەبیب محەمەد کەریم) دابمەزرێنێت بە جێگری سەرۆك، بەڵام بەعس ئەمەی بە (توانج) زانی لەبەر ئەوەی کە ئەم پیاوە ئێرانییە و بەلایەن بەعسەوە لەوئاستەشیاوە دا نەبوو کە ببێت بەجێگری سەرۆك، لە گەڵ ئەمانەشدا حزبی بەعس هەر سور بوو لەسەرئەوەی کە کورد بەشداربێت لەدەسەڵاتدا بۆیە لە دانیشتنێکی (صدام حسین) لەگەڵ (بارزانی) دا پێشنیاری کَرد کە (فؤاد عارف)ببێتە جێگری سکرتێر بەڵام بارزانی دەستی خستە سەرشانی فؤاد عارف و وتی(من و کاك فؤاد کارمەندی ناکەین).

حزبی بەعس داوای لە بارزانی کرد کە چەند ئەندامێکی پارتی دیموکراتی کوردستان بنێرێت بۆ ئەوەی بەشداربن لەدەسەڵاتدا لەمەشدا (بارزانی) دوو ئەندامی پارتی نارد کە هەردوکیان جیی گۆمانێکی زۆر بوون وە لەهەمان کاتدا خاوەنی ئاستێکی کۆمەڵایەتی نزم بوون ئەو دووکەسە (عبد الوهاب ئەتروشی) و(هاشم عقراوی)بوون.

دوای چەند مانگێك ووردە وەردە بە ئاشکرا ونهێنی پەیوەندیەکانی بارزانی لە جاران بەهێزتر بوو لەگەڵ (شا)دا و لەهەمان کاتدا پەیوەندی تازەکردەوە

بەلام بەشێوەیەکی بەهێزتر لەجاران و بەنهێنییەکی زۆر لەگەڵ جولەکەدا.
هاتنی (هێلمز) کە (بەڕێوەبەری سیخوری C.I.Aبووە ئێستا کرا بە بالێۆزی ئەمریکی لە تاران و هەروەها (کیسنجەر) کە وەزیری دەرەوەی ئەمریکا بوو لەسەردانێکی دا بۆ ئێران چاوی کەوت بە جەنابی بارزانی.
بارزانی وای دەزانی کە زۆر بە چاکی کارەکەی بۆ دەچێتە سەر لەلایەك خاوەنی کوردستان بێت ولەلایەك لەگەڵ حکومەتی بەعس دا تێکەڵ بێت هەوەها لەلایەکی ترەوە پەیوەندی بەهێزتر بکات لەدوای (١١ی ئازاری)پیرۆز لەگەڵ حکومەتی ئێران و (C.I.A) وە ئیسرائیل بەبێ ئەوەی حکومەتی بەعس لەهیچ شتێك لەم کارە ئاگاداربێت.
لەدانیشتنێکی تایبەتی لە نێوان حکومەتی بەعس وپارتیدا بەڕێوەبەری ئەمنی گشتی (ناظم کزار)بە دورو درێژی باسی هەموو ئەو سەرکێشیانەی (خروقات) کەپارتی پێی هەڵساوە لەسەرەتای ١١ی ئازارەوە هەتا ئەو دانیشتنە هەمووی ئەخاتە ڕوو ئەم کارەی حزبی بەعس جێی سەرسورمانێکی گەورە دەبێت لەلای پارتی بە خەیاڵی خۆیان وایان زانیوە کە حکومەت گێلە و ئاگاداری هیچ شتێك نیە و تەنها بارزانی سیاسەت دەزانێت. لەسەرروو ئەمانەش هەمویەوە لە خۆبایی بونێکی ترسناك رووی کردبووە بارزانی و دەروە پشتەکەی بەشێوەیەك حزبی بەعس زۆرپەشیمان بوو کە پاڵی بە باڵی مەکتەبی سیاسی جەماعەتەکەی (مام جەلال)و نا کەبچنە پاڵ (بارزانی) وەبەهۆی ئەو لە (خۆبایی بونەی) کەسەیتەرەی کردبوو بەسەریاندا نەیان توانی سود لەو هێزو دەسەلاتە وەرگرن کە هاتبوە بەردەستیان لەهەمان کاتدا لە جیاتی ئەوەی کە باڵی مەکتەبی سیاسی جەماعەتی (مام جەلال) لە خۆیان نزیك بکەونەوە بۆ ئەوەی پشتیوانی بن بۆ بارزانی وشۆڕشەکە، بگرە هەتا دەهات دوریان دەخستنەوە لە خۆیان.

هەڵسوکەوتی (بەعس - صدام) هەوڵوێستی بەرامبەر شۆڕشەکە.

لە دوای ١١ی ئازار (بەعس بڕیارێکی دەرکرد کە ئەو کەسانەی کە لە پێش

ئەم ڕێکەوتننامەیەدا مۆچە خۆری (حزب بەعس) بوون وکوردن واتە (سەرۆك جاشەکان و سیخورە ناسراوەکان) بە هیچ شێوەیەك نابێت ڕێگایان پێ بدرێت کە چاویان بکەوێت بەوەزیرو سەرکردەکانی حزبی بەعس.

بۆ نمونە: ڕۆژێکیان چووم بۆ لای (سعدون غیدان) کە وەزیری ناوخۆ بوو چوومە ژورەوە ئاگادارم کردەوە لەوەی (حسێن ئاغا سورچی وعمر ئاغای سورچی) لە خوارەوە لە پرسگە دانیشتون ونایەڵن بێنەلات لە وەلامدا وتی: ئەی تۆ چۆن گەیشتیتە سەرەوە، منیش وتم کە گەیشتمە پرسگە وەکو هەمو جارێك پرسم نەکرد و یەکسەر هاتمە سەرەوە بەلام ئەم جارە لێیان پرسیم تۆکێیت منیش لەوەلامدا وتم من (رەفیق)م لە کابراش وایە ئەلێم (رەفیق حزبیم)، ئەم بەسەرهاتەی من بوو بە نوکتە و گەیشتەوە (صدام).

ئەوکوردانەی کە مانەوە لە بەغداو نەچونە پاڵ شۆڕش (بەعسیش)پشتی تێکردن لە دوای (١١ی ئازار) باری ئابوورییان هەتا دەهات بەرو خراپی دەڕۆیشت، بۆ نمونە(ئەنوەر بەگی بێتواتە)داوای لێکردم کورێکی بۆ دامەزرێنم بە (چاودێر) واتە (مراقب)لەلای هەرکەسێك بێت مانگی بە (١٥) دینار، وە هەروەها (محی هەرکی) کەیەکێك بوو لەو سەرۆك جاشانەی کە باری ئابوری بە جۆرێك خراپ بوو ئێستا کە ڕووم نایەت باسی ئەوە بکەم کەهات بۆلام داوای چی دەکرد. وە زۆرێك لەبراو کوری سەرۆك هۆزەکان ناچاربوون کە ببن بە شاگرد کەباب خانەکان و چایخانەکان و میوان خانەکاندا کە پێویست ناکات ناویان بهێنم.

لە دوای تێپەربوونی ساڵێك بەسەر مۆرکردنی ڕێکەوتن نامەکەدا ئەو تەبایەی کە لەنێوانیاندا هەبوو ووردە ووردە نەدەماو و گومانی خراپ بەیەك بردنی جێگای دەگرتەوە، هەربۆیە دوای ئەم ماوەیە (صدام)دەستی کرد بە هەڵوێست گرتن بەرامبەر (بارزانی) ئەوە بوو فەرمانی دەرکرد بە نهێنی (الاجهزە الامنیە) کە ئاسایش و سیخوڕ وهەوالگری و ڕێکخراوی بەعسیش دەگرێتەوە هەروەها بۆ وەزارەتی دەرەوە کە ئاگاداری بالیۆزخانەی

عێراقی له ئێران و تورکیا وسوریا بکاتەوه لەم فەرمانه کە زۆر بە وردو درشتی هەموو هەواڵێکی بارزانی ڕۆژانه بە ڕاپۆرت بگاتەوە لای(صدام)وه هەواڵەکان ئەبوایه لەم شتانەدا خۆی ببینایەتەوه وەکو:

جۆری چەکیان، ژمارەی پێشمەرگەکانیان، پەیوەندیان بە دەرەوە، وە لە هەمان کاتدا بە هەموو شێوەیەك هەوڵ بدرێت کە سیخوڕکان خۆیان نزیك بکەنەوه له جەماعەتی بارزانی و دووبەرکی لەناو بنەماڵەکەدا دروست بکەن ئەوەبوو پەیوەندیان کرد بە عبیدالله کوڕی مەلا مصطفی وشێخ عوسمان کوڕی شێخ ئەحمەد بارزانی)، هەروەها کار لەسەر ئەوە بکەن کە جەماعەتی (جەلال تاڵەبانی) ڕێگایان پی نەدرێت بە هیچ شێوەیەك لێپرسراویان دەست گیربێت له ناو شۆڕشدا بە تایبەتی (عەلی عەسکەری، ومام جەلال و د.خالید).

حزبی بەعس لە دوای ئەوەی کە سەرکەتوو بوو له پیلانەکەیدا بە نهێنی ئینجا دەستی کرد بەکارکردن لەسەر پیلانە ئاشکراکان.

١- دوورخستنەوەی برا فەیلیەکان.

٢ - گرتنی ئەو هاووڵاتیانەی کە پەیوەندیان هەبوو بە شۆڕشەوە.

٣-لەناو بردنی هەندێك لەو هاوڵاتیانەی کە پەیوەندیان بەشۆڕشەوە هەبوو وەکو (حسێن شیروانی).

٤- دەستیان کرد بەدورخستنەوەی هاوڵاتیان له کەرکوك.

٥-بۆ ڕوون کردنەوەی پیلانەکەی تیرۆرکردنی (بارزانی) لەلایەن (ناظم کزار)ەوه بە هۆی مەلاکانەوه ئەم تێبینیانەم هەیه لەسەری:

مەلاکان لە ڕوانگەی بیروباوڕێکی ئیسلامی و نەتەوایەتی و بە ئاشکرا لەهاتوچۆکردندا بوون بۆ چاکردنی نێوان گەلی کوردو گەلی عەرەب بەبێ ئەوەی ئاگاداربن کە بۆ پیلانێکی ئاوا گەورە نێردراون تەنها دوو کەس بەم پیلانەیان دەزانی کە ئەوانیش یەکێکیان شۆفێری ئۆتۆمۆبیلەکە بوو ئەوەی تریان ئەو کەسە بوو کەلە سەیارەکەدا مابووەوە (کۆنترۆڵی) (T.N.T)یەکان لەلای خۆی بوو، بەو نیازەی کە لەکاتی پێویستدا ئەوکاره ئەنجام بدات بەڵام

خۆشبەختانە پیلانەکە سەرکەوتو نەبوو، لە لەلایەن حکومەتیشەوە تەنها (ئەحمەد حەسەن بکر و صدام ناظم گزار)بەم کارەیان دەزانی، وە ئەم کارە خۆی لە خۆیدا کودەتایەك بوو بۆ سەر مەلا مصطفی وبزوتنەوەی کوردی بەڵام لەبەر ئەوەی کودەتاکە سەرنەکەوت پیلانەکەشیان سەری نەگرت بۆ لە ناوبردنی بزوتنەوەی کوردی.

ئەم کارە پاڵنەرێك بوو بۆ بارزانی کە پەیوەندییەکەی لە جاران بەهێزتر بکات لەگەڵ (شا، C.I.Aوئیسرائیل)دا، وە ئەو کەسانەش کە لە دەوری بارزانی بوون وهاندەریشی بوون بۆ ئەم کارە تا دەهات پلەوپایەیان لەلای بارزانی بەرزدەبووە، تا کار گەیشتە ئەوەی کەئەو کۆمەڵە قسەیان بەسەر سەرکردایەتی پارتیشدا دەڕۆیشت وە ئەو کەسانەش کە زۆر هەوڵیان لەگەڵ بارزانیدا ئەدا کە پەیوەندی نەپچڕێنێت لەگەڵ (بەعس)دا ڕۆژ بەو ڕۆژ پلەوپایەیان لەلای بارزانی بەرەو لاوازی دەڕۆیشت.

## ڕوون کردنەوەیەك لەسەر ناظم گزار:

لە لاپەرەکانی (٢٠، ٢٩، ٣٠، ٣١) لە کتێبەکەی پێشومدا (کورد، دوژمنی خۆت بناسە) ناوم هێناوە وئێستاکە هەندێك لەسەری دەدوێم.

ئەم پیاوە بریتی بوو لە کەسێکی پیاو گوژ وستەم کارو خوێن مژ. لە کودەتاکەی (١٩٦٣)دا ناوی هاتە ناو ناوانەوە کرا بەلێپرسراوی لێکۆڵینەوە و کەسانێکی زۆر بەفەرمانی ئەم کوژراون، وە لە(١٩٦٨)دا کە بەعس بە تەواوی هاتە سەر حوکم کرابە بەڕێوەبەری پەیوەندییەکان لە (مجلس قيادة الثورة)، لە ساڵی ١٩٦٩دا کرا بە بەڕێوەبەری ئاسایشی گشتی عێراق ودبریکاری بەڕێوەبەری پۆلیسی گشتی عێراق، ئەم پیاوە لەبەر ئەوەی جێی باوەڕو متمانەیەکی زۆری(بکر و صدام)بوو بۆیە هێنایان ئەم دەسەڵاتەیان خستە ژێر دەستیەوە بۆ ئەوەی دڵنیابن لەوەی کە پەیڕەو وپرۆگرامی (حزب بەعس)جێبەجێ ئەکرێ لەناو خەڵکی عێراقدا، هەر بۆیە لە دەست

رۆیشتوییدا له دوای(صدام)ەوه دەهات.

پاش ماوەیەك هەڵوێستی (ئەحمەد حەسەن بكر و صدام حسین)ئاشكراو روون بوەوه بۆ ئەندامانی حزبی بەعس كه ئەمانه لایان داوه له بەرنامەكەی حزبی بەعس وایان باس دەكرد لەناو خۆیاندا ئەگەر بێت و كار ئاوا بەردەوام بێت ئەوا(بكر و صدام) هەموو بیرو باوڕێكی حزبی بەعس دەخەنه ژێر پێڵاوەكانیانەوه بۆیه گەیشتنه ئەوەی كه مانەوەیان له حوكمدا خەتەرێكی گەوره دروست ئەكات بۆ بەعسیەكان به تایبەتی و عێراق بەگشتی.

ئەم هەڵسو كەوتەی (بكر و صدام) رۆژ بەرۆژ له ناخی (ناظم كزار)دا ناڕەزاییەكی بەجێ دەهێشت له بەرامبەریان تا وای لێ هات له ناخی خۆیدا بڕیاری دا كه خۆی و(محەمەد فاضل)وه چەند كەسانێكی تر پیلانێك داڕێژن بۆ له ناوبردنی (بكر و صدام) بەڵام دوای سەرنەكەوتنی كودەتاكه تەنها ناوی (عبدالخالق سامرائی)ئاشكرابوو لەو نێوانیاندا، وه كاتێك دەست بەسەركران به هیچ جۆرێك دانیان پیادا نەنا كه هیچ كەسێكی تریان لەگەڵدایه.

**روون كردنەوەیەك لەسەر حەمەی مەلا شەریف:.**

لەلاپەڕەكانی (٨٠ بۆ ٨٥) دا له كتێبەكەی پێشومدا (كورد، دوژمنی خۆت بناسه) باسم كردووه، بەڵام من كه له ١٩٧٦/٩/١٤دا كه گیرام ئیتر له یەك دابڕاین به هیچ شێوەیەك ئاگاداری دەنگ وباسی نەبووم.

**روون كردنەوەیەك لەسەر (منذر نقشبدني وحەمەی عیسی كەلاری):**

سوپاس بۆ یەزدانی مەزن كه ئەم دوو تاوانباره ئێستاكه له هەرێمەكانی كوردستاندا نەماون (چونكه ئەگەر لێره بمانایەتەوه ئەوا ئێستاكه كاربەدەستێكی گەوره دەبوون دەبوایه به ناچاری (خوشكی لەیلا قاسم و یان

منالّی شەهید عبد الرحمن قازی) ئیش و کارەکانیان لەرێی ئەوانەوە جێبەجێ بکرایە، چونکە ئەوانەی بەشدار بون لە ئەنفالە بەدناوەکاندا هەندێکیان وەزیر بوون (امناء)لە هەولێر لە(حکمی ذاتی)دا ئێستا کە بە هەمان شێوە دەسەلاتدارن لە ناو هەرێمەکاندا لێرە بە ئاسانی جێت دەبێتەوە وە ئەگەر دژی لایەك بیت.

## روون کردنەوەیەك لەسەر (حسێن حەمە سوار ئاغای پشدەر):

لە تیرەیەکەی میراو دەڵی ناسراوی پشدەرە لە بنەماڵەیەکەی ئەوپەری خزمەت گوزاری مالّی خۆیان، بەلام بەداخەوە خودی تایبەتی خۆی کابرایەکی (دزو تالان کەرو خوێن مژو ستەمکارو خۆفرۆش) بوو یەکێکە لەوانەی کە بەشداری کردووە لە ئەنفالەکانداوجێی باوەرو متمانەیەکی زۆری بەعس بوو لە ناوچەی پشدەر، وە دژی هەموو کوردێکی نیشتمان پەروەرو کاسب بوو، و چەندەها پێشمەرگەی شەهید کرد لە پێناوی چەند دینارێکدا بە فەرمانی بەعس پیلانێکی دارشت بۆ کوشتنی (فاروقی مام عەلی)کادرێکی ناسراوی یەکێتی نیشتمانی کوردستان بوو، ئێستا لەسەر تاوانێکی گەورە لەبەندینخانەی (پ.د.ك) دا رۆژ دەباتە سەر و دوور نیە دوای ئەوەی ئەم کارەی ئەنجام داوە دەرگای بەندینخانەی بۆ بکەنەوە چونکە جەلالیەکی کوشتووە.

## روون کردنەوەیەك لەسەر صالح یوسفی. :

لە کتێبەکەی پێشومدا لە لاپەرە (٦٢) (کورد، دوژمنی خۆت بناسە) ناوم هێناوە بەشەرمەوە لەسەر ئەم پیاوە بەرێزە ئەم چەند دێرە دەنوسم ئەم پیاوە نیشتمان پەروەرە هەموو تەمەنی خۆی بەخت کرد لە پێناوی ئازادی و رزگاری کوردو کوردستاندا هەزار رەحمەت لە گۆرت بەراستی (زیندویت و

ـە نێو میللەت دا ئەژیت).

ـدوای هەرەسەکە(صالح یوسفی) هاتە بەغدا بەو نیازەی گفتوگۆ لەگەڵ بەعس دا بکات کە چاوم پێ کەوت هەلۆێستی کوردایەتی ئەم پیاوە گۆڕانکاری بەسەردا نەهاتبوو وورەی بەرز بوو، وە بەشێوەیەك قسەی بۆ ـەکردم لە میوان خانەکە ئەدووت لە ناو پێشمەرگەکانی خۆییدایەو وتار ـدخۆێنێتەوە بۆیان لەگەڵ ئەوشدا کە دەیزانی دەوروپشتەکەی هەمووی ـیخوڕن، وەمن لە قسەکانی تێ گەیشتم کە ئەیەوێت چاوی بە (سەید النائب)بکەوێت بە مەبەستی ئەوەی بۆی ڕوون بکاتەوە کە (ڕێکەوتن نامەی جەزائیر) سەرکوتوو نابێت ئەگەر ڕێگا چارەیەك بۆ کێشەی کورد نەدۆزرێتەوە.

ئینجا من پێم وت ئەگەر ڕێگام بدەیت دەستە بەنرخەکانت ماچ ئەکەم وە ئیجازە بفەرموو با هەندێك شتت بۆ ڕوون بکەمەوە وە ئەویش ئەوەیە کە لەلای سەرکردەکانی بەعس (بکر و صدام)شتێك نەماوە جێی سەرنج بێت وپێی بڵێن کێشەی کورد، کێشەی کورد لەلایەن ئەوانەوە کۆتایی پێهاتووە هەتا هەتایە وە ئەم باسەم زۆر بە ووردی و بە دوورو درێژی بۆ باس کرد.

دوای ئەوەی کە کۆتایم بەقسەکانم هێنا (سەیدا یوسفی) زۆر دڵگران بوو، زۆر گرژ بوو کەتێگەیشت بارودۆخەکە بەو شێوەیە ئاڵۆزە ئینجا نزیکەی نیو ساعاتێك بێدەنگی وبێتاقەتی دایگرت، وئینجا دەستی کردەوە بە قسەکردن وتی: بەڕاستی ئێمەی ڕۆشنبیران ولێپرسراوان کە لە دەوری بارزانی بوین ڕۆژ نەبوو لەناو خۆماندا باس لە مەترسی ئەو پەیەوەندیە بەهێزە نەکەین کە بارزانی بەستویەتی لەگەڵ (شا)دا وە ئەمان وت نیازی (شا) ئەوەیە کە ڕۆژ بە ڕۆژ دەسەڵاتی زیاد بکات بەسەر( شۆڕشەکەدا، من یەکێك بووم لەوانەی کە چوومە خزمەت بارزانی وئاگادارم کردن و لەوەی کە حکومەتی کۆنە پەرستی ئێران سەرانسەری مێژوو بە تایبەتی بنەماڵەی (شا) دووژمنی کورد بونو مێژوویەکی ڕەشیشیان تۆمارکردووە بەرامبەر بزوتنەوە کوردیەکان بۆ

نمونە :کوشتنی (سمایل)ئاغای سمکۆ وە لەسێ دارەدانی سەرۆکی کۆماری مهاباد خولێخوش بوو قازی محەمەد)وە ئێمە لەناوخۆماندا گومانێکی زۆرمان پەیدا کردووە بەرامبەر ئەو بارودۆخەی کەتێدا دەژین وە خۆت لە هەموو کەس شارەزاتری لە حکومەتی ئێران، بەلام لەوەلامدا پێی وتم: ئێمە بەهێزترین شۆرشین لە ڕۆژهەلاتی ناوەڕاستدا و چەك و جبەخانە وپارەی پێنج سالمان هەیە وە لە هیچ شتێکمان کەم نیە وە بەهیچ شێوەیەك مەترسیتان لە عێراق وئێران نەبێت.

کە لەباسی قسەکانی بارزانی تەواو بوو پێی وتم ئێمەش باوەڕمان بە قسەکانی بارزانی هەبوو لە ١٠٠٪ چونکە منیش لام ئاشکرا بوو کە چەك وجبەخانەی ودارایی‌مان وەهێز وتوانای پێشمەرگە وفیداکاریان لە لایەکی تریشەوە گەلی کورد بە هەموو جۆرێك باوەشی کردبوو بە شۆڕشەکەدا ئەمانە هەمووی جێی متمانە وقایل بون بوون بە وەی کە کەس ناتوانێت زەفەربەرێت بە شۆڕشکە.

بەلام ئەوەی جێی سەرسوڕمان بوو لەلای من و هەموو گەلی کورد کوردستان ئەوە بوو کە بارزانی بەتەنها بریاری دا کی(ئاش بەتال) بەشۆڕش بکات. وتی گەیشتین کە ئەم کارە پەیرەوی کردنی پیلانێکی داڕێژراو بوو لەلایەن (شاو C.I.A بەئاگاداری جولەکە) جێبەجێ کرا لەلایەن بارزانی‌یەوە.

ئینجا دوای تەواو بوونی وتەکانی (سەیدا یوسفی) پێم وت سەرکردەکانی بەعس دەلێن سوپاس بۆ یەزدانی مەزن لە پیلانەکەی (ناظم کزار)دا مەلا مصطفى‌ی بارزانی هیچی لێ نەهات، چونکە مانی بارزانی ئێستاکە گەورەترین سودی هەبوو ئەوەتا بەدەستی خۆی ئاش بەتالی بە کورد کرد.

ئینجا سەیدا یوسفی وتی ئەبێ هەول بدەین هیچ کوردێکی عێراقی لە ئێران نەمێنێتەوە بۆ ئەوەی جارێکی تر کورد نەکەنەوە بە دار دەستی خۆیان.

**تێبینی:**

١- سەرۆك كۆمار (ئەحمەد حەسەن بەكر) بۆچونێكی تایبەتی هەبوو بەرامبەر (سەیدا یوسفی) وڕێزی زۆر لێ دەگرت وە ڕوون وئاشكرا بوو لەلایان كە كوردێكە هیچ جۆرە پەیوەندیەكی بە دەرەوەی ولاتەوە نییە وە هۆی ئەوە بوو ماڵەكەی لە بەغداد وەكو خۆی مابووە هیچ دەستیان لێ نەدابوو.

٢- لەساڵی (١٩٩٧) دا لەگەڵ هاوسەرەكەم سەردانی خێزانی خوالێخۆشبوو (سەیدا یوسفی)م كرد لە زاخۆ و پێم وت كە لە تەلەفزیۆندا نیشانی داوە كە(سەرۆك بارزانی) هاتۆتە لاتان انشاءالله كەم و كوڕیەكانی بۆ ئەنجام دوایت، لەوەڵامدا هاوسەرەكەی یوسفی وتی: داوام لەسەرۆك كرد كە باخچەی خانووەكەم جێگای (٤٠)دوكانی تیا ئەبێت و یارمەتی پارەمان بداتێ بۆ ئەوەی دروستی كەین ئەوكاتە باری ئابوریمان زۆر باش دەبێت بەلام سەرۆك بارزانی لەوەلامدا وتی ئێستاكە پارەمان نییە كەی پارەمان بوو بۆت ئەكەین.

٣- لەدوای چەند مانگێك لەو سەردانەم بۆ زاخۆ سەردانێكی تری زاخۆم كردەوە بە تەنیا كە لەمیوانخانەی (بەغداد)دا بەزیبووم، لە پڕا گوێم لە دەنگی دەهۆڵ و مۆسیقا بوو سەرنجم دا سەیرم كرد ئاهەنگێكی گەورەیە و سازدراوە بۆ پەردە لابردن لەسەر پەیكەری (صالح یوسفی)وە منیش چوومە (بالەكۆنی) میوانخانەكە بۆ ئەوەی تەماشای ئاهەنگەكە بكەم، ڕووم كردە كابرایەك لەتەنیشتمەوە ڕاوەستا بوو لەبەر خۆمەوە وتم: (پارەی ئەو پەیكەرەیان بدایە بەهاوسەرەكەی دووكانەكانی پێ دروست بكردایە باشتر نەبوو؟ بەلام كابرا جوابی نەدامەوە ڕۆی، لە دوایی دا خاوەن میوان خانەكە وتی ماڵ خراپ ڕەفیق ئەوە نەقیبی ئاسایش بوو، منیش وتم كەواتە ئاگاداری وەزعەكەیە بۆیە ڕۆی.

٤- ئەم پیاوە ئەوەند بەڕێز بوو ئەگەر لە هەموو پارێزگایەك پەیكەرێكی بۆ دروست بكرایە هێشتا كەمە. وەئەگەر ئێستا بمایە خاوەنی حیزبێك دەبوو كە لە ٩٥٪ بادینان و ٧٥٪ سۆرانی لەگەڵدا دەبوو، ماڵت وێرانبێت (صدام) بۆ

تیرۆرت کرد.

## ڕوون کردنەوەیەك لەسەر زەکیە اسماعیل حقی(فەیلی)

لەکتێبەکەی پێشومدا لە لاپەرە (١١٤)مدا (کورد، دوژمنی خۆت بناسە) ناوم هێناوە.

دەرچووی کولێجی یاسایە بە پلەی (امتیاز) زیرەك ورۆشنبیرو لە بنەماڵەیەکی کوردی ناسراو لە بەغدا، وە سەرۆکی ئافرەتانی کوردستان بوو لە ساڵەکانی (٧٠)دا لە رابوردوودا کوردێکی نیشتمان پەروەر بوو، دوای هەرەسەکە لە مانگی ٤ ی ١٩٧٥دا (متحەت ابراهیم جمعە)کە بالیۆزی عێراقی بوو لە تاران هاتبوو بۆ بەغدا بۆ گفتوگۆ کردن و لێکۆڵینەوە دەربارەی کورد منیش (زەکیە)خانم بە (متحەت) ناسان لە ماڵی باوکی سێ قۆڵی کۆبونەوەمان کرد لە(بەتاوین)، باسی چۆنیەتی ئەوەمان کرد کە چۆن ئەو کوردە عێراقیانەی کە لە ئێران ماونەتەوە بە خۆشی بگەرێنەوە.

چونکە هەڵوێستی (ساواك پاراستن) ئاشکراو ڕوونە بە هەموو شێوەیەك پروپاگەندە دەکەن بۆ ئەوەی نەگەرێنەوە، چونکە مانەوەیان زیانێکی گەورەی هەیە بۆ میللەتی کورد و لەهەمان کاتدا سود بە خشە بۆ دوا ڕۆژی حکومەتی شا، ئەوەبوو کۆمەڵێك لە کوردی عێراق رۆیشتن بۆ ئێران بۆ ئەوەی لە نزیکەوە چاویان بە کوردەکانی ئەوێ بکەوێت تاکو (قایل)یان بکەن کە بگەرێنەوە، زەکیە خان یەکێك بوو لەو کۆمەڵە، لە گەرانەوەیدا ئاگاداری منی کرد کە بە تەلەفۆن قسەی لەگەڵ (حەبیب محەمەد کەریم) کردووە کە سکرتێری پارتی دیموکراتی کوردستان بوو، ئەوە بوو حبیب محمد کریم ئێرانی بەجێ هێشت چووە قاهیرە، زەکییە خانی بەرێز لەوێش سەردانی کرد، دوای گەرانەوەی زەکیە خان بە ماوەیەکی کەم ئەوەبوو (حەبیب) گەرایەوە بۆ عێراق وخۆی تەسلیم بە حکومەتی عێراقی کرد، زەکیەخان چالاکییەکی بێ ئەندازەی ئەنجام دا بۆ خزمەتی (بەعس) کەشایەنی باس

کردنە کە ئەنجامدا دەرکەوت بۆمان کە ئەندامێکی چالاکی (مخابرات)ە.

**تێبینی:**

لە ١٩٩١/٣/١٢ لەماڵی عزەت بەگ لەدێگەڵە چاوم بە کاك مەسعود بارزانی کەوت کە لە هەمان ماڵدا لە ژورێکی تر(زەکیە خان) چاوەڕاونی ئەکرد چاوی بە سەرۆك بکەوێت.

وەمنیش بەرێکەوت چاوم بە (زەکیە) کەوت لەو ماڵەدا زۆرم حەز دەکرد کە دەست بکەم بە چاوی داو وە ناپاکی و خیانەتەکانی خۆی بدەمەوە بەدەموچاوی دا، بەڵام سوپاس بۆ خوا ئەم هەڵوێستەم نەبوو چونکە(حەبیب محەمەد کەریم)کە سکرتێری پارتی دیموکراتی کوردستان بوو و خۆی تەسلیم بە حکومەت کردبوو و دوای ئاشبەتاڵەکە، ئەم جارە زەکیە لە بەغداوە هێنایەوە بۆ ناو پارتی کە لێرە دامەزرا بە (عضو لجنة مراقبة وتفیش)لە ریزەکانی پارتی دا.

**حەبیب محەمەد کەریم-دارا تۆفیق - عەلی عەسکەری:**

لە دائیرەی بەڕێوەبەری ئاسایشی گشتی دوای چەند کەسانێکیان ئەکرد لەوانەی کە لەگەڵ شۆڕشدا بوون و دوای هەرەسەکە گەڕاونەتەوە، لێپرسراوی کاروباری سیاسی( عەمید سلیمان) کە لە ئاسایشی گشتی دادەنیشێت ئەنێرێت بە شوێن(حەبیب محەمەد کەریم ودارا توفیق و عەلی عەسکەری) و پێیان رادەگەیەنێت کە ئێوە دەست نیشان کراون لەلایەن حکومەتەوە بۆ ئەوەی دابمەزرێن بە کاربەدەستی میری و ئەمانەوێ بزانیین کە ئێوە ڕاتان چیە؟

١- لەوەڵامدا حەبیب محەمەد کەریم دەڵێت: (زۆرخۆش حاڵم بەم بڕیارە تایبەتەی بەعس کە بۆ منی دەرکردوە وەبەم شێوەیە رێزم لێ دەگرن بەڵام یەك داواکاریم هەیە ئەویش ئەوەیە لە شوێنێك دامبمەزرێنن کە کوردی تیادا نەبێت.

٢- وە دارا تۆفیق یش دەڵێت: ئەوپەڕی سوپاسی سەرکردەکانی بەعس دەکەم زۆر ڕێزم هەیە بۆیان خۆشحاڵم بەم کارە.

٣-عەلی عەسکەری یش دەڵێت: ئێوەی بەعس هەڵوێستی من باش ئاگادارن کە من هەرگیز نەم ویستووە بچمە پاڵ ئەو شۆڕشەی کە(شا) سەرپەرشتی دەکرد بەڵام ئێوە بە زۆر پاڵتان بەمنەوە نا بۆیە من رازی نیم بەم دامەزراندنە( ئەم کەڵە پیاوە نیشتیمان پەروەرە یەکێك بوو لەسەر کردەکانی باڵی مەکتەبی سیاسی کەپێیان دەوتن جەماعەتی جەلال تاڵەبانی دوای (١١ی ئازاری ١٩٧٠) بەعس فشاری خستنە سەر بچنەوە پاڵ بارزانی).

**تێبینی**:

بەڕێوەبەری ئاسایش ئەم وەلامانە دەکات بە راپۆرتێك وە دەینێرێت بۆ (مكتب شؤون الشمال)کە(صدام) لێپرسراوی یەکەمێتی و لە ڕاپۆرتەکەدا لەسەر(حەبیب)دەدوێت و دەڵێت: (باشە من سەیرم لێ دێت یەکێك ئەمە بیر و بۆچونی بێت چۆن لەلایەن مصطفی بارزانییەوە کراوە بە سکرتێری حزبەکەی، هەروەها بە خۆڕایی نەبووە کە مەلا مصطفی لە(عەلی عەسکەری)ترساوە و هەروەها (دارا)یەك کە بیروباوەڕێکی چەپی هەیە چۆن مەلا مصطفی لەلای خۆی کردوویەتی بە لێپرسراو)، لەدوای هەرەسەکە خێزانەکەی دارا پەیوەندی پێوە کردم و ووتی : دارا دەیەوێت بگەڕێتەوە لەبەیروت کاك ڕەفیق تۆ دەڵێیت چی..؟ ووتم: ئەگەر بگەڕێتەوە لەسێدارەی دەدەن، دارا وای دەزانی حکومەت یان لەبیریان چۆتەوە یان چاوی لێ دەپۆشن لەوەی کەپەیوەندی بەدەرەوەی ووڵات هەیە بۆیە بەو پلە بەرزە دای دەمەزرێنن بەڵام ئەوە بوو هەر لەناویان برد.

**ڕوون کردنەوەیەك لەسەر عبید الله بارزانی لەگەڵ شێخ عوسمان بارزانی.**

**لەلاپەرە ٤٧، ٤٨، ٤٩، (کورد، دوژمنی خۆت بناسە) ناوم هێناون.**

هەردوکیان هەریەکە بە جیا پەیوەندیان هەبوو بە (بەعس)ەوەپێش ئەوەی مەلاکان بنێردرێت بۆ تیرۆکردنی، بارزانی، دوای ئەوەی عبید الله بارزانی و عوسمان بارزانی کە پەیوەندیەکەیان بە حکومەتەوە بە هێز دەبێت ئینجا بە حکومەتی بەعس دەلێن ئەگەر بێتو ئێوە بەشێوەیەکی باش پشتیوانی مان بکەن و بە گوێمان بکەن لەو پێشنیارانە دا کە ئێمە ئەیخەینە بەرچاوتان ئەوا بەلێنتان دەدەینێ کە هەموو خێلی بارزان رابکێشین بەلای حکومەتدا رەنگە تەنها چەند نەفەرێك بمێننەوە بەلای بارزانی یەوە و داواکارین کە بەقسەی سەرۆك هۆزەکانی دەورو بەری بارزان هەڵسوکەوت لەگەڵ ئێمە دا نەکەن چونکە ئێمە ناکۆکی کۆنمان هەیە لەگەڵیاندا.

حیزبی بەعس دوای ئەوەی هەستیان کرد کە شۆڕشی کوردی جارێکی تر دەست پێ دەکاتەوە، بیریان کردەوە کەئەبێ پیلانێکی توندو تۆڵ دارێژن بۆ لەناوبردنی شۆڕشەکە ئەوە بوو پیلانێکی گەورەیان دارشت کە چەند خالێکی زۆر سەردەکی لە خۆی گرتبوو یەکێك لەو خالە سەرەکیانە ئەوە بوو پشتیوانی یەکی بە هێز لە(عبیداللە بارزانی کە کوڕە گەورەی مەلا مصطفی یەو وەعوسمان بارزانی کە برازایەتی بکەن) بۆ ئەوەی کەئەو پەیمانەی داویانە بە حزبی بەعس بیبەنە سەر و لە کەسایەتی بارزانی دابەزێنن.

دوای ئەوەی شەڕ دەستی پێ کردەوە لە نێوان (بەعس) وبارزانی دا (عبیداللە بارزانی) کرا بە وەزیری وولات ئەمە بوو بە هۆی ئەوەی یەکەم پیلانی حزبی بەعس سەرکەوتوبێت بەوەی لەهەمەوو ڕاگەیاندنەکانی حزبی بەعسەوە بلاو دەکرایەوە کە (عبیداللە بارزانی) کە کوڕە گەورەی بارزانی یە بیروباوەری مەلا مصطفی بەڕاست نازانێت ئیتر ئەو خەلکە چۆن باوەری پێ دێنن و بەڕاستی دەزانن، دوای ئەوە (بەعس) تەنها بەڕاگەیاندنەکانی خۆیەوە نەوەستا بەلکو (عبیداللە)یان دەگەڕان بە شاراندا بۆ ئەوەی رۆژنامەگەری جیهانی لەگەڵدا ببەسترێت بۆ نمونە کۆنگرەیەکی

رۆژنامەگـەری بـۆ دەبەسـترێت لـە ئـەڵمانیای رۆژئـاوا دوای ئـەوەی هــەمو رۆژنامەگـەرەکان لـە پرسـیارو وەڵامــەکانیان دەبنــەوە لەگـەڵ (عبیــد اللــە بارزانی)دا تەنها یەك رۆژنامە نووسینی ئەڵمانی دەمێنێتەوە کە کیژێکی زۆر سـەرنج راکێش بــوو خــۆی ئەهێڵێتــەوە بـۆ ئـەوی ئـاخر کـەس بێـت کـە چاوپێکـەوتنی لەگـەڵدا بکـات، کـاتێك سـەرەی دێـت دەچێتـە پێشـەوە لـە (عبیدالله بارزانی) دەست دەکات بە پرسیار کردن وسێ جار لەسەر یەك پێی دەڵێـت نـاوت چیـیە دوای ئـەوە سێ جاری تـر دووبـارەی دەکاتــەوە و دەڵــێ بـاوکت نـاوی چیـیە دوای ئـەوە پـێی دەڵێـت باشـە تـۆ بـە تـاکید کـوڕی ئـەو مصطفی بارزانی‌یەی کە هـەموو جیهان باسـی دەکـەن و حکومـەتی عـێراقی زەلیلـە بەدەسـتی یـەوە (عبیداللـە بـارزانی) لـەوەڵامدا دەڵێـت (بـە تـاکید) ئافرەتەکەش زۆر بەلایەوە سەیر دەبێت و پێی دەڵێت (خۆزگە لەبار دایکت بچویتایـە)، لـەم کاتـەدا(عبیداللـە بـارزانی)خـۆی جـیڕ دەکاتــەوە بـۆ ئـەوەی هەڵوێستێکی توند بنوێنێت بەرامبەری بەڵام(نوری فەیصەل شاهد)ی یاوەری کە سـکرتێری(صـدام)بـووە دەسـتێکی بـاڵای هـەبوو لەقــەلاچۆکردنی کـوردا، چاکەتەکـەی لـە پشـتەوە رادەکێشـێت پـێی دەڵێـت ئاگاداربـە ئەمـە کـۆری رۆژنامە گەریە بۆت نیە هیچ شتێك بەرامبەر ئەو ئافرەتە بکەیت.

ومیەکێك لە پیلانەکانی تری حزبـی بـەعس ئـەوە بـوو کـە بایـەخێکی زۆر بدرێت بـە(عوسمـان بـارزانی)کـە کـوڕی شـێخ ئەحمـەد بارزانی‌یـە، بـۆ ئـەوەی بتوانــن ئــەم پیــاوە ئامادەبکــەن بــۆ هەڵســان بــە ئیــش کــردن لەســـەر خێڵی(بارزان)بۆ ئەوە بتوانێت بە شێوەیەك بیروباوەڕی خێڵی بارزان بگۆڕێت بەرامبەر بە(مەلا مصطفی)کـە ئەگـەر بێتـوو حکومـەتی بـەعس بـە هـەموو قیادەوە بچن لە بارزان دابنیشن بە هیچ شێوەیەك مەترسی لەسەرنەبێت.

( عبیدالله بارزانی وعوسمـان بـارزانی)لـە هـەموو راپۆرتـەکان دا کـە دەیـان ناردبۆ سەرکردەکانی بەعس و هەروەها لە هەموو چاوپێکەوتنێکیشـیاندا کـە چاویان یەسەرکردەکانی بەعس دەکەوت بـە تایبـەتی(صـدام حسـین)ئـەومیان

دۆزیات دەکردەوە کە ئەگەر بێتو(حکومەتی بەغداد)رێك بکەوێت لەگەڵ(حکومەتی ئێران)دا ئەو کاتە مەلا مصطفی نامێنێت چونکە هێزی دەرەکی مەلا مصطفی (ئێران و ئەمریکاو ئیسرائیل)وە لەبەر ئەوەی هێزی خۆی هیچی تیا بەسەر نییە(بۆشە)هەربۆیە ئەگەر بێتو لەگەڵ ئێراندا رێك بکەون ئەو شۆڕشە کۆتایی پێ دێت.

کار گەیشتبووە ئەوەی بەشێوەیەك لەراگەیاندنەکانی بەعسەوە ئەم دوو کەسایەتی‌یە باسی بنەماڵەکەی خۆیان دەکرد، قسەی نابەجێیان پێ دەوت کە من بە هیچ شێوەیەك لەرووم نەدەهات کە بیخەمە سەر کاغەز و بینێرمەوە بۆ(بارزانی)هەر بۆیە لە مەکتەبی بارزانی‌یەوە رادیۆ و تەسجیلێکیان بۆ ناردم بۆ ئەوەی دەنگیان تۆمار بکەم و بۆیانی بنێرمەوە.

شێوەی کار کردنەکەمان وا بوو کەمن لێپرسراو بووم بەسەر(شێخ عوسمان)ەوە بە هۆی لێپرسراوێتیمەوە هەموو پیلانێك و هەڵسوکەوتێکی(عوسمان بارزانی)کە دەهاتە بەردەستم کتوپر مەکتەبی بارزانیم لێ ئاگادار دەکردەوە بۆ ئەوەی پیلانەکانی پوچەڵ ببێتەوە، کار بە هۆی منەوە گەیشتە ئەو ئاستەی کە بوون بەجێی گومان بەلای(صدام حسین)وە وایان بۆ لەقەڵەم درا کە ئەمانە (خط مائل)ن واتە لەگەڵ هەردوولادا کاردەکەن، وەلەگەڵ پیلانەکانی مندا بۆ نەمانی ئەوان، هەموو سەرۆك هۆزەکانی دەوروپشتی (بارزان)یش پەیتا پەیتا دەچونەوە لای (صدام حسین) و پێیان دەوت کە ئەم دوو بارزانی‌یە ڕاست ناکەن لەگەڵتا، و توانیم سەرکەوتوانە دووبەرەکی‌یەکی زۆر بخەمەوە نێوان (شێخ عوسمان و عبیداللە)وە، بەڕاستی ئەوەی ئەم دوو کەسەی سوك کرد بە دەم حزبی بەعسەوە ئەوە بوو ئەم دووانە هەموو هەڵسوکەوت و هەستان و دانیشتێکیان لە پێناو پارەدا بوو بەلام عبیداللە هەندێك هەڵسوکەوتی نابەجێ پیادە دەکرد کە نەئەبوایە لەو بووەشایەتەوە ئەویش ئەوە بوو دەستی تێکەڵ کرد لەگەڵ باڵیۆزخانەیەکی بێگانە و زۆربەی کاتەکانیشی لەگەڵ (SEX)دا دەبردە

سەر وەئەو كوردانەی لەگەڵی دەگەڕان خەڵكێكی نـزم و بـێ مستوا بـوون. وە گرنگترین شت بـەلای(عوسمان)ەوە ئـەوە بـوو كـە بەهەرچی شێوەیەك بێت پارەی دەست كەوێت ئیتر ئەو پارەیە چۆن دێتە دەستی گرنـگ نـیـیە، گرنـگ ئەوەیە كە بتوانێت كە گردێكی لە پارە هەبێت، ئەم پیاوە ئـەوندە حەزیشی لەسـەیارەی جوان بـوو كـە ناچـاری كـردم بچـم لـە (كوێـت) ئۆتۆمبیلێكـی (مارسـیدس)ی تـازەی بـە گریـزەوە بـە قاچـاخ بـۆ بـهێنم بـۆ بـەغداد.و كە(سەعدون غێدان) ئەمـەی بیستەوە پـێی وتم (أخي متجيب لي سيارة الي همينة)

سوێند بە خوا سوێند بە خوا سوێند بە خوا ئەگـەر مـن نەبوومایـە هـێزی حكومەت بە پشتیوانی خێڵی بارزان (عبیداللـه وعوسمان) هێرشیان دەبـردە سەر بارەگای مەلا مصطفی بارزانی.

## ڕوون كردنەوەیەك لەسەر كاكی كاكان(عومەر دەبابە)

لەلاپەرەكانی (٨٦، ٨٧، ٨٨، ٨٩، ١٣٩)لە كتێبەكەی پێشوەدا (كـورد، دوژمنـی خۆت بناسە) باسم كردووە.

لە تەمموزی ١٩٧٦دا چاوم كەوت بە(مام جەلال)لە بەیروت و دوای گەڕانەوە بۆ بەغداد لەسـەر داواكـاری (مـام جـەلال) چـاوم كـەوت بـەو بـرادەرە ئـازیزو شۆڕش گێرو نیشتمان پـەروەر و سیاسـەت مەدارانـەی كـە ڕای سـپاردبووم لـە مژدەی بەڕێوەبونی چرای ڕووناكی گـەڵی كوردسـتان ئاگاداریـان بكەمـەوە بـە هۆی دروست بونی(یەكێتی نیشتمانی كوردسـتان)وە پێـم ڕاگـەیاندن كـە ئـەم هەنگاوە ئومێدی ئـەوەی لێ دەكرێـت كـە كـاروانی ڕزگـاری خـوازی كوردسـتان بێت انشاءالله، و بە دورو و درێژی هەموو ئـەو ڕاسپاردانەی كـە(مـام جـەلال) ڕای سپاردبووم وەكو خۆی بە ئەمانەتەوە بە نهێنی گەیانمە جێخۆی.

دوای ئەنجام دانی ئەم كارەم، ماوەی (١٠)ڕۆژ سەرقاڵی ئـەوە بـووم كـە خـۆم ئامادەكەم تاكو بتوانم لەگەڵ (صدام)دابنیشم ڕووداوەكانی بۆ بگێڕمـەوە بـە

شێوەیەکی داڕێژراو لەلایەن خۆمەوە.

کە چاوم بە(صدام)کەوت یەکەم پرسیار کە لێی کردم وتی بۆ چ وولاتێك رۆیشتبووی بە گەشت و گوزار، لەوەڵامدا وتم من لبنان م زۆر لاخۆشە لەبەر ئەوەی لێیان تێ دەگەم و هەروەها خواردنەکانیشیان زۆربەی لە خواردنی کوردەکان دەکات بەخێریش گەرا چونکە لە گەرانەوەمدا چاوم بە(جەلال تاڵەبانی)کەوت وبەدوور و درێژی گفتوگۆمان کرد.

(سید النائب)یش وەکو ئێستری چەمووش لوشکەی دەهاویشت وبەشێوەیەکی زۆرناشرین هێرشی دەبردە سەر سەرکردەکانی کورد بە زیندوو مردووەوە و لەم کاتەدا سکرتێرەکەی کە بە دیارمانەوە وەستا بوو و ناوی(نوري فيصل شاهين)بوو چاوەڕوانی ئەوەی دەکرد کە بەڵکو(صدام حسين )بڵێت (رەفیقم)بۆ ڕەوانەی کونە ڕەشەکە بکە، چۆن لە خۆیەوە وبەبێ پرسی ئێمە لەگەڵ(جەلال تاڵەبانی)دا دانیشتنی کردوە و چاوەڕوانم کرد هەتا هەرچییەك لەسکی دابوو هەمووی هەڵڕشت.

ئینجا ڕێگای دام کە قسە بکەم منیش وتم: کاتێك کە گەرامەوە لە(بیروت)دەست بەجێ خۆم گەیاندە چەند کار بەدەستێکی بەدەسەڵات کە یەکێکیان(سعدون شاكر)بوو کە بەڕێوەبەری سیخوڕی گشتی(مدير المخابرات العامه)، ئایا (سيد النائب) بەفڕۆکە هاتووچۆی کەنداوی عەرەبی دەکات؟ و لە دوای وەڵامەکانیان بۆم ڕوون بووەوە کە پیلانەکەی من زانییومە لە ١٠٠٪ ڕاستە، جەنابی (السيد النائب) تکام وایە لە ئێستەوە بەدواوە هیچی کە هاتوو چۆی کەنداو نەکەیت چونکە پیلانێکی زۆر ڕێکوپێکیان بۆ دارشتوی بۆ ئەوەی فڕۆکەکەت بە زۆر لە ئاسمان بێننە خوارێ خۆشت دەستگیر بکەن و بەنەمانی بەڕێزتان عێراق تێك دەچێت.

دوای قسەکانی من (السيد النائب)چەند دەقیقەیەك ماتی دایگرت وئینجا کەوتە قسەو وتی: من ئەوەند ترسنۆك نیم کە خۆم بەزیندووی تەسلیم بە دووژمن بکەم. دەستی برد بۆ گیرفانی پشتەوەی پانتۆڵەکەی وشتێکی دەرهێنا

سێ ئەوەندی شـقارتەیەك دەبـوو كـە دەسـتی پیـادا نـا فیشەكێكی دەمانچەی (یۆبلی) هاتە دەرەوە و وتـی: ئـا بەمـە خـۆم دەكوژم، ئینجا هەڵویستی گـۆڕا بەرامبەرم و زۆر بە گەرمـەوە سوپاسـی كـردم وئـەملاو ئـەولای مـاچ كـردم و پرسیاری لێ كردم ئایا كوردەكان بە گشتی بۆچونیان لەسەر تۆ چۆنە؟

منیش وتم ئـەوەی روو بكاتـە مـاڵم بەگەرمـەوە بـەخێرهاتنی ئەكـەم وە ئـەوكارەی كـە هـەبێت بـۆی جـێ بــەجێ دەكـەم ودوای جـێ بـەجێ كردنـی كارەكەی پارەشی ئەدەمێ لەبەر ئـەوە روو لەهەرشـوێنێك بكـەم بـە پیرمـەوە دێن. وەمنیش بەهۆی تۆوە ئیشو كارەكانم لەهەموو شوێنیكدا بـە ئاسانیجێ بەجێ دەبێت.

ئینجا پرسیارێكی تری كردوو وتی : ئەی پلەی حزبیت چییە؟

وتم من لەگەڵ هەموو وهەڵوێسـتێكدام كـە تـۆ پـێی هەڵدەسـتیت لـە ١٠٠٪، لەوكاتـەدا زەنگـی تەلەفونەكـەی لێدا، دووجـار هـەڵی دەگـرت وتەلەفونەكـەی دادەخرایەوە و خۆی وتی: تـەلەفۆنی (السـید النـائب) تێكچووە، وەلأم دایـەوە لەوە دەچێت ئەو كەسە پەراوە بكات چونكە ئەوەندە سامت هەیە كـە گـوێی لە دەنگت دەبێت دایدەخاتەوە.

## تێبینییەك بۆ خۆێنەری خۆشەویست:

كاربەدەسـتانی بـەعس لـە هـەوڵێكی بـەردەوامدا بـوون لەگـەڵمدا كە ببمـە ئـەندامێكی ڕێكخـراوی بـەعس و خـۆم ئـەمزانی بـەبێگومان هـەتا (عضـو فرقـة)ئـەرۆم بـەڵكو زیـاتریش بـەلأم لـە دوایـی دا دەمكەنـە كارمـەندێك لـە فەرمانگەیەكی میری، لەگەڵ ئەوشدا هەرچەندە ناوم بە(سیخوڕ)دەركـرد بـوو بەلأم توانیومە بـە هـۆی ئـەم نـاوەوە خزمـەتێكی گـەورەی كـوردو كوردسـتان بكەم لە هەموو لایەنێكییەوە، بـۆ نمونـە جارێكیـان داوام لـە مامۆسـتا (تـەها محیالدین معروف)كـرد كـە جێگـری سـەرۆك بـوو هاوكـاریم بكـات وەپێكـەوە بچینـە لای صـدام حسـین تـاكو بتوانـین كێشـەی كـورد بخەینـە بـەردەمی، لـە وەلأمـدا وتـی ئەمـە ئیشـی مـن نـییـە بـەلأم بـۆ تــۆ زۆر ئاسـانە بەردەوامبـە

هەرنەومت بۆ دەمێنێتەوە.

(سەید النائب) پرسیاری کرد لەگەڵ(جەلال تاڵەبانی)دا باسی چیتان کردووە بە دوور درێژی وەکو خۆی بۆم بگێرەوە، منیش وتم:

گفتوگۆو لێکۆڵینەوەیەکی دوور ودرێژ دروست بوو لە نێوان دوو بیروباوەری جیاوازدا کە بە ئەندازەی ئاسمان و زەوی لێکەوە دوورن کە بە دوو ڕۆژ کۆتاییمان پێ هێنا.

ئەوە بوو مام جەلال پێی وتم: حزبێکی تازەمان داناوە بە ناوی یەکێتی نیشتمانی کوردستان، پێك هاتووە، لەو کوردە ڕۆشنبیرو نیشتمان پەروەرانەی کە باوەڕیان بە دۆستایەتی ئێران و تورکیا و جولەکە و(C.I.A)نیە، وە ئەو کوردە عێراقیانەی کە لە پاڵ بارزانی دا بون وەباوەڕیان بە ئاش بە تاڵ بوو وە ئێرانیشیان بەجێ هێشتوە ونەگەڕانەوە بۆ عێراق وچون بۆ هەندەران بەشی زۆریان دێنە پاڵ ئێمە، هەروەها هەموو هێزو توانایەکمان لە خۆمانەوە دەبێت، وەبریارمان داوە لەگەڵ حکومەت دا شەڕی پارتی زانی بکەین (لێدەو راکە)وە چەکی قورسیشمان نابێت، و ئیستا مەشق لەسەر چەکی سوك دەکەین، وە لە دوایی دا باسی هەموو سلبیاتێکی حکومەتی کرد لە هەموو ڕویەکەوە، بەڕاستی باش ئاگادار بوو لە هەموو کەمو کوڕیەکانی حوکمی زاتی لە کوردستان وتی تەنها بەناو حوکمی زاتیە وە هەتا ئێستا (گواستنەوەو تەعریب و تەبعیس) بەردەوامە کورد هیچ مافێکی نەتەوایەتی نیە بە هاوڵاتی پلە دوو دانراوە، ئێمە بە تەماین لە ناوەوە لە دەرەوەی وڵات هەموو پروپاگەندەیەکی بەعس بەدرۆ بخەینەوە کە ڕۆژانە بە تەلەفزیۆن ئێستگەو ڕۆژنامە بلاوی دەکاتەوە، کە گوایە کێشەی کوردیان جێبەجێ کردووە، و ئێمە بە تەماین بە (ژمارەیەکی زۆر کەم)لە (٤٠٠-٥٠٠) چەکدار وابکەین سوپای عێراقی بەشی زۆری برژێتە کوردستان و شەوو ڕۆژ پاسەوانی شارو شارۆچکەو ڕێگاو بانەکانی پێبکات.

ئینجا بە (صدام)م وت.

دوای ئەوەی بەڕێز مام جەلال تەواو بوو لە قسەکانی وەڵامم دایەوە وتم:

ئايا تۆ بە جانتايەكی بە تاڵ و(٥٠٠)چەكدار ئەتەوێت جێگای بارزانی بگریتەوە لە كاتێكدا ئەو خاوەنی (٧٠,٠٠٠)پ.م بوو بە چەك و جبە خانەی تەواوو سەروەت و سامانی نزيكەی (١٠٠)مليون دۆلار زياتر بوو بێجگە لە ديناری عێراق و تومەنی ئێرانی ليرەی توركی ئينجا ئێران و سوريا و توركيا جولەكە و C.I.A بە هەموو شێوەيەك پشتيان گرتبوو، يارمەتيشی لە هەموو لايەك وەردەگرت، بەلأم كاتێك كە گەيشتە ئەو باوەرەی كە بارودۆخی دەرەكی لە بار نيە بۆ ئەوەی مەسەلەی كورد جێ بەجێ بكرێت و ئەگەر شۆرش بەردەوام بێت، ئەبێتە هۆی ئەوەی زيانێكی زۆر گەورەی هەبێت بۆ ميللەتی كورد بارزانی وتی بەردەوام بوون لە شۆرشدا ياری كردنە بە ئاگر.

راستە مام جەلال كە لەلايەن حوكومەتەوە كەم و كوريەكی زۆر هەيە بەلأم روو لە چاك بوونە لە هەموو روويەكەوە، چونكە(سەيد النائب)خودی خۆی سەرپەرشتی (مكتب شؤون الشمال)دەكات كار لەسەر ئەوە دەكات كە هەموو ئەو (سلبياتانەی) لەبەر چاودايە و هەستی پێ دەكرێت لەناوی بەرێت وە ئێستاكە بارودۆخی (باكور)بەرەو ئارامی يەكی زۆر دەروات خەلكی بە كارو كاسبی خۆيەوە سەرقاڵە و دزی و خراپەكاری وپياو كوژی بە ئەنازەيەكی زۆر كەم بۆتەوە ديارەدی چەكداری بەهيچ شێوەيەك بەدی ناكەيت (ياسا) سەروەرە.

وتم (جەلال)جەنگ رێگاچارە نيە بۆ چارە سەركردنی كێشەی كوردی هەرگيز ئێوە ناتوانن بگەنە هێزو توانا(بارزانی)، و لێت روون بێت كە حكومەت دەربارەی تۆ و حيزبەكەت لە هەموو شتێك ئاگادارە، بەعس بە جۆرێك بە هێزە لە ناوچەكەدا هيچ هێزێك نيە بتوانێت راوەستێ بەرامبەری.

وتم (جەلال): جەنگ رێگا چارە نيەو ئايا وا باشتر نيە كە دوو بە دوو پيلانێك دارێژين بۆ هەڵدانەوەی پەرەيەكی سپی تازە لەسەر رووداوەكان؟ و چی تر ئاور نەدەيتەوە لەبەسەرهاتە كۆنەكان و من كە گەرامەوە ئەچم بۆ خزمەت(سەيد النائب)وە ئاگاداری ئەكەم لەوەی كە چاوم بە(جەلال

...عبانی)کەتوه و بە بیروباوەڕێکی تازەوە پێش هەموو جوڵاندنەوەیەك دژی بەعس دەستی ئاشتی درێژ دەکات، ئایا(جەلال) ڕێگام پێ دەدەیت کە لەم بارەیەوە زمان حاڵی تۆ بم لەلای(سەید النائب)بە هیچی تر هاوڵاتی عێراقی خوێن لە لوتی نەیەت.

و جەلال وتی: ڕازیم و زۆریشم پێ خۆشە سلاو ڕێزم هەیە بۆ(سەید النائب)وپێی ڕابگەیەنە (گواستنەوە تەعریب و تەبعیس) بنە بڕ بکات وە(باکور)وەکو خۆی لێ بکاتەوە، و هەروەها(حوکمی زاتی)ڕاستەقینە بچەسپێنێت، من یەکسەر سواری فڕۆکە دەبم و دەگەڕێمەوە عێراق بادەست گیرم بکەن.

دوای ئەوەی هەموو ئەو گفتوگۆیەی کە لە نێوان من و (مام جەلال)دا ڕووی دابوو گێڕامەوە بۆ (صدام)ئینجا لە کۆتایی قسەکاندا (صدام)پێی وتم ئەمەوێت بە دوورو درێژی باسی بارودۆخی ئێستای کوردستانم بۆ بکەیت بە بۆچونی خۆت:

وە لە وەڵامدا منیش وتم: لەیەکەم ڕۆژەوە کە بارزانی کوردستانی بەجێ هێشت، وەکو ئاشکرایە ئێوە باڵا دەست بوون بەسەر سرانسەری(باکور)دا، ئەگەر بهاتایە ئێوە سودتان لەو بارو دۆخە وەربگرتایە لە ٥٥٪ ی ئەو داواکارییانەی (بارزانی) اوای دەکرد بۆ کورد دوای ڕۆیشتنی خۆی بۆ خەڵکی(باکور)تان دابین بکردایە ئەوا ئێستا لە ٩٥٪ کوردەکان لەگەڵ ئێوەدا دەبوو.

وەکو جەنابتان ئاگادارن لە دوای هەرەسەکەوە بارزانی بۆشاییەکی گەورەی بەجێ هێشت لە نێوان کورد وحکومەتدا بە تایبەتی لەو ناوچانەی کە لەساڵی (١٩٦٢-١٩٧٥) لەژێر فەرمانی بارزانی دابوون، هەرچەندە ڕێکخراوەکانتان هەوڵی دا ئەو بۆشاییە (فراغ) پڕبکاتەوە بەڵام بە داخەوە بە هۆی خراپ هەڵسوکەوت کردنی دەزگاکانی ئاسایش وە هەولگری تیمە سنوریەکان لەگەڵ خەڵکی ئەو ناوچانەدا بۆشاییەکە زیادی کرد کەمی

نەکرد، جەنابی (السید النائب)من بەش بە حالی خۆم چ بەراپۆرت چ بەقسە ئەم کەم و کوڕیانەم خستۆتە بەرچاو بەلام لەوە دەچوو بێ سود بێت، هەروەها ئەو حیزبە کوردیانەی کە دروست کرابوون بۆ ئەوەی کە جێی پارتی بگرێتەوە و بایەخێکی زۆریان پێدرا لەلایەن ئێوەوە، ئەمانیش سەرکەوتوو نەبوون بۆ پڕکردنەوەی بۆشاییەکە چونکە بە شێوەیەکی گشتە هەموو هەوڵێکیان بۆ پارە دەستکەوتن بوو نەك بۆ پڕ کردنەوەی بۆشایەکە و لە هەمان کات زۆرێك لە کەسایەتییەکانی ئەم حزبانە ناسرا و خۆشەویست نەبوون لەناو جەماوەردا، و هەروەها خەڵکێکی زۆریش بی ئیش و کاربوو کە هەوڵتان نەدەیا ڕێگا چارەیەك بۆ بێ ئیشی و هەژاربونیان بدۆزنەوە.

بە شێوەیەکی گشتی هەرسێ دراوسێکانمان (ئێران، تورکیا وسوریا) چاویان بریوەتە باردۆخی ئێستای عێراق چونکە لەبەرژەوەندی ئەواندا نییە حکومەتی عێراق بالاّ دەست بێت لە هەموو ناوچەکانی عێراقدا بە تایبەتی لە ناوچەکانی باکوردا، و ئەوەی کە ئاشکراو ڕوونە ئێران بۆ سەقام گیربوونی مەبەستەکانی لە هەوڵ ڕۆژەوە کە کوردەکان چونە ئێرانەوە دوای(ڕێکەوتن نامەکەی جەزائیر) لە ڕێگای (پاراستن و ساواك)ە، هەموو هەوڵێکیان دا کە ئەو کوردانە نەگەڕێنەوە بۆ عێراق بە نیازی ئەوەی لە دوا ڕۆژدا لە بەرژەوەندی خۆی بەکاریان بهێنێت، بەلام سوریا هەرلەیەکەم ڕۆژی(ڕێکەوتن نامەکەی جەزائیر)ەوە نارەزایی خۆی دەربری لەوەی کە کورد چەك دابنێت، و بۆ ئەم مەبەستە نوێنەری خۆی نارد بۆ لای خودی بارزانی کە بە هیچ جۆرێکە چەك دانەنێت چونکە ئێمە بە هەوو شێوەیەك یارمەتی ئەدەین، بەلام وەلامی بارزانی ئەوە بو کە وتی: (دەوری من کۆتایی پێ هات) ئێستاکە سوریەکان بە ئاشکرا یارمەتی دوژمنانی عێراق دەدەن، هەربۆیە مۆلگەی ئۆپۆزسیۆنی عێراقی لە ئێرانەوە گواستڕایەوە بۆ سوریا و بۆ کوردەکان دەرگا والاّ کرا بە تایبەتی بۆ جەماعەتی(جەلال تالەبانی). ئینجا دوای دەربرینی بۆچونەکانی خۆم بەرامبەر بارودۆخەکە(سەید نائب) پرسیاری لێ کردم وتی/ ئایا حزبی شیوعی شوێن کەوتویان هەیە لە کوردستاندا؟ ئایا دوای

ئەمانی شۆڕشەکەی بارزانی توانیویانە ئەو بۆشایی پربکەنەوە؟

منیش لە وەڵامدا وتم: لەبەر ئەوەی حزبی شیوعی شان بە شانی ئێوە بەرامبەر بە شۆڕشەکەی بارزانی ڕاوەستا وە لە هەمان کاتدا دوای ئاشبەتاڵ کە خەڵك گەڕایەوە، ئێوە ڕێگاتان پێ نەدان وەکو پێویست جموجوڵ بکەن بۆ ئەوەی بتوانن بەشێك لە خەڵکە ڕابکێشن بەلای خۆیانەوە، بەڵام کەم تا زۆر لەناو خەڵکدا هەن چونکە کۆنترین حزبن لەساحەکەدا بۆ نمونە لە ساڵی ١٩٦٢ کاتێك پ.م بووم شوانێك قسەی بۆ کردم کە لە ساڵی ١٩٥٤دا (٥٠)فلسی مانگانە داوە بە حزبی شیوعی.

ئینجا جارێکی تر پرسیاری کرد و وتی ئایا ئەو کوردانەی کە لە پاڵ بارزانیدا بوون وگەڕانەوە بۆ عێراق هەڵوێستیان چۆن دەبێت بەرامبەر شۆڕشی نوێی (مام جەلال)؟

لەوەڵامدا وتم: ئەوانەوی گەڕانەوە بارزانی زۆری پێ ناخۆش بوو بە گشتی و بۆ گەڕانەوەی لوقمان کوڕی بە تایبەتی زۆر دلگران بوو، ئەوەی دەگەڕایەوە هەریەکە لە ڕاست خۆیەوە راپۆرتێکی دوور درێژی پێش کەش بە ئاسایش دەکرد کە تیایدا بەزەقی باسیان لە هەموو سلبیاتێکی بارزانی دەکرد، ئەمانە لەلایەن بارزانی و جەلال متمانەی خۆیان لەدەست دا چونکە شۆڕشیان بەجێ هێشت، ئەگەر ئاسایش پاڵیان پێوە نەنێن هەرگیز ماڵەکانیان بەجێ ناهێڵن.

(سەید النائب) پرسیاری کرد: ئایا مەلا مصطفی بە تایبەتی کوڕەکانی ئەچنە ناو ڕێکخراوە تازەیەی کە (جەلال) دروستی کردووە یان کۆمەکیان دەکەن؟

منیش لەوەڵامدا وتم: لە کاتی گفتوگۆکەمدا لەگەڵ (جەلال) ئەم پرسیارەم ئاڕاستە کرد دەربارەی بۆچونی بارزانی بەرامبەر ئەم شۆڕشە تازەیە؟

بەقسەی (جەلال) ئاگاداری کردوون وڕازین و خۆشحاڵن بە دامەزراندنی ئەم ڕێکخراوە تازەیە، بەڵام ناچنە پاڵی، و دژیشی ڕاناوەستن.

ماوەی چەند دەقیقەیەك (السید النائب) پیشی دەخواردەوە وبیری دەکردەوە و خۆی سەر قاڵ کردبوو بە(چروت) کێشانەوەو جار جار کە

تەماشای منی ئەكرد هەستم كرد گرژی لە دەموچاويدا نەمابوو وە ديار بوو خۆش حاڵ بوو بە قسەكانی من، ئينجا بە زردە خەنەيەكەوە وتی: خۆت ئامادە بكە وبە نهێنی بچۆ بۆ لای (جەلال و ابراهيم) بۆ دۆرزينەوەی رێگا چارەيەكی گونجاو بۆ چارەسەركردنی كێشەی كورد.

منيش لەوەڵامدا وتم: سوپاسی هەستی بەرزت دەكەم وخوا تۆمان بۆ بهێڵێت و حەز دەكەم دڵنيات بكەم لەوەی ئەم رێكەوتنە هيچ مەترسی‌يەكی نی‌يە بۆ سەر بەعس بەڵكو سوديكی گەورەی هەيە لە هەموو رووييەكەوە، وە هەنگاوێكی گەورەيە بۆ پوچەڵ كردنەوەی پيلانە گلاوەكانی دوژمنانی بەعس، و من پێم باشە كەسەرنجت رابكێشم بۆ تێبينی‌يەكی زۆر گرنگ ئەويش ئەوەيە كە ئەگەر من هەڵسم بەم كارە سەركەوتوو نابم لەبەر ئەوەی من بە (سيخوڕ) ناسراوم وپی‌ی دەچێت زۆر متمانەم پی نەكەن و لە هەمان كاتدا من لەو ئاستەدا نيم كە هەستم بەم كارە گەورەيە، بۆيە پێشنيار دەكەم (عومەر مصطفى) كە ناسراوە بە(عومەر دەبابە) ئاگادر بكرێتەوە بەم كار هەڵسێت ئەم پياوە لەگەڵ ئەوەشدا كە يەكێك بوو لەوانەی ئێرانيان بەجێهێشت وهاتنەوە عێراق، بەلام جی‌ی متمانەيەكی زۆرە لەلای خودی(جەلال)وە (ابراهيم ئەحمەد).

ئينجا (سەيد النائب) وتی :پێشنيارەكەتمان لاپەسەندە، وە بەگەرمەوە سوپاسی كردم ولە كۆتايی دا وتی: ئێمە برِيارێك ئەدەين كە لەبەرژەوەندی وولاتەكەماندابێت.

ئينجا ئيشارەتی پی‌دام كە كۆبونەوەكە تەواوبوو.

**تێبينی:**

١-ئەم دانيشتنە لەگەڵ (سەيد النائب) دا ماوەی (٢,٣٠)سەعات خايان لە نێوان ئەو ماوەيەدا دووپەرداخ شيری خواردەوە.

٢-سكرتێرەكەی (سەيد النائب) (نوري فيصل شاهين) زۆر دلگران بوو بەو سەركەوتنەی من بەلام دەسەلاتی نەبوو.

-ود بۆ دەربرینی سوپاس گوزاریم بۆیەزدانی مەزن کە پشتیوانی کردم
سەرکەوتنم لەم کارەدا دایکم ڕاسپارد کە ۳۰۰لەفە شفتە بۆ دروست بکات
ود بیبات لە مەرقەدی (شێخ عەبدالقادر گەیلانی)دابەشی بکات بەو نیازەی
کە انشاالله بە هۆی منەوە ئەم کارەسەر دەگرێت وچی تر کورد ناگوزرێت بە
خۆڕای.

-فەرمان لە (مەکتەب شوون الشمال)ەوە دەرچوو (صدام سەرۆکایەتی
دەکرد) بۆ بەڕێوەبەرایەتی ئاسایشی گشتی بەپەلەو نهێنی بە مەبەستی
پەیوەندی کردن بە مامۆستا (عومەر دەبابە)وە بۆ ئەوەی هەموو ڕێگایەکی
بۆ ئاسان بکرێت کە بچێت بۆ (لەندن) و (سوریا) وەچاوی بکەوێت بە
ئیبراهیم ئەحمەد) و (مام جەلال) بۆ ئەوەی لە نزیکەوە باس لەسەر
دۆکاریەکان بکرێت وەبۆیان جێبەجێ بکرێت.

-بۆ ئاگاداری دوای هەرەسەکە ئەو کوردانەی کە شۆڕشیان بەجێ هێشتبوو
هاتبونەوە عێراق بۆیان هەبوو کە چاویان تەنها بە (ئاسایش) و (هەوالگری)
بکەوێت بۆ ڕاپەراندی ئیش و کارەکانیان.

٦-کاتێك کاك (عومەر) دەگەڕێتەوە لە سەفەرەکەی ڕاپۆرتێك ئاراستەی
بەرێوەبەری ئاسایشی گشتی دەکات وە تیایدا بە دوورو درێژی دەرئەنجامی
چاوپێکەوتنەکەی ڕوون دەکاتەوە، وەچاوەڕوانی وەلامی ڕاپۆرتەکە دەکرد بۆ
ئەوەی لەسەر ڕۆشنای وەلامەکەی ئاسایش وەلام بەرێتەوە بۆ (مام جەلال و
مامۆستا ئیبراهیم) چەند جار کاك (عومەر مصطفی) ئەیویست بە تەلەفۆن
لەگەڵ (عەبدالخالق عەبدالعزیز)دا قسە بکات کە بەرێوەبەری ئاسایشی گشتی
بوو بەلام پرسگەی ئاسایش لە وەلامدا پێیان دەوت (لەوێ نییە)، بەلام
لەرێگای منەوە وەلامەکەی وەرگرتەوە وتی (أخي استاذ عمر کل ما هناك
رفعنا التقرير الى الفوق، غير ماكوشي بيدي) واتە وتی: (براکەم مامۆستا
عومەر ئەوەی لەسەرمن بوو ڕاپۆرتەکەتم بەرزکردەوە بۆ سەرەوە وە بێجگە
لەوە هیچ ترم دەسەلات نیە).

٧-بۆیه ئەم باسەم ئاوا بە دورو درێژی ڕوون کردۆتەوە چونکە چەند کادرێکی پارتی باسی چۆنیەتی گەشتەکەی کاك (عومەر دەبابە)یان لەگەڵدا کردم کە چۆتە (لەندن) و(سوریا) چاوی کەوتووە بە (مامۆستا ئیبراهیم ئەحمەد) و(مام جەلال) لەسەر فەرمانی بەعس.

نازانم چۆن باسی نیشتمان پەروەرێتی وفیداکاری و ئازایەتی ئەم خوالێخۆش بووە بکەم کە یەکێك بوو لەسەرکردە بەناوبانگەکانی کورد بەلام بە داخەوە دوویەرەکی وبراکوژی کارێکی وای کردوە لەووڵاتەکەدا سەرکردەکانمان بە مردویش ڕزگاریان نەبێت لە (توانج)لێگرتن.

وەکو ڕوون و ئاشکرایە لەلای هەموو کەس (صدام حسین) خاوەنی دەرکردنی بڕیارەکانە لە عێراقدا و لەو زیارتر کەس تر بۆی نیە بریاردەربکات.

هەبۆیە لێرە پرسیارێك سەر هەڵدەدات ئەویش ئەوەیە، باشە بۆچی (صدام حسین) لەچاوپێکەوتنەکەی لەگەڵ مندا بەو شێوە گەرم گوڕە سوربوو لەسەر چارەسەرکردنی کێشەی کورد وە جەختی لەسەر ئەوەکرد کە (عومەر دەبابە) بڕوات بۆ (لەندن) و (سوریا)؟! کەچی کە بەرێز (عومەر دبابە) گەڕایەوە بەشێوازێکی زۆر ساردو چاوەڕوان لێ نەکراو پێشوازی لێ کراوە بە هیچ شێوەیەکیش وەڵامی نەدرایەوە!

وەڵامدانەوی ئەم پرسیارانە لە دوو خاڵی سەرەکی دا خۆی دەبینێتەوە:-

١-کاتێك هێشتا (عومەر دەبابە) نەگەڕابووەوە بۆ عێراق (ئیدریس بارزانی) لە وتارێکی ئاشکرادا بڵاوکردەوە وتی(ئێمەی بارزانی ئەگەر شۆڕشمان پێ نەکرێت بەڵام شۆڕشمان پێ تێك دەدرێت) بەمەدا (صدام حسین) گەیشتە ئەو باوەڕەی کە بارزانیەکان مەترسی ئەوەیان لێ ناکرێت کە بچنە پاڵ شۆڕشەکەی (مام جەلال) جارێکی تر وە کۆمەکی بکەن بەڵکو دژایەتیان دەکەن.

٢-بۆچەنی دووەم ئەوەیە کە تورکیا بوبێت بە هۆکارێك بۆ پاشگەز

ـدوونـەوەی (صـدام حسـین) چونکــە لەسـاڵی (١٩٨٤)دا یــەکێتی نیشـتمانی کوردستـان و حکومـەتی بـەعس گەیشتبوونە ئـەوەی کەرێکـەوتن نامەیـەك مۆربکەن، شـەوێك بـەر لـە مۆرکردنـی رێکەوتن نامەکە بەپەلە (وەفدێکـی تورکی) دەگەنە بەغدا وکـاتێك ڕۆژ بـووەوە (صـدام حسـین)بەشیمان بـووەوە لەهەموو ئەو بریارانەی کە دابوی بۆ رێکەوتن.

## ڕوون کردنەوەیەك لەسەر بۆردومانەکەی شارۆچکەی قەلادزێ:

لە لاپەرە (٥١)دا لە کتێبەکەی پیشومدا (کورد، دوژمنـی خـۆت بناسـە) بـە کورتی ئاماژەم پێکردووە وە ئێستاش درێژە بەباسەکەم دەدەم.

کاتێك جەنگ دەستی پێکردەوە لە نێوان (بـەعس) و (شۆڕشی بـارزانی)دا، دانیشتوانی شـارۆچکەی قـەلادزێ، بەهـەزارو موچـە خـۆرو دەوڵەمـەندو لاو وپیرەوە بەکۆمەڵ باوەشیان بۆ خەبات گێرانی ئـەم شۆڕشـە بەنرخـە کـردەوە کە پێـك هـاتبون لەسیاسـەت مـەداران و نیشـتمان پـەروەران و رۆشـنبیران ودکتـۆر مامۆسـتا و قوتـابی کەبـەو پـەڕە دڵسـۆزیەوە پاڵیـان دابـوودوە بەشۆڕشـەکەوە و شۆڕشـیش ویسـتی بـەم خـەبات گێرانـە دانشـتگایەك دابمـەزرێنێت لـەناو شـارۆچکەی قـەلادزێ دا، لـە کـاتێکدا بـە هیـچ جۆرێـك پێویسـتیەکانی دانشـتگا ئامـادە نـەکرابوو، بـەلام لەبـەر بـەرژەوەندی حزبایەتیـەکی تەسـك، پرۆپاگەندەیـەکی زۆرکـرا لـە ئێسـتگەو ڕۆژنامـەو گۆڤارەکانیـان دا ڕۆژانـە باسـی دامـەزراندنی ئـەم دانیشـتگایە بلاودەکرایـەوە هەربۆیە کە حکومەتی (بەعس) بە دامەزراندنی ئەم دانشگایەی زانی، توشـی هیستریا بـوون و وە وایـان لێـك دایـەوە کـە(بـارزانی) بــە دامـەزراندنی ئـەم دانیشـتگایە بریـاری جیابونـەوەی داوە، بۆیــە بریارپـان دەرکـرد بــەهیچ شێوەیەك ئەم دانیشتگایە لەگەڵ شارۆچکەی قەلادزێدا نابێت بمێنێت و ئەبێ ئەو شارە سەرەو بن بکرێت.

لەرێگای کاك (حمەی وەلی حمەی کەرەم)ەوە لە بنکەی پێشمەرگایەتی شاخی بەمۆ بەلاسلکی ئاگاداری مەکتەبی بارزانیم کرد کەلەم ڕۆژانەدا بەعس بە فرۆکەی مێکی ڕوسی وە بەچەکی ناپاڵم بۆردومانی شارۆچکەی قەڵادزێ ئەکات، نێردراو: ناوی نهێنیم (بەیروت ماریتنس) بەراستی نەوەك هەرمن بە تەنیا ئەم هەواڵەم گەیاندبێتە مەکتەبی بارزانی (مەسعودو ئدریس)، گومان لەوەدا نیە کەسانێکی زۆری تریش کە دڵیان بەم شارەو بە خەڵکەکەی دەسوتا بە هەمان شێوە مەکتەبی بارزانی (مەسعود و ئیدریس)یان ئاگادار کردبووە وە لەوەی کە (صدام حسین) بە تەمای وێران کردنی قەڵادزێیە بە دانشتگا کەوە، بەهەرحاڵ هەرچی داواکاریەکانی (ئێران و ئەمریکا)هەیە هەمویان بەرێکو پێکی جێبەجێ کرد دڵنیابن لەوەی هیچ کەس گلەیی لێ نەدەکرن لەسەر ئەوەی کە پیلانەکانی ئەوانتان جێبەجێ کردووە، بەمەرجێك ئەگەر بهاتایە چۆن بە نهێنی پیلانەکانتان جێبەجێ کرد بە هەمان شێوە هەر بە نهێنی پارێزگاری ئەو شارەو دانیشتوانەکەیتان بکردایە، دەبا ئەو خەڵکە داماوە بە ڕۆژ دەوامیان نەکردایە لە دانیشتگا وبەشەو دەوامیان بکردایە وە هەروەها ئاگاداری ئەو خەڵکەشتان بکردایەتەوە بە ڕۆژ بچونایەتە دەرەوەی قەڵادزێ بۆ ئەوەی لەو بۆردومانە سەلامەت بونایە، وەکو ئەمانەشتان بە چاك نەدەزانی دەبا لە جیاتی ئەودۆشکە شکاوەی کەهی جەنگی جیهانی یەکەم بوو لە(حەسار کە ٥کم دوورە لە قەڵادزێوە)داتان نابوو، چەند چەکێکی چاك و تازەی ئەو ڕۆژەتان وەربگرتایە لە (C.I.A) کە بیتوانیایە بەرامبەر مێکی (٢٣) ڕوسی مقاوەمەی بکردایە.

سەردانی (سەعدون غێدان) م کرد کە وەزیری ناوخۆ بوو پرسیاری لێ کردم، ئایا ئەزانی بۆردومانی قەڵادزێمان کرد، شارەکە و دانیشتگاکەمان بەیەکجاری لە ناوبرد منیش بە زەردە خەنەیەکەو وەڵامم دایەو وتم: دەستان خۆش بێت شتێکی باشتان کرد، بەڵام دنیا لەبەر چاوم تاریك بوو وە یەکسەر خۆم بە خۆمم وت ڕەفیق دان بە خۆتا بگرە هەر بۆیە بەپەلە

گەڕامەوە ماڵەوە بەهاوسەرەکەم ڕاگەیاند ئیمڕۆ لە ماڵەوەبە تاکو گوێت لە ئێسگەکەبێت بۆ ئەوەی بزانیت چی ڕووی داوە ئایا کەسمان ماوە، هەرچوارمان دەستمان کرد بەگریان بە دزییەوە بۆ ئەو شەهیدانە دایکم وتی ئەی کوڕم تۆ ئاگادارت نەکردبونەوە، هاوسەرەکەم وتی بە تفەنگی ئینگلیزی شەڕی فڕۆکە ناکرێت.

سەعات (١٠)ی سەر لەبەیانی لە بەرواری ١٩٧٤/٤/٢٤ قەلادزێ بۆردومان کرا ١٣٤کەس شەهید بوو، ٣٠کەسیان لەشیان پارچە پارچە ببوون نەدەناسرانەوە وە ١٥٠کەس بریندار بوون. ٢٠ خانوو ڕوخا لەم شارەدا، (٥٠) لەم شەهیدانە خەڵکی شارۆچکەی قەلادزێ بوو کە لەم بنەماڵەنەن.

| ناوی بنەماڵە | ژمارەی قوربانیەکان | ناوی بنەماڵە | ژمارەی قوربانیەکام |
|---|---|---|---|
| کاک ئەحمەد صابر | ٩ | کوڕی عەلی باپیر ئاغا | ١ |
| حەسەن حاجی محمود | ١ | مەلا بەکر | ٢ |
| ڕەسول مام ئەحمەد | ٧ | عوزیز ڕەسول ئاغا | ١ |
| هۆرمەر کەرە | ١ | ئەحمەد کەریم | ١ |
| مامۆستا عەبد لرزاق | ٤ | حاجی ڕەحمن دەشتی | ٢ |
| قادری وەستائەحمەد | ٤ | فەتحی حاجی کەریم | ١ |
| جەمال حمە عەلی کەڵپە | ١ | حاجی ئەحمەد هەلاج | ١ |
| زاهیر مام ڕەشید ڕەسام | ١ | عبد الرحمن ڕستەم | ١ |
| زاهیر کارەبایی | ١ | مامۆستا غەریب حمە ئەمین | ٤ |

لەدوای ڕووداوەکەی قەلادزێ ڕۆژنامەگەری جیهانی لە دەرەوەی وڵات بەعسیان مەحکوم کرد بە کردنی ئەو تاوانە گەورەیە و لەم کاتەدا چەند ڕۆژنامە نوسێك هاتنە کوردستان کە یەکێکیان ڕۆژنامەی (لیمۆندی فەرەنس)

بوو كه به ناوبانگه له جيهاندا چوو بۆ قەڵادزێ، كه گەڕايەوه بۆ فەرنسا لەسەرئەو تاوانه درندانەی بەعس دابوو. لە دوای راپەرينەكەی (١٩٩١)كاك (ئەحمه سابير) ئەچێته هاوينه هەواری (صەلاح الدين) وچاوی دەكەوێت به كاك مەسعود ئەڵێت لە دوای بۆردومانەكه خوالێخۆشبو مەلا مصطفى بارزانی هاته گوندی حەسار كه (٥كم لە قەڵادزێوه دووره) چاوی بەبەشی زۆری كەس و كاری شەهيدان كەوت بەلێنی پێداين كه يارمەتی مان بدات وه خانووكانمان بۆ دروست بكاتەوه بە تايبەتی بەلێنی بە من دا كه ژنم بۆ بهێنێت و خانوەكەم بۆ دروست بكاتەوه چونكه من خاوەنی ٩ (شەهيد) بووم كەسم دەرنەچوو لەوەڵامدا كاك مەسعود دەڵێت: ئێستاكه پارەمان نىيه بەڵام بری (٢٠٠٠)ديناری ئەداتێ.

ساڵانه له ١٩٧٤/٤/٢٤ يادی ئەم تاوانه گەورەيه دەكرێتەوه، دوابەدوای ئەوه رژێمی بەعس چوار تاوانی تری خسته پاڵ بۆردومانەكه قەڵادزێ (تعريب وتەبعيس وئەنفال هەڵەبجەی شەهيد) هاتكو ئەم سەعاته رژيمی بەعس به فرمانی سەرۆك كۆمار (صدام حسين) هەر بەردەوامه بۆ لەناوبردنی ميللەتی كورد.

ئيستاش ئاشكراو روونی ئەكەمەوه وه ئيخەمه بەرچاوی هەموو كوردێكی نيشتمام پەروەر شۆڕش گێرو ئەوانەی به شێوێن ڕاستی مێژوودا دەگەرێن وه بۆ هەموو كەسو كاری شەهيده كان بۆ دانيشتوانی شارۆچكەی قەڵادزێ، كه تاوان بار كێيه وەبۆچی وايان كرد؟

باشه كه (شا) ئەوەندەی كورد خۆش ئەوێت وه به مەكتەبی بارزانی (مەسعود وئيدريس) ئەڵێت دانشتگا بكەرەوه لەقەڵادزێ به كوردی بۆچی لەناو قوتابخانەكانی خۆيدا نەیئەهێشت هيچ قوتابيەك به كوردی بخوێنێ تەنانەت له پشوەكانی نێوان وانەكاندا چاودێری قوتابيەكانيان ئەكرد نەوەك به كوردی بدوێن وەهەروەها كەس بۆی نەبوو منداڵەكەی به كوردی ناوبنێت، ئەگەر ئەمه پيلانێكی دارێژراو نىيه و بەيارمەتی شۆڕش پيادە ناكرێت، بەڵام هەموو شتێك روون و ئاشكرايه چونكه مەكتەبی بارزانی (مسعود

ئیدریس)بۆیان نەبوو هیچ بڕیارێك بۆ هیچ شتێك ئەگەر زۆر بچوكیش بویە دەربکەن پێش ئەوەی (شا و C.I.Aو جولەکە) ڕەزامەندی خۆیان دەرنەبرن بۆ هەڵسان بەو کارە، وەبەڵگەش بۆ ڕاستی ئەم وتەیە ئەوەیە کاتێك بارزانی لە ئەوجی توناو دەسەڵاتی خۆیدا بوو بەسەر شۆڕشەکەدا ئێران فرمانی کرد (بە ئاش بەتاڵ) کردن، ئەوەبوو کاتێك لە بارزانییان پرسی بۆ ئاش بەتاڵتان کرد لەوەڵامدا وتی: دەوری من تەواو بوو، وە هەروەها لەڕێکەوتن نامەکەی جەزائردا (صدام لە شا) دەپرسێت دەڵێت ئەی بارزانی؟ ئەویش لەوەڵامدا دەڵێت ئەوە پەیوەندی بە خۆمەوە هەیە.

بە هەمان شێوە لە قەڵادزێ لەسەر جێبەجێ کردنی پیلانەکەی (شاو C.I.A) مەکتەبی بارزانی (مەسعود و ئدریس) (١٥) ملیۆن دۆلار وەردەگرن ولە بانقەکانی ئەوروپادا هەڵی دەگرن، منیش دەڵێم: لە (١٩٧٤)ەوە فایزی ئەو پارەیە چەندەبووە بۆ خۆتان بەڵام خۆێنی ئەو خەڵکە بێتاوانەی کە لەسەر ئێوە شەهید کرا بەرێك وپێکی بدەن لەو پارەیەی کە وەرتان گرت، چونکە ئەگەر ئەو پارەیە بەیەکسانی دابەش بکرێت بەسەر خاوەن شەهیدەکانی شارۆچکەی قەڵادزێ هەریەکەیان (٥٠)هەزار دۆلاریان بەردەکەوێت بەلای کەمەوە، وە قەڵادزێ پێئاوادان ئەکرێتەوە.

جولەکە دوای مۆرکردنی ڕێکەوتن نامەی (جەزائر) بلاوی کردەوە لە ڕۆژنامەیەکدا کە ئێمە ١٥ ڕۆژ پێش مۆرکردنی ڕێکەوتن نامەکە ئاگادارکراینەوە، بەڵام کە زانیمان ئەم ڕێکەوتن نامەیە هیچ زیانێك نابەخشێت بە بەرژەوەندییەکانمان لەو ناوچەیەدا وە سوپای عێراق بە هیچ شێوەیەك دژ بە جولەکە ناجوڵێتەوە، دەنگمان نەکرد.

لە ساڵی ١٩٨٦دا هاتوچۆم دەکرد لە نێوان یەکێتی وپارتیدا، لەلای کاك مەسعود بارزانی دانیشتبوم پێم ڕاگەیاند هەندێك نهێنی هەیە ئەمەوێ بێتی بڵێم، کاك مەسعود وتی: ئەبێ کاك عەلی عەبداللەش بەشدار بێت (ئەوکاتە بنەماڵەی (مەلا مصطفی) بە تەواوی زاڵ نەبوون بەسەر پارتی دیموکراتی

کوردستاندا ومبێ کاك (عەلی)چاویان بەکەس نەدەکەوت، بەلآم ئێستاکه ماموستا عەلی عەبدالله ئەبێ لەرێگای پرسگەوه کاتی بۆ دیاری بکرێت ئینجا چاوی به سەرۆك بکەوێت)، پێم وت (مام جەلال) فەرمویەتی ئاگاداری کاك مەسعود بکه که چەند سەرکردەیەکی کۆماری اسلامی (فلان وفلان فلان) پێیان ڕاگەیاندوم که کورانی (مەلا مصطفی) ئەوپەڕی پەیەوەندیان هەیه لەگەڵ (C.I.A)دا، که قسەکانم تەواو کرد کاك مەسعود بێ دەنگی دایگرت و هیچ وەلآمی نەدامەوه، بەلآم جارێکی تر که هەر له هاتوچۆدابوم له نێوانیاندا (کاك مەسعود) فەرموی: (کاتێك لەسەرەتای هەشتاکاندا زۆرێك له ئۆپۆزسیۆنەکانی عێراق کۆبونەوه له سوریا بۆ ئەوەی ڕێ وشوێنێك دابنێن بۆ بونبەیەکی سەنگەرەکانی خەبات دژ به حزبی بەعس، له و کۆبونەوەیەدا داوایان لێ کردم که بایانێك دەربکەم ئێستاکه پەیوەندیم( C.I.A) ەوه نەماوه بەلام له وەلآمدا پێم وتن کاتێك بۆردومانی قەلآدزێ کرا کەس به هانای ئێمەوه نەهات تەنها (C.I.A) ی نەبێت دووپاتی دەکەمەوه من له پێشوشدا پەیوەندیم هەبوو ومنێستاش پەیوەندیم هەیه).

منیش دەڵێم: پەیوەندی کردنی سەرکردەیەك به (C.I.A)وه لەبەر ڕزگاری وولآتەکەی و بەرژەوەندی گشتی هاوولآتیەکانی بێت' ئەمه گەورەترین خزمەته به مەرجێك ئەم پەیەوەندییه وەکو (کۆسۆفۆ) بێت نەوەکو وەکو (بارزانی) کەفەرمانی بۆ دەرچێت له ئەمریکاوه (ئاش بەتاڵ) کردن بەبێ ئەوەی گوێ بداته وولآتەکەی یەکسەر بلێت باش بەسەرچاو.

که له دادگای (ثورة)ی بەعس حوکم درام وبریاری حوکمەکەیان بۆ خوێنەمەوه سەیرم کرد یەکێك له تاوانەکانم ئەوبوو که من (جاسوسی دەولیم) بەو واتایەی من پەیەوەندیم هەبووه به (اسرائیل و ئێران)دوه.

بەڕاستی ئەم بریاره جێی سەرسوڕمان بوو بۆمن، چونکه من دڵنیا بووم له خۆم که پەیوەندیم به هیچ وولآتێکی دەرەکییەوه نەبوو و هەتا ئێستاش هەر نیمه، لەگەڵ ئەوەشدا که به هەموو شێوەیەك هەوڵم لەگەڵدا دراوه

پەیوەندیم هەبێت پێیانەوە، دوای ئازادبوونم لە بەندینخانە، یەکەم کرکەیپێ هەڵسام گەڕان بوو بەدوای ڕاستیئەو تاوانە دا و دۆزینەوەی سەر چاوەکەی، ئەوەبوو بۆم دەرکەوت حزبی بەعس بەبێ هۆ ئەو تاوانەی نەخستبوە پاڵم، بەڵکو من هەرچی هەواڵێکی کۆشکی کۆماریم بە دڵسۆزانە گەیاندبووە مەکتەبی بارزانی (مەسعود و ئدریس) ئەوانیش کردبویان بە ڕاپۆرتو دابویان بە (ئێران و ئیسرائیل).

## هەوڵوێستی عێراق بەرامبەر قەڵادزێ:

تاوانباری دووەم لەم کارەساتە، حکومەتی بەعسە، چونکە بەعس هەموو توانایەکی خۆی بەکارهێنا دژی گەلی کوردستان بە هەموو جۆرێك لە گرتن و کوشتن ولەسێ دارەدانی خەبات گێڕو ناودارەکانی کورد(. لەیلا .قاسم)یەکێك بوو لەوانە، وەبەمانەشەوە نەوەستائەوەبو بەو بێ بەزەی و درندانەیە (قەڵادزێ)بۆردومان کرد، لەگەڵ ئەوشدا کە ئەیزانی کە ئەو دانیشتگایە هیچ زیانێکی نابێت بۆ ئەو، بەڵام رقو کینەی بەرامبەر بە کورد لە داخی ئەوەی کە پیلان دانانەکەی لەلایەن(C.I.A)ەوە داڕێژراوە، نەی دەهێشت جگە لەوێران کردنی کوردستان هیچی تر ببینێت، وە دوابەدوای ئەو کارەساتە صدام چەندەها جاری تر چوو بۆ قەڵادزێ دانیشتوانی شارۆچگەی چاوەڕوانی بەزەیی یەك بوون لەسەرۆکی وولاتەکەیان بەڵام نەوەك یارمەتی نەدان بەڵکو بریاڕی دا قەلادزێ بگوازێتەوە بۆ ئۆردوگا، ئەوە بوو بە ناچاری نوێنەرانی قەڵادزێ بە سەرۆکایەتی مامۆستا (مەلا محەمەد دەلگەیی) چونە بەغدا بۆ دۆزینەوەی ڕێگا چارەیەك بۆ خەڵکی ستەم لێ کراوی ئەم شارە، بەڵام دوای ئەوەی ئازارو ئەشکەنجەیەکی زۆر درا لەلایەن ڕژێمەوە سواری ئۆتۆمبیلێکیان کردو بردیان قەڵادزێ یان پێشان دا بە وێران کراوی وتیان ئێمەی بەعس بمانەوێت کارێك ئەنجام بدەین هەر ئەنجامی دەدەین، بزانین ئەتوانی ماڵی خۆت بدۆزیتەوە لەم وێرانەیەدا.

## هەڵوێستی (C.I.A) لەم کارەساتەدا.

هێلمز لە بەڕێوەبەری (C.I.A)دیەوە کرا بە باڵیوزخانەی ئەمریکی لە تاران لەبەر ئەم مەبەستانە:

١-لاوازکردنی حکومەتی عێراق.

٢-ڕاکێشانی شۆڕشی کوردی بەلای خۆیاندا بۆ ئەوەی چۆنیان بوێت ئاوا بیجوڵێنن.

٣-بەهێزکردنی شۆڕشی کوردی بۆ ماوەیەکی کەم ئەوە بوو سوپای ئێرانی لە ناو ئێرانەوە سوپای عێراقی بە تۆپ بۆردومان ئەکرد.

٤-هەوڵی گەرم کردنی شەڕی دەدا لە نێوان حکومەت و بارزانی دا بۆ سود وەرگرتن لەو وەزعە.

٥-لە ئەنجامدا چۆکی بە عێراق دادا بۆ ئەوەی لەگەڵ ئێراندا ڕێکەوتننامەی جەزائیر مۆربکات.

٦-ئەوە بوو دوای مۆرکردنی ڕێکەوتن نامەکە دەوری مەلا مصطفی تەواو بوو، وە دوای ئەوەی هێلمز زانی هەموو پیلانەکانی سەرکەوتوبوو گەڕایەوە بۆ واشنتۆن.

٧- مەبەست لەدارشتنی ئەو پیلانە گلاوەی (C.I.A) بۆ مەکتەبی بارزانی (ئدریس و مسعود) ناچار کردنی صدام و بۆ بۆردومان کردنی قەلادزێ بەو نیازەی نێوان کورد و بەعس بەتەواوەتی تێك بچێت نەوەك جارێکی تر ڕێکەوتن نامەیەکی نهێنی تری وەکو (١١ی ئازار) ئەنجام بدرێت لەنێوانیان دا، بۆیە دەڵێم تاوانباری سەرەکی مەکتەبی بارزانی (مەسعود و ئدریس)ە لەم تاوانەدا.

مــن کــەناوم (ڕەفیــق مامــە صــادق) ە ناســـراوم بـــەڕەفیق پشـــدەری لەبنەماڵەیەکی دەوڵەمەند هاتومەتە دونیاوە.

(٤٠٠ ) ســاڵ پێــش ئێســتاکە لەناوچــەی جزیــرە و بۆتانـــەوە هاتوینەتــە کوردستانی باشوور لەشاری کویسنجق جێنشین بویـین ئێسـتاکەش ئاسـەواری باپیرە گەورەمان ماوە بەناوی کاولی علی بەگ ناو دەبرێت.

یەکێك لەنەوەکانی ناوی صادقە کەپێی دەوتـرا(مـام صادقـە درێـژ) دەبێتـە باپیرم نزیکەی ( ١٠٠)ساڵ زیاتر ژیاوە هاوسـەرەکەی مـام صـادق نـاوی فاطمـە مصطفی بووە لەبنە ماڵەیەکی کۆیی ناسـراوە و خوشـکی صـابر کۆیـی بـووەو پوری ملا خدر نجم الدین(قەڵادزێی) بووە.

باپیرم دەستێکی باڵای هەبووە لەکاری پزیشکی داوە مرۆڤێکی کاسب بـووەو چوار زمانی زانیـوە (کـوردی، عـەرەبی، فارسـی، تورکـی) قسـەخۆش و سـەخی بووە، کاروانی چۆتە (بغداد و بصرە و موصل و دیاربکر و مـهاباد و تـەورێز) دوو کوڕ و چوار کچی هـەبووە و، کـوڕی گـەورەی نـاوی حسـین بـووە بەمامـە ناسراوە، کوڕی دووەمی ناوی تۆفیق بووە کچەکانی (عیفەت، ڕەعبـە، ڕەعنـە، گوڵی)

حســین کەبەمامـــە ناســـراوە لەتەمــەنی (١٥) ســـاڵی دا، ژنـــی هێنـــاوە، هاوسـەرەکەی نـاوی صبریـە رەزا مـام یحیـی بـوو ئـامۆزازای مامـە بـووەو کەلەتەمـەنی (١٣) سـاڵی شـووی کـردووە، دایکـی نـاوی مریـمـە سـوور بـووەو لەبنەماڵەی مەلا عبداللە بیتوشە سێ کوڕو دوو کچی هەبووە بەناوی شفیق و ڕەفیق و کەمال و بدریە و فخریە.

تۆفیق صادق لەژنی یەکەمی دوو کچی هەبووە، لەژنی دووەمی پێنج کـوڕو چـوار کچـی هـەبووە، پیـاوێکی کاسـب و سـەخی بـووە خزمـەتی هــەزاری زۆر کـردووەسالار تۆفیــق صــادق پ.م نـاوخۆ بـوو، لەسـاڵی ١٩٦٥ لەشـارۆچکەی قەڵادزێ شەهید کرا.

سـردار تۆفیــق صــادق کەیەکێکــە لــەکورەکانی ئێســتاکە لــەپۆڵندە دەژی.تاوانبارێکی گەورەیە لەهەموو ڕویەکەوە بەتایبــەتی بەرامبــەر ژن و منداڵەکانی و گەلی کورد و بنە ماڵەکەی و بەتایبەتی من.

چوار ژنی هێناوە یەکێکیان لەمهابادە و کورێك و کچێکی هەیە لەساڵی ١٩٩٩ کچەکـەی شـوی کـرد و کورەکـەی لەدانیشـتگایە و نـازانن کـەباوکیان نـاوی سەردارە، ژنێکی کەی لەشاری سنەیە، خێزانی کچی پوریەتی بەموچەی خۆی توانیویـەتی کورو کچـەکانی بـەخێو بکـات و پێیـان بگەیـەنێت بـەبێ ئـەوەی باوکیـان یارمـەتی دابـن، خـێزانی چوارەمـی لەپۆڵندەیـە بەیەکـەوە ئـەژین نـازانێت کەسـەردار سـێ ژنـی کـەی هێنـاوە و هـەموویانی بـەجێی هێشـتووە، ژنەکەی مهاباد ئەڵێت: (تەنها تەلاق نامەم بۆ بنێرێت هیچی ترم لێی ناوێت) سەردار بەهەر گونـدو شـارۆچکەیەکدا تێپـەڕ بـوو بێـت خراپەیـەکی کـردوەو پارەیـەکی لەچـەند کەسـانێك وەرگرتـووە بەدەسـت بڕیــن بــۆ نمونــە (٢٠٠٠) هـەزار دۆلاری لـەدکتۆر ئـەرجمند مـەلا صدیـق لـە ئــەڵمانیا بــەناوی منــەوە وەردەگرێ.

**عیفەت صادق کەخێزانی مام ڕەزا بووە.**

مـام ڕەزا پێـاوێکی ئـازاو زیــرەك و ناســراوەو ڕیــش ســپی قــەڵادزێ بــووە لەسەرەتای شۆڕش دا دادوەر بوە لەقەڵادزێ ئێستاش بۆ نمونە هەمیشە باســی دڵسۆزی و نیشتیمان پەروەری ئەم پیاوە ئەکەن پێنج کورو سـێ کچـی هـەبوە کورەکــانی علــی مــام ڕەزا کەناســراوە بــەپیاوێکی شــۆرش گــێڕو نیشــتیمان پـەروەرو دڵسـۆز و سیاسـەتمەدار . بکـر مـام ڕەزا دڵســۆز بــوو بــۆ وڵاتەکــەی کوردێکی نیشتیمان پەروەر بوو.

عمر مام ڕەزا : کوردێکی دڵسۆزو نیشتیمان پەروەر

حاجی مام ڕەزا: کارمەندێکی دڵسۆزو پاك بوو کۆچی دوایی کرد.

محمد مام ڕەزا: بەتەمەنی لاوی لەشەڕێکدا، ناوبژی کردبوو کوژرا.

کچەکانی خیریە و سەرگوڵ و ڕووناك.

رەعبە صادق خێزانی کەریم ی مام علی بووە کەبن ئامۆزای یەکن.

وەکریم ی مام علی پیاوێکی کاسب و ناسراو بووە لەشارۆچکەی کۆیە و یەك کورو پێنج کچی هەبووەو مام غریب بەکارمەندێکی پاك و دڵسۆز بۆ کارەکەی و وڵاتەکەی ناسراوە، کچەکانی بەناوی (دلار و ئامینە و فخریە ناسکە و حلیمە).

ڕەعنا صادق خێزانی حەمەدی مصطفی سوور بووەو بن ئامۆزانی یەکن، حەمەدی مصطفی سوور پیاوێکی کاسب و ناسراو بووە لەشارۆچکەی کۆیە دوو کوڕو سێ کچی هەبووە، کوڕە گەورەی ناوی جەلالە هاوسەرەکەی گورجی خان بووەو کچی تۆفیق صادق بووە لەساڵی ١٩٨٤ جەلال کات ژمێر (٨)ی شەو کۆچی دوایی کرد پاش (١٢) سەعات واتە کات ژمێر (٨) ی بەیانی هاوسەرەکەی (گورجی) کۆچی دوایی کرد بەدوایدا، کوڕی دووەم( عبد الخالق مضمد) پیاوێکی دڵسۆز بوو بۆ وڵاتەکەی کوڕەکەی لەتەمەنی ١٢ ساڵی کەناوی سەرباز بوو سەرباز بەدەستی جاشەکانی بەعس شەهید کرا، کچەکانی (ئامنەو نەزاهەت و عەزیمەو لایقە).

گوڵی صادق خێزانی عبدەی مصطفی سوورەو بن ئامۆزای یەکن و عبدەی مصطفی سوور ئەم پیاوە پیاوێکی کاسب و ناسراو بووەو لەشارۆچکەی کۆیە دوو کوڕو چوار کچی هەبووە شوان و ئیسماعیل . کچەکانی (نەزیرە و سنەوبەر و خیریە و نەجیبە).

هەندێك لە بەسەرهاتەکانی صادقە درێژ: کورد ئەڵێت مشتێك نموونەی خەرمانێکە دەستێکی باڵای هەبوو لەکاری پزیشکی دا لەهەمان کاتدا مرۆڤێکی کاسب بووە کاروانی چۆتە بەغداو بصرەو موصل و دیار بەکرو مهاباد و تەبرێز لەو هاتوچۆو گەڕانانەی دا شتی خۆش و سەر سوڕهێنەری بەسەر هاتووەو چەند نموونەیەکیان لێ باس ئەکەم. ساڵێکیان بەشی زۆری توتنی پشدەری کڕیوە و بەرەو بەغدا و بصرە ڕۆیشتوەو پاش ئەوەی توتنەکەی شێ دەکا و دەرزی دوای (٩) مانگ دەگەڕێتەوەماڵەوە، کاتی نان

خواردن ئەبێت سێ کفتەی گەورەی کۆیی دەخوات، نەنکە فاتمم پێی ئەڵێ کابرای کاروانچی چوار جارە داوای کرێی بارەکەت لێ ئەکات، تۆش جەنابت لەسەر ئەو هەموو توتنەی بردوتە عانەت نەهێناوەتەوە سێ کفتەشت خوارد، مام صادق دڵێت: ئەوەندە ئەڵێی (دایکی مامە بەری دڵت گرتم ئەگینا ئەم کرد بەچوار کفتە).

لەیەکێك لەسفەرەکانی لەساڵی ۱۹۱۹ لەگەڵ مامەی کوڕی دا کاتێك لەمەهاباد ئەبن ئیسماعیل ئاغای سمکۆ دەستت بەسەر شاری مەهاباد دا دەگرێت، هەرچییەکیان هەیە تالان ئەکرێ، ناچار خۆی لەگەڵ مامەی کوڕی ئەبێت بەحەماڵ(کۆڵ هەڵگر) لەو ڕێگایەوە خۆیان ئەگەیەننە جەنابی ئیسماعیل ئاغا دوای سلاو دەست ئەکات بەگفتو گۆ کردن لەگەڵ ئیسماعیل ئاغادا.

باپیرم ئەڵێ: من دانیشتوی شاری کویەم، من بازرگانێکی دەوڵەمەند بووم ئێستاکە وا کۆڵ هەڵگرم لەکاتێکدا ناسراویت بەمرۆڤێکی کورد پەروەر، بەنیازی ئازاد کردنی ئەم وولاتەی، بڕیارم داوە کە گەڕامەوە و ئەبێت باسی چالاکی و فیداکاری و ئێوەی مەزن بکەم، زمانم لاڵ ئەبێت قسەیەکی ناجۆر بکەم بەرامبەرت ئەوەش بارودۆخی منە کەلەبەر چاوتم.

ئیسماعیل ئاغا: کەگوێی لەقسەکانی دەبێ زۆر بەلایەوە خۆش ئەبێ و ڕێزێکی زۆریان لێ دەگرێت (داوایان لێ دەکات ئەو شەوە میوانی ئەو بن وکاتێك ڕۆژ دەبێتەوە دەڵێ :(مام صادق چیت ڕۆیشتوە باسی بکە تاکو دوو بەرامبەر زەرەرەکەت بۆ ببژێرم)، کاتێك مام صادق دەگەڕێتەوە ناو کەس و کارەکەی خۆی لەزۆربەی کۆڕو کۆمەڵەکاندا باسی هەڵوێستی مەردانەی ئیسماعیل ئاغای سمکۆ دەکا بەرامبەر ( کۆڵ هەڵگرێکی) ماڵ تالان کراو، کەبەڕاستی ئەو هەڵوێستە ( چاوەڕوان کراو بوو لە سەرکردەیەکی کوردی نیشتیمان پەروەری لێ هاتوو).

جارێکیان ئاغایەکی پشدەر دێتە ماڵەوە بۆلای و داوای دەرمانێکی لێ دەکات بۆ ئەوەی بتوانێ بەفەرمانی خۆی هەستی لەگەڵ هاوسەرەکەی.

باپیرم: دەرمانی دەداتێ و دەڵێت کە ئەم حەبانەت تەواو کرد ئەو کاتە ئاغا ژنت هیچی تر کە گلەیی نامێنێ، لەو کاتەی کەباپیرم لەگەڵ ئاغاکە گفتوگۆ دەکەن لەهەمان ژور نەنکم دانیشتوەو لەخواری ژورەکە رەستەی یاپراخ ئامادە دەکات گوێی لەهەموو قسەکانی دەبێ لەدوایی دا ڕوو دەکاتە باپیرم و دەڵێ بابی مامەی خورکت لێ کەوێ کەدەرمانی وات هەیە بۆ نایخۆییت.

باپیرم وەڵام دەنێرێ بەدوای حەمەدو عبدەی مصطفی سور بێنە قەڵادزێ ئەو کاتە هاتو چۆ کردن بەوڵاخ بووەو کاتێ دەگەنە وێ هاوین وەرزی هاوین دەبێ و باپیرم سەرو قات جلیان بۆ ئەکات و لییان ئەپرسێت چەندتان پارە هەیە کاسبیتان چۆنە ئینجا ئەڵێت بەتەمام گوڵێوو ڕەعناتان لێ مارەکەم وەلەگەڵ خۆتان دابیانبەنەوە بۆ کۆیە، هەموو جلو بەرگێکی بووك وهەندێك زێرو بڕی (٥٠) پەنجا دیناریان دەداتێ وەبانگی نەنکم ئەکات بۆ ئەوەی کچەکان برازێنێتەوە و ئامادەیان بکات لەگەڵ مێردەکانیاندا بەڕێ بکەوون بۆ کۆیە، بەڕاستی باپیرم لە کاتێکدا ئەم هەڵوێستە ئەگرێت کەزۆرێك لەدەوڵەمەندان و ناودارانی شارەکەی خۆی داوای کچەکانی لێ ئەکەن بەڵام دیار بوو لەمێشکی خۆیدا بڕیاری دابوو کەبیاندا بەکەسێك خۆی لەدین و خووروشتیان شارەزا بێت و بەبێ ئەوەی گوێ بداتە پارەو ناو: بۆ شارەزابوونتان زیاتر کە خۆی ڕەوشتی ئەم پیاوە حەز ئەکەم ئەم بەسەر هاتەشتان بۆ بگێڕمەوە( باپیرم لەکۆیە نیشتەجێ ئەبێ وەگرانییە گەورەکە دێت بەسەریاندا ئەم پیاوە خۆی و زۆربەی کەس و کارەکەی کۆ دەکاتەوەو دەچێ بەرەو گوندی سما قوڵی بۆ ئەوەی ژیانێکی باشتر بژین کاتێك یەکەم ئێوارە نان دەخۆن سەیر دەکات ( ٧٦) کەس لەکەس و کاری خۆی لەگەڵی هاتۆتە دەرێ.

**حسین کەناسراوە بەمامە صادق**

لەتەمەنی (١٤) ساڵییەوە لەگەڵ باپیرم لەبەشی زۆری سەفەرەکانیدا

بەشداری كردووە دوكانی بازرگانی قوماشی هەبووەو لەگەڵ دەرمانی پزیشكی و كاسپی توتنی كردوە، دێهاتی گرتووەو بەئیجار ساڵانە (٣-٤) هەزار سەر حیوانی لەكوردستانی ئێرانەوە ئەهێنا ئەی بردە موصل، لەتەمەنی(٦٠ )ساڵی دا بەنەخۆشی شێر پەنجە كۆچی دوایی كرد لەساڵی ١٩٦٥ و تەرمەكەی لەگۆڕستانیكۆیەیە، ئەو پەڕی دۆستایەتی و برایەتی بەهێز بووە لەگەڵ دانیشتوانی ناوچەی (پشدەرو مانگورو مامەش) وەتا ئێستا سامانی ئەو دۆستایەتیە هەر بەردەوامە، بۆ نموونە بەجۆرێك نزیك بوو بووەوە لەئاغاكانی پشدەر كەقسەیان رەت نەدەكردەوە، جارێكیان چەند ڕیش سپیەكی (شۆڕێ) دێنە لایو پێی دەڵێن كەئەبێت یارمەتیمان بدەی شوینی ژیانمان بچۆكە بەڵكو تكامان بۆ بكەی لەلای جەنابی مینا ئاغای گردباغ خاوەن قەلادزێ كەرێگامان پێ بدات لەدەورو پشتی (جوت كانییان) خانووبەرە بكەین وەلەناو بازاری قەلادزێ دا كاسپی بكەین بەڵكو بە هۆی ئەو هەوڵەی تۆوە بحەسێنەوە.

كاتێك كە باوكم ئەچێتە خزمەت مینا ئاغا داوای ئەوەی لێ دەكا رێگا بدەیت بەشوریەكان بێنە قەلادزێ هەندێك زەوی و زاریان بدەیتێ و وبتوانن لەناو قەلادزێشدا كاسپی بكەن.

مینا ئاغا ئەڵێ: كاكە مامە تۆم زۆر خۆش دەوێ ئێمە یەك ماڵین هەموو داواكاریەكی تۆ بەسەر چاو جێبەجێ دەكەم بەڵام بەقسەم بكە ئێوەی كۆیی كەزاڵن بەسەر دارایی قەلادزێ هاتنیان بۆ ئێرە مایەی زەرەرە لەدوا ڕۆژدا بۆ ئێوە.

باوكم مامە: (ئەڵێ ئێمە گیرفانمان پڕ بووەو ئەوانیش گیرفانییان بەتاڵە رێگایان بدەرێ بەڵكو ئەوانیش گیرفانییان پڕ بێ)، ئەوەی ئاگادار بم لەوەزعی برا شۆڕێیەكان جێی شانازین بەگشتی لەهەر لایەك هەن وابزانم گیرفانیان پڕە بەڵام ئایا كەسیان لەبیر ماوە لەبەر گیرفان پڕی.؟!

**شفیق مامە صادق:**

لەساڵی ١٩٢٦ لە(گوندی گرمیتەن) لەدایك بووە کەنزیکەی ٢٠کم دووره ـەقەلآدزێ، مرۆڤێکی دڵ پاك و خۆشەویست بووە لەناو خەڵکدا، خوێندەواری ـەبو، سەرەتا بیرو باوەڕی شیوعی بوو، لەگەڵ (٢٤ )کەس لەبەغدا هێرش ـەبەنە سەر ڕۆژنامەی (فجر الجدید) لەساڵی ١٩٦٠ دا ئەگیرێت، بەهۆی بارزانی هەر هەموویان بەر بوون، ئینجا بوو بەپارتی ناوم هێناوە لەکتێبەکەی پێشوم( کورد، دوژمنی خۆت بناسە) لەساڵی ١٩٧٦ گیراوە لەساڵی ١٩٧٨ بەردرا، لەساڵی ١٩٨٠ کۆچی دوایی کرد تەرمەکەی لەگۆڕستانی قەلآدزێ بەخاك ـپارد، کرا لەسەر کێلەکەی ئەم پارچە شیعرەی شاعیری بەناو بانگی کورد شێرکۆ بێکەس نوسراوە کە دەڵێ:

چرای دڵم بەناو ژووری زیندانمە
باوەشی کرد بەتاریکی ژیانما
کاتێك مردم چراکەش کوژایەوە
پەنجەی ئازار دووا پەڕەی هەڵدایەوە.

چوار کورو شەش کچی هەبووە، کوڕەکانی محمد، ئاراس، احمد، نەبەز، کچەکانی ئەمیرە ، نزیرەو، نەورۆز، بەیان، هەوار.

محمد شفیق: بوو بە پێشمەرگەو لەساڵی ١٩٨٥ کەوتە ناو بۆسەی عباس بایزی بالو ئاغا ئەم کابرایە لەبەر خاتری بڕێك دینار نامەیەکی دروست کراو دەخاتە ناو گیرفان ئەم لاوە کورد پەروەرەو تەسلیمی هەوالگری سوپای دەکات و لەئەنجامی ئازارو ئەشکەنجە دانێکی زۆردا ئەم لاوە توشی نەخۆشی مێشك دەبێت و هەرچەندە پیشانی دکتۆرێکی زۆر درا بۆ چارەسەرکردنی بەلآم بێ سوود بوو، ئێستاکە بەشێتی بەناو بازاڕی قەلآدزێ دا دەسوڕێتەوە (حسبنا الله ونعم الوکیل).

لەداهاتوودا لەسەر تاوانەکانی ئەم تاوانبارە دەدوێم لەکتێبی سێیەمدا.

**ئاراس شفیق**

لەدایك بووی ساڵی ١٩٦٢، دەرچوی کۆلێژی ئاداب بەشی کیمیا، لەبەر ئەوەی نەچووە ڕێکخراوی بەعسەوە و ڕای کرد، لەم ساڵانە شهادەکەیان بۆ هێناویەوە، ماوەیەك (پ.م) بوو لەکاتی کیمیا بارانەکەدا هاتەوە، مرۆڤێکی نیشتیمان پەروەرە ئێستاکە مامۆستایە لەشارۆچکەی ڕانیە،

نەبەز شفیق: لەدایك بووی ساڵی ١٩٦٥، پیشەسازێکی ناسراوە لەبواری ئۆتۆمبیل چاکردندا، پ.م ناو شار بووەو، سێ جار گیراوە بەهۆی مامی‌یەوە (مفوض کمال) بەردراوە پەیوەندی هەبووەبەکۆمەڵەی ڕەنجدەرانی کوردستا ئێستاکە لەقەڵادزێ ئەژی.

**ئەمیرە شفیق**

خێزانی عبدالخالق، کوڕێکی کەناوی دەرباز بوو بەدەستی جاشەکان شەهید کرا، ئازاد و گۆران و ئەژین ئەم سێ منداڵەی ماوە.

نەوروز شفیق: خێزانی حسین حاجی علی لەیەکێك لەشەڕەکانی کورد کوژەدا کەلەنێوان ( پ.د.ك و ی.ن.ك) دا ڕووی دا لەساڵانی( ٩٤-٩٥) دا تۆپێکی کوێر کەلەلایەن پارتی‌یەوە لەئێرانەوە ئاڕاستەی قەڵادزێ کرا بوو، بوو بەهۆی ئەوەی ٢١ تەرم بهێنریتە دەرێ لەماڵی خوالێخۆشبوو نەوروز کەیەکێك لەکچەکانیشی تەمەنی ١٦ ساڵان بوو ناوی (کانی) خان بوو لە نێوان ئەو ٢١ تەرمەدا بوو.

لەسەردانێکی کاڵی‌ی کچی خوالێخۆش بوو(نەوروز) لەگەڵ باوکیدا بۆ خزمەتی سەرۆکی(پ.د.ك)، سەرۆك ئەفەرموێت: چیتان ئەوێ بۆتان بکەم..؟

لەوەڵامدا کاڵێ خان ئەڵێت: دایکم وخۆشکم بۆ زیندوو کەرەوە، کاشکا ئەو تۆپە بەر ماڵی تۆ بکەوتایە.

بەیان شفیق: خێزانی بازیان ڕەفیق، دەرچوی پەیمانگای مامۆستایانە.

هەوارشفیق : خێزانی ئارام کریم ە، دایکی ئارام پورزامانە.

جوان شفیق: خێزانی جبار عبدالله مولود، هەردووکیان دەرچوی

پیشەسازین.

کمال مامە صادق: لەقەڵازێ لەدایك بووە لەساڵی ١٩٤١ لەتەمەنی ١٦ ساڵان لەگەڵ دایکم و ئەمیرە و نزیرە بردمە لای خۆم لە بەغدا، لەساڵی ١٩٥٦ لەقوتابخانەی فەیلیەکانیش سەرەتای تەواو کرد ئینجا لە کاشف الغطاء ناوەندی تەواو کرد کاتێك بەعس کودە تاکەی بەسەر عبدالرحمن دا کرد کرابە مفوضی شرطە ی نجدە،شوینەکەی یەکجار زۆر ناخۆش بوو زۆر پاڕایەوە بگوازێتەوە بۆ بەڕیوبەرایەتی ئاسایش، ناچار بووم لەبەر خاتری دایکم جێبەجێ بکەم لەکتێبەکەم کورد، دوژمنی خۆت بناسە بەشی یەکەم ناوم هێناوە.

کەمن گیرام لە ١٩٧٦/٩/١٤، لەساڵی ١٩٧٧ گواسترایەوە، بۆ ئاسایشی سلێمانی، چەند جار توشی مەفرەزەی پ.م هاتووە دەستیان بۆ درێژ نەکردوە بەڵکو و جێی ڕێز بووەو چەندیك لە ئاسایش کاری کردووە.بەگشتی خەڵکی زۆری لێ ڕازی بوون، ئینجا لەئاسایشی سلێمانی دور خرایەوە دوای چەند مانگێك کرا بە (مدیری سوق مرکزی) لە سلیمانی، لیرەوە توشی کێشەو گیرو گرفت هات بازاڕی ڕەش دەستی پێکرد (سەعات ویسکی و جگەرە وهەموو کەلەپەلێکی ناو ماڵ و جلو بەرگی ژنان و پیاوان و خواردەمەنی) ڕۆژانە توشی تەنگو چەڵەمە ئەهات لەگەڵ کاربەستانی مخابەراتو ئیستخباراتو سوپاو چڵکاو خۆرەکانی میری و قاچاغ چیەکانی ناو بازار، ڕۆژێك بەنهێنی سەردانی کاك مصطفی چاوە ڕەشی کردبوو وتبووی: هیچتان هەیە لەسەر من..؟، لەوەڵامدا کاك مصطفی ئەفەرموێت : (نەخێر بەڵام ئاگاداری ڕەوشتی ناو دائیرەکەی خۆت بە پارێزگاری تەواوی ئافرەتەکان بکە نەهێڵیت تەعدای شەرفیان لێ بکرێت)، ئێمەش بەگشتی زۆرت لێ ڕازین، و جار جار بەنهێنی ئەهات منی ئەبینی بەئاگاداری کاك نەوشیروان مصطفی، کە ڕاپەڕینەکە بوو دەست گیریان کردبوو ئینجا بردبوویانە دادگای شۆڕش لەوێ دوای لێکۆڵینەوەیەکی دورو درێژ دابویانە دەست جەماوەر بەگولەی وێڵ کوژرا.

کەهەولێر گیرا خەبەری کوشتنی کەمالم زانی هاتمە سلێمانی چومە خزمەت کاك عمر عبدالله ناسراو بە(ملازم عمر) بەڕاستی ئەم پیاوە مەزنە لەهەموو ڕویەکەوە جێی شانازیە لەڕۆژی لێقەوماندا وێنەی نییە بەجۆرێك پێشوازی لێ کردم کەهەرگیز لەبیرم ناچێتەوە، فەرموی دوای گرتنی سلێمانی بەدوو ڕۆژ ئینجا ئێمە هاتینە ناو شار بەگۆڕی شەهیدان کاتێك هاتومەتە ئێرە یەکەم کەس هەواڵی کاك کەمالم پرسیوە تازە کار لە کار ترازابوو ئەمە چەقۆو ئەمە ملی من ئێستاش باپرسەی لەمزگەوتی کاك ئەحمەدی شێخ بۆ دانێین پ.م سەرپەرشتی بکات خۆشم ئامادەم لەبەر دەرگا بوەستم و ئامادەم کەئوتومبیلێك پ.م بۆ گەڕەکەکەیان تاکو کەلوپەلی ماڵەکەی لەماڵان بهێنینە دەرێ.

وتم: نوسراوێکم بۆ ئاراستەی کاك مسعود و کاك نەوشیروان بکەو وتێیدا ڕوونی بکەوە کەچۆن ئەم کارەساتە ڕویداوە.

گەیشتمە قەزای صدیق( ڕەواندوزی تازە) لەماڵی جەنابی عزت بەگی دێگەڵە لە ڕۆژی ١٩٩١/٣/١٢ چاوم بەکاك مسعود بارزانی کەوت عومەری مام ڕەزا و بازیانی کوڕم لەگەڵ بوو زۆر بەگەرمەوە بەخێر هاتنی کردین ، بەڵام من بەگرژی و بەشێوەیەکی ناشیرین لەڕویدا وەستام لەوانەی دانیشتوون کاك فرانسۆ حریری و عبد المهیمن بارزانی و حاجی ئیبراهیمی شێر خۆرو عزەت بەگ بوون نامەکەی کاك عومەرم دایەو دوای خوێندنەوەی فەرمووی: بەگۆڕی بارزانی ئاگام لێی نییە، نامەکەی دا بەکاك فرانسۆ حریری ئەویش وتی: تۆ داوای (رد الاعتبار) ناکەیت..؟ ئەوە کاك عومەر ئیشارەتی پێ داوە؛ کاك مسعود فەرموی: نەخێر، زنجیرەیەك زیاد لەنیو سەعات قسەی کرد فەرموی ئێمە گەلی کورد لەکوردستانی عیراق (٧٠) ساڵە دوژمن دەمانچەوسێنێتەوە و بەکەیفی خۆی یاری بەچارەنوس و موقەدەساتمان، ئەکات بەهەزارەها شەهیدمان داوە، دوژمن بەم شێوەیە ڕوخا خۆی ناگرێت بەرامبەر بەهێزی جەماوەر تینویەتی گەلی کورد بۆ ئازادی ە پاڵنەرێك بوو

بۆ بەرپابوونی ئەم ڕاپەڕینە لەلایەن جەماوەرەوە، گەلی کورد بەجۆرێك تینوی ئەم ئازادیە بوو لەئاکام دا ئەم ڕاپەڕینە بەرپا بوو ئینجا فەرموی: برای تۆ نەپارتی و نەیەکێتی نەیان کوشتووە بەڵکو جەماوەر نەیان ناسیوە و بەر گولەی وێڵ کەوتووە، فەرمووی: جەولەیەکم لە کوردستان بەدەستەوەیە پێم خۆشە لەگەڵم بیت تۆ وەزیری دەستە ڕاستی ئایندەدەی، لەوەلامدا:

وتم: ئەیمە فەراش بەلام لەگەڵتا نابم، وا ئەچمە سلێمانی تەرمەکەی کمالی برام بەخاك ئەسپێرم چونکە هەروا بە ئەمانەت نێژراوە.

وتی: پاش (٧) ساڵ ڕۆژێ کەدێمە سلێمانی کۆنگرەیەکی ڕۆژنامە نوسی جیهانیم بۆ دەبەسرێت باسی بارودۆخی ئێستا ئەکەم من خۆم زۆر باش لەدورو نزیك کمال ئەناسم باسی فیداکاری ئەو دیمەنە بەر چاوکە بەهەموو توانایەك خزمەتی کردوە پەیوەندی بەخۆمەوە بووەو بچۆ بۆلای نێچیرڤان بەناوی منەوە تاکو چیت پێویستە بۆت ئەنجام بدات.

نانی بەیانی‌و نیوەڕۆو شەوم کرد بەیەك ژەم ویستم بڕۆم خواحافیزیم کرد.

وتی: ئیشم پێتە ئینجا کاتی ئەوە هاتووە کەچەند پرسیارێکت لێ بپرسم.

- پرسیار: ئایا صدام ئەڕوخێ

وەلام: لەبەر بارودۆخی ئێستای جمهوری ئیسلامی، ئەمریکا، صدام لاواز ئەکات بەلام ناهێڵێت بڕوخێت( صدام ناروخێت)

پرسیار: ئایا ئەگەر کەرکوك بگرین صدام ناڕوخێت..؟

وەلام: بەهیچ جۆرێك ڕوو مەکەنە کەرکوك چونکە دانیشتوانی شاری کەرکوك بریتین لە( کورد و تورکمان و ئاشوری و ئەرمەنی و کلدان و عەرەب) وە( شریکەی نەوتی تێدایە) سەبارەت بەدهۆك کە گرتان بەمەرجێك وەکو سلێمانی و هەولێر تالان نەکرێت لەڕۆژانی نزیکدا کەرکوك ڕزگاری ئەبێت تکام وایە کەدهۆك وەکو سلێمانی و هەولێر تالان نەکرێت.

پرسیار: ئایا پ.م بنێرین بۆ بەغدا بۆ گرتنی سەرکەوتو نابین..؟

وەڵام: شەڕى بەغدا بە پ.م ناكرێت وناگیرێت.

ئینجا ڕوم كردە كاك مسعود كەچەند پرسیارێكم ئاڕاستەكەم كرد

پرسیار: ئایا دابینى(تامین) ى وقودتان كردوە

وەڵام: فەرموى مەبەستت لەچییە، وڵامم دایەوە نەوت و بەنزین، فەرموى نەخێر.

پرسیار: ئایا دابینى خۆراكتان كردوە.؟

وەڵام: فەرموى نەخێر.

پرسیار: ئایا مقدارى چوار هەزار ملیۆن دۆلارتان پێیە.؟

وەڵام: فەرموى والله یەك دۆلارم پێ نییە دەستى خستە سەر ساكەكەی(جانتاكەی)

پرسیار: ئایا ئەمریكاتان لەگەڵە.؟

وەڵام:فەرموى نەخێر.

ئینجا من وتم ئەی باشە بۆ هاتنەوە.

وتم: كاك مسعود زۆر سوپاسى هەستى برایانەت ئەكەم بەڵام یەك پێشنیازم هەیە ئەیخەمە بەر چاوت تكام وایە پەسەندى بكەیت ئەویش لەم چەند ساڵانەدا دەست درێژى تاوانى گەورە و ناشیرین بەئاشكرا لەلایەن سەرۆك جاشەكان بەرامبەر هەندێك خێزان كراوە هەرچەندە لێ خۆش بوونى گشتى (العفوا العام) تان دەركردوە بەڵام تاوانەكان زۆر زۆر زەقن لەهەر پارێزگایەكدا دادگایەكى شۆڕش دابنێن ئەو تاوانبارانە لەسێدارە بدەن.

فەرموى ئەم پێشنیازەت بەم زووانە جێبەجێ دەكەین لەهەموو پارێزگاكاندا.

خوا حافیزیم لەكاك مسعود بارزانى كردو بەنیازى ئەوەی بچمە لاى كاك نەوشیروان یەكسەر كاك فرانسۆ حریرى لەقسە خۆشە ڕازاوە جوانەكانى شەكرێكى شكاندو وتى: نەوشیروان دوو كەسى لەگەڵەبەڵام لەوە دەچوو كاك فرانسۆ حریرى بەرێز لەوە ئاگادار نەبێت كە( سەر كردە دەبێت هێزى

جەماوەری لەگەڵ بێت نەك هێزێ بەپارە كراو).

لەهەمان شوێن دور لەكاك مسعود چوومە خزمەت برای تێكۆشەرو نیشتیمان پەروەر كاك نەوشیروان مصطفی بەگەرمەوە بەخێر هاتنی كردم زۆری لا ناخۆش بوو كەڕەحمەتی برام كوژراوە چەند نمونەیەكی هێنایەوە كە لە زۆر شوێن ئەندامانی كۆمەڵەیان كوشتووەو جارێكیان ئەندامێكی كۆمەڵە بەر دەستی دادگای شۆڕش دا بوو بەتەلەفون ئاگاداریان كردم كەناتوانین بیپارێزین چونكە جەماوەر داوای ئەكات ئێمەش ئەكوژن.

نامەكەی كاك(عومەر عبدالله)م دایە.

وتی: زۆر لەكمال خراپتر هەبوو ڕزگاریان بووە بەڵام كمالی ڕەحمەتی باسكیل و شیری نیدۆ یەعنی (سوق مركزی) كوشتی.

لەچاوپێكەوتنێكدا جەنابی[1] (حاجی محمود ئاغای پشدەری) و برای تێكۆشەر[2]( خاڵە نەبەز)یش كە ناسراوە بە(خولەی جگەر) لەهەمان شوێن لەخزمەتی كاك نەوشیروان بوون دەستمان كرد بە، قسەو باسمان لەچۆنیەتی ڕوخانی سوپای عیراق كرد كەچۆن وەكو بەفری بەهار ئەم هێزە گەورەیە

---

[1] هەرسێك براكە حاجی و بابكر و مصطفی بەپێی توانای خۆیان خزمەتێكی بێ وچانیان كردەوە لە گوندی هیرۆ(ماڵیان) بارەگایەكی نهێنی بووە بۆ سەر كردەكانی حزبی دیموكراتی ئێران وەهەروەها پارتی. جەنابی مەلا مصطفی بارزانی لەساڵی١٩٦٢بەخۆی و هێزێكی زیاد لە ٤٠٠ پ.م ماوەی ٤٠ ڕۆژ زیاتر میوانی ئەم بەڕێزانە بوو ناچار بوون قەرز كەن. چونكە بۆ چونیان جیاوازی بوو لە كاری سیاسی.

[2] لەساڵەكانی ١٩٨٣ ئەم زاتە بەڕێزەم ناسی مرۆڤێكی ئازاو زیرەك و شۆڕشگێڕو نیشتیمان پەروەر بوو یەكێكە لەو كەسانەی كەجێ دەستی دیار بوو لەو ناوچانەی كەخۆی پ.م بووە و تیایدا لێپرسراوو بوو بێت.

بەم شێوەیە بەرامبەر بەجەماوەری کورد توایەوە، شەو درەنگ بوو فەرمووی ئێوە زۆر ماندون ئەم ماڵە ڕێکەپێکە لێرە بن ئێمە یەکتر ئەبینینەوە و بەیانی‌یەکەی دێمە لاتان.

لەماڵی جەلا بەگ ئامۆزای کەریم خان محمود خەلیفە صمد شەومان بردە سەر ئەمە یەکەم جارە بەم شێوەیە بەتەنها من و جەلال بەگ دوو بەدوو گفتوگۆ بکەین، جەلال مستەشارێکی کۆنی باوەڕ پێکراو بوو لەلایەن ڕژێمی (بەعس) ەوە.

وتی: من زۆر حەز لەڕاو ئەکەم ئەچومە ڕاوە(مرۆڤ) بارزانیەکان هەندێك جار لەبەر دیواری مزگەوت دا دائەنیشتن مامەی قەڵەوو(ناسراو) بوایە ئەم گوشت ڕاوی من بەئاشکراو ئەهێنی و کاك مسعودیش ئەمە ئەزانێ، بەیانیەکەی کاك مسعود سێ جار ناردنی بەشوێنیا بۆ نان خواردن نەدەچوو لەدواییدا بەپاڕانەوەی زۆری من ڕۆیشت نانی لەگەڵ خوارد دوایی وتی: کاك ڕەفیق ئاگاداری بە چ جۆرێك گەورەکەیان پەیتا پەیتا دەنێرێت بەشوێنما...؟

وتم: من ڕێزم هەیە بۆ ئەم پیاوە مەزنە ئەگەر گلەییم لەبنە ماڵەی بارزانی کردبێت ئەوە چونکە لەساڵی (١٩٥٦) ەوە تێکەڵاوییم لەگەڵیانا پەیدا کردوە و من ئازام هەیە بەسەریان بەڵام بەڕاستی کارێکی زۆر خراپت کردووە، و من ئەم قسە گرژانەم لەگەڵ جەنابی کاك مسعود کردووە، بەڵام کەلێی قبوڵ کردووم چونکە برام بەناهەق کوژراوە خزمەتی شۆڕشمان زۆر زۆر کردوە.

چوینە سلێمانی تەرمەکەی ڕەحمەتی کمال مان هەڵگرت بردمانە کویسنجق لەوێ بەخاکمان سپارد شەوەکەی لەگەڵ مامۆستای گەورەی کوردی نوسەری بەناوبانگ کاك (مسعود محمدی مەلای گەورەی کۆیە) دانیشتین بەدورو درێژی باسی چاوپێکەتنەکەمم لەگەڵ برایانی شۆڕشگێر کاك مسعود و کاك نەوشیروان بۆ گێرایەوە، ئینجا کەوتینە گفتوگۆو لێکرلێنەوە دەربارەی داهاتوی کورد کە ئایا چۆن کێشەکە

چارەسەر ئەکەن.؟ وەئایا لەڕۆژەکانی داهاتوودا ئەم دوو حزبە چۆن سیاسەت بەڕێوە ئەبەن.!

هەردووکمان بەیەك دەنگ گەیشتینە ئەم باوەڕە کەدوژمنانی کورد لەدەرەوەو ناوەوە زۆر بەهێزن مادام دوو حزبن نابنەوە بەیەك لەبەر ئەوەی دوو بەرەکی دەست پێ دەکات کاتێك کەبانگی بەیانی دا هەریەکە بڕیاری خۆی دا (من ئەم وت دوای دوو ساڵی کە شەڕی برا کوژی دەست پێ دەکات کاك مسعود محمد ئەیفەرموو: نەخێر دوای شەش مانگی کە بەهەر حاڵ تەنها لەسەر ماوە کە جیاوازیمان هەبوو لەبۆچونەکاندا.

لەسەر فەرمانی کاك مسعود بارزانی چومە سلێمانی چاو پێکەوتنم لەگەڵ کاك نەوچیرڤان کرد کاك فائق تۆفیق (فایەقە ڕەش) و دکتۆر محمەدی لا بوون بەگەرمەوەبەخێرهاتنی کردم کەوتینە گفتوگۆ ولێکۆڵێنەوە

وتم: ئایا ئەزانی ئێرە میوانخانەیە و ئەمەش زۆری بووك و زاوایە و وا سەعات دووی پاش نیوەڕۆیەو نانتان نەخواردوە، ماڵی ڕەحمەتی کمال تان تاڵان نەکردایەو لەوێ دانیشتبایە باشتر نەبوو بەڕاستی ئێوە بێ سفەتن کەئیشتان بە یەکێك ئەبێت دەستەکانی ماچ ئەکەن و کاتێك کەئیشتان پێی نەما ڕێزی لێ ناگرن.

کاك فائق تۆفیق ویستی وەڵامی قسەکانم بداتەوە.

کاك نەوچیرڤان وتی: کاك ڕەفیق ناڵێیت پارتی بەڵکو قسەکانی بەرەو ڕوی ئێمەیە ئەمە دۆستێکی دێرینی مەلا مصطفی بووە و باوکم زۆر ڕێزی لێگرتووە لای مامم ڕێزی هەیەو زۆری خۆش دەوێت بەچاوی مامم تەماشای ئەکەم وەکاك ڕەفیق بۆی هەیە ڕوو بەڕوی ئێمە هەموو کات قسەمان لەگەڵ بکات.

بەگرژیەوە خوا حافیزیم خواست.

تێبینی: تانکیەکی گەورەی پڕ لەبەنزین ڕاوەستا بوو، منیش

ئۆتۆمبیلەکەم بنزینی تێدا نەمابوو لەبازاڕیش دەست نەدەکەوت داوای بەنزینم لەمەسئولەکە کرد نەیتوانی بمداتێ وتی ئەبێ کاك نەوچیرڤان ئەم بڕیارە گرنگە بدات بەنزین بەدەست ئەوە.

وتم: هەتاکو بەنزینیش لەئێستاوە کەبچوکترین شتە هاتۆەتە بەردەستیان ناتوانین بێ پرس هەلوسوکەوتی پێوە بکەن خودا ڕەحمتان پێ بکات بەم شێوەیە لەیەکەم ڕۆژەوە خۆیان تەسلیم بەم بنە ماڵەیە کرد کەلێپرسراوەکە چووە بۆلای کاك نەوچیرڤان گەڕایەوە سەیارەکەیان بۆ پڕ کردم لەبەنزین خوا خوایان بوو دورکەوومەوە قسەی تر نەکەم.

بەو نیازە هاتبوومەوە سلێمانی کە کاك مسعود بارزانی تەشریفی دێت منیش بەشداری سکاڵای خۆم بکەم دەربارەی کوشتنی کمال، بەلام کە چومە بنج وبنەوانی مەسەلەکە گەڕامەوە هەولێر چونکە ڕاستیەکانم هەمووی بۆ دەرکەوت وا بەکورتی ڕونی ئەکەمەوە.

## ڕوون کردنەوە:

لەگەلْ زۆر لەپیاوە ناسراوەکان و سیاسی و کاسب لەدانیشتوانی پارێزگای سلێمانی کۆبومەوە دەربارەی ڕاووبۆچونیان بەرامبەر ڕەحمەتی کەمالی برام و هەرچەندە خۆم لەهەموو کەس باشترم ئەناسی چونکە لە تەمەنی ١٦ ساڵیەوە لەگەلْ خۆم دا ئەژیا لەکتێبەکەی پێشومدا لەزۆر شوێندا ناوم هێناوە، بەلام کەمن گیرام لە ١٩٧٦/٩/١٤ هاتە سلێمانی یەکەم جار مفوض بوو لەئاسایشی سلێمانی دوور خرایەوە، دوای چەند مانگێك کرا بە(مدیری سوق مرکزی) لەئەنجامی لێکۆڵینەوە زۆر باش ڕاستیەکانم بۆ دەرکەوت.

کەلە ئاسایشی سلێمانی کاری کردووە هیچ سلبیاتێکی لەسەر نییە هەمووی ئیجابییە، کاك مسعود بارزانی ڕای خۆی دەربڕی و کاك (نەوشیروان مصطفی)ش چەند جار لەسەر کمال قسەی کردووە،خەڵکێکی

یەکجار زۆرم دیوە کەوتویانە کمال ڕزگـاری کـردووم لـەزینـدانی و سێداره دان لەمانە بۆ نمونە کاك ئەحمەد سمێلٚ وتبوی: ئەگەر کمال نەبوایە مـن کوژرابووم، کاکە حمەی فەرج وتی بەمام جەلالم وتوە کمال ڕزگاری کردم.

دەروێش ئاغا وتـی: تەمـەنام ئـەکرد لـەخودا کەبێمـە سـلێمانی کمـال بەلێقەوماوی ببینم و فریای بکەووم لەبەر ئەوەی دوو جار منی لەکوشتن ڕزگار کردووە.

کاتێك بوومتە مـدیری سوقی مرکزی ڕۆژانە توشی کێشـە دەبـوو لەگـەلٚ چلکـاو خۆرەکـان و قاچـاخ چیـەکان و مخابـەرات وهـەوالگری سوپا(استخبارات العسکری).

لەڕۆژی ١٩٩١/٣/٧ لەکاتێکدا ئەچێتە مالّی کچێکی پوری چاوەڕوانی ئەوە ئەکات کە پ.م بێتە ناو-شار تاکو بیناسن.

چەکدار دێن بۆ گرتنی لـە ١٩٩١/٣/٨ خـاوەن مالّەکـە ئـەلّێت لـێرە نییـە، کمـال هـاوار ئـەکات ئـەلّێت مـن لـێرەم هیـچ لـەخۆم شـك نابـەم ئەیبەنـە دادگای شۆڕش، ماوەی چەند سەعاتێك لێکۆلّینەوەی لەگەلٚ ئەکەن هەموو پەیوەندیـەکانی خـۆی ئاشـکرا ئـەکات کەپـەیوەندی بەگروپـە سیاسـیەکان بەتایبـەتی ی.ن.ك و پ.د.ك، دوای ئـەوەی کـەهیچی لەسـەر نادۆزنـەوە تەسلیم بەجـەماوەری ئەکەن گولەیـەکی وێلّی لەپشـتەوە بـەر دەکـەوێ و دەکوژرێ.

**کام جەماوەر**

بەشی زۆری نیشتیمان پـەروەر تینـوی ئـازادی بـوون و (٧٠) سـالّە کـورد چـاوەڕوانی ئـەم هـەل و مەرجـەی ئـەکرد کـەڕزگاری بێـت بەتایبـەتی لەدەست بەعس و تاوانەکانی( بۆردومانی قەلادزێ و تەعریب و تـەبعیس و بۆردومـانی هەلّەبجە بەچەکی کیمیـاوی) بـەلاّم لەپـەنا جەماوەرەکـە خـەلّکی چلکاو خـۆرو دزو سـیخوڕ سـەربە ڕژێمـی بـەعس لەوانـە چـەند کەسانێك مانگانەیان لەدەست کمال وەرگرتووە.

**پرسیار:**

١.ئێوە لەخۆتانەوە ناوی خۆتان نابوو( دادگای شۆڕش) کەزانیتان هیچی لەسەر نییە بۆچی موجامەلەتان کرد..؟ ئینجا تەسلیم بەو جەماوەرە غەوغایەتان کرد..؟، ئەو ڕۆژەی کەمەسئولی دادگاکە چەکی پێ نەبایە بەدەست بەستراوی تەسلیم بەجەماوەر کرا بایە ئەویش هەمان دوا ڕۆژی ئەبوو.

٢.جەنابی سەرۆکی دادگای شۆڕش وەکو بەکوشتت دا ئەم کردەوە ناشرینەت لەگەڵ کرد،مردو کەمرد شەیتان دەستی لێ هەڵدەگرێت.

سەرتان بڕی ئەو مرۆڤە کە لەسوقی مرکزی جگەرەی نەدابویە باوەڕی نەکرتبوو جگەرەیەکی خستبوە ناو دەمی،ڕاستە برا خۆشەویستە ڕەحمەتی کمال نزیکترین برادەری گیانی بەگیانیم بوو لەهەمام کاتدا وەکو باوك لەگەڵی ئەجولامەوە، تاوانێکی زۆر گەورەیان لەگەڵ کردین بەم شێوەیە کوشتیان.. لەهەمان کات سوپاسی ئەو برا بەڕێزانەی دادگای شۆڕش و ئەو برایەی لەپشتەوە تەقەی لێ کرد، هیچ ڕق و کینەیەکم لێیان نەماوە سوپاسیان ئەکەم چونکە پارمەتییەکی زۆرتان دایین ئەگینا ئەگەر کمال نەکوژرایە ئێستاکە لەپاڵ گروپێکی سیاسی ئەبوو وەخەڵکێکی زۆری ئاشکرا ئەکرد لەوانەی لەژێرەوە پەیوەندیان بەرژێمی بەعسەوە هەبووە و زۆریان ئێستاکە لێپرسراوو کارمەندن، ئەمەش مەترسیەکی زۆر گەورە ئەبو منیش ئەوسا ئەبوایە لەگەڵ یەکێك لەم دوو هێزە دا بومایەو بە ناچاری بەشداری جەنگی برا کوژیم بکردایە وەگومانم نییە لەوەی کەئێستا کوژرا بووم و تەرمەکەم بۆگەنی ئەکرد لەسەر ( تەپکەی حەمەد ئاغا) دەرزام یا لە بندیخانەی ( شارۆچکەی عقرە یا لە دێیی شێنێ) وەئەبوایە ئەم هەموو ڕاستیانە کە لەلای منە لەگەڵ خۆم بمبردایەتە گڵەوە وەخودای گەورەش دەفەرموێ( وعسی ان تکرهوا شیئا وهو خیر لکم).

بەڵام ئێستاکە سەربەستم لەخودای مەزن بەزیاد بێت لەگەڵ هیچ

گروپێکی سیاسی دا نیم وەجێی دەستم دیارە وا کتێبی دووەم بلاو کرایەوە.

ئەوەی لەپشتەوە گولەی پێوە نا، هەولێکی زۆری دابوو کەئازادی کوڕی بکوژێت پڕو پاگندەیەکی زۆری لەسەر بلاو کردەوە دیار بوو زۆر دەست ڕۆشتو بوو چونکە دەنگ و باس وا بلاو بۆوە کە ئازادی کوڕی کەمال پشدەری بەسەیارەیەکی بەڕازیلی شەوان خەلك ئەکوژێ یا تەقە لەخەلك ئەکات.

لەهاوڕێکانی پرسیار بکەن بزانن ئازاد ڕەوشت و کردەوەی چۆن بووە لەگەلْ هاوڕێکانی لە قوتابخانەولەگەلْ دراوسێکانی، ئازاد لە ڕێکخراوەی بەعس نەبووەو ئێستاکە شۆفێرە لەشاری هەولێر. سوپاسی ئەو برا ئازیزانە ئەکەین کەیارمەتیان داین بەتایبەتی ئەم بەڕێزانە

کاك عمر عبدالله ( ملازم عمر)

کاك شێخ صلاح طالبانی

کاکە سوور

کاك رؤوفی زەرنگەر

کاك عمری مام ڕەزا

یارمەتی بازیانی برازای ڕەحمەتی ئەدەن بۆ هەلگرتنی تەرمەکەی.

کاك شێخ صلاح طالبانی خێزانی و منالەکانی ڕەحمەتیان بردەوە کویسنجاق.

کاك عزیز رحمان و کوڕەکانی یارمەتیان داین بۆ شۆردن.

**تێبینی**

دوای لێکۆلینەوەیەکی زۆر ڕاستیەکانم لەهەموو لایەك بۆ دەرکەوت گەڕامەوە هەولێر تاوانبارم هەوالەی خودا کرد و خوای گەورە ئەفەرموێ( ومن یتوکل علی الله فالله حسبه)..

**بلریه مامه صادق :**

خێزانی ئیسماعیل مام حمەد ناسراو بەئیسماعیل قصاب

پێنج کوڕو سێ کچی هەیە، کوڕەکانی جەلال و جبار و کاوە و ڕزگار و

بەختیار ، کچەکانی گەلاویژ و هێزەو بەناز.

جلال لەشەڕی عیراق و ئێران کوژرا، ماوەی چەند ساڵێك لەگەڵ خۆم پ.م بووە

کاوە لەناو شاری ڕانیە ئینزیباتێکی عسکری پانزە گولەی پێوە نا چونکە کاوە ویستویەتی چەکەکەی لێ بسێنێ

**فخریە مامە صادق:**

خێزانی رحمان مام صادق. چوار کوڕو سێ کچی هەیە، کوڕەکانی مریوان و کامەران و کەریم و بەهزاد، کچەکانی شلێرو نهایەت و بەختەوەر.

کامەران لەناوی ئاسکی کەڵەك خنکا، کوڕەکانی کەشی لەهەندەرانن.

باوکم ژنی دووەمی لەساڵی ١٩٣٦ هێناوە لەجولەکەکانی قەڵادزێ ناوی سمحە ناحوم بووە کە هاتە سەر ئاینی ئیسلامی ناویان نا عاصمە ناحوم، پێنج کوڕو دوو کچی هەیە کوڕەکانی حسن و حاجی و جمال قادر و نادرو کچەکانی نسرین و کوردستان.

خاڵێك و پورێکیان ماوون بەهۆی ئەوانەوە هەموو کوڕەکان چونە ئیسرائیل دوای چەند ساڵێك ئیسرائیل یان بەجێ هێشت چونە ئەوروپا وەکو بیستم حاجی و قادر هاتبونەوە قەڵادزێ سەر لەماڵە خەزورانیان بدەن، ئێستاکە حاجی و قادر لەسویدن، وەنسرین خانیش لەهەندەرانە.

**کوردستان مامە صادق:**

خێزانی کاك عبدالله حاجی احمد لەڕانیە ئەژین، مرۆڤێکی نیشتیمان پەروەر و دڵسۆز بوو بۆ ماڵ و منداڵەکانی.

ڕەفیق مامە صادق ناسراوم بەڕەفیق پشدەری:

جا حەز دەکەم کە کە پێناسەیەکی خۆمتان بۆ بکەم وەلەگەڵم دا بژین تاکو ئاگاداربن لەنزیکەوە کەچیم دیوە و چیم بەسەر هاتووە.

لەدایك بووی ساڵی ١٩٣١ وەلەشارۆچکەی قەڵادزێ پۆلی شەشم تەواو کردووە و پۆلی چوارو پێنجەمم لەلەقوتابخانەی فیصلیە لەشاری سلیمانی تەواو

کردوە کاتێك کەماڵمان چو بۆ سلێمانی بەڵام دوایی ماڵمان گەڕایەوە قەڵادزێ، باوکم هەمیشە هانی ئەدام کەشارەزای کەسابەت بم، لەساڵی ١٩٤٧ لەشاری قەڵادزێ مامۆستای تێکۆشەرو نیشتیمان پەروەر کاك حمە سووری مینە عەرەب هانی دام کەلایەنێك لەم دوو لایەنە سیاسیە هەڵبژێرم پارت و تەحەرور منیش زۆر بەباوەڕەوە پارت م هەڵبژارد وەلەدواییدا ئەم وشەیە گۆڕاو بو بە پارتی، لەتەمەنی ١٧ساڵیدا قەڵادزەم بەجێ هێشت چوومە شاری کەرکوك جەنابی بابکر ئاغای پشدەری نوسراوێکی بۆ یەکێك لەبەڕێوەبەرەکانی شەریکەی نەوت لەساڵی ١٩٥٢ دامەزرام بەپۆستە بەر لەنێوان شەریکەی نەوت و موتەصەریفیەتدا ( متصرفیە) وەمانگانە بە موچەی ١٦،٦٠٠ دینار دوای ساڵێك بووم بەکاتب دوایی وورده وورده موچەکەم زیادی کرد تاکو گەیشتە ٢٥،٦٠٠ دینار بووم بە( ملاحظ توزیع الأوراق) لەهەمان کات ئێواران لە قوتابخانەی خۆیەتی دەوامم ئەکرد تاکو ناوەندیم تەواو کرد فێری زمانی تورکی و ئینگلیزی بووم، لەقوتابخانەی شەریکەی نەوت ژمێریاری م( محاسبە) م تەواو کرد فێری ڕێك خستنی دەفتەری حسابات بووم بەشێوەی( بلانجو) وەهەروەها شارەزاییەکی تەواوم وەرگرت کەچۆن فایل ڕێك و پێك بکەم، بەڕێوەبەری پۆلیسی کۆمپانیای نەوت بە( شیوعی)یان لەقەڵەم دا بووم بۆیە ناچاریان کردم کەواز بهێنم، یەکسەر چومە بارەگای ڕۆژنامەی (الأهال)ی لەبەغدا چاوم کەوت بە بەمامۆستا[٢]

---

[٢] سیاسەتمداریەکی عیراق ناسراو، نیشتیمان پەروەر، لەحزبی نیشتیمانی دیموکراتی دا پلەی بەرزی بوو، هاوسەرەکەی کورد بوو لەبنەماڵەی زهاوی بوو، لەزەمانی مەلیکدا کرا بەوەزیری داد بەیانێکی دەرکرد هەموو ئەو بارزانیانەی کەژووری سێدارەدان دا بوون حوکمەکەی گۆڕین بەبەند کردن، کوردی زۆر خۆش ئەویست.

(حسین جمیل) پێم ڕاگەیاند کە کۆمپانیـای نـەوت بـەچ جۆرێك زیادە ڕەوی مـافی مرۆڤـی نەتوایـەتی گـەلی عـیراق ئەکـەن، ڕاسـتەو خـۆ پێیـان وتم ئێمـە دەربارەی کۆمپانیای نەوت هیچ باسێك بلاو ناکەینەوە.

لەبـەغدا جێنشین بـووم ١٢ شـوێنی بازرگـانیم گرتبـووە دەسـت کەڕۆژانـە لەسەر شێوەی بلانجو حساباتم بۆ ئەکردن، توانیم دوای سالێك سەرمایەیەکی بـاش کـۆ بکەمـەوە وەهـەر وەهـا کـاتێك لـەکۆمپانیـای نـەوت بـووم لەکـەرکوك هـەندێك پـارەی تـرم کۆکردبـۆوە، توانیـم لـە( شـارع النـهر) بـەناوی ڕەفیـق پشدەرییەوە لەخان یاسین خضـیری نوسـینگەیەکی بازرگـانی دابنێـم لەسـالی ١٩٥٦ ڕۆژ بـەڕۆژ بـارودۆخی ئـابوریم بـەرەو بـاش ئەڕۆیشـت، توانیـم دوای ماوەیەك لەدەرەوەی وولات سەعات و ڕادیۆ بە( استیراد) بهێنم.

ئەوە بوو کەخۆم گرت دایکم و کمال و ئـەمیرەو نـەزیرەم هێنایـە لای خـۆم بـۆ بـەغدا لـەپال کاسـپی یەکدا دەسـتم دایـە کوردایـەتی لـەکاتی حوکمـی مەلەکیەت ماوەی حەوت ڕۆژ گیرام، هاتمە گۆڕەپانی سیاسیەوە پـەیوەندی و دۆستایەتیم لەگەل خەلکێکی زۆری نیشتیمان پەروەر و سیاسەتمەداری کورد پـەیدا کـرد لـەم مامۆسـتا بەڕێزانـە سـودێکی گـەورەم وەرگـرت شـارەزاییم لـە سیاسەت پەیدا کرد تاکو ئـەهات ڕۆژ بـەڕۆژ مـن زانیـاریم وەرئـەگرت وەهـەر گوێگـر بـووم قـەرزداریانم وخـۆم بـەبچوك و قوتابیـان ئـەزانم هـەتا مـردن ئەویش ئەم بەڕێزانەن. (مەلا مصطفی بارزانی ، نـوری شاوەیس ، ئیـبراهیم احمد، عبدالرحمن زبیحـی، مسعود، محمـد، عمـر دەبابـە، سـعید قـزلی، جمـال نەبەز، ڕەفیق حلمی، حلمی علی شریف، مام جەلال، انـور جمیـل بـەگ جـاف، همزە عبدالله، هەژاری شاعیر).

دوای ٢٥ سال ڕۆژێك لەکۆڕێك قسەم ئەکرد مامۆسـتای مـەزنی ناسـراو کـاك مسعود محمد پرسیاری لێ کردم ئەمە چۆن چۆنی ئەزانیت کەباست کرد..؟

وتم : کاك مسعود کاتی خـۆی ڕۆژێـك لەمیوانخانـەی( تروکادیرۆ) لەبـەغدا بەڕێزتان ئەم قسەیەت کرد منیش نوسیمەوە لەبەرم کـرد، بـەم شێوەیە لـەم

بەڕێزانە شت فێر بووم، سوپاسی ئەو مامۆستا بەڕێزانە ئەکەم بۆ من گەورەترین و چاکترین پشت و پەنا بوون دوای پشتیوانی خودای مەزن.

ماڵمان لە(شارع مشجر) بوو گواستمانەوە بۆ (أعظمية شارع الضباط) .

لەساڵی ١٩٥٧ یەکەم ژنم هێنا کەناوی شیرین معروف رۆستم بابان بوو لەبنە ماڵەیەکی ناسراوی سلێمانی بووکاتێك کەپارتی دیموکراتی کوردستان بەسەرۆکایەتی بارزانی داوای لەزعیم کرد کە ڕێگایان پێ بدات بەشێوەیەکی ئاشکرا کاروباری حزبایەتی بکەن هاوسەرەکەم یەکێك بوو لەو ئافرەتانەی کەناویان لەلیستەکەدا بوو.

لەهەموو دیدارێکی زەعیم کە لەگەڵ ئافرەتانی کوردستان دا کۆبۆتەوە هاوسەرەکەم بەناوی پ.د.ك وە بەشدار بووە.

کاتێك کەشەڕ دەستی پێ کردفەرمانی گرتنی دەرچوو خۆی شاردبۆوە لەماڵی عبدالکریم الندی کەخزمێکی نزیکی احمد حسن بکر بوو.

توشی نەخۆشی ژێر پەنجە بوو لەساڵی ١٩٨١ لە١٠/١١/ ١٩٩٣کۆچی دوایی کرد تەرمەکەی لەگردی سەیوانە. دوو کورو کچێکم لێی هەیە بەناوی ( ڕوبارو بازیان و ڕەومز).

لەساڵەکانی حەفتا لەکوێت لەباڵیۆزخانەی عێراق لای باڵیۆز مدحت ابراهیم جمعە دانیشتبووم مرۆڤێك هاتە ژوورێ داوای لەمدحت کرد کە مقداری ١٠٠٠ دیناری کوێتی بداتێ، مدحت وتی ئەبێت بروسکەم بۆ بێت أبو طلال ئینجا ئەتوانم ، کەزانیم ئەمە عبد الکریم الندی یە.

وتم: پێویست ناکات من قەرزداری ئەم پیاوەم تەلەفونم لەگەڵ[4] عنایەت شکر علی کە بە ابو حیدر ناسراوە داوام لێ کرد کەهەر ئێستاکە مقداری ١٠٠٠

[4] لەکوێت بە بارزانی ناسراوە لەپەنجاکانەوە لەکوێت دەژی دەڵێت ئێمە جافین پیاوێکی ناسیاوو سەخی یە جێی خۆی کردۆتەوە وەحەزی لەخزمەتکردنی دەورو پشتەکەی زۆرە.

دیناری کوێتیم بۆ بهێنێت من لای جەنابی باڵیۆزم، کەپارەکەم دایە، وتی مـن ناتناسم.

وتم: کورد پیاوەتی لەبیر ناچێتەوە ئەگەر یەکێك چاکەی لەگەڵ بکات، مـن فلانم هاوسـەرەکەم کەشـیرین معـروف رۆسـتم بابانـە، کـاتی خـۆی بـەرێزتان یارمەتیتان داوە بۆ ئەوەی دەست گیر نەکرێت لە ماڵی ئێوە خۆی شاردۆتەوە.

مدحت وتی: ئەی ئەگەر یەکێك خراپەتان لەگەڵ بکات.

وتم: ئەگـەر دەسـەڵاتمان هـەبێت یەکسـەر چیمـان دەسـەڵات بێـت لەگـەڵی ئەکەین و ئەگەر هیچمان پێ نەکرا چاوەڕوانی دوا ڕۆژ ئەکەین چەنکە کورد ئەڵێ( تۆڵە بەسەبرە ئەما بەزەبرە).

جـارێك لەخزمـەت مـام جـەلال و هاوسـەرەکەی چوینـە کوێـت لەمیوانخانەی(فینیقیا) دابەزین لە ساڵەکانی حەفتا دا، مـام جـەلال فـەرموی برادەرێکـم هەیـە ملیـۆن لـێرە منیـش وتم برادەرێکـم هەیـە بەرامبـەر سەرمایەی ئەو برادەرەت ( مفلس لێرە) وەرە تاقییان بکەینەوە.

تەلەفونم کرد بۆ کابرای ملیون لێر دوای چاك و چۆنی ئاگادارم کـردن کـە لە(کوێت)م لەخزمەت مام جەلال و هاوسەرەکەی، وەڵامی دامەوە تەلـەفونیان بۆ ئەکەمەوە، منیش وتم مام جەلال ئەوە برادەرەکەی تۆ ئینجا تەلەفونم بۆ مـاڵی برادەرەکـەی خـۆم کـرد، پرسـیاری لێ کـردم، کەهۆی چیـە لەمیوانخانـە دابـەزیویت ئاگـادارم کـرد لەخزمـەت مامـەم دوای ئـەوەی شـوین و تەلـەفونی زانی دوای نیو سـەعات پرسـگای میوانخانەکە پێیـان ڕگـەیاندین کـەمیوانتان هاتووە چاوی پێتـان بکـەوێت دوای ئـەوە ڕوخسـەتم لـەمام جـەلال وەرگـرت ئینجا وتم بابینە سەرەوە، سێ کەس بوون خۆیی و کوڕەکەی حیدەر براکەی کاك عبداللە، زۆریان هەوڵدا کەبگوێزینەوە بـۆ مـاڵی ئـەوان، وتیـان ئـەوە دوو سەیارەشمان بۆ هێناوون لەخزمەتاندا بێت، میوانـداری کردیـن لـەماڵی خـۆی کاتێك چوینە ژورەوە بۆ نان خواردن هەرچی میوەیەك لە جیهاندا هەبوو وە لە عـیراق دەست نەدەکەوت ئـەو لەسـەر سفرەی نـان خواردنـی دای نـابوو،

منيش وتم ابو حيدەر بەميوه ئەتەوێ تێرمان بكەيت، وتی: ئەوه بخۆن دوايى نان بخۆن منيش وتم: نان دەخۆين دوايى ميوەكه دوەخۆين.

وتم: مام جلال ئەوه برادەرەكەی من ( دڵ حسابه)؟

هاوسەری دووەمم : ئێران فيض الله بيگى لەشارۆچكەی سەقز هاتۆتە دونياوه لەساڵی ١٩٥١ دبلۆمی هەيه لەرشتەی تەبيعی (سروشتی).

باوكی حاجی عبدالله خانی فيض الله بێگی سەرۆكی هۆزی فيض الله بێگی بووەسەرپەرشتی ٨٠٠ چەكداری دەكرد بەناوی هۆزی فيض الله بێگی لەكتێبەكەی ( مسعود بارزانی) دا (البارزانی والحركة التحررية الكردية _ ثورة بارزان ١٩٤٥ _ ١٩٥٨) ئيشارەت بەوه دەدات كه عبدالله خان بەناوی هۆزی فيض الله بێگی‌يەوه ٨٠٠ چەكداری لەگەڵ بووه.

دايكی خوشكەزای خوالێخۆش بوو قازی محمده سەرۆكی كۆماری مهاباد، دايكی پێشەوا كەناوی گەوهەر تاج خانم بووه( فيض الله بێگی بووه خزمێكی نزيكی دايك و باوكی هاوسەرەكەم بووه، وەخێزانی سيف القاضی فيض الله بێگی بووه خزمێكی نزيكی دايك و باوكی هاوسەرەكەمن).خاڵی سعيد خانی همابونی‌يەكە لێپرسراوی پاراستنی پێشەوا قازی محمد بووه دەستەی پارێزگاری ( قازی محمد) بوو، ولەهەمان كاتدا سكرتێريشی بووه.

دوای ڕوخانی كۆماری مهاباد يانزه كەس لەكەس و كاری هاوسەرەكەم لەسێداره دران لەنێوانياندا ( حسن خانی فيض الله بێگی) كەمامی خێزانم بووه و (علی بەگ يەك شەوه) مامی دايكی خێزانمه.باوكی حاجی عبدالله خان بەند كرا دوای ئازارو ئەشكەنجەيەكی زۆر ئينجا ئازاد كرا.

لەكاتی هاتوچۆ كردنم لەنێوان (ى.ن.ك و پ.د.ك) لەگەڵ ئەم بنەماڵە بەرێزه ناسياويم پەيدا كرد بەيارمەتی دكتۆر شيرازی و ئاغای حسن ڕۆشن فكر و هاوسەرەكەی كارەكه زۆر ئاسان بوو بەڵام لەكاتی ماره كردن دا( اطلاعات) ئاسايشی شارۆچكەی سەقز برديانم لەو كاتەدا كه خەڵكێكی زۆر لەپياوه ناسراوەكانی كوردستانی ڕۆژ هەڵات ئاماده بوون بەم بۆنەيەوه لەپرا

وتیان ئێمه ڕازی نیین ،واته (این ازدواجی سیاسی نەمیشی) .ڕێگایان نەدا مەلا مارەی بکات بەنائومێدی ویستمان بگەڕێینەوه تاران، لەکاتێکدا هاتینه (تێرمینالْ _ گەراج) تەشریفی حاجی عبدالله خان و ئێران خان لەپڕا دەرکەوت تاکو بەریمان بکەن بەڕێز حاجی عبدالله خان فەرموی هەتاکو من لەژیاندا مابم دەسەڵات بەدەست خۆمه خودای مەزن بیەوێت کارێك ئەنجام بدات کەس ناتوانێت بەرامبەری ڕابوەستێت، ئێمه انشاءالله دوای حەوت ڕۆژی که دێینه خزمەتان لەتەهران.

من و بازیانی کورم بەرامبەر ئەم پیاوه بەڕێزه قسەمان بۆ نەدەهات بازیانی کورم سوپاسی یەزدانی مەزنی کرد کەئێمەی نەناسراوو ئەم پیاوه گەورەو ناسراوه هەڵەوێستی بوو، لەگەڵْ ئەوەشدا ئێران خواردنی خۆشی بۆ ئامادە کردین بیبەین بۆ ڕێگا.

لەڕۆژی ١٩٨٧/١١/٤ لەسەر مزهەبی شافعی مارە کرا بەبێ ئاگاداری کۆماری ئیسلامی سوپاس بۆ یەزدانی مەزن خۆم بە بەختەوەر ئەزانم لەگەڵْ ئەم بەڕێزەدا ڕۆژگار دەبەمه سەر هەرچەنده توشی ئازارو ئەشکەنجەیەکی زۆر بویین ئەویش داستانێکه لەکتێبی سێیەمم بەدوور و درێژی باسی ئەکەم.

دایکی بازیان لەژیاندا مابوو کاتێك بازیان و ڕەوەز لەگەڵْ دایکیان کێشەیان دەبوو دەهاتنه هەولێر پەنایان ئەهێنا بۆلای (ئێران خان) بۆ ئەوەی چارەسەری کێشەکەیان بکات، پێش کۆچی دوایی دایکی بازیان بەچەند مانگێك ئێران خان ڕۆیشته سلێمانی دایکی بازیانی هێنایه هەولێر ماوەی ١٧ ڕۆژ خزمەتی کرد.

خۆم چەند خەڵکم ئەناسی بەهۆی ئەوەوه هەزار ئەوەنده خەڵکم ناسی و شانازی بەماڵه خەزورەکانم ئەکەم، دوعای خێرم ئەوەیه هەموو مرۆڤێك بەم شێوەیه بەختەوەر بێت.

فیض الله بێگی هۆزێکی ناسراون لەسەران سەری کوردستانی ڕۆژ هەڵاتدا، تیرەیەکن لەفەقێ ئەحمەدی دارەشمانە. لەپێناوی ئازادی و سەر بەخۆیی

کوردستان گیانی خۆیان بەخت کردوە لەپێناوی کوردستان لەسەر ئەم هۆزە چەند کتێب نوسراوەتەوە.

## پەیوەندیم لەگەڵ بنەماڵەی بارزان:

لە( اعظمیة) دراوسێی پێنج ماڵی کورد بویین یەکێکیان ماڵی (مەلا مصطفی بارزانی) بوو ماڵەکەیان بەناوی ماڵی عبید الله ناو ئەبرا.

لەگەڵ دایکم و هاوسەرەکەم چوینە ماڵی جەنابی عبید الله بارزانی سەردانمان کردن، هاتو چومان ڕۆژ بەڕۆژ زۆرتر ئەبوو دایکم زوو زوو سەری لێ ئەدان ئەی وت کورم بەداخەوە هەندێك لەئافرەتەکان باش لەقسەیان تێ ناگەم بەڵام وا خەریکە لەگەڵ زمانەکەیان ڕادێم کاتێك لەگەڵیان دائەنیشم خۆمم لەبیر ئەچێتەوە ئەوەندە ڕێك و پێکن بەرزن لەهەموو ڕویەکەوە وەکو خۆیان ئەیان وت میری موچەی کەناسیمان ئەدمنێ خودا چۆن بەوە ڕازیە، ئەو ماوەیە بارودۆخی ئابوریان زۆر خراپ بوو، لەپەنا عبید الله دا دۆستایەتی و برایەتیم لەگەڵ شێخ صادق و شێخ محمد خالد و لوقمان پەیدا کرد وای لێ هات نزیکترین برادەریی عبیدالله من بووم ا ئیدریس و صابر برادەری کمالی برام بوون، چەند جار سەردانی شێخ ئەحمەدی بارزانیم کرد لەبەندیخانەی بصرە، سەردانی ئەو قەتابخانەم کرد لە اعظمیة کە ئیدریس و مسعود و صابر تیایدا قوتابی بون. بەڕێوە بەری قوتابخانەکە وتی: زیرەکترین و بەڕەوشت و جوانترین قوتابی ئەمانەن کەتۆ هاتوییت پرسیاریان لێ ئەکەی تکا دەکەم ئاگاداریان بکە ئەوان چاویان لە ئێمە بێت، ڕاستی دڵ خۆش بووم کە کوڕانی سەرۆك مصطفی بارزانی ئەم ڕێزەیان هەیە لەقوتابخانەکە.

دوو جار سەردانی بەڕێوەبەرەکەیانم کردووە جارێکیان لەگەڵ کاك بورهان جاف چویین بۆلایان،لەجەژنێکی تردا سەردانی شێخ ئەحمەد و شێخ لەتیفم کرد لەبەندیخانەی بصرە، باسی خۆراگری و لەسەرخۆیی ئەم پیاوە مەزنەی

بۆ کردم کە بەجۆرێك هەموو بەندەکان ڕێزی لیّ دەگرن کە شێخ ئەحمەد نمونەی خۆراگری، لەهەموو میوانداریەك دا من ئەمکرد ئەبوایە عبید الله وصادق و لقمان بەشدار بونایە، زوو زوو سەرادنی خولەی حمەی لەیلیّ مان ئەکرد بەڕێوەبەری دارای میوانخانەی (ریجینت) وەمانگی زیاتر لە دە جار میوانداری تایبەتی ئەکرد بۆیان وەهەروەها ئەوەندەی من لەنزیکەوە ئاگادار بووم بەڕێز عبید الله خۆی بۆی باس ئەکردم جەنابی کاکە زیاد ئاغاو ڕەسولی حسن ئاغای پشدەری و خولەی حمەی لەیلی بیّ ئەندازە خزمەتی عبید الله یان ئەکرد.

عبید الله و شێخ صادق و لوقمان زۆر زۆر خۆڕاگر بوون ئەم جۆرە ژیانە سەختەیان پێوە دیار نەبوو بەڵام دڵی خۆیان بۆ من ئەکردەوە و گلەیی خۆیان دەردەبڕی بەرامبەر چەند کوردێکی دەوڵەمەند و ناسراو ئەو کاتە ئاگاداری کاکە خولەی حەمەی لەیلیم کرد کە عبید الله زۆر بیّ تاقەتە داوای ئاهەنگێك ئەکات حەز ئەکەم کۆڕێکی دانیشتن و گۆرانی ساز بکەین لەماڵی ئێمە، ئاهەنگێکمان پێك هێنا کەئەم بەڕێزانە بانگ هێشت کرد کاکە زیاد ئاغاو و عبید الله و شێخ صادق و لوقمان و خولەی حمەی لەیلی و عەونی یوسف ، بەهۆی کاکە خولەو رەشۆل عبدالله و طاهر تۆفیق رەسول گەردی و حسن زیرەك ئامادەبوون، بۆ ئەم ئاهەنگە لەژنان هاوسەرەکەم لەگەڵ دکتۆرە نزیهە دلیمی و صبیحە جبوری، بەڵام ئەوان لەژورێکی تایبەتی دانیشتبوون.

## شۆڕشی ١٤ تەموزی ١٩٥٨ پیرۆز:

بەسەرۆکایەتی زەعیم عبدالکریم قاسم ئەنجام درا گەورەترین ڕوداو بوو لەمێژووی عیراق ئەوانەی کە سەر بە بنەماڵەی پادشا بوون توشی ئازارو ئەشکەنجە بوون، لەڕۆژانی یەکەمی شۆڕشی ١٤ تەموزی موبارەك لەگەڵ عبید الله دا پیاسەمان ئەکرد تەماشامان کرد لەگەرەکی خۆمان ئاگریان لەتەرمەکەی صباح نوری سعید بەردابوو قرچە قرچی گۆشتی ئەهات

کابرایەك وتی: ئەمە تەرمی ناوبراو نییەو دەیگوت ئەمە تەرمی مسئولێکی نۆردونیە بەناوی بەناوی( توفان)، لەم جۆرە ڕوداوانە زۆری وا هەبوو بەڵکو گەلێك لەمە زیاتر ئەهاتە بەر چاو پێم جوان نییە باسی تەرمەکانی تر بکەم بەڕاستی دیاردەیەکی زۆر ناشرینە، مرۆڤ دوای کوشتنی ئەم جۆرە ڕەفتارەی لەگەڵ بکرێت بەداخەوە لام یەقینە ئەمە پیشەی باوو باپیرانمان نەبووە بەڵکو دەستێکی تاوانە وە پێویستە لەبنا ببڕدرێت چونکە لای هەموو کەسێك ئاشکرایە ئەگەر خاوەن دکتۆرا بی و لەسەر تەختی پادشایی وە بێ ڕۆشنبیری بی خۆڕاییە وەکو شاعیر دەڵێ، هەموو خوێندەوارێك ڕۆشنبیر نییە بەڵام هەموو ڕۆشنبیرێك خوێندەوارە.

**تێبینی:**

(ئێمەی کورد لەڕاپەڕینە مەزنەکەدا زۆر لەوە ناشرینترمان ئەنجام ئەدا هەندێك مرۆڤ هەیە دەرونی نەخۆشە و حەز بەئەتك کردنی بەرامبەرەکەی ئەکات لەتۆڵە کردنەوەدا دوای مردنی مرۆڤەکە یاری بە لاشەکەی دەکەن یان دوای تالان کردنی ماڵەکەی ئەوەی بۆی ناچێت تێك و پێکی ئەشکێنێ، دوای گرتنی کەرکوك ماڵی علی حسن مجید تالان ئەکرا کابرایەك لەتراکتۆرو ئۆتومبیلەکەیدا جێ نامێنێ هیچیکەی تێ بکات دەست ئەکات بەشکاندنی کەل و پەلی ماڵی علی حسن مجید پێی ئەڵێن لە تراکتۆرەکەتدا جێ نەماوە شتی تر بەریت ئەوانەی ماوە بۆ ئەیانشکێنیت..؟ لەوەڵامدا ئەڵێت چونکە قینم لێیەتی).

بۆ پیرۆزبایی لەزعیم دەربارەی ئەم سەرکەوتنە مەزنەی بەدەستی هێنا لەهەموو شارۆچکەیەکی کوردستان چەند کەسانێك بەنوێنەر هەڵبژێردرا لەگەڵ کوردی بەغدا ژمارەیان گەیشتە ٥٠٠ کەس زیاتر چوینە وەزارەتی بەرگری ئەو بەرو ئەو بەری شەقامی ڕەشید دەستیان کرد بەچەپڵە لێدان هاواریان ئەکرد وەئەیان وت (بژی برایەتی کوردوعەرەب) کاتێك لەدەرگای سەرەکی وەزارەتی بەرگری چوینە ژورێ گەیشتینە باڵەخانەکە چوینە ناوەوە

زەعیم هاتە خوارێ ئەوەندەم سەرنج دایە وێنە کێش نیم هەر چەندە ٤١ ساڵ بەسەر ئەم ڕووداوە ڕۆیشتەوە و بەڕوی نوێنەرانی کوردستان پێشوازی لێ کردین ماموستای مەزن و تێکۆشەر ابراهیم احمد وتارێکی بەنرخی خوێندەوە بەناوی گەلی کورد پیرۆزبایی لەزەعیم کرد خۆشحاڵی کوردی پێ ڕاگەیاند کە گەلی عیراقی ڕزگار کرد لەستەم و زۆرداری و کۆنە پەرستی پادشایی بەتایبەتی گەلی کورد، وەهەروەها ماموستا ابراهیم فەرموی کەئێمەش ئومیدەوارین شان بەشانی ئێوە مافمان پارێزراو بێ و وەمن بەڵێنی گەلی کوردستانت پێ ڕائەگەیەنم وەئامادەین پشتگیری لەشۆڕشی ١٤ تەموز بەسەرۆکایەتی زەعیم بکەین.

لەدوایدا زەعیم بەگەرمەوە پێشوازی لێ کردین سوپاسی نوێنەرانی کوردستانی کرد وەبەڵێنی دا کەمافی میللەت بپارێزرێت بەتایبەتی گەلی کورد.

ئەم ڕوداوەی کە ئەو ڕۆژە یەکەم جار بوو لەمێژووی کوردا بەو ئاشکرایە نوێنەرانی کورد ڕوو بکەنە وەزارەتی بەرگری، هەرچەندە ووشەکانی ماموستا ابراهیم احمد زۆر زۆر بەنرخ بوو ئەوەندە باسی کراوە نەم نووسیوە.

شۆڕشی ١٤ تەموزی ١٩٥٨ بەهەزاران کتێب و نامیلکەو ڕۆژنامەو هۆنراوەی لەسەر بلاو کراوەتەوە گەلی کورد لەعیراق هاتە ناو ناوانەوە بۆ یەکەم جار بوو دوای ڕوخانی کۆماری مهاباد بەم شێوەیە باسی کورد لەلایەن جیهانەوە، ببیسترێت عقید ماجد محمد امین چەند وتەیەکی بەنرخی فەرموو وتی کوردو عەرەب هاوبەشن لەم نیشتیمانەدا ئەم وتەیە هۆکارێ بوو بۆ خۆشی و شادی خستنە ناو دڵی هەموو کوردێکەوە لەسەنسەری کوردستاندا وا بیر دەکرایەوە کەمەسئەلەی کورد چۆتە (محافیلی سیاسی) یەوە

لەدوای شۆڕشی ١٤ تەموزی ١٩٥٨ گۆڕانکاریەکی سیاسی بەسەر بارودۆخی خۆم داهات ماڵی من بوو بەبارەگایەکی ئاشکراو جێی کۆبونەوە بوو ئەمە لەسەرەتای هاتنی شۆڕش، دانیشتوانی گەڕەك وایان دەزانی مۆری کوردایەتی

لای منەو لەماڵەوەمان دایە.

لەو گەڕەکـەی لێـی بـووم لەسـاڵی ١٩٥٦ پێنـج خـێزانی کـورد بویـین بـەماڵی عبید الله وە، ئێوارانی پێنج شەمە ئەچووینە پشـت (سـەدە) بەیەکـەوە کاتمان ئەبردە سەر، بەڵام دوای وتەکەی ماجد محمد امین و دۆستایەتی زەعیم بڵاو کرایـەوە کـە کـوردو عـەرەب هاوبەشـن لـەم نیشـتیمانەدا لـەو ٨٦ ماڵـەی لەگەڕەکەدا بوون (٤٢) یـان هاتنـە لام و ئـەیان وت ئێمـە رەچەڵەکمان کوردە بەڵام ماوەی (١٥٠-٢٠٠) ساڵێك ئەبێت ئێمە هاتوینەتە بەغداد.

ڕۆژێـك لەخزمـەت جـەنابی کـاك[٥] حسـینی سـید احمـدی خانـەقا دا بـووم جەنابی کـاك حـاکم عبـدالله سـعید کەسـەرۆکی دادگـای کـەرکوك بـوو بەسـەر قسەکانم داهات.

عبدالله سعید: فەرموی ئێمە چوار قوتابی بویـین لـەپۆلی یەکـەم لـەکۆلێژی یاسا ڕۆژێکیان مامۆستایەکی ئینگلـیز هاتـە سـەرمان وتـی: حکومـەتی( تـاجی بریطانی) داوای لەحکومەتی عیراق کردووە کەحوکمی زاتـی بـدەن بـە کـورد وابزانم لە ناو ئێوەدا چەند کوردێك هەیەو لە کاتی دان پێانـانی ئـەم بڕیـارە پێویسـتان بـە خوێنـدەوارێکـی زۆر ئـەبێت تـاکو دامـەزرێن بـە بـاش کـاتب ومدیری ناحیە وقائمقام، هەر قسەکەی تەواو کـرد ٥٥٪ قوتابیـەکان هەڵسانە سەرپێ وتییان ئێمە کوردین، بە کورد دەرچوون لەکاتێکدا پێش ئـەم قسـەیە چوارمان کورد بویین (عارف چاوك ومعروف جاروك وعبدالله سعید...)

کاك حسن -وتی: کـورم رەفیـق لـە ٣٥٪ دا دانیشـتوانی عـێراق کـوردن بـەڵام لەیەکەم ڕۆژی دامەزراندنی عێراقەوە ئەگەر بتوتایـە کـوردم توشـی زیـانێکی گەورە ئەبویت، ئەوانەی ئەڵین ئێمە تورکمـانین ٩٠٪یـان بەرەچەلـەك کـوردن لەبەر بەرژەوەندی خۆی خـۆی دەکـات بـە عـەرەب یـان تورکمـان مـادام کـورد

---

[٥] خوێنەری بەڕێز ئاگادار ئەکەمەوە کورتە باسێکم لەسەر بنەماڵەی (سید ئەحمەدی خانەقا) نوسیوە لەکۆتایی ئەم کتێبەدا.

کیانی سیاسی نی‌یه رۆژ بەرۆژ لەکەمی ئەدات لە هەمان کات رۆژ لە دوای رۆژ بیروباوەڕی نەتەوایەتی روو لە زیادی ئەبێت فیداکاری زۆرتر ئەبێت؟

## لە یەکەم رۆژی شۆڕشی ١٤ تەموز.

باس لە گەڕانەوەی بارزانی دەست ودایرەکەی دەکرا بەڵام زۆری پێ چوو هەر بە قسە دەمان بیست و هاتنەوەکەی دوا ئەخرا لەبەر زۆر هۆ چونکە عەرەبە شوفینێەکان بە ئاشکرا پێیان نیشان ئەدا کە گەڕانەوە خەترناکە حکومەتی تورکیاش بە ئاشکرا نارەزایی خۆی دەربریبوو بەرامبەر گەڕانەوەی لەهەمان کاتدا هەلو مەرجی ئەو رۆژە زور پێویستی بە شخصی بارزانی بووە لە گۆرەپانەکەدا زەعیم لە دواییدا بڕیاری گەڕانەوەی بۆ دەرکرد ئەوە بوو مامۆستا ابراهیم احمد وکاك نوری احمد طه، شێخ صادق، عبیدالله سەفەریان کرد بۆ رۆمانیا بەو نیازەی پێشوازی لێ بکەن ولەگەڵی بگەرێنەوە بۆ عێراق.

مصطفی بارزانی لە ساڵی (١٩٥٩) گەڕایەوە یەکەم جار لە میوانخانەی خەیام دابەزی چەند ساڵبوو بیرم لەوە دەکردەوە تۆ بڵێی رۆژێك بێت چاوم بەم زاتە گەورەیە بکەوێت بەڵام زۆری پێ نەچوو خەوەکە بوو بە ڕاست وبەرامبەر سەرۆکی گەل ونیشتمان ڕاوەستام ودەستم خستە ناو دەستە پیرۆزەکانی یەوە هەزار ملیون جار سوپاسی یەزدانی مەزنم کرد کە نەمردم روو بە روو چاوم پێی کەوت بە جۆرێك دڵشاد بووم زمانم نەبوو کە بڵێم من کێم.

جەنابی شێخ صادق بارزانی هاتە بەردەمی بارزانی وتی (ئەمە رەفیق پشدەری کە بومان باسکردبوییت) ئینجا بارزانی زۆر بە گەرمەوە بە خێر هاتنی کردم وفەرموی (دانیشە) لە خۆشیان قسەم بۆ نەدەکرا دوای ماوەیەك هستام بڕۆم فەرموی دانیشە، روی کردە صابری کوڕی، ووتی:

کاتێ پشوودانی تۆ هاتووە بڕۆ بخەوە، دیسان منیش هەڵسام بەرەو ماڵەوە بڕوم، بارزانی فەرموی مەڕو لەگەڵ ئێمە نان بخۆ کە روانیمەوە سفرەی نان

خواردن ئەم پیاوانەی خوارەوە دانیشتبون باشم لـە بـیره (مصطفـی بـارزانی) ولەگەڵ ١٢ دوانزه کەس بەیەکەوه نانمان خوارد لەوانەی لە بیرمه (بابه علیو ابراهیم ئەحمەد ومام جەلال وحـاکم جەوهـەر دزەئـی وبکـر ئاغـای حویـزی، نوری احمد، وحید بامرنی و عزیز وطه بامرنی وصالح مـیران وشـێخ صادق، بەشێکی تریش بەجیا نانیان ئەخوارد.

لـە خوشـیان نــەم دەزانــی چــۆن خواردنەکـە بخــۆم هــەر تەماشـای ئــەم شورشـگێرەم دەکــرد، کــاك جەوهــەر دزەئــی خــوێ و بــەهاراتی کــرده نـــاو شورباکەوه.

بارزانی -وتی: دەتۆ جارێ کەوچکێکی لێ بخۆ، بۆ ئەوەی بزانی بـێ خوێیـه، یان نا ئینجا خوێی تێ بکه به چـاو تەماشـام ئـەکرد بـه گـوێ گوێیـم ئـەگرت بزانم چ دەفەرموییت.

شـەو دەرنـگ داهـات خـودا حـافیزیم لێ کـردن، شـێخ صـادق -وتــی بــەیانی تۆزێك زۆر زوو وەره کارمان ئەبێ.

گەڕامەوه ماڵەوه به دورو درێژی بۆ دایکم وهاوسەرەکەم گێرایەوه.

دایکم -وتی: کوڕم ئەمه ئاشکرایه عبیدالله وشـێخ صادق باسی تۆیـان بـۆ کردوه، که چیت بۆ کردون بۆیه بەم جۆره پێشوازی لێ کردوییت.

بۆ بەیانی چومـه خزمـەتی لەبـەر بچوکـی میوانخانکـەو نـەبوونی باخچـەو گۆڕەپان گواستمانەوه بۆ میوانخانەی سمیرامیس لـه (سـنك) لەگـەڵ کـاك مـیر حاج کەل وپەل و جانتاکانی بارزانیمان گواسـتەوه. بـارزانی سـەردانی زەعیـم قاسـم ی کـرد بـه گەرمـــەوه پێشـوازیان لێ کـرد لەهــەمو رۆژنامــه وگۆڤــارو ئێزگەیـەکدا وتەکەی بـارزانی بڵاوکرایــەوه کــه فــەرموی مــن (سـەربازێکی زەعیم)م، ئەمەی هەمیشه لەسەر زمان (بوو) له هـەموو وتوێژێکـی دا. بـەڵام به گشتی جەماوەری کورد ئەوەی لاپەسەند نەبو که چۆن ئەبیت بارزانی ئەم دەستەواژەیه بەکاریهێنێت من سەربازم.

لەسەرەتاوه ئەو پەڕی متمانەو دوستایەتی دروست بـوو لـه نێـوان بـارزانی

وعبد الكريم قاسم.

بەشی زۆری رۆژگار لە خزمەتی بارزانی دابووم وەك ئینزبات وكاروباری تایبەتی پێئەسپاردم ڕۆژێك لەگەڵ دایكم وهاوسەرەكەم چوینە خزمەتی. بارزانی فەرموی:

(دایكی رەفیق زۆر خزمەتی منالی ئێمەتان كردوە زۆریان بۆ باس كردوم ئەمەم لە بیرناچێتەوە).

دایكم ولامی دایەوە: (گەورەم بارزانی حەزدەكەم. نانێكمان لەگەڵ بخۆیت).

بارزانی فەرموی ڕۆژێك دێم، لەپر ڕۆژێك هات ئەو ڕۆژەی كە هات چێشتی ساوەرمان هەبو.

دوای ئەوەی ماوەی ٤٥ ڕۆژ لە میوانخانەی سمیرامیس بوو فەرموی لەگەڵ خاوەنەكەی حساب بكە، هەموی گەیشتە ١٤٧٠دینار لەگەڵ حسابی قەدری جان كە شاعیرێكی كوردی سوری ناسرابوو.

بارزانی فەرموی وەرە حساب بكەین، دوای ئەوەی مەسرەفی ئەو ماوەیەی مابووەوە بۆم دەركرد لەو پارەیەی كە وەزارەتی مالیە بویان ناردبوو كە برەكەی (٥٠٠٠) دیناری عێراقی بوو تەنها ٥٣٠ دیناری پێ مابوو.

لە دوای ئەم حسابە هەندێك پارەی تری هەبوو دایمێ وفەرموی ئەم پارانەم بۆ بگۆرەوە بە دیناری عێراقی چوومە لای ئەوانەی پارە دەگۆڕنەوە وەكو خۆی بۆم هێنایەوە وتم ئەم تومەنانە كاتی بەسەر چووە هی زەمانی شایەو ئێستا نایگۆڕنەوەو بەتاڵ بۆتەوە، ئینجا فەرموی جانتاكان با بگوازینەوە نانی نیوەڕوش لێرە ناخۆین هەر چەندە پارەشمان داوە چونكی ئەگەر هیچیكە بمێنینەوە لێرە ئەبێ ئەو پارەیەی پێمان ماوە ئەویش بدەینە خاوەنی میوانخانەكە. گواستمانەوە بۆ خانوی خوالێخۆشبو نوری سعید بەرامبەر ئیستگە لە گەركی صالحیە خانویەكی چوڵ وهۆل بوو هیچی تیادانەبوو، یەك سەر دەستمام كرد بەشت كرین لەگەڵ زەعیم علی برای شەهید عزت عزیز هەندێك شتمان كڕی بەشی زۆری بە دیاری هات ئەو كاتە بە پێچەوانەی ئێستا بوو (حزب فقیر بوو میللەت دەولەمەند بوو).

-بەم شێوەیە بارزانی باوەڕی بەمن هەبو بەو پاساوانە بارزانییانەی ڕاگەیاند بوو کە پاسەوانی یان دەکرد رەفیق بۆی هەیە هەمو کات بێتە لام بێ پرس.

-پیاوێکی ئاسوری هەبوو بارزانی خۆشی دەویست وە بە پیاوێکی ڕاست گۆو کەسایەتییەکی زیرەك وقسە زان ودڵسوز ناسراو بوو لەلای برا ئاسوریەکان، هەروەها لە لای بارزانیش ڕێزیکی تایبەتی هەبوو تەنانەت ئەو پیاوە یەکەمین کەس بوو لە دوای گەڕانەوەی بۆ بەغدا سەردانی کرد وەیەکەمین کەس بوو کە بارزانی قبوڵی کرد کە لە ماڵەکەی دەعوەت بێت ونان بخوات لەوێ لە بەغدا ئەم پیاوەش کە مطرانی حریر بوو، ناویشی (ماریوسف حنا ئیشو).

-جاریکیان بە فەرمانی بارزانی لەگەڵ مطرانی حریری دا چوینە وەزراتی بەرگری چاومان بە(عقید وصفی طاهر) کەوت کە سکرتێری زەعیم بوو ئاگادارم کرد لەوەی کە بارزانی رای سپاردووم کە جەنابی مطران ئەیەوێت لەگەڵ زەعیم کۆ بێتەوە بۆ ئەوەی زەعیم ڕێگا چارەیەك بۆ کێشەی ئاسوریەکان بدۆزێتەوە.

کاتێك عقید وصفی طاهر هاتە دەرەوە لەلای زەعیم ئیشارەتێکی بۆ من کرد چومە پێشەوە بۆ لای پێ ڕاگەیاندم زەعیم ئەیەوەێت چاوی بە تۆ بکەوێت بە تەنها، ئەمە دووهەم جارە بەرامبەر ئەم شۆڕشگێرە ڕاوەستم قسەم بۆنەدەکرا لە خۆشیان دا وام بیرئەکردەوە کە گەلی عێراقی هەمووی ئەبێت دوعا بۆ ئەم پیاوە مەزنە بکەن وەکو ئێمەی کوردی ڕزگار کرد خودای مەزن بپارێزیت.

زەعیم فەرموی:

سلاوم بگەیەنە بە بارزانی ڕێزم هەیە بۆی مرۆڤێکی نیشتمان پەروەرە ژیانی خۆی بەخت کردوە لە پێناوی گەلی کورددا هەمو لایەکمان ماڵ وێرانی دەستی ئیستعمارین بە کوردو عەرەب. ئێستاکە مصطفی بارزانی دیەوێ

گەرمکی (دورە) بکاتە بنەکەیەکی ئینگلیز تاکو لە کاتی پێویست ئابلوقەی بەغدا بدەن والله هەتاکو لەسەر ئەم مێزەبم ئەم بریارە نادەم.

کە لە خزمەتی زەعیم هاتمە دەرێ ئاگاداری جەنابی مطرانی حریرم کرد کە زەعیم لەم بارەیەوە گفتوگۆ لەگەڵ شخصی بارزانی ئەکات، لەبەر چاوی جەنابی مطران بە هەمان شێوە بۆ بارزانیم باس کرد.

بەڵام دوای رۆیشتنی دوو بە دوو بە دورو درێژی دەقی قسەکانی زەعیمم بۆ جەنابی بارزانی گێرایەوە، کە زەعیم رای چەند خراپە بەرامبەر برا ئاسوریەکان.

بارزانی فەرموی رەفیق شارەزاییت پەیدا کردوە، بەڵام من زۆر قەرزداری برا ئاسورییەکانم هەرچییان بۆ بکەم کەمە زەعیم کەیفی خۆیەتی چۆون تەماشای مەسەلەکە ئەکات، ئایا ئەمەی کورد چ تاوانێکە بەرژەوەندی خۆمان هەبێت؟

بەداخەوە زەعیم ئێستا لە خەوە دورو درێژەکەدایە و دانیشتوانی _دورە) لە ٨٥٪ برا ئاسوریەکان ئەویش بە عقلێکی تەسکەوە دەی روانیە مسەلەی جێگیربونی ئاسوریەکان لە (دورە لە بەغداد)

لە قاعەی مەلیك فیصل لە باب المعظم لە ساڵی ١٩٥٩ بە بۆنەی گەڕانەوەی جەنابی بارزانی بۆ نیشتمان ئاهەنگێك سازکرا بە ناوی قوتابیانی کورد لە بەغدا لە هۆڵی پاشاه فیصل.

ئەمە یەکەم جارە پارتێکی سیاسی کورد بەم شێوە ئاشکرایە ئاهەنگێك ساز بکات وە بۆ یەکەم جاریشە بەم شێوەیەش حکومەتی مرکزی بەغدا بەشدار بێت شان بە شانی شورشگێرانی کورد. رۆژێك پێش دەست پێکردنی ئاهەنگەکە ئەوانەی بەشدار بوون هەر یەکە جێگای خۆی بۆ دیاری کرا نزیکەی ٤٠ قوتابی لە قوتابیەکانی دانیشگا دانرا بوون بۆ خزمەت کردن لە ئاهەنگەکەدا کە ٢٠ لەوانەی کیژ بوون، بەندەی بچوکتان مەسئولی تەشریفات و رێك خستن و دابەش کردنی خواردن بووم لەگەڵ ئەو ٤٠ قوتابیانەدا،

هەروەها ئەندامانی سەرکردایەتیش هەر یەکە بە ئیشێك هەلدەسا لەو ڕۆژە.

ژمارەی میوانە ئازیزەکان لـە ٧٠٠ کـەس زیـاتر بـوون، لەوانـە نۆێنـەری تایبەتی زەعیم وحزبی شیوعی و حزبی وتەنی دیموکراسی (کمال چادرچی) وئەنـدامانی دادگای شۆڕش، ئەم بەڕێزانە جەنابی مهداوی وکاك فـەتاح شـالی، دلسۆزی کـورد مـاجد امـین بالیوزەکـانی بالیوزخانـەی ئیشـتراکی، حکومەتـە عەرەبیـەکان وسیاسـەتمدارانی کـورد عـەرەب وشـاعیری عـێراقی بـە ناوبـانگ ودۆستی کورد محەمەد مهدی جواهری.

بەهۆی گۆرانی و هەلپەرکێ ودەنگی دەهۆل زورنا هۆلەکەش کەوتە خۆشیو شادی میوانە ئازیزەکان هەریەکە لە راست خۆیەوە سەرنجی ڕاکێشام کـە ئـەم پروگرامە بەم شێوە رێك و پێکە پێشکەش ئـەکرێت ئـەم کیـژە جوانانـە بـەم جلە سورو زەردە وسەوزە جل و بەرگی کـوردی رەسـەن پـەزیرایی ئەکـەن لـە دابـەش کردنـی خـواردن و خوارنـەوی (بیبیسـی) وەرگـێرانی کـوردی بـۆ عەرەبیو ئینگلیزی.

شاعیری بە ناوبانگی کورد مامۆستا هـەژار هاتـە سـەر شـانۆ شـعرێکی کـەی ئامـادە کـرد بـوو کـە ئـەویش ئـەوە نـەبوو کـە خسـتبویە بـەرچاوی (لیژنـەی لێپسراو) کاتێك لـە سـەر شـانۆ دەسـتی درێـژ کـرد بـۆ جـەنابی بـارزانی ئـەی سەرۆکی کورد و کوردستان ئەی مەلیك کوردستان چاوەڕوانی بەرێزتانین کـە کوردستان رزگار بکرێت ماوەی دە دەقیقە چەپلەی بوە لێدرا.

جەنابی بارزانی گرژ بوو یکجار زۆر نارەحەت بوو لـە شـیعرەکەی مامۆسـتا هەژار ولامی دایەوە روونی کردەوە کە ئەمە بۆ چونی من نییە یـەك زەعیـم هەیـە ئـەویش عبدالکریـم قاسـم، مـن سـەربازێکی عـەبدلکریمم، سـەربازێکی شۆڕشـی ١٤ی تـەموزم خـۆم بـەخت ئەکـەم لـە پێنـاویدا، کـاتێك کـە چوومـە خزمەتی بارزانی زۆر گرژ بووە بەرامبەر ئەمە یەکەم جار بـوو بـەم شـێوەیە بە گرژی لەگـەلم بدوێت، هەرەشـەیەکی زۆریشـی لـە (مـام جـەلال ومامۆسـتا هەژار) کرد چاوەڕوانم کرد تاکو قسەکانی کۆتایی پێهێنا.

-وتم: گەورەم هیچ کەم وکورتیەکت بەدی کرد لە هۆڵەکە لە هەموو روویەکەوە بە تایبەتی لە راستی بەریزانی میوانە ئازیزەکان، چۆنیەتی دابەش کردنی خواردن وخواردنەوە بۆ ئەم (٧٠٠)کەسە کە هەموو ٤٠٠دینارێ تێچوو من مسئولی هەموو ئەوانە بووم کە باسم کرد.

-وتی: والله زۆر رێك وپێك بوو.

چاوم بە مامۆستا هەژار کەوت بۆم باس کرد بارزانی هەرەشەی لێ ئەکات لە سەر شیعرەکەی چوومە خزمەتی مام جلال لە میوانخانەی (تروکادیرو) بوو بۆم باس کرد کە بارزانی چەند گرژە وتورەیە فەرمویەتی هەموی جەلال تاوانبارە.

بارزانی فەرموی ئەم نامەیە تەسلیم بە بابا عەلی شێخ محمود حفید بکە، وڵامەکەش بهێنەرەوە ئەمە یەکەم جار بوو بە خزمەت ئەم پیاوە مەزنە بگەم، چەند پرسیارێکی لێ کردم تۆ کێیت، خەڵکی چ شوێنیکی، ئیشوکارت چیە، چۆن بارزانی بەم شێوەیە باوەری پێتە لەقسەکانی باش تێگەیشتم کە نامەکە زۆر زۆر گرنگ بووە، وەڵامەکەشم بۆ بارزانی هێنایەوە.

رۆژگار بە خۆشی وئارامی بەسەر دەچوو لە نێوان بارزانی و زەعیم دا هیچ جۆرە گرژیەك نەبوو، کە شایانی باس کردن بێت، جەنابی بارزانی ئیش وکاری زۆر بە باشی بەرێوە دەرۆیشت ئەو نامانەی کە دەی نارد بۆ (عبد الباقی کاظم) بەرێوەبەری گشتی پولیس بەغدا بوو، هەمو کارەکانی بارزانی لە رێگای ئەم پیاوە جێبەجێ دەکرا بە فەرمانی زەعیم بۆیە ئاگاداری ئەم وەزعە بووم چونکە زۆربەی کات من نامەکانی جەنابی بارزانیم دەبرد بۆ جەنابی عقید عبدالباقی کاظم بۆ ئەوەی بۆی جێبەجێ بکات.

دوای روخانی کۆماری مهاباد یەکەم جار بوو لە پارچەیەك لە پارچەکانی کوردستان بەم شێوەیە بەرێکخراوێکی سیاسی کورد بە ئازادی هەبێت بە ناوی پارتی دیموکراتی کوردستان بە سەرۆکایەتی مصطفی بارزانی، دەرچونی رۆژنامەی خەبات بەسەر پەرشتی مامۆستا ابراهیم احمد رووداوێکی زۆر

گرنگ بوو، دەنگی دایەوە لەسەران سەری وڵات بابەتەکانی ڕوون وئاشکرا بوو لە بارودۆخی ئەو کاتەی کوردی ئەکۆڵیەوە شانازی پێوە دەکرا، هەڵکردنی مەشخەڵی ئازادی لە سەرانسەری کوردستان، نەمانی ترس لەسەر جەماوەری کورد کە ئازار و ئەشکەنجە بدرێت، هۆیەك بوو کە سیاسەت و پەیڕەو و پرۆگرامی خۆی ڕۆژانە لە ڕۆژنامەی (خەبات) دا بڵاوبکاتەوە، بە تێکڕای گەلی کورد هەریەکە کە لە ڕاست خۆیەوە کەوتبوە جموجوڵ کردن ڕووەو بارەگاکانی ڕێخکراوی پارتی ئەرۆیشت، کادرانی پارتی لەسەرانسەری وڵات کاروباریان دەبرد بەڕێوە بەڵام بە ڕاستی جێ دەستیان دیار بووە، شەوو ڕۆژ لە تێکۆشان دابوون، وەلێپرسراوانیان ڕاستەوخۆ پەیوەندی ڕۆژانەیان بە جەماوەرەوە هەبوو، دەرگای ماڵەوەیان و بارەگاکانیان لەسەر پشت بوو تا وەکو داواکاریەکانیان جێبەجێ بکەن، بارزانی زیاتر لە ١٨ سەعاتی لەشەوو ڕۆژێکدا تەرخان کردبوو، لە پێناوی وڵاتدا، سەرنجی دانیشتوانی عێراقی بەگشتی ڕاکێشا بوو بۆ لای خۆی، بە هەزارەها عەگاڵ بەسەرو دشداشە لەبەرو جامانە بەسەر رووی لە ڕێکخراوەکانی پارتی ئەکرد وئەیان وت: (باوە باپیرانمان کورد بوون بەڵام لە ساڵاتێکی زووەوە هاتونەتە باشورو ناوەند جێگیربوون) لەمەوە بۆم دەرکەوت کە وتەکانی کاکە حسێنی خانەقا حاکم عبداللە سعید زۆر ڕاست بوون کە ئەیان فەرموو: (ئەگەر کورد ئازارو ئەشکەنجە نەدرێت ئەوا لە ٣٥٪ ی عێراق کوردە)

لە نێوان پارتی وحزبی شیوعی دا گرژی یەك پەیدا بوو کە جار بە جار سەری ئەکێشا بۆ کوشتن وبرین لە نێوانیاندا وە کێشەکانیان هەتا دەهات بەرەو خراپی دەرۆیشت لەسەر ململانێی حزبی و وەمانەوە نەتەوایەتی، لەبەر ئەوەی لەسەرەتاوە ڕای حزبی شیوعی دەربارەی مافی نەتەوایەتی کورد، ئەوەبو دوژمنای کۆمارەکەمان زۆر بە دەسەڵاتن، بەڵام ڕۆژانە لە ڕۆژنامەکەیاندا لاپەرەیەکیان دولاپەرەیان لەسەر مافەکانی کورد بڵاوئەکردەوە.

لەهەمان کات لە ناو ڕێکخراوی پارتیش کێشە دروست ببوو ئەوە بوو مامۆستا همزە عبداللە کە سکرتێری پارتی بوو دور خرایەوە،مامۆستا ابراهیم کرا بە سکرتێری پارتی لە کاتێکدا مامۆستا همزە عبداللە دامەزرێنەری (پ.د.ك) بوو بەلام خۆی هەڵنەستا بە سەرۆکایەتی حزبەکەوە وە مەلا مصطفیی بارزانی دانا بە سەرۆکی (پ.د.ك) هەربۆیە لە نامەیەکدا کە لە سالآنی شەستەکاندا همزە عبداللە ئاراستەی بارزانی دەکا پێی دەڵێت: (چۆن بە نامەیەك تۆم کردە سەرۆك بە نامەیەکیش دەتهێنمە خوارەوە).بەناوی دووبەرەکیەوە ئەم باسە بە دوور دەرێژی قسەی لەسەر ئەکەم لە هەمان کتێب؟

## دوژمنانی ١٤ ی تەمموز.

لەیەکەم ڕۆژی شۆڕشەکەمان (شۆڕشی کورد وعەرەب) دوژمنانی ١٤ ی تەموز چ لە دەرەوە چ لە ناوەوە بە ئاشکرا ونهێنی تکتیك وپیلان و نەخشەیان بەردەوام بوو بۆ تێکدانی شۆڕشەکە لە هەموو رویەکەوە، عەرەبە شۆفێنێەکان تورانیەکان وکۆنە پەرستەکان لە کوردو عەرەب بە ئاشکرا هەوڵێکی زۆریان دا بارزانی نەگەرێتەوە، سەفیری تورکی لە بەغدا روو بە روو بە مامۆستا صدیق شنشل وەزیری ١٤ تەموزی. وت: ئێمە رازی نین کە بارزانی بگەرێتەوە چونکە گەرانەوەی مەترسێەکی گەورە دروست ئەکات بۆ کۆماری تورکیاو ئێوەی کۆماری عێراق.

وە لەسەردانێکدا بۆلای (صدیق شنشل) کە (بەندەو کاك عبیداللە بارزانی) بوین بۆی گێراینەوە کە لە وەلامیدا بۆ سەفیری تورکیا فەرمویدتی( بە نیسبەت کۆماری عێراقەوە ئەوە کێشەیەکی ناوخۆیەو ئێوە بۆتان نییە باسی لێوەبکەن،)

جەنابی (عمر عەلی) کە ئەفسەرێکی ناسراوە. پلەیەکی بەرزی هەبوو لە سوپای عیراقیدا ئەویش ئەچێتە لای زەعیم پێ ڕائەگەیەنێ مەلا مصطفی بارزانی دوا ڕۆژ مەترسیەکی گەورەیە بۆ عێراق، هاتنەوەی زۆریی پێ ناچێت

شەڕ دروست ئەبێتەوە وە هەروەها دوو مرۆڤی سەرۆك هۆزی ناسراویش بۆ ئەم مەبەستە چاویان بە زەعیم ئەکەوێت.

ڕۆژ بە ڕۆژ بارودۆخی کورد بەرەو باشتر ئەرۆیشت، تازە وا دەهات لەسەر قاچی خۆی ڕاوەستێت، دوا ڕۆژی ڕوو لە ڕووناکی بوو بەلام لەهەموو ڕویەکەوە ساوابو، شخصیەتی بارزانی بەرز تربو بەرامبەر بە دۆست ودوژمن. جارێکیان مەلا مصطفی بارزان چوو بۆ سەردانی شێخ احمد بارزانی گەڕایەوە فەرموی پانزە سال پێش ئێستاکە سەرشاخی بەرز کەوتبووم. ئێستا توانیم بە هەمان شاخ دا سەرکەومەوە( لێرەوە شکم پەیدا کرد و وتم: جەنابی بارزانی ئەلَی نیازێکت هەیە).

یاسای چارەسەرکردنی کشتوکال (قانون اصلاح الزراعی) لە ٣٠ ایلولی ١٩٥٨ ئەم بڕیارە مێژوویییە گەورەترین هەنگاو بوو زەعیم عەبەدولکریم قاسم پێی هەلسا، هیچ گومانێك نەما بەرامبەر سەرکردەکانی شۆڕش کە بووە هۆی ئەوەی جوتیاران ببن بە پال پشتی ئەم ئەزمونە.

بەلام کەم و کورییەکی یەکجار زۆر لە ناوەرۆکی یاسای چارەسەرکردنی کشتوکالدا هەبوو کە بوو بەمایەی تەنگ وچەلمە لە نێوان ئاغاو خاوەن زەوی وجوتیاراندا ئەوە بوو هەرچەندە بەشی زۆری ئاغا وشێخەکان بوون بە دوژمنی کۆماری ١٤ تەموز و چەکیان ڕوو بە ڕوی هەلگرت وە بەشێکیان چوونە ئێران هەتا باس لەم یاسایە بکرایە ئەوان زیاتر گرژ دەبوون لەهەمان کاتدا لەیەکەم ڕۆژی ١٤ی تەموزی ١٩٥٨ گەورەترین خاوەن زەوی لە عێراق بە تایبەت لە کوردستان انور جمیل بگ جاف خاون ٧٦,٠٠٠دۆنم بوو، پێشکەشی شۆڕشی ١٤ی تەموزی کرد، وە هەروەها شەوکەت بگ جاف ٧٠,٠٠٠هەزار دۆنمی پێشکەش شۆڕشی ١٤ی تەموزی کرد.

بەلام بەشێکیش لە ئاغاو بەگزادەو شێخ وخاوەن زەویەکان لەگەل چەند کەسانێك ڕوویان کردە حکومەتی شای ئێران، کە دەستی هەرە گەورەی هەبوو لەیەکەم ڕۆژەوە (ثغرة) کونێك لە شۆڕشی ١٤ی تەموز بدۆزێتەوە تاکو

بتوانێت لەوێوە بچێتە ژورەوە، هەروەها سوریا و کوێتیش بەشدار بوون لەگەڵیاندا.

## هەوڵ دان بۆ تیرۆر کردنی زەعیم.

هەزار ملیون جار سوپاسی بۆ یەزدانی مەزن کە دوژمنانی گەل و ئازادی سەرنەکەوتن لە تیرورکردنی ئەم زاتە مەزنە کە مێژوو شاهدە زەعیم گەلی عێراقی ڕزگار کرد بە تایبەتی کورد لە چەنگ چەوسانەوەی حوکمی پادشای کۆنە پەرست، ئێمە گەلی کورد بە تێکڕایی قەرزداری ئەم نیشتمان پەروەرەین.

یەکێتی وپەیوەندی دۆستایەتی لە نێوان زەعیم وبارزانی لە هەموو رویەکەوە گەلێك بە هێز بوو، واتە لە نێوان حکومەتی عێراق وگەلی کورد، پارتی دیوکراتی کوردستان بەسەرۆکایەتی بارزانی سەرپەرشتی کوردستانی دەکرد.

**تێبینی**:

(بەونیازەی چاپخانەیەك بهێنم لە ئەمریکا سەردانی بالیۆزخانەی ئەمریکیم کرد لە بەغدا بەشی بازرگانی بۆ ئەم مەبەستە لە ڕێگای گۆڤارێکی ئەمریکی بازرگانیەوە بەڵاوکراوەیەکم بڵاوکردەوە ئەمەوێت چاپخانەیەك بکرم بەڵام پاش ماوەیەك وێنەی زیاتر لە (٥٠٠)چاپخانەم بە نمونە بۆ هاتەوە منیش چوار جار هاتوچۆی بەشی بازرگانیم کرد لە بالیۆزخانەی ئەمریکی لە بەغدا لەم هاتوو چویانەدا منیان هێنا بە گفتوگۆ، ویەکسەر چومە خزمەتی بارزانی ئاگادارم کرد وبۆم گێرایەوە کە بە کورتیەکەی پییان -وتم بۆچی شۆڕش ناکەن داوای سەربەخۆی خۆتان ناکەن لەوەڵامدا بارزانی فەرموی ئیتر هیچی کە هاتو چۆیان مەکە).

-چەندجار جەنابی بارزانی ئەی فرموو لە بەر ئەوەی زۆرم باوەرپێتە وئیش و کارت زۆر پێ ئەکەم وبومەتە مایەی نارەحەتی بۆ تۆ لە ئیش و کارم کردویت،

-وتم: گەورەم مـن قـەرزای بـەڕێزتانم خـەڵکێکی زۆرم ناسـی لـە کـوردو عەرەب، بە هۆی جەنابتانەوە بۆ دمونـە ئەگـەر بـەڕێزتان نـەبێت (زایسـڤف) باڵیوزی روسی کارتی میوانداریم بۆ نانێرێت، دووجار شخصی زەعیـم دیـوە، لـە پـەنا بـەڕێزتان فێری سیاسـەت بـووم، وەمـن بـەجلو بـەرگ ونـانی خـۆم خزمەتم دەکردن، وئینجا لەسەر ئەو پێنج شەوە بـەندە خزمتکاری کورد و کورستان دەموت سوپاس.

## ڕووداوەکانی دژی شۆڕشی ١٤ ی تەموزی ١٩٥٨:

١.مانگرتنی شەواف وگرتنی موسڵ، پوچەڵ کرایەوە ساڵی ١٩٦٠

٢.ڕووداوی کەرکوك، کوردیان تێوەی گلاند ساڵی ١٩٦٠

٣.هەوڵدان بۆ تیرور کردنی زەعیم ساڵی ١٩٦٠.

بۆچوونی زەعیم/ لەسەرەوە چەند خاڵێکم بە کورتی نوسیوە، زەعیم وەکو تەبیعەتی ئادەمیزاد غرورێك چووە جەستەی وخۆی بـە هێزێکی پولایـین دەزانی بێ ئەوەی هەموو بارودۆخێکی ئەو ڕۆژە هەڵسەنگێنێ حسابی بۆ هیچ گروپێکی سیاسی نەدەکرد.

زەعیم سیاسەتی گۆڕی بەرامبـەر نیشـتمان پـەروەران وە بـە هێزی ئـازادی دەووت: گیرە شێوێنەکان( مخربین) زۆر لە کادرانی حـزب شـیوعی لـە موسـڵ وکـەرکوك بـەغدا گیران، کوردیـش بەرکەوت لەوانـە زۆریـان ئـەندامی پـارتی بوون بەبیانوی ئەوەی ئەمانە دژی دیموکراتی و دژی گەلن.

لەگەڵ ئەوەشدا کە (ئینگلیزو ئەمریکاو ئێران شاە وتورکیا وسـوریا وکوێـت ومسر) هەریەکە لەلایـەن خۆیـەوە کـاری دەکـرد بـۆ روخـانی ئـەم ئەزمونــە وتێکدانی نێـوان زەعیـم و بـارزانی، توانیـان بـە نـاوی دژی (یاسـای چاکردنی کشتوکاڵ)ەوە بوشایی (فراغ) دروست بکەن ووردە ووردە بچنە نێوان زەعیم و بارزانیەوە لە هەمووی گرنگتر ئەوە بوو خیانەت کەوتە ناو پیاوەکانی زەعیم و دەستێکی باڵایان هەبوو لە تێکدانی نێوان زەعیم و بارزانی دا، بـە تایبـەتی

شخصی (كمال عوسمـان ئاغـا) ئـهم زاتـه نامباركـه كـه دهورێكـی زۆر خـراپ و خیانهتی ههبوو.

-بارزانی كتوپڕ بهغدای بهجێ هێشت گرژی بهرهو زیادی دهرۆیشت.

-سهرۆك هوزهكانی كـورد كهوتنـه جموجـولْ بـۆ گـۆڕینـی یاسـای چاككردنی كشتوكالْ.

-كوشتنی احمد زێباری له موصل به دهست چهند بارزانیهك، لهوانه مهلْكۆ بارزانی باوكی جمیله.

-كوشـتنی صدیـق مـیرانی شـقلاوه بهدهسـتی محمود كـاوانی، فرمـان گرتنـی مامۆستا ابراهیم احمد، دهرچوو، دهست كرا به گرتنی ئهندامانی پارتی لهوانه بۆ، نمونه كاكی كاكان عمر دبابه.

## بۆچوونی بـارزانی وههلهكانی:

١-بارزانی دهستێكی بالای ههبو له جموجولی سـهرۆك هۆزهكـان وای ئـهزانی زهعیـم لاوازه و دهنـێرێت بـه شـوێنـیدا دهلێ وهره مصطفـی ئـهم بارودوخـه چاكه.

٢- لـه كـاتێكدا وایـان تێگـهیانـدبوو كـه زهعیــم ئابلۆقـهی دراوه لــه دهرهوه ونـاوهوه زۆر لاوازه داواكاریكـانی جێبـــهجێ نـهكات، بهداخــهوه حســابهكانی ههموی ههله بوو.

٣-ههرچـهنده زهعیـم بـه تـهواوی ئاگـاداری پیـلان و تـاكتیكی بـارزانی بــوو بهلام به هیچ جۆرێك بایهخی پێ نهدا پشتی تێكرد؟

٤-بارزانی غرور بوو لهههموو رویهكهوه ههله بوو وای دهزانی زهعیم لاوازه بـه ناچـاری داواكاریـهكانی جێبـهجێ ئـهكات، ههمو ئـهو حكومـهت و گرووپـه سیاسـیانهی دژ بـه زهعیمـن پشـتیوانی لێ دهكهن، بهڕاســتی خــهلكێكی زۆر پلرسیاریان لههۆكاری تێكدانی نێوان زهعیـم و بـارزانی دهكـرد كـهس نـهبوو

ودڵامی بداتەوە هەتاکو کۆچی کـرد. هۆکـاری تێکدانـی لەگـەڵ زەعیـم دا ڕەفتارێکی نا دیار بوو(ئایا پێیان کـرد یا پێوە بـوو بـە قسەی ئـەو حـەوت سـەرۆك هۆزەی کەچووبونـە لای لـە بـەر خـاتری چـەند بستێك زەویـی ئـەم کێشەیەیان دروست کرد، لە کاتێکدا بـەبێ ئـەوەی هیـچ پیلانێکـی دارێـژراوی هەبوو بێت لە پێش ئەوەی ئەم هەلوێستە گەورەیە بگریت بەرامبەر زەعیم.

**بارزانی نوسراوێکی ئاراستەی زەعیم کرد:**

جەنابی کاك عبیداللە بارزانی ئاگاداری کردم کە مەلا مصطفی نوسـراوێکی ئاراستەی زەعیم کردووە بـە یەکەوە سەرمان بـە زۆر کـون کـرد کـەس نـەی توانی ئەم نامەیە بگەیەنێ؛ ئیزباتێکی کوردی دڵسوز نیشتمان پـەروەر مـاوە ئێستا ناوی (٠٠) پاسەوانی تایبەتی زەعیم بوو یارمەتی داین کە ئەو نامەیە بگەیەنینە زەعیم بڕیارمان دا کە بەرامبەر(ماڵەکەی رابوەستین لە (بتـاوین) پێش گەڕانـەوەی بـۆ ئـەوەی کـە گەڕایـەوە چاوی پێمان بکـەوێت ئـەوە بـوو کاتێك هاتەوە ئێمەی بینی ئینزباتێك هات بـانگی کردیـن لەگـەڵی ڕۆیشتین تاکو گەیشتینە لای زەعیم سڵاومان کرد نامەکەی بـارزانی مـان تەسلیم کـرد بەڵام بە بینینی نامەکە غەزەب لە دەموچاوی ئـەباری وە ساردییەکی نوانـد بەرامبەر عبیداللە بارزانی.

زەعیـم ـوتـی: ئەمـەم چاوەڕوان نـە دەکـرد لـە کەسـایەتی مـەلا مصطفـی بەرامبەر بە خۆم بە تایبەتی چونکە یارمەتیکی زۆرم دا لە هەموو ڕویەکەوە من لە سەر ئەو لە زۆر شوێن بە لاوازیان دائەنام وپروپاگەندەیـەکی زۆرم بـۆ دروست کرا لەسەر ئەو، ١٤تەموز نەبوایە تەرمەکەی لە روسـیا ئـەبوو، چـۆن ئـەم تاوانـە گەورەیـەی کـرد بازگـا دانێـت ڕوو بـە ڕووی سـوپا وجـەماوەری عێراق، باشە ئەو بەچە حەقێك دەست نیشانی خەڵك دەکات وە دەڵێت ئەمـە دڵسۆزە ئەو فلان هۆزە خراپن چونکی پاڵ پشتی حکومەتن، ئەی دوێنی هەر ئەو نەبوو ئەی وت من سـەربازم کـەچی ئێسـتاکە بازگای دانـاوە لـە کۆتـایی قسەکانی دا تەوا بوو بە کـاك عبـداللە بـارزانی وت ئـەتبینم بـەلام چاوی پێ

نەکەوت، وا پێ دەچوو لە قسەکانی ئاگاداری هەموو شتێکە، وا دەردەکەوت نیازی خراپە وبڕیاری داوە چۆن هەلوێستی بێت، سوپاسمان کرد هاتینە دەرێ ، نزیکەی ٢٠ مەتر لەماڵی زەعیم دورکەوتینەوە، (کمال عوسمان ئاغ)[٦] لە سەیارەکەی هاتە خواری بەبێ ئەوەی سلاوٚمان لێ بکات بە گرژیەوە قسەی لەگەڵ کردین -وتی ئێوە چیئەکەن لێرە چۆن ئێرەتان دۆزیەوە؟ کام ئینزباتی کورد یارمەتی دان؟ چۆون گەیشتنە زەعیم؟ رووی کردە عبید الله -وتی: (هاتوویت قسە لەگەڵ شخصی زەعیم بکەیت؟ لە کاتێکدا چەکداری مەلا مصطفی بازگایان داناوە دژی سوپای زەعیم، مصطفی هانی سەرۆك هۆزەکانی دا لە پێناوی یاسای (اصلاح الزراعی)، رەفیق پێم نالێت هۆی چیە دوای کلاوی بابردو کەوتوییت)، دوای بێدەنگ بونی کمال.

عبیدالله -وتی: ئەم پرسیارانەی لە ئێمەت کرد برۆ لە زەعیمی بکە ولامەکانیان لای ئەوە.

### دوژمنانی کۆماری عێراق:

یەکەم هەنگاو لە سەرەتاوە ئەو حکومتانەی پیلانییان دائەنا بە تایبەتی شاه ئێران وتورکیا وئینگلیز وئەمریکا کە ناکۆکی دروست بکەن لە نێوان زەعیم وبارزانیدا (حکومەتی عێراق وگەلی کورد) ئێستاکە گەیشتنە ئامانجی خۆیان.

-پیلانی تازەیان لاوازکردنی حکومەتی قاسم بوو لە هەموو ڕویەکەوە لە ناوەوە ودەرەوەی وولات ئینجا هەوڵدان بۆ روخانی ئەو حکومتەی کە دژی غەربە.

-عەرەبە شۆفینیەکان وتورانیەکان وحزبی بەعس هەمو هەولێکیان

---

[٦] چەند بنوسیت لەسەری کەمە گەورەترین تاوانبار بوو بەرامبەر گەلی کورد دەورێکی زۆر گرنگی هەبوو لەدروست کردنی ناکۆکی و دوو بەرەکی لەنێوان زەعیم و بارزانی دا سەرکەوتو بوو لەپیلانەکانی.

خستبووه گەر بۆ پشتیوانی کردنیان لە زەعیم بۆ لاواز کردنی (بزوتنەوە رزگاری خوازی کوردی کە ئەویش لە پارتی دیموکراتی کوردستاندا خۆی دەبینیەوە) وەك ئەڵێن دوژمنی دوژمنم دوستمە) بە فرمانی حکومەتی تورکیا تورانیەکان گەروە ترین دەوری سیخوڕیان هەبو دژی کورد.

خۆپیشاندان بە ئاگاداری فەرمانی بارزانی لەسەران سەری کوردستان هەمو هێزە چەکدارەکان بە هەموو توانا یەکیانەدە ڕووبەڕووی حکومەت سەنگەریان لێداو وبازگایان دانا، حکومەت هەمو هێزو توانایەکی بەکارهێنا بە ئاگرو ئاسن و بە هەموو جۆرە چەکێکی قورسەوە هێرشی کردە سەر سەران سەری کوردستان دژی گەلی کورد وەستایەوە.

هێزو سوپای عێراقی چەکی شەستەکانی بەکارهێنا لە فرۆکەو تازەترین تانك و زرێژۆش تازەترین چەك سووك، سوپایەکی شارەزاو رێك وپێك وخواردن وجل وبەرگی سوپایەکی مودرینیان هەبوو.

-هێزی کورد بریتی بوو لە چەکی سەرتایی جەنگی جیهانی یەکەم سالآنی ١٩١٧ (تفەنگی سیترپی فرنسی، وتفەنگی ئینگلیزبوو هولەندی وبرنوی چیکی).

هاتوو چوکردن یان بەپێ یا بە ولآخ بوو، کورد هێزیکی چەکداری شارەزایی نەبوو جلوبەرگ ونەخوشخانە وشتی کە باسی نەکەی باشترە چونکە چەك وتوانایەکی وایان پێ نەبوو کەجێ باس کردن بێت.

لە ١١ ایلولی ساڵی ١٩٦١ پارتی دیموکراتی کوردستان بە سەرۆکایەتی بارزانی بڕیاری شۆڕشیئەیلول درا (شەڕ لێرەوە دەستی پێکرد).

## حکومەتی قاسم و پیلانەکانی:

لە سێ خاڵەوە دەستی پێکرد بۆ جێبەجێ کردنی لە ناو بردنی بزوتنەوەی کوردی.

١-سوپای عێراق بە هەمو هێزو توانایەکیەوە هێرشێکی دەڕندانەی کردە سەران سەری کوردستان بە فڕۆکە وتانك و زرێپۆش) دڕندانە پەلاماری گوند

ماڵ و منداڵ حەیوانی یان ئەدا.

٢-بە بۆنەی دەست بەسەراگرتنی شارو شاروچکەو گوندی کوردستان بەڕێوەبەری ئاسایشیی گشتی واستخباراتی سوپا دەستیان کرد بە گرتن بە ناوی پارێزگاری کردن لە حکومەتی قاسم، لە تابوری پێنجەم وە هەروەها لە شارەکان بەغداو موسڵ یش کوێرانە خەڵکیان گرت.

٣-پیلان ودەسیسەی پەیوەندی کردن بە سەرۆك هۆزەکان وە کەسە ناودارانی کورد، بەسەرۆکایەتی کەمال عوسمان ئاغا سەرپەرشتی دەکرا لە هەندێ بواردا سەرکەوتو بوو توانی شێخ ئەحمەد بارزانی نزیك کاتەوە لە حکومەت ولە ئیستگەو تەلەفزیون بلاوی کردەوە، (بەکورتی لەسەر ئەم بابەتە رونی ئەکەمەوە)لەم کتێبە لە لاپەرەێکی کە.

## سەبارەت بە گرتنی خۆم:

کاك حسێن شیروانی ئاگاداری کردم لە ئاسایشی گشتی فرمانی گرتنت دراوە، خۆم شاردەوە لەماڵی دۆستێکی دێرینی ئەرمەنی خاوەن دوکانی قژبرین بوو لەگەرەکی مەنصور بە ناوی (محل ئاڤۆ) دوای دە ڕۆژ بەرکەوتم گیرام، بردیانم بۆ ئاسایشی گشتی دەستێکیان بەسەروریشمدا هێناو سەرییان سفرکردم بە شێوەیەکی ناریك وپێك ماڵییان پشکنیم، راپورتەکەیان واڵێ دابووم کە مسئولییکی گەورەی پارتیم، هیچیان نەدەزانی سەبارەت بەمن، لە ئەنجامی گفتوگۆ و لێکوڵینەوە شتێکم لەسەرنەبو (حجزیان کردم لە خلف السده) کەس وکارم دایکم وهاوسەرەکەم وکمالی برام ومحەمەدی مام رضا هاتن بۆ لام ڕوباری کچم تەمەنی سێ ساڵان بوو ئەو کاتە کە چاوی بە من کەوت بە سەر تاشراوی ترساو ئەوندە گریا ژیرنەبووەوە، دوای یەك هەفتە گواسترامەوە بۆ فلوجە لەوێ لە مرکزی پولیس یەك شەو مامەوە بە پارە ناردیانم بۆ بندیخانەی رمادی بەشی حجز لای کۆمەڵێك لە گیراوەکان کورد بوون لەسەر مسەلەی کورد گیرابوون ژمارەیان ٤٠ کەس ئەبوون لەوانە

کاك(انور دزەیی)[٧] و عەلی سلیم بەگ و جرجیس فتح الله وە دوو ئامۆزای سید مجیدم ئەناسی وەکو یەك خێزان نانمان بەیەکەوە لەسەر یەك سفرە ئەخوارد ڕۆژگارمان بە لێکۆڵینەوە لەسەر بارودۆخی ئێستاکە ئەبردە سەر بەگشتی خوراگر و ئازاو خاوەن بیروباوەڕ بوون، کاربەدەستانی بەندیخانە بە ناچاری ڕێزیان لێ دەگرتین دەیان زانی بە هۆی دلسۆزو ڕاست گۆیی خۆمان ئەم ژیانە دەبەینە سەر .

براە شیوعیەکان وەکو ئێمە لەسەر یەك سفرە نانییان ئەخوارد رێکوپێك بوون بەڵکو لە(ئێمە باشتریش)، ناکۆکیمان نەبوو ڕێزمان لە یەکتری ئەگرت، بەلام لە بۆچونا لەیەك دور بووین لەبەر ئەوە لێکوڵینەوەمان نە دەکرد تەنها مامۆستا جرجیس فتح الله هەندێ جار خۆی نەدەگرت ئەکەوتە لێکۆڵینەوە لەگەڵیان بە جۆرێك شارەزا بوو لەسەر مارکسیەت (شیوعی) کە هیچیان دەرحەقی نەئەهاتن، رەوف الخالدی لەگەڵیان بوە ڕێزیان لێ دەگرت بە کەسێکی نیشتمان پەروەریان دانابوە، دەی وت شیوعیەکان نام ناسن تکایە ئاشکرام مەکە باش دەلەوڕێم لەسەر حسابی شیوعیەکان، ئاگادارم کرد تەنها ئەوەم دەوێت لە تۆ جاسوسیەت نەکەی نەچی بۆ دائیرەی بندیخانە ئەمە مەکە من باست ناکەم؟

-بەعسیەکان لە هەمو ڕویەکەوە زۆر زۆر ئازاد بوون لەوانەی تاوانبار کرابوون کە تەقەیان کردوە لە زەعیم لە شوێنی تایبەتی بوون دەرگا بۆ ئەوان لەسەرپشت بو ڕێزیان لێ دەگیرا بەشێکی کەشیان لەگەڵ بەندکراوەکان بوون بە گشتی.

کاتێك مامۆستای پارێزەر عبدالستار عەلی حسێن هاتە لام لە ڕێگای ئەوەوە

---

[٧] پارێزەری ڕۆژنامەی خەبات بوو لەبنەماڵەیەکی ناسراوو لەهۆزی دزەیی پیاوێکی ژیرو زیرەك و دانا و بەخشندە بوو کوردێکی نیشتیمان پەروەرو خۆ ڕاگر بوو وەهەروەها ئەم پیاوە برازای خدری ئەحمد پاشا بوو.

بەعسیەکانم ناسی.

-وتم: ئێمە بونمان لێرە لەیەك سەرچاوە تاونبارین یەك دوژمنان هەیە ئەویش عبدالکریم قاسم لەم بووچوونەوە گفتوگۆم لەگەڵ کردن وام ئەزانی دوای ئەم چاوپێکەوتنە نزیك دەبینەوە لە یەك وەکو پارتی و بەعس، بەلاّم کەوتنە دوژمنایەتیمان.

مامۆستا صدیق شنشل مامۆستا عبدالستار عەلی حسێنی ناردبوە بۆ ئەوەی یارمەتیم بدات بۆ بەردانم بەلاّم بەداخەوە نەی توانی هیچم بۆ بکات.

مانگی چوار جار (مواجهە) وچاو پێکەوتنمان هەبوو، هەریەکێك کەسوکاری ئەهات ئەچو، بۆلای لێپرسراوی بەندیخانە ئەی وت (فلان) لیرە بەندە دوای لێکۆلّینەوە و پشکنین، ئەنجا بانگی ئەو کەسەیان ئەکرد پێیان را ئەگەیاند چاوپێکەوتنت هەیە.

لە کاتی چاوپێکەوتندا سیخورێك بە دیارمانەوە را دەوەستا لەیەکەم چرکەوە هەتاکو کۆتایی چاوپێکەوتنەکە، ئەو بەندە دوای چاوپێکەوتن ئەگەراپێەوە شوێنی خۆی. دەبوایە ئەمانەی خوارەوەی جێبەجێ بکردایە، هەموئەو شت مەکەی کە بۆی هاتوە لە خواردن ووەکو خۆیی تەسلیم بە مسئولی دابەش کردنی خواردن ئەکات، دەربارەی بارودۆخی ئێستای کورد لە هەموو روداوەکانی چ روی داوە وەکو دەقی خۆی باس ئەکات لای باوەرپێ کراو(مسئول).

لیژنەیەك هەیە بۆ سەرپەرشتی هەمو ئیش وکاری ناوخۆمان لە سێ کەس پێك هاتوەو، مسئول بۆ پەیوەندی سیاسی وە چێشت لێنانو قاپ شتن وپاك کردنەوە لیژنەی یارمەتی ئەوانەی مواجهەیان نییە وبارودۆخی دارایان باش نییە.

دایکم لەبەر ئەوەی زمانی عەرەبی نەئەزانی کاروان کرام بەدەستی عەرەبە شۆفێنیەکان بە دەنگێکی بەرز هاوار کرا رەفیق مامە صادق (مواجهە)، کە چوومە دەرێ چاوم بە دایکم کەوت دەستە بەنرخەکانیم ماچ کرد، ئەمە

یەکەم جارە لە بەندیخانە سەردانم بکات ڕووبەڕووی دانیشـتم دەستمان کـرد بەقسەکردن سیخورێك لەگەڵمان دانیشتبوو، دایکـم هـەواڵی منـدال وژن و دوکانەکەمی بۆ هێنـابووم وتەکانیشی بریتی بـوو روبار تەندروستی باشـە بەڵام هەر دەگری دەڵی بابە کوانێ بازیـان منداڵیکی گرینۆکە. دایکیـان لـە هەمان مەکتبە مدیرەکەی رێك و پێکە لەگەڵی، کەمالی بـرات باشـە و هـاتوو چۆی دوکانەکەت ئەکات، زۆری خەڵك قەرزەکان ناهێنێتەوە کێشەمان نـیـە انشاءالله بەم زوانە بەر ئەبی، منیش زۆر زۆر باشم وهەر خەریکی خـواردن و نوستنین ورۆژگار بە خۆشی ئەبینە سەر، سیخوڕەکە لێی پرسین ئـەلێن چی منیش یەکە یەکە هەموو قسەکانم کردە وشەی عەرەبی، لەیەکـەم دەقیقـەوە پرتـەو بوڵەی ئەهات و قسـەی نـاخۆش و ژهـراوی ئـەکرد زۆربــێ شـەرمانە لەگەڵمان ئەدوا ئـەی وت چـۆن دایکت لـە ژێـر سێبەری وڵاتێکـی عـەرەبی دا دەژی زمـان و ووشـەی ئـەم وڵاتـە نـازانێت (ئـێـرە عێراقـە) وڵاتـی عەرەبـە، تورکمانـەکان دەستیان خـۆش بێـت ئـەوان بـاش ئـەزانن چـۆن لـە گـەڵتان بجوڵێنەوە، منیش وەکـو دیلێکـی بێ دەسـەڵات ناچار زۆر لەسـەر خـۆ وڵامـم دایـەوە ببـورە واللـه دایکـم عـەرەبی نـازانێت لەلایەکی کەشەوە بۆیـە لـێرەم چونکە تاوانەکەم ئەوەیە کە کوردم من حجزم بەڵام هیچم لەسەر نـیـە بـەم زوانە بەر دەبم خۆ من بزنم نەدزیوە.

هەرچی سیخوڕەکە وتی من وەڵامم نەدایەوە بۆ ئەوەی گـرژ نـەبێت لـە وە زیـاتر دایکـم بـە خۆشـی بڕواتـە دەرێ، دەسـتە پیرۆزەکـانیم مـاچ کـرد و خواحـافیزی کـرد و بـەرەو لای روبـار و کـەمال و هاوسـەرەکەم کەوتـە رێگـا بەرەو بە غدا خوا بۆمانی بیهێڵێت.

**تێبینی**

کاروان وشـەیەکی کوردیـە، بـەڵام لـە بەندیخانـەکان بـەکاری ئـەهێنن واتـا کەش (دارکاری کردن بە کۆمەڵ)

گەڕامەوە شوێنی خۆم ئەو دیاریانەی بۆم هاتبو یامە دەست لێپرسراوەکە نانمان خوارد، پاش پشودان بانگیان کردم چاو پێکەوتنت هەیە.

کاتێك چومە دەرەوە، یەکێك بە سجانەکان (پاسەوانەکانی بەندیخانە) پێشم کەوت، دوانیشیان لە دوامەوە ئەڕۆیشت تاکو گەیشتمە بەر باخچەی ئیدارە دور لە ژوری محجر ئینجا چوار دەوریان گرتم ژمارەم کردن (۱۳) سجان بوون، وتیان پێویستیت بە کاروان هەیە دوای ئەم کاروانە دایکت فێری زمانی عەرەبی ئەبێت.

ئەمە یەکەم جارە وشەی کاروان ببیستم لە مرۆڤێکی عەرەب چونکە کاروان ووشەیەکی کوردییە، خۆم بە خۆمم وت رەفیق ئەمەیە کاروان. ۱۳ کەسەکە دەوریان گرتبووم بە یەك (فەریق) منیشیان کردە تۆپ هەریەکە لە راست خۆیەوە دەستوو قاچی بەکار ئەهێنا، بەبێ ئەوەی کە مەترس حەکەمیان هەبێ زۆری پێ نە چوو ئازارەکە زۆری بۆ هێنام و هاوار هاوار دەستی پێکرد بە دەنگە گەورەکەی خۆم ئەم گوت، بەڵکو حوکومەتی رمادی فریام کەوێت... بەلاّم نەخێر وتم رەفیق سەعات چواری ئێوارەیە حکومەت بریتیە لەو ۱۳سجانانە، دوعام ئەکرد وازم لێ بهێنن بەردەوام بوون تاکو پەکییان خستم کەوتمە ئەرز ئینجا بە چوار کەس وەکو مەری مردارەبوە بوو بە تەنها فرپایان دامە ژورێکی چۆڵ وتاریك رەش وپیس کە مشك هاتوچوی تیا ئەکرد ئەم ژورە ٢٥ ساڵ پێش ئیستاکە چێشت خانە بووە جێی شوێنی دەستو قاچیان دیار بوو ئینجا وورده وورده بە خۆمدا چومەوە عاقلانە نەئەجولامەوە لەگەڵییان خوای من تۆ کردی، فرسەتم لە یەکێکیان هێنا بە هەردوو دەستم پەلاماری گوێچکەکانیم داو بە قاچیش تێم هەڵئەدا هەتا بەهەر (۱۲)سجانەکەی تر ئەوەندیان لێدام کەوتمە ئەرزەکە.

دوای یەك هەفتە لە تاك بەندی بردیانمەوە بۆ ناو بەندینخانە گشتییەکە (سجن العام) کە لەسەر پیاو خراپی گیرابوون (دزو پیاو کوژو شەوو کوت) بەلاّم کە هاتمە ناویان خۆش بە ختانە خەڵکێکی رێك و پێك لە ناویان دا

هەبوو خزمەتێکی بێ ئەندازەیان کردم لەبەر ئەوەی ئەیان زانی کوردم ودژ بە رژێمی قاسمم و ئازارو ئەشکەنجە دراوم لەناو بەند کراوەکان دا کوردێکی زۆریان لەگەڵ بوو لەوانە کوری شێخێکی گەورە هاتەلام وتی باپیرمان لە نزیکەی ۱۰۰ساڵ پێش ئێستا لە هەلێرەوە هاتوەتە ناوچەی رمادی بە هۆی دوژمنایەتی ئێمە لێرەین ئەنکم کوردی باش ئەزانێت کەی کوردستان رزگار بێت ئێمە ئەگەرێینەوە ئینجا زانیم و بۆم روون بوەوە کە لە ناوچەی رمادی کوردێکی زۆر نیشتەجێ بووە ژیان دەباتە سەرو چەند گوندێکی سەر بە خۆیان هەیە.

انور دزەئی توانی سەرم بدات وبەیەکەوە نانمان خوازد وتی باش رزگارت بوو لەم دارکاریە ، بەلام وەکو سجانێکی کورد بۆی باس کردم تاوان بارە بەعسیەکان کە تاوان بارن بە هەوڵدانی تیرۆر کردنی عەبەولکریم قاسم دەستێکی سەرەکیان هەبوو لەم دارکاری کردنەی تۆدا.

باسی بارودۆخی ئێستامان کرد لەسەر بنەمای ئەو هەواڵانەی کە لەلایەن خزمانەوە، بە شێوەیەکی راست و دروست ئاگاداریان ئەکرێنەوە لە چاوپێکەوتن وسەردانەکاندا.

قاسم بارودۆخی بەرەو باشی ناروات بزوتنەوەی کورد بەرو پێشەوە ئەروت قاسم وا چووە بووەمێشکی بە هۆی راپۆرتی سیخورەکان واستخباراتی سوپا و بەرێوەبەری ئاسایشی گشتی کە بزوتنەوەی کوردی کۆتای پێ هات، سوپای عێراق بە تەواوی دەستی بەسەر باکوری خۆشەویست داگرتوەوە چاوەروان ئەکرێت کە مەلا مصطفی یا خۆیی تەسلیم دەکات یا را ئەکاتە تورکیا یا سوریا وە ئەوانەی کە لەگەڵی ماون بە پەنجەی دەست دەژمێردەرین، قاسم غرور بیبوو بەلام خەڵکی پشتی لێ کردبوو دڵی خۆی بەو راپۆرتانە خۆش دەکرد کە لە لایەن (کمال عوسمان ئاغاوە بە دەستی دەکەوت، یەکێك لە قسەکانی کاك ئەنوەر دزەیی ئەوە بوو فەرموی ئێمە بەر ئەبین، ئەم قسەیە لە زمانی کمال عوسمان بیستراوە. هاتنی کاك ئەنوەر لە هەموو رویەکەوە دڵی

زۆر خۆش کردم، چونکی ئەوە بۆ ماوەی ١٥ رۆژ دەچێت، بە هیچ جۆرێك ئاگاداری بارودۆخی وولات نیم، چونکی دورخراومەتەوە.

لە ساڵی ١٩٦٢ عەبدولکریم قاسم لە دەربەندیخان وتارێکی خوێندەوە، بریاری لێبوردنی گشتی دەرکرد، بۆ هەمو ئەو کوردانەی کەلەسەر سیاسەت گیراون (اطلاق سراح المحجوزين من الاكراد).

قاسم ئەوەی باش دەزانی خەڵکێکی بێ تاوانی زۆر گیراون، لە کاسبکارو فەرمانبەر وکرێکار جوتیار، کە پەیوەندیان بە بارزانیەوە نەبوو، بەلام ویستی بەم بریارە خۆی لە کورد نزیك بکاتەوە، قاسم بۆی دەرکەوتبو ئەو هێرشەی کردبوی لە رووی سیاسیەوە شکستێکی زۆر گەورە بوو لە بارودۆخی ئەو رۆژەدا بۆ خودی کەسایەتی خۆی.

دوای ماوەی ٢٤ سەعات بریارەکەی قاسم جێبەجێ کرا ئێمە ئازاد کراین تەنها مامۆستا (جەرجیس فتح الله)[٨] نەبێت کە بە بەنکراوی مایەوە، بە

---

٨ پیاوێکی زۆر تێگەیشتوو زاناو قسە زان بوو، بەهیچ شێوەیەك ئامادەنی ئەوەی تیا نەبوو لەگەڵ عەرەبە شۆفێنیەکان و بەعسیەکان و شیوعیەکان تێکەلاو ببێت، زۆر حەزی بەتێکەلا و بوون هەبوو لەگەڵ ئەو کەسانەی کەبیرو باوەریان لەسەر بنەمای دیموکراتی و سەربەخۆیی و ئازادی دامەزراوە، زۆر دۆستی کورد بوو بەبەردەوامی لەهەوڵی ئەوەدا بوو لەکورد نزیك بێتەوە هەرچەندێك لەتوانای دا بووبێت بەهەموو شێوەیەك خزمەتی کورد و بزوتنەوەی رزگاری خوازی کردووە عەرەبە شۆفێنیەکان کەبەمەیان زانی لەداخا تاوانباریان کرد بەوەی رووداوەکەی شەواف دا دەستێکی بالای هەبووە لەئازارو ئەشکەنجە کردنی عەرەب نەتەوایەتیەکاندا، ئەم تۆمەتەی بۆیە خرایە پاڵ بۆ ئەوەی لەبەندیخانەدا دایرزێنن لەکاتێکدا ئەم پیاوە چەکەکەی تەنها پێنوس بوو هیچی تر، بەلام خۆ بەوختانە بەهۆی تێکۆشانی بارزانی و (پ.د.ك) ەوە رزگاری بوو لەچنگی بەعس و دوای ئەوە بەیەکجاری چووە ریزەکانی پارتیەوە لەگەڵ ئەوەشدا کەهەندێ سرپاتی هەبوو بەلام جێ دەستی دیار بوو وەئیجابیاتی یەکجار زۆر بوو.

پشتیوانی خوا شادبوومەوە بە ماڵ ومناڵ و برادەرانم، سوپاس بۆ پەروەردگار کە رزگاری کردم لە چنگی عەرەبە شۆڤێنیەکان.

پاش پشو دانێکی کورت، رووم کردە بازار بۆ ئەوەی بزانم باری ئابوری دوکانەکەم لەچیدایە کە گەیشتمە ئەوێ دەستم کرد بە لێکۆڵینەوە لەگەڵ (کەمال)ی برام وئەو کورە ژمێریارەی کە لەلام بوو یەکەم جار لە پەروای قەرزەکانەوە دەستم پێکرد سەیرم کرد زۆرێك لە قەرزەکانم فەوتاون ئینجا هاتمە سەر فرۆشراو کردراو تەماشام کرد لەویشدا زەرەرم کردووە بە هۆی مانەوەی یان فرۆشتنی بە نەزانی بە کورتی بۆم دەرکەوت کە ئەوەی لە ماوەی (٥-٦) ساڵدا بەیەکەوەم نابو بەو ماوە کەمە وەکو بەفری بەهار توابۆوە، دڵم بەو دوکانە زۆرخۆشبوو، چونکە لە دەرەوەی وڵاتەوە بە (استراد) شتومەکی کارەبایی تازەم بۆ ئەهات، وبریکارێکی زۆرم هەبوو بە (کۆ) لێیان وەردەگرتم، بە تاك دەیان فرۆشتەوە، بەڵام لەگەڵ قەدەری خوا هیچ شتێك ناکرێ، ئەوەندە هەیە ئەو گرتنە بوو بە هۆی ئەو زەرەرە گەورەیە کە لە باری ئابوریمدا لێم کەوت.

بە ئاشکرا و نهێنی کەوتمە سەردانی برادەرانی کوردە نیشتمان پەروەر بە تایبەتی کادرانی پارتی ناسراو لایەنگر و پاڵێوراوو دلسۆزان کەوتمە گفتوگۆ کردن ولێکوڵینەوە لەسەر بارودۆخی ئێستای کوردستان کە بە چ قۆناغێك تێپەر ئەبێت ئێستاکە دوای بریارەکەی عەبدولکریم قاسم کە بریارِی ئازاد کردنی بەندکراوەکانی دا قاسم نەی دەزانی حزب بریارِی شۆرِشی چەکداری ئەدا هەمو کوردێکی بەشەرف پشتگیریی لەم شۆرِشە دەکات بە سەرۆکایەتی بارزانی.

رووم ئەکردە هەر کوردێك پرسیاریان لێ ئەکردم، ئایا راستە کە بە شێوازێکی ناشرین رەفتاریان لەگەڵ کردوێت لە بەندیخانە؟

لەگەڵ ئەوەشدا کە بۆ زیاتر لە ١٠ ساڵ ئەچوو لە بەغدا ئەژیام وە زۆری برادەرکانیشم عەرەب بوون، بەڵام ئەم ئەزانی کە هەندێ عەرەب هەستێکی

شۆڤێنی تیادایە بەرامبەر بە کورد لە کاتێکدا کە دایکم ژنێکی پیرەو دێت بۆ لام بۆ بەندیخانە لەبەر ئەوەی عەرەبی نازانێت ئەبێ من بیرێم بۆ (کاروان) و لەوێ ئاشکەنجەو ئازار بدرێم ئەمەو چەندها ویرەوەری تر دەهاتنەوە یادم هاواریان دەکرد وەدیان وت رەفیق بیربکەرەوە چۆن ببیت بە (خولە پیزە) وتۆڵەی خۆت بکەیتەوە. بیرم ئەکردەوە کە منێك بە ژیانی قەلادزێ رازی نەبووم ئێستاکە لە بەغدام گەیشتمە نازو ژیانێکی بەختەوەر کە زۆر لاو خەونی پێوە ئەبینی.

بەلأم ئێستاکە هەستی کوردایەتی پالم پێوە دەنێ، کە بە زوترین کات رووبکەمە نام (پ.م)، ئەم بریارەم دا بەلأم دەبێ رای دایکم وهاوسەرەکەم وکمالی برام وەرگرم چونکە روبارو بازیان مندالن، یەکەم جار کەوتمە گفتوگۆ لەگەلْ دایکم کەچی بکەم کام رێگا بگرمە دەست لە کاتێکدا لە هەموو رویەکەوە شۆرش رۆژ بە رۆژ بە هێزتر دەبێت، ئینجا دوای ماوەیەکی کە ئاسایش دەست دەکاتەوە بە گرتنی خەلك منیش یەکێك ئەبم لە گیراوەکان ئایا فرمانت لەسەر چییە.

دایکم: یەك سەر پەسندی بۆچونەکەی منی کرد فەرمووی رۆژێك زوتر خۆت بگەینە لای مەلامصطفی بارزانی، خۆم سەرپەرشتی مالەکە ئەکەم (روبارو بارزیان هەمیشە لە باوەشم ئەبن)، کمال: خۆشحالی خۆیی دەربری ئامادەیی پێ نیشاندا بۆ پرکرنەوەی هەمو کەلێنێك لە مالەوە.

هاوسەرەکەم: هەر چەند ئەندامێکی پارتی بوو بەلأم سەخت بوو بە لایەوە کە من مالەوە بەجێ بهێلم، بەلأم هەستی نەتەوایەتی هەمیشە زالْ بوو بەسەر ویست و خۆاستەکانی دا.

پاش بیرکرنەوە لێکۆلینەوە لە چوونم بۆ ناو رێزی (پ.م) بە خۆشم.

- وت:/ شتێکی نەزانی لە بواری چەك و تەقەوە شەرِی پارتیزان دا دەیمەنان ناخۆیی جێگر بۆیە بە پێویستم زانی کە ئیشیك بۆ خوم رەچاوکەم ئەویش کاری (اسعافات) برین پێچی بوو بریارم دا کە پێویستە لەکاری

پزیشکی شتێك فێربم، ئەم دکتۆرە نیشتمان پەروەرانە کە شایانی باس کردنن یارمەتیێکی زۆریان دام ماوەی دووهەفتە لە گەڵم خەریك بوون بۆ شارەزابونم لەو کارە جار جار بە دلەیەکی سپیان لەبەر ئەکردم لەگەڵ یەکێك لە قوتابیەکانی پزیشك دکتۆر سەروەری کاکە حەمە دکتۆر ئەحمەد شاڵی و دکتۆر عمر دزەئی دکتۆر دارا ئەحمەد توفیق، بە شهادەتی هەمویان شارەزایەکی باشم پەیدا کرد وبریارم دا کە ئێستا ئەتوانم لەم بوارەدا لە خزمەت پ.م کوردستان بم نزیکەی دە کارتون دەرمانم کڕی مقداری هەزار دینارم تەرخان کرد بۆ ئەم مەبستە، لەسەر هەموو شوشەو پاکەتێك ئەم نووسیبۆ چ نەخۆشیەك باشە.

مامۆستا ئەنور مائی تێکۆشەر و رۆشنبیرو نیشتمان پەروەرهات بۆماڵەوە پاش گفتوگۆە کردن لە بارودۆخی ئێستای کوردستان وتی لەم هەفتەیەدا پەیوەندی ئەکەم بە (پ.م) پرسیاری کرد ئەی تۆ کەی پەیوەندی ئەکەی .

-وتم: منیش لەم روژانە ئەچمە ریزی (پ.م) لە رێگای موسڵەوە برادەرێکم هەیە یارمەتیم ئەدا ئەگەمە لای سەرۆك بارزانی.

-وتی: ئەم شۆڕشە بارزانی سەرۆکایەتی ئەکات، هیچ جیاوازێك نییە کە روو بکەیتە هەر ناوچەیەك بنکەی (پ.م)ی لێبێت، پاش گفتوگۆ رێك کەوتین روو بکەینە بارەگای (شاخی بەمۆ) بچینە خانقین یەك لە دوای یەك دوای ٥ رۆژ.

دەستە بەنرخەکانی دایکم ماچ کرد وتم انشاءالله جێ دەستم دیار دەبێت بەمە وشەی (کاروان) لە بیر خۆم دەبمەوە خودای مەزن تۆمان بۆ بهێڵێت.

ئەملاو ئەولای هاوسەرەکەم ماچ کرد چاوی کماڵی برام ماچ کرد ئینجا چاوی رووبارو بازیانم ماچ کرد ماڵ و مناڵم بە جێهێشت خواحافیزیم لێ کردن، دوو برادەر گفتیان دا نایەڵین پێویستیان بە هیچ شتێك بێت کومەکیان ئەکەین، بەڵام بە هیچ جۆرێ بەسەرییان نەکردنەوە.

دەرمانەکانم لە رێگای کاك عەلی عمری تەسلیم کرد، خۆشم بە (پاصی مصلحە) چومە بعقوبە لەوێشەوە چومە خانقین یەکسەر چوومە ماڵی کاك

(عەلی عیسی ئەرکەوازی)، لە ڕێگای ڕێکخراوی پارتی دوای چوار ڕۆژ پرسیار و ئاگاداری سەرەوە کرا، ئینجا بەرییان کردم بۆ ناوچەی شاخی بەمو کاتی بەهار بوو سعات ٥ئێوارە بە ئوتۆمبێلێکی پاص گەیشتمە مالی پ.م. جەنابی علی احسان بەگی شرف بەیانی لە گوندی (باخە هەنارە) وناوچەی رزگار کراو، شەو لایان مامەوە دوای نانخواردنی بەیانی نزیکەی ٤٠ دەقیقە ڕۆیشتین گەیشتینە بارەگای پ.م کاك حلمی عەلی شەریف و مامۆستا ئەنوەر مائی بە گەرمەوە پێشوازیان لێ کردم دڵ خۆشی خۆیان پێنیشان دام ئینجا یەکەیەکە برا پ.م کان بە خێرهاتنیان کردم ڕێزیان لێ گرتم یەکسەر بە دکتۆر ناوبرام ئیستاش دوای ٣٧ ساڵ ئەچمە ناوچەی دەربندیخان و کەلار بەموو هورین شێخان خۆمیان پێ ئەناسینم ڕێزم لێ دەگرن رابردوییان لە یادە سوپاس بۆ یەزدانی مەزن رودوای چەند مانگێك پێشوی ژیانم وەکو فیلیمك تومارکراو هاتە بەرچاوم بە داخەوە نووسەر نیم تاکو بتوانم هەستی خۆم بنووسم وە نازانم بە چ شێوازیك باسی بکەم، یەك وشەیە ئەویش (ئازادیە) سوپاس بۆ یەزدان مەزن بەندە خزمەتکاری کوردو کوردستان بووم بە هاوڕێ و شەریکی ئەم دڵسۆز شورگێرە پیرۆزانە کە کوردستان ڕزگار دەکەن.

## بنەماڵەی شەرف بەیانی:

وەسمان بەگ سەرۆکی هۆزەکەیانە ٤٠٠ ساڵ پێش ئێستا لە ناوچەی بادینان هاتونەتە ناوچەی هۆرین وشێخان، پیاویکی سەخی، ئازا، زیرەك، هاوسەرەکەی ئەختەرە خان خوشکی حامد بەگی جاف، کوری گەورەی علی احسان بەگ ئەندامی حزبی هیوا بوو،کوردێکی نیشتمام پەروەر بوو هاوسەرەکەی سلمەخان خوشکی شێخ عوسمانی بیارە، مەحمود خان کوری دووهەمی بوو خێزانەکەی بە فڕۆکە شەهید کرا، تەرمەکەی شەو لە گۆڕستانی بەمۆ دەریان هێنایەوە، بردیانەوە بۆ ئێران چونکە قەڵغانی بوو لە گورستانی خۆیان ناشتیان.

تاهر بەگ خاوەن گوندی بیلولە برای وەسمان بەگ بوو چەکدارەکانی کە لە براو کورەکانی پێك هاتبوو دەکەسی بوون هەموویان لە ریزی پ.م بوون، هەروەها جۆریی چەکییان تفەنگی برنەوە بوو شەو و ڕۆژ لە بارەگای دەربەندی بیلوله بوون جێ دەستیان دیار بو، ئەم بنەماڵەیە نەبونایە توشی چەند جۆرێك نەخۆشی ئەهاتی.ن بەلام بە هۆی یارمەتی ئەوانەوە نەبونیمان پێوە دیار نەبوو بە داخەوە وەکو بیستومە بارودۆخی داراییان زۆر زۆر خراپە کە چاوم پێیان ئەکەوێ چونکە ئەزانن لەوان خراپترم بە هیچ جۆرێك گەلەییم لێ ناکەن.

ئەم بنەماڵەیە چەند لە سەریان بنووسم کۆتایی نایە تەنها ئەم دوو دێرە ئەنووسم ئەلێم ئەگەر ئەم بنەماڵەیە نەبونایە کە سەرۆکەکانییان جەنابی وەسمان بەگ و تاهر بەگ وهەموو بەگزادەی شەرەف بەیانی نە بونایە بنکەی پ.م نەدەبو لەم ناوچەیە، ڕۆژێك بوو، ئەمان وت:(حزب فەقیر میللەت دوڵەمەند) بەلام ئێستا (حزب دەوڵەندە میللەت فەقیرە).

ئەم ناوچەیە کە بەهۆرین و شێخان ناسراوە زۆربەی دانیشتوانی خەلکێکی خاوەن بیرو باوەر هۆشیار بوون کاك نوری ئەحمەد تەها لە گوندی شمشێر کوڵەوە گەیشتوتە مهاباد پەیوەندی بە کۆماری مهاباد قازی محمد کردوە.

**پەیوەندی من و حلمی عەلی شەریف.**

لە ساڵی ١٩٥٤ یەکترمان ناسیوە تاکو ئەو ساتەی کە کوچی دوایی کرد برادەری و دۆستایەتیمان زۆر زۆر پتەو بوو. بەلام لە رووی بیرو بۆچونمانەوە زۆر زۆر لێك دور بووین من دوای خوای گەورەو پێغەمبەر کە مەلا مصطفیم خۆشویست ئەمە بە پیچەوانەی بۆچونی ئەوەوە بوو من کوردێکی مەلایی بووم وئەو پارتییەکی کورد بوو.

کە دوو بە دوو من و کاك حلمی گفتوگۆمان دەکرد لەسەر بارودۆخی وولات لەیەك خاڵدا یەکمان نەدەگرت ئەویش مەلا مصطفی بوو، لەیەکەم ڕۆژەوە کە هاتمە ناو پ.م هەمو هەوڵ و کوششی ئەو پیاوە ئەوە بوو کە کارنەکەمە

مێشکی پ.م وە بیانکەمە مەلایی هەر بۆیەش بە نهێنی بە پێشمەرگەکانی ووتبوو باوەڕی پێ مەکەن ئەمە دۆستی زەعیمە، هەرچەندە کاك حیلمی مسئولی یەکەم بوو بەڵام نەی توانی سەرکەوتوبێت لەم هەوڵەیدا سوپاسی بۆ یەزدان مەزن لە بواری پزیشکی دا سەرکەوتنێکی گەورەم بە دەست هێنا جگە لەوەی الحمد لله ئەو گوندانەی دەور و پشتی میدانیش نزیك شاروچکەی خانەقین ئەهاتنە لام وە لە خودای مەزن بە زیاد بێت دەرمانەکانم چارەسەری نەخۆشی ئەکرد.

## پەیوەندیم لەگەڵ برا پ.م کان:

بەگشتی لەگەڵ هەموویان وەکو یەك ئەجوڵامەوە، جیاوازیم لە نێواندا نە دەکرد ئەوانیش ڕێزیکی تایبەتیان لە من دەنا بە برای گەورە دایان دەنام، بە هیچ جۆرێك ڕۆژیك لە ڕۆژان ناکۆکییەك یا گرژییەك ڕووی نەداوە لە نێوان من و گشت برا پ.م کان، بۆ ئاگاداربیتان هەتاکو ئەم کات ژمێرە ئەوانەی ماون لە ژیاندا پەیوەندی دۆستایەتیم بەردوامە وەکو رابوردوو کە پ.م بوین پێکەوە چۆن برایەتیمان خۆش بووە ئێستاش هەر برایەتی بە هەمان شێوە هەر خۆشە بەڵام بە هۆی بارودۆخی ئێستاوە دور کەوتوبنەتەوە لە یەك دابراوین لەگەڵ زۆریاندا.

## پەوەندیم لەگەڵ دانشتوانی ناوچەی هۆرین وشێخان:

پێشەکی لەگەڵ وەسمان بەگ وتاهر بەگ و خانەوادەکەیاندا ئەوپەری دۆستایەتیەکی بە هێزم هەبوو سەران سەر لە خزمەتیاندا بووم بە هەموو توانایەکەوە چونکی ئەم بنەماڵەیە بە نان و بەرگی خۆیان لە خزمەتی کوردستاندا فیداکاربوون بەم کردەوە فیداکاریانەیان جێی خۆیان کردبووەوە لە گۆرپانی کوردستاندا بەڵام خراپەیەکی زۆر دەکران لەلایەن هەندێك کەسایەتیەوە ئەویش لەبەر ئەوە بوو کە سەرۆك هۆز و دەوڵەند بوون.

لەگەڵ جوتیار وشێخ ومەلای ئەو ناوچەیە پەیوەندی ڕۆژانەم بە هێز بوو ڕێزم لی دەگرتن ئامادەیی خۆم پێ نیشان ئەدان کە بەردەوام لە خزمەتیاندام.

لە هەموو جەولەیەکی پ.م دابەشداریم ئەکردوو بە دەنگە گەورەکەی خۆم وتارم ئە خۆیندنەوە بۆیان لە هەر کاتێکدا ئەگەر یەکێك بهاتایە وبیگوتایە کە نەخۆشەکەمان ناتوانێت بگاتە بارەگا بۆ چارەسەر کردن، زۆر بەپەلە شتەکانم دەپێچایەوە دەچووم بە دەنگییەوە گوێم نە ئەدایە ئەوەی دورە یان نزیك بە تایبەتی ئەگەر کەس وکاری پ.م بوایە.

کارەکان بەشی زۆری من پێی هەڵئەستام بەڵام بە ناوی کاك حلمی تەواو ئەبوو بەڵام لە دڵەوە وەکو پێویست نەبوو، جارجار ئەم وت بەبێ مەلا مصطفی هیچتان بۆناکرێت؟

**بارەگاکانی پ.م بریتی بوون لەمانە :**

١- دەربەندی بێلۆلە بارەگای سەرەکی ناوچەی خانقین بوو کە بریتی بوو لە ئەشکەوتێك جێگای ٢٠ پێشمەرگەی تیادا ئەبوەوە، کەوتبووە ڕاستی شاخی بەمۆ وجێگای حەوانەوەی شەو ڕۆژی پ.م بوو ئەم شوێنە نزیکەی ١٠ کم لە سنوری ئێرانیەوە دوور بوو، ئەگەر پشتت بکردایە تە ئێران دەستی ڕاستت دەربەندی بێلۆلەیەو دەستی چەپت گوندی بێلولەیە وە بەردەمەکەت گوندی باخە هەنارەیە.

٢- بنکەی سەرتەك هۆرێن.

٣-بنکەی شمشێر کوڵ: لە گوندی پشتی شمشێر کوڵەوەیە بە دووری ١٠کم ، ماوەی ١٥کم دوورە لە ناحیەی دەربەندیخان نیوانییان ئاوی سیروان.

ژمارەی پ.م: ئەگەیشتە ٣٥ کەس، ئەم ناوانەی خوارەوە بوون ئەگەر کەسم لەبیرنەچوبێت لەم بوارەوە داوای لێبوردن ئەکەم لەو برایانەی ناوم نەهێناوە.

حلمی عەلی شەریف مردووە، ئەنوەر مائی شەهیدە، ڕەفیق پشدەری ماوە،

وەسمان بەگ مردوە، عەلی احسان بەگ مردوە، حەمە رەشید بەگ مردوە، مەحمودخان ماوە، تاهر بەگ مردوە، کەریم تاشەیی کوژرا، مەلا عەلی مردوە، کوێخا محەمەد شمشێر کوڵی مردوە، صابر کوێخا محەمەد ماوە، عەلی فەیلی شەهیدە، عەلی سەلیم بگ مردوە، حمە باخە هەناری ناسراوە بە حەمە فریشتە لە شەڕی برا کوژی دا کوژرا، عەزەی ئاو رحیم لەشەڕی برا کوژی دا کوژرا، عەلی حاجی مشیر بوو بە جاش و کوژرا، رەزا قالە جاف بوو بە جاش کوژرا، رەشەی قالە جاف ماوە، کوێخا محەمەدی ناوماچك کوژرا،ئەحمەد هۆرینی ماوە، حەمەی وەلی کەرەم ماوە، حمە ئەمین کەلاری ماوە، عەزەی حەوا ماوە، خولە رەشاش ماوە،حەمەی صوفی صالح ماوە، محمود قەصلان مردوە، مامۆستا مەلا سەعید زەمناکو ماوە، حسێن حاجی محیالدین مردوە، حەمەی شمێرانی کوژرا، مەحمود صوفی ماوە، عەلی کاکە اللە ماوە، صالح پالەوان شەهیدکرا، عەزەی حەمە خنان ماوە.

**خوارد نمان**

بەیانیان نانووچای، نیوەڕوان پەتاتەی کوڵاو، ئێواران پەتاتەی سورەکراو، هەفتەی دوو جار ماستمان هەبوو، مانگی جارێك گۆشتمان ئەخوارد، (وەسمان بەگ وتاهر بەگ) هەریەکە حەیوانێکیان بۆ سەر ئەبڕین، ئەمە بڕیاری وەسمان بەگ بوو.

-گوتی: ئەمانە کیۆر ئەبن ئەگەر وا بڕوا گۆشت نەخۆن.

**جۆری چەك:**

وەسمان بەگ وبراو کورەکانی چەکیان برنەوە بوو، تفەنگی سێ تیری فەرنسی، ئینگلیزی، هوڵندی، برنەود، یەك دەمانچە برنەود، سێ دەمانچەی چوارده خۆر،

سەردانی دێیەکەو ئاوەکەیان کرد، ماوەی نیو سەعات لای پەیکەرە داتاشراوەکە راوەستان، بەڵام زیاد لە چوار سەعات سەرنجی سەرو چاوی ئاوەکەیان داو وە ئەو شوێنەی کە لە شاخەکەدا بوەوەبە جۆگە وایپێ دەچو توشی سەرسورمان بوبن.

## شاخی بەمۆ

شاخێکی زۆر سەختە ئاوی یەکجار زۆر کەمە بەڵکو نییە، کاتێك کە ئەم ناوچەیە ئابلوقە دراوە ماڵو منالێیان هاتومنە سەروویی شاخەکەوە لەوپەری بێ ئاوی شاخەکەدا لە سەرووی شاخەکەیان داتاشیوە حەوزی گەورەیان دروست کردوە بۆ ئەوەی کە ئاوی تیا پاشەکەوت بکەن. چ ئاوی زستان یا ئاوی بەهار، حەیواناتی یەکجار زۆرە وەپڵنگ وبەرازو ورچ وحیوانە کێوی زۆر زۆر هەبوو زوو زوو گۆشتیان بۆ ئەهێناین، خاوەن ئاژڵەکان ناو بە ناو هانایان بۆ ئەهێناین کە بیست سەر بزنیان نەهاتومتەوە ودابراوە لە شوانەکەی،( پ.م)کان لە گەڵیان دا دەگەڕان دوای ماوەیەك لاشەی حیوانەکانیان ئەدۆزیەوە، ئەمە ئیشی پلنگ بوو، بەراز بە شێوەیەکی ئەوتۆ هەبو زۆر ئەبینران پیاوە پیرەکان ئەیان گێرایەوە (٥٠-٧٠)سەر بەرازییان لە ساڵی پەنجاکان دا بەیەکەوە بینیوە. رۆژێکیان چەند برادەرێکی رێکخراوی پارتی هاتن سەردانی مامۆستا حلمییان کرد یەکێکیان لەو برایانە کاك

---

کەمال لە کۆتایی قسەکانی دا دەفەرموێت مادام ئێوە مانگانەکەم لێ قبوڵ ناکەن ئەوا من پارچەیەك زەوی لە زەویەکانی خۆم لە سلێمانی ئەکەم بە ناوی کاك رەفیقەوە بۆ ئەوەی بۆ منداڵەکانی بێت.

کاتێك کە بەربووم لە بەندینخانە، ئەو پارچە زەوی یەم فرۆشت وپێی چوم بۆ (لندن)، وە لەوێ هەفتەی دووجار جەنابی عەلی کەمال دەهاتە لام.

رۆژێك فەرموی رەفیق جوان نی‌یە من ئەوەند بەم جۆرە ئەرکم بەسەر تۆوەبێت.

وتم: جەنابی کاك عەلی هەرپارەی زەویەکەی تۆیە من لێرە دەیخۆم.

حەمەی مەرج بوو پیاوێکی تێکۆشەرو خاوەن بیروباوەڕ بوو و لێرەوە لەگەڵ ئەو پیاوە بەڕێزەدا یەکترمان ناسی.

## پەیوەندی سەرباز

سەربازێك بە نهێنی هاتە بارەگای پ.م دوای گفتوگۆو لێکۆڵینەوە هاتوچۆکردنی ٣جار لە بارەگایەکی دەربەنیدخان وتی: دەسەرباز ئامادەن بێنە ناو پ.م بە چەکەوە وەرنگە بە کارێکی گرنگ هەستین، ژمارەی ١٠ پ.م خۆیان ئامادەکردو لە کات وشوێنی دیاری کراودا چاوەڕوانیان کردن، لە ناویان تەنها من و کاك عەزیز حەمە خنان مەلەوانیمان ئەزانی لە شوێنی دیاری کراو چاوەڕوانیمان کردن شەو تەقە دەستی پێ کرد ئێمەش لەڕاست خۆمانەوە کردمان بە تەقە بارەگاکانی سوپا بەردەوام بوون لە تەقەکردن تاکو بەیانی.

بەتەنها یەك سەرباز هات وتی ئاشکرابووین، بەیانیەکەی پێش ڕۆژ هەڵات پەڕینەوە کاك حلمی لە گوندێکی ئەو ناوە چاوەڕوانی ئەکردین.

وتم: کە هاتین بگەڕینەوە ئاوەکەیان کرد بوەوەو پەڕینەوە زۆر زەحمەت بوو هەرچەندە برا پێشمەرگەکان هاوارو قیژەیان کرد وڵامم نەدانەوە، نەمتوانی ئەم ئەرکە هەڵگرم، ئایا کاك حلمی: من دەکتورم یا مەلەوانم..؟ لە کاتی پەڕینەوەمدا سەرەنجی خۆم دا کە مرۆڤ خۆی روت کردەوە هەمووی وەکو یەکە بەڵام ئایا من چیم زیاترە (جلو بەرگ و پێڵاوو دەمانچەکەم خستە ناو جامەناکەم لەسەر سەری خۆم داناوە بە دەستێك گرتم وە بە دەستکەی کەش تفەنگ و برا پ.م گرتو بووە بۆ پەرانەوە.

یەکەم جارە سەرباز بە خودی خۆی بێتە ریزی پ.م بە ناوچەکە دا ئەمان گێڕا لە ناو گوندەکاندا پروپاگندەمان پێوە ئەکرد، چەکێکی زۆر گرنگی پێبوو ناومان بیستبوو بە چاویش بینیبومان بەڵام تەنها بەدەست سەربازە وئەمە یەکەم جارە لەم ناوچەیە بەشانی (پ.م )ەوە بێت ئەویش کلاشینکۆف

**هەڵوێستی پ.م:**

خاوەن مەعنەو یاتێکی بەرز بوو وەقارەمان و کوڵنەدەر وئازابوون، خووزەوشت بەرزو دواین پاك بوون، کاتێك فەرمانێکیان بۆ دەرئەچوو بەبێ ئەوەی بپرسن لە ١٠٠٪جێبەجێیان دەکرد، و گورج وگوڵ بون لە کارەکانیاندا، بەراستی نمونە بوون لە هەموو رویەکەوە بۆ خزمەتی کوردستان.

**پەیوەندی پێشمەرگە**

ئەگەر بەراوردیی بکەی لەگەڵ هێزی دوژمن هیچ حسابێکی ژماردیی بۆ نەدەکرا، بەڵام بەهۆی ئەوەی جەماوەر بە تێکرایی دەستیان دابووە باڵی پ.م. بە هەمو جۆرێك یارمەتیان ئەدان هێزی پ.م گەیشتە ئەوەی بە هیچ جۆرێك دوژمن ناتوانێت بەرەنگاری ببێتەوە تەنها بە هۆی دووبەرەکییەوە نەبێت.

ئاگاداری هەموو جموجوڵێکی دووژمن بوون بە تایبەتی لە بەعقوبە وجەلەولا و خانقین وکەلار دەربەندیخان، شەو یان ڕۆژ ڕوومان بکردایە هەر گوندێك دانیشتوانەکەی بەرگەرمەوە پێشوازیان لێ دەکردین بە هەمو توانایەکیانەوە دەستی یارمەتیان بۆ درێژ دەرکردین بە گشتی پەیوەندی نێوان پ.م ودانیشتوانی ناوچەکە زۆر پتەو بوو، بە جۆرێك لە هەڵوێستیاندا لە یەکتری جیانەدەکرانەوە بەپێچەوانەی ئێستاوە.

**ژیانی ناوچەکە**

سەرچاوەی ژیانی ئەم ناوچەیە ئاژەڵ بە خێوکردن و کوشتوکاڵ کردن بوو، گونم و جۆو برنجی بیلولە بە ناوبانگە و گوندی دەربەندی بیلولە وسەرتەك باشترین و خۆشترین گوێزو هەنجیر و قۆخ و قەیسی یان هەیە وە گوندی سەرتەك لە هاوینە هەوارەکانی کوردستانە.

## رێگاو بان

هاتوو چۆکردن یا بەپێ یابە وڵاخ بوو ئوتومبێل ئەگیشتە گوندی بیلولە لە شەڕی عێراق وئێران دا بەعس لەبەر بەرژەوەندی خۆی نەك لەبەر کورد. جادەی بردە سەران سەری سنور وسەرتەکیش بێبەش نەبوو لەم کارە.

## مۆزەخانە -متحف

٣٠٠مەتر دوور لەئەشکەوتەکە بەردێکی داتاشـراوی لێیە کە درێژیـەکی نزیکەی دوو مەتر ونیو و پانیەکەی مەترو نیوێك دەبێت کە پەیکەری مرۆڤێکە بە چەکی ئەو کاتە زاڵ بـوەوە بەسـەر دوژمنەکـەی دا مامۆسـتا ئەنومرمائی ئەی وت بەخـەتی (مسماری) نوسـراوە ئەوە پێنیشان ئەدا کە ئەمە (ئەنونو بانونییە) کوردە ئابڵوقە دراوە، بەڵام دوایی بەسەر دوژمندا زاڵ بووە.

لە کۆتایی گوندی دەربەندی بیلولە لەسـەر چاوەی کانیەکە ئاوی کانیەکە راکێشراوە بە درێژایی زیاد لە ١٠ کیلو مەتر لەو شاخە بەردیان داتاشیوە،بۆ ئەوەی ئاودکەی پیادا بڕوات وسمان بەگ وتی: لـە سـاڵانی (سیەکاندا) باڵیۆزی بەریتانی ولەگەڵ دوو کەسی ئینگلیزی کە ئەو کات بەهار بوو هاتنە باخە هەنارە (عەلی کمال)[٩] معاونی پولیس بوو لە خانەقین.

---

[٩] -کاتێك کە لە ساڵی ١٩٧٦دا من گیرام بیێ سەرو شـوێن بوم بەرێز کاك (عەلی کەمال)جەنابی عەقید فایق دەنێرێتە ماڵی ئێمە بە مەبەستی ئەوەی یارمەتیان بدات وبرێك پارەیان مانگانە بۆ ببرێتەوە، دایکم پێی دەڵێت زۆر ڕێزمان هەیە بۆ کاك عەلی کەمال وپێی ڕابگەیەنە کە پێویستیمان بە پارە نییە، لە دوای ئەمەکە عەلی کمال خۆی دەچێت سەردانی دایکم ئەکات و دەڵێت دایکی کاك ڕەفیق بۆم کردنە (٣٠٠)دینار مانگانە لە وەڵامدا دایکم دەڵی کە پارەکەم وەرنەگرتووە لەبەر ئەوە نەبوو کەم بوبێت بەڵکو هەر پویستیمان بە پارەی نییە بۆیە وەری ناگرم. عەلی

بوو.(لەم دووایییەدا هەواڵی ئەو سەربازەم پرسی ووتیان شێت بووە).

## شەڕی نێوان پ.م وچەکدارەکانی شیوعی:

لەیەکەم ڕۆژی گەیشتنمەوە بۆ بنکەی شاخی بەمۆ ڕۆژی دوو دەرزیم لە مامۆستا حلمی عەلی شەریف ئەدا کە زامدار کرابوو بە دەست چەکدارەکانی شیوعی.

بە دووروودرێژی بۆی باس کردم کە ناکۆکیەکان گەیشتن گەیشتوەتە چ رادەیەك ووتی: ئێمەی پارتی بە ئاشکرا رووبەڕووی حکومەتی قاسم وەستاوینەتەوە ئەجەنگین، شیوعیەکان ڕێگامان لێ دەگرن بە هەموو جۆرێك، پروپاگەندیەکی زۆرمان بۆ ئەکەن لەهەموو گوندێك دەژایەتیان دەکردین سەرنجم دا پ.م کان گرژن بەرامبەر شیوعیەکان بە جۆرێك ئەگەر وا بروات حکومەتی قاسم یان لەبیر ئەچێتەوە و هەر یەکە لەڕاست خۆیەوە دەستی لەسەر پەلەپیتکەی تفەنگەکەی بوو، بە نهێنی دەربارەی ئەم ناکۆکیە گفتوگووم لەگەڵ کردن بەشی زۆریان ئەیان وت ئەبێت ئێرە پاك کەینەوە لە شیوعیەکان، تەنها دوو پ.م نەبێت ئەیان وت زۆر غەڵەتە ڕاست نیە بەلاَم ناوێرین لای مامۆستا حلمی ئەوە بلێین، لەگەڵ وەسمان بەگ و کورەکانی قسەم ئەکرد ئەیان وت هەرچی شیوعی هەیە بۆ کوشتن باشە هەروەها ئەیان وت نابێت لێرە یەك ماڵیان بمێنێت، خۆشم لەگەڵ خۆم قسەم ئەکرد بیرم ئەکردەوە وئەم وت ئەوا بۆ شەش مانگ دەچێت من لە ناو (پ.م)دام وهاتومەتە ئێرە بەشەو بەڕۆژ هاتوچۆ ئەکەم لە نێوان گوندەکان دا بە هۆی ئەوەی کە دەکتۆرم خەڵك دێت نەخۆشییان هەیە ڕۆژێك یا شەوێك چەکداریکی شیوعی ڕێی لێ نەگرتوم.

(شەو مامۆستا حلمی ئاگاداری کردم کە هێرش دەبەینە سەر شیوعیەکان خۆت ئامادە کە) کاتێك گەیشتینە گوندی هۆرین هێرش دەستی پێکرد، من ئەمە یەکەم کاتە لە ژیانمدا بکەومە ناو شەڕەوە نەمدەزانی وشارەزا نەبووم لە ناوچەکە کاتێکم زانی کەوتمە ناوەندی شەڕەکە لە دوو لاوە تەقایان لێ

کردم یەك سەر وەكو فیلمی سینەمای خۆم کرد بەمزدوو خۆم تلۆر کردەود وەکو باگردێن تاکو کەوتمە پەنا بەردێکی گەورە هاوار هاوار دەستی پێ ی کرد دکتۆر رەفیق کوژرا سەرم هەڵنەبڕی تاکو پێشمەرگە گەیشتە سەرم، کوژراو زامدار لە هەردوو لا هەبوو لای ئێمە ئازەترین (پ.م )کە ناسراو بوو بە پاڵەوان شەهید کرا وحەوتیش لە پ.م زامدار بوو.

سوپاس بۆ یەزدانی مەزن زامدارەکانم بەسەرکەوتوی نەشتەرگەری کردوو دوای ماوەیەکی کەم هەمویان چاك بونەوە پ.م کان مەرو ومالاتێکی زۆریان هینا هی ماڵە شیوعیەکان بوە، شەوێك شیوعیەکان هێرشیان هێنایە سەر ئەشکەوتی دەرەبەندی بێلولە وچوار دەورریان لێ گرتین ونەیان هێشت یەك پ.م لە بارەگاکەی بێتە دەرێ وهەموو مەرو ماڵاتەکانی خۆیان بردەود وخەڵکی گوندەکە بە نهێنی یارمەتیان دابوون لەرێ ی خزمایەتیەوە بۆیە توانیان سەرکەوتن بە دەست بێنن.

ئێمە وشیوعیەکان (١٥) ڕۆژ بەرامبەر یەکتر ڕاوەستاین وهەردوو لا شەووڕۆژ لە حاڵەتی ئامادە باشی دا بووین دەستیان لەسەر پەلەپیتکەی تفەنگەکەیان بوو، چاوەڕوانی فرمان بوون. لە پر نوێنەری (پ.د.ك) وشیوعیەکان تەشریفیان هێنا بۆ بنەبر کردنی وەزعەکە کاتێك سەرنجم دایە نوێنەری (پ.د.ك) سەیرم کرد بەڕێز کاك (محەمەدی حاجی تاهر)(*)ە منیش لەبەری هەڵسام وزۆر بەگەرمیەوزە پێشوازیم لێکرد وئەویش زۆر بە گەرمیەوە جوابی دامەوە چونکە لەوەپێش یەکترمان باش ئەناسی و لەگەڵ ئەوەشدا خزمایەتی یەکی دووریش هەبوو لە نێوانمان بە چرپەیەك پێم وت

* لە بنەماڵەیەکی کورد پەروەردا هاتۆتە دنیاوە، کادرێکی کۆنی پارتی بووە سەرانسەری ژیانی خۆی تەرخان کردووە بۆ خزمەتی بزوتنەوەی کوردی ولەساڵی (چلەکانەوە) لەکاتێکدا (انشقاق) لە نێوان پارتی وباڵی مەکتەبی سیاسی جەماعەتی مام جەلال رووی دا ئەویش یەکێك بوو لە سەکردەکانی، کادرێکی باك وزیرەك بووە و خاوەنی خورەوشتێکی بەرزەوە بەجەلالی ناسراوە.

من لێرە (د.رەفیقم)پێ دەڵێن، وتی ئەمە تۆ (د.رەفیق)ی تا گەیشتومەتە ئێرە هەر باسی تۆیان بۆ کردووم، ئینجا وتم وەکو خۆت ئاگاداری پ.م زۆر حەز لە جەولەکردن دەکات و حەزی لەبە هێرش بردنە سەر شوێنێك وشەڕی چەند سەعاتی هەیە، وە ئەوە بۆ ماوەی (٢٠) ڕۆژ دەبێت بە بەردەوامی ڕۆژ لەسەنگەردا دەکەینەوە بۆیە وام پێباشە بە زوترین کات ڕێکمان بخەیت، چونکە ئەگەر وەزعمان بەم شێوەیە بمێنێتەوە ئەوا یان توشی بەرەنگاری بونەوەیەکی خۆێناوی دەبین لەگەڵ شیوعیەکاندا، یان ئەوەتا (پ.م)ەکان سەنگەرەکان بەجێدەهێڵن.

دوای گفتوگۆیەکی دوورو درێژ هەردوو لا ڕێك کەوتن، سوپاس بۆ یەزدانی مەزن کە بەربەرەکانیەکە رووی نەدایەوە.

چەند تێبینی و ڕوون کردنەوەیەك لەسەر ڕووداوەکان:

١-بنەماڵەی شەرەف بەیانی لە ناوچەی هۆرێن و شێخاندا زۆر دەست ڕۆیشتوو بوون، بۆ نمونە وەسمان بەگ بۆی گێرامەوە کە لەساڵی چلەکانەوە بەکۆڵی جوتیارێك بردویانە بۆ سەرتەك.

٢-وەسمان بەگ بەلای شیوعیەکانەوە یەکێکە لە دەرەبەگە ناسراوەکان.

٣-شیوعیەکان لە کۆنەوە بنکەیەکی جەماوەریان هەبوو لە ناوچەی هۆرێن وشێخان جوتیارێك بۆی گێرامەوە کە هەموو مانگێك (٥٠)فلسی داوە وەکو ئابوونە، دانیشتوانی ناوچەکە بە بیروباوەرەوە بووبونە ئەندام لە حزبی شیوعی دا، کادری مەزنیان تیادا هەڵکەوتبو وەکو نمونەی مامۆستا مەلا ئەحمەد بانیخێڵان وە ئەم پیاوە بەشی زۆری کاتەکەی لە ناوجوتیاراندا بردۆتەسەر ڕۆژێکیان لە ناو گشت برا (پ.م)ەکاندا وتم (پارتی شانسی باشە ئەگەر حزبی شیوعی لەم ناوچەیە بە شۆرش هەڵسایە بە هیچ جۆرێك جێگای (پ.د.ك) لە ناوچەیە نەدەبووەوە. بەڵام سوپاس بۆ یەزدانی مەزن ئەوان دروشمی سەر زمانییان ئاشتیە دیارە فەرمانەکەیان لە روسیاوە بەم جۆرە بۆ هاتووە.

٤-شۆڕشی ١٥ تەموزی ١٩٥٨ بەسەرۆکایەتی زەعیم، ئینجا دابەش کردنی زەوی بەسەر جوتیار.

٥-حزبی شیوعی بە ئاشکرا بەیانی بڵاوکردەوە دژی شۆڕشی چەکداری.

٦-پ.م کانی بەمۆ هەموویان ٢٥ کەس بوون لەوانە (١٠ پ.م یان خەڵکی (کەلار و جاف بوون) ژمارەی (١٢)کەسیان خەڵکی هۆرێن وشێخان بوون، ئەوانیش بەش زۆریان لە بنەماڵەی شەرەف بەیانی بوون.

٧-مامۆستا حلمی عەلی شەریف لەو ناوچەیە لەبەر زۆر هۆ سەرکەوت و نەبوو، خۆیی وا هەستی ئەکرد کە شیوعیەکان کوسپن لە ڕێگای ئەو دا بۆیە لە ناخی دا بریاڕی دابوو لە گەڵیان بجەنگێ بەڵام نەخێر زۆر هۆی کە هەبو بۆ سستی (پ.د.ك) لەو ناوچەچەدا.

٨-ئێستاش نەم زانی حزبی شیوعی یا (پ.د.ك) کامیان ئەم شەڕەیان بەرپاکرد.

لە دوای کۆتایی شەر لەناو پارتی دا صالح پاڵەوان شەهید کرا کە زیانێکی گەورە بوو وە ئەم شەڕە بوو بە مایەی رەخنە بۆ مامۆستا حلمی چونکە ئەو فەرمانی دا خۆشی ٢٥ کم لە شەڕەکەوە دووربوو وە هەروەها سەردانی زامدارەکانی نەکرد وەکو پێویست.

دانیشتوانی ناوچەکە چ پارتی وچ شیوعی بە گشتی بەقسە نارەزاییان دەردەبری، بە گشتی ناوچەکە ئەیان وت پێویستە حزبی شیوعی کۆمەکیان بکات یا هیچی کە پرۆپاگەندە نەکات دژی پ.م پارتی.

وردو وردە دانیشتوانی ناوچەکە روویان ئەکردە بارەگاکانی پ.م سەریان لە برا (پ.م) کان ئەدا، ئەو ٢٠ ڕۆژە بە بەردەوامی بە دیاریانەوە بووم ولە گەڵیان دا لە هەموو شەریکدا بەڵام بڵێم چی شەهید نەبووم. چاك بونەوەی زامدارەکان بۆ یەزدانی مەزن سەرکەوتنێکی گەورەبوو لە هەموو رویکەوە بۆ شخصی من لە ٨٠٪ دانیشتوانی ناوچەکە وگشت برایانە پ.م بە پیرمەوە ئەهاتن بە جۆرێك ڕێزیان لێ ئەگرتم توشی سەرسورمان بووم ئەگەر

هەلبژاردن بکرایە من ئەبووم بە لێپرسراو.

کاك حلمی ئەوەی باش ئەزانی بە بەردەوامی ئەی وتەوە کە هەموو ئەندامێکی پارتی پێشمەرگەیە بەڵام هەموو پێشمەرگەیەك پارتی نییە.

منیش ئەمزانی ئەوەی لەگەڵ منە (بۆکیځ لەگەڵ تومە و خەسو گوێت لێبێت) چونکە ئەو کاتە بیروباوەڕ و عەقڵم هەمووی مەلایی بوو (بارزانی).

دوای ئەوەی هیچ کێشەو گرژییەك نەما نوێنەرانی پارتی و شیوعی هەریەکە گەڕانەوە بۆ جێگای خۆیان. مامۆستا حلمی وتی مشکلەی گەورەیی ئێمە ئەوەیە کە چەکمان نییە وا مام جەلال بەرەو شارۆچکەی پێنجوین دەڕوات وچەند پێشمەرگەیەك ئەنێرم تاکو ژمارەیەك چەکمان بۆ بنێرن، ناوی من لە ئارادا نەبوو بە هیچ جۆرێك.

کاك حلمی وتی: حەز ئەکەم بە کاك محەمەد بڵێیت منیش با بێم تاکو لە نزیکەوە لەگەڵ مام جەلال قسەبکەم.

منیش چووم بە کاك (محەمەد)م وت حەزدەکەم بێم لەگەڵتا بەڵکو چاوم بە مام جەلال بکەوێت، کاك محەمەدیش گەڕایەوە بۆ لای کاك حلمی وتی کاك رەفیق زۆر جەخت لەسەر ئەوە دەکات کە بێت لەگەڵ مندا، کاك حلمیش وتی قەیچێکە بیبە لەگەڵ خۆت، بەڵام من نەم دەزانی کە ئەمە پیلانێك بوو لەلایەن مامۆستا حیلمییەوە بەرامبەر من چونکە ئەوکاتە من لە سیاسەتدا تازە بووم.

هەر لێپرسراوێك فەرمانێکی بەسەرما بدایە بەڵێ جوابم دەدایەوە دەست بەجێ بە کارەکە هەڵدەستام. خودا حافیزیم کرد لە مامۆستا حلمی وئەنوەر مائی، وە هەروەها هەموو برا پ.م کان بە تایبەتی لە جەنابی وەسمان بەگ شەرەف بەیانی و کورەکانی.

وتم جەنابی وەسمان بەگ انشاءالله رۆژێك دێت کوردستان رزگار ئەبێت منیش ئەو شەرەفەم پێبدرێت کە دەست درێژکەم بۆ جەنابتان لەبەر چاوی جەماوەردا بڵێم ئەگەر ئەم زاتە پیرۆزە مەزنە نەبوایە پ.م لە شاخی بەمۆ

نەدەبوو، کاتێك پ.م بارەگای لە دەربەندی بێلولە بوو ژیانی ڕۆژانەمان لەسەر ئەو بوو (حزب فەقیر میللەت دەوڵەمەند).

کەوتینە ڕێگا لە خزمەتی کاك محەمەد حاجی تاهر دا وە بەلێپرسراوێتی کاك حمەی وەلی حمەی کەرم وە ئەم برا پ.م نەشمان لەگەڵ بوون.

مامۆستا شێخ محەمەد امین[١٠] (عبابیلی) لەگەڵ (٥) پ.م هاتبونە لامان کەیارمەتیمان بدەن لەو شەڕی لە نێوان پارتیو شیوعی دا ڕووی دا بەلاّم کە گەیشتنە ئەویّ شەڕ تەواو بوو بەڕاستی لە هەموو ڕوویەکەوە شایانی باس کردن بوون.

ژمارەمیان بوو بە ١٢ پ.م شەوگیشتینە گوندی (تاوگۆزی) کە خوالێخوشبو شاعری بە ناوبانگی کورد مەولەوی لەم گوندە هاتوتە دنیاوە هەزار مليون رەحمەت لە خۆت وناوچەکەت کەپێ دەڵێن تاوگوزی.

شەو دوای نان خواردن کاك محەمەدیان جیاکردەوە لە دەرەوە پیان وت کابرایەك رانکوچوغەیەکی سپی لەبەردابوو وماوەیەك پێش ئێستا کە هاتە لامان بە میوانی وئێسترێکی لێ وەرگرتین بردی نەیهێنایەوە وەمن هەرچەند دیقەت لەم دەدەم بەو کابرایەی ئەزانم، دوای گفتو گۆ و لێکۆڵینەویەکی چەند سەعاتی ئینجا کابرای خاوەن ئێستر بروائەکات کە ڕانکو چوغە سپی دکتۆر رەفیقە کابری دز نیە نەوەك واحاڵی بوبێت کە هەرچی سمێل سور بوو همزە ئاغایە، لەوەشەوە بوینە برادەر لەگەڵ ئەم خاوەن ماڵەدا چەند جارێك هاتو چۆم ئەکردو ئەمامەوە بە میوانی ڕۆژی دووەم دور لە شارۆچکەی هەڵەبجە بە سێ سەعات بە تەنیشت گوندێك دا تێپەر بویین پیاو ژن و منالّ دەورپشتیان گرتین بە چەپڵەو هەلهەلەو گریان باوەشیان پیا کردین و پارانەوە شەو لایان بمێنینەوە ژنێك ڕووی کردە من وتی کاکی پ.م

---

[١٠] لەبنەماڵەیەکی ناسراو، دەرچوی کولیژ، مرۆڤێکی نیشتمانی پەروەرو خوێندەوار و ئازاو شورشگێر بوو و جەماوەری زۆر بوو ڕێزیان زۆر لێ دەگرت.

کورەکەم نەخۆشە لە ڕانکو چوغەی خۆت پارچەیکم بۆ لیٚ بکەرەوە ئەی دەم بە منالّەکەم بەلّکو خوا شفای بۆ بنیٚریٚت لە دلّی خۆمدا وتم انشاالله خوا لەبەر خاتری دلّسۆزی ومتمانەی ئەم ژنە بە (پ.م )خبوا کوردستان ڕزگار دەکات، ئەوەند خوشحالّ بووم تیٚر تیٚر دەستم کرد بە گریانی خۆشی، سوپاس بۆ یەزدانی مەزن کە پ.م .کوردستان بەم جۆرە جەماوەر باوەڕی پیٚ ی هەیە، ڕیٚکخراوی هەلّەبجە ئاگادار بوون کە ئیٚمە دەگەینە ئەوەیٚ ئیٚستاش نازانم چونیان دابەش کردین لە ڕیٚکوپیٚکی ئەو دابەش کردنە سەرم سورمابوو دووبە دوو هەریەکیان بردین بۆ مالّیٚك، منیان بردە مالّی جمالّ خەفاف وە کاك حمەی فرج م لە دیوەوە یەکترمان ناسی ئیٚستاش هەر شانازی بەو یەکتر ناسینە ئەکەم چونکە ئەم پیاوە پیاوی تەنگانەیەو ڕۆژی لیٚ قەومان بە هاناتەوە دیٚت.

ڕۆژی دووهەم ئیٚوارەکەی لەگەلّ یەکیٚکی شارەزە دارۆیشتم کوچە کوچە تاکو نزیك مالّی قائمقام بومەوە، بە تەنها رویشتمەوە بەردەرگای پاسەوانەکەی پرسیاری کرد چیت دەویٚت ولاٚمم دایەوە کیٚشەم هەیە ئەمەویٚت چاوم بە قائیمقام بکەویٚت وخۆی ئەم ناسیٚت تەماشای جل و بەرگم مەکە کە دراوە، ئینجا رۆیشت کە هاتەوە ڕیٚگای پیدام بچمە ژۆریٚ، کاتیٚك قائمقام چاوی بە من کەوت ئیشارەتی کرد بۆ پاسەوانەکەی ئیٚرە بەجیٚ بهیٚلە، کاك (کانبی دزەیی[11]) بە گەرمەوە بە خیٚرهاتنی کردم بانگی هاوسەرەکەی کرد حوشکە رمزیە خان ئەمە ئەناسیتەوە ئەوە کابرای سەعات فرۆشەکەی بەغدایە، بە جۆریٚك ڕیٚزیان لیٚ گرتم شەرمەزار بووم.

وتی چۆن وا هاتویتە ئیٚرە ناوت زۆر دەبریٚت لەم ناوەوە ئەگەر بگیریٚت رزگارت نابیٚت.

[11] لە بنەمالّەیەکی هۆزی دزەئی ناسراو، دەرچوی کولیژی یاسایە، کوردیٚکی نیشتمان پەروەر زیرەك، سیاسەتمدار، برازای خوالیٚخۆشبو خدری احمد پاشایە.

وتم: پرسیارت لێ ئەکەم کەی پارەی دائیرەی توتن دێت.

وتی: فەرمووی بڕوابکە من نازانم بە ئوتوموبێلیەکی تاکسی دێت وکاتی هاتنەکەی زانراو نیەو لە پڕدا دێت، ناردی رانکو چوغە پشتێن وکڵاشیان بۆ هێنام وبری (دە) دیناری دامی.

(۳) هەڵەبجەمان بەجێ هێشت بنارە وبنار ڕۆیشتین دوای ۳سێ ڕۆژ نزیکی دارۆخان بوینەوە لەگەڵ ئەو هێزەی بەسەرۆکایەتی مام جەلال هاتبوو تاکو شارۆچکەی پێنجوین داگیرکات لەوی یەکترمان گرتەوە، دوای سڵاو چوینە ریزی ئەو هێزەوە وەکو پ.م یەك، مامە وتی با حەمەی مام وەلی بچێتە پێشەوە چونکی گەنجێکی ڕێك وپێکە بوو تفەنگێکی برنەوەی درێژی دار شوشەی پێبوو فەرنجیەکی سپی کەفشانی لەبەردابوو هۆی ئەوە بوو مام جەلال کە چاوی پێ کەوت فەرمووی بچێتەپێشەوە.

حمە ڕەشید خان وکورەکانی هاتن بە پیرمانەوە یەکەیەکە دەستیان خستە ناودەستی هەموو پ.م .کان بە گەرمەوە بەخێرهاتنی هەمومانیان کرد.

مام جەلال خودی خۆی لاستکێکی دڕاوی لە پێدا بووە وە هەموو لەشی قوراوی بوو، تەنها دەم و چاوی قوری پێوە نە بوو بە کورتی لەو کریکارانەی ئەکرد کە (قور ئەشێلن)

حەمە ڕەشید خان فەرمووی کاتێك بانەمان گرت خێزانی ئەفسەرەکان مەنرسییان لێپەیدا بە بوو داوای منیان کرد کاتێك چوومە ناویان بەیەك دەنگ وتیان (ان خانە) ئەمەیە خان ئێستاش مام جەلال لەو ڕوژەی مـن ئەکات، چونکی بە جۆرێك جلو بەرگی تۆزاوی و قوراوی و پیس بوو زۆریان لاسەیر بوو.

حەمە ڕەشید خان کاتێك دەست بەسەر بوو لە شاری کەرکوك هاتوچۆی دوکانی حەمە ئەمینی شەربت فرۆشی ئەکرد لە ساڵی ۱۹۵۳ئەو کاتە یەکترمان ناسی ومنی ناسیەوە.

ژمارەی پ.م زیاد لە ۴۰۰کەس ئەبوو، نانخواردنی نێوەرۆ وئێوارە بە

تێکرایی له خزمهت خاندا نانمان ئهخوارد گهورهو بچوك جۆریی خواردنهکهی وهك یهك بوو ههردوو کهسه له سهر یهك سینی نانمان دهخوارد کهسهر سینیهك پێك هاتبوو له (قاپێك برنج و قاپێك شله وقاپێك گۆشت و زهلاته دوو قاپ کاستر، چوار نان دوو پهرداغ ماستاو.

پیاوێکی بالا بهرز که جلوبهرگێکی رێك و پێك لهبهردابوو تفهنگێکی برنهوهی له شان دابوو چای دابهش ئهکرد پیاله چاکانی یهکه یهکه لهسهر سینیهکی زهردی پاك دا ئهنا ئینجا خۆی پشتاوپشت ئهگهڕایهوه.

من ئهو کاته ههرچی یهکم بدیبایه تۆمارم ئهکرد له مێشکم بۆ ئهم رۆژه.

دوای (٥) ڕۆژ (کاك محمود کاوانی دارو خان[١٣] ) بهجێ هێشت.

مامه فهرموی تۆ بچۆ له بنکهی دڕی ماوهت دانیشه تاکو پێنجوین ئهگرین منیش ههموو وهلامهکهم ههر تهنها بهڵێ بوو.

لهگهڵ جهنابی کاك محمود کاوانی کهوتینه رێگا چوار ڕۆژمان پێچوو له خزمهتی دا بووم کاتێك دابهش ئهکراین بهیهکهوه ئهبوین پهنجهی بۆ من درێژ دهکرد وئهی فهرموو ئهمه لێپرساوه. ئهگهر له مالێکی کهش دابهش کرامایه ئههاته لام یا ئهی نارد بهیهکهوه دائهنیشتین، ئیواره یهکیان بهناو گوندێك پێکهوه تێپهڕین دانیشتین تکایان لێ کَردین چایهکمان لا بخۆنهوه، من وکاك مهحمود لهبهر دهمی مالێك دانیشتین ژنی مالهکه نانی ئهکرد فهرموی لێ کردین نان وتهڕه پیازو دۆیی بههار بخون ١٦انانی ساجمان خوارد، دهستی کاك محمودم گرت که بینیم چوار گونك ههویری مابوو با ئهمهش بۆ منالهکهی بێت، ژنهکه به پارانهوه.

---

(١٣) کوردێکی نیشتمان پهروهر، ئازاو زیرهك لاو زهمانیك بوو نزیکترین کهس بوو لای بارزانی، بنهمالهیهکی فیداکاری خاوهن شههیدن له پێناوی کوردو کوردستان، پۆژگارێك پۆژانه لهسهر زمانی بهش زۆری کوردی بهشهرف ناوی ئههات، صدیق میرانی تیرۆر کرد، راستی چهند لهسهری بنوسێت کهمه، روون و ئاشکرابوه که به فهرمانی بارزانی صدیق میرانی کوشت.

- وتی: به قوربانی پ.م ببم خوا بکات به نانی من ڕازی بن بەرختان بۆ سەر ئەبڕم.

پێش جیابونەوە دوو بە دوو قسەی لەگەڵ کردم بەنهێنی چی تۆی گەیاندە شاخی بەمۆ بۆچی نەهاتیتە لای بارزانی، ئێستا کە ئەچیتەوە بارەگای (دڕی)لەوی دەست بەسەر ئەبێت ورە لەگەڵ من ئەت گەینمە لای بارزانی.

وتم نەخێر سوپاس برایانەت ئەکەم من هیچ لە خۆم شك نابەم ئەگەر بێە گوێی بارزانی پرئەکەن تکایە بەردێکی لەسەر دانێ.

بەداخەوە ئەم فەرمانەش بەدڵ جێبەجێ دەکەم، بەڵام خۆم بە خۆمم وت رەفیق سەبرت بێت ئەمەش بەسەر ئەچێت، ئەمە دەستێکی زۆرگەورەیە، لە لایەکی کەشەوە زۆر عاجز بووم چونکە زوڵمم لێکراوە چالاکی وفداکاری من دەنگی دابوەوە ئێستاکە بەم شێوەیە (فلان) پاداشتەکەم ئەداتەوە شەرتم کرد بەسەر خۆمی نەهێنم:

کە برا پ.م کان ئەگەڕینەوە پرسیاریان ئاراستە کرد بوون دەربارەی من ئەڵین لەگەڵ گەیشتنمان ڕێزێکی زۆریان لێ دەگرت هەمو کاتێك لە دیوەخانی حەمەڕەشید خان ئەمان دیت لە پرانەما پرسیارمان کرد وڵامیان داینەوە لەگەڵ مەحمود کاوانی ڕۆیشتوەوە، بەڵام پێش گەڕانەوەمان بە هۆی تەتەرێك (پوستەچی) یەك زانیمان لە بنکەی دڕی (ماوت). دانشتوە ئەڵین دەست بەسەر، کاتێك پێشمەرگەکان دەچنەوە بڵاو ئەبێتەوە رەفیق دەست بەسەرە، وەسمان بەگ وکوڕەکانی و خەڵکی ناوچەکە ڕ دەمیان دەکەنە مامۆستاحلمی بە تاوانباری دا ئەنێنن یان دەستی تێدایە یابێ دەسەڵاتی ئەی هۆی چییە ئاوا بێ هیچ هەولدانێك بۆ بەربونی راوستاویت.

بارەگای بنکەی دڕی (ماوەت) پێشمەرگەی لێپرسراوی ئەوێش نازانێ من بۆچی نێردراوم لەلایەن (مام جەلال)ەوە لەهەمان کاتدا خۆشم هیچم نەدەزانی وەبەهیچ شیوەیەك باسی ڕابوردووی خۆم بۆ ئەو خەڵکە نەدەکرد دەبوو هەموو ڕۆژێك کات ژمێر (٤)ی سەرلە بەیانی لە گوندەکە دەربچین وە

کەس لە بارەگا کە نەمێنێت خۆمان بشارینەوە لەبەر مەترسی فرۆکە بۆ سەر ئەو ناوچەیە، ئێوارەکەیان کابرایەك مێوژی دەفرۆشت کیلۆی بە (٥٠)فلس وەمنیش زۆر حەزم لە مێوژەکە دەکرد وبەلاّم یەك قلسم پێ نەبوو ناچار بەرامبەری راوەستام وەکو سوالکەر وتم بەلکو یەکێك لەوانەی کە مێوژ دەکرن دلّیان نەرم ببێت و هەندێك مێوژم بدەنێ بەلاّم سەیرم کرد کەس نەدامێ و مێوژ فرۆشەکەش خەریك بوو دەرۆیشتەوە ئینجا مێوژفرۆشەکە بانگی کردم وتی (دکتۆر رەفیق وەاللەهی حەز لە مێوژدەکەیت وپارەت پێنییە) ئەوە (روبعە) دینارێك وئەوش کیلۆیەك مێوژ خێری مەولودی پێغەمبەر بە داخەوە ئەمە ساڵی ١٩٦٢ رووی دا ئەوکاتە تەمەنی ئەو کابرایە (٥٠)ساڵێك دەبوو وەئێستا لەوەدەچی کۆچی دوایی کردبێت وەلەوەدەچێت کوردەکانیش وماڵەوەشیان ئاگاداری ئەو خزمەتە گەورەیە نەبوبن ئەگینا پاداشتێکی زۆرچاکم دەدایەوە هەرچەند ئێستاش وەکو ئەوسا گیرفانم بەتاڵە بەلاّم پاداشتی خودا لەسەروو هەموو پاداشتەکانەوەیە.

من پالّم لێ داوەتەوە بەسەر خۆم ناهێنم، چونکی ئەم رێگایە خۆم هەلبژاردووەوە کەس تاوانبار نییە لەوەی بەسەرم هاتووە، دلّسۆزی تێکۆشانم بۆ مسئولەکە خەتەر بوو چونکی زۆر زوو جێ خۆم کردەوە لە ناو (پ.م)ەو دانیشتوانی ناوچەکەدا، ئەم زانی ئەم رێگایە گرتومە کوشتنی تێدایە یا رۆژێك بەدیل ئەگیرێم، بەلاّم ئەمەم چاوەروان نەدەکرد، من تازە بووم نەم دەزانی ئەم جۆرە دەسیسە هەیە کوردیش بە کاری ئەهێنێ.

ماوەی ١٥ رۆژ زیاتر پیچوو بەبێ ئەوەی کەسێك قسەیەکەم لەگەلّ بکات شتێکم پێ بلّیت خەریکی خواردنوو نوستنم بەلاّم پارەم پێ نیە لێپرسراوی رێکخراوی قەلادزێ (کاك عەبداللە ئەحمەد[١٣]) نوسراوێکی بۆ ناردبووم کە

---

[١٣] خێزانێك بوو لە کوردستان رۆژهەلاّتەوە هاتبونە شارۆچکەی قەلاّدزێ جێنشین ببوون زۆر خۆشەویست بوون جێ خۆیان کرد بووە، یەکێك لەکورەکانیان ناوی عەبداللە مام ئەحمەد بوو برادەرێکی دلّسۆز خۆشەویست و هەمیشەییم بوو بە

چیم پێویسته، منیش داوای پارەوە جەل وبەرگم کرد بوو کە باوکم بۆ روانە کات، کاتێك بۆی روانە کردبووم بۆیان ناردبووە، چونکی ئێواریەك ئاگاداریان کردم کە بەیانی دەکەویتە رێگا بەرو شاری سلێمانی لەگەڵ حیوان فرۆش دەگەیتە میدان پرسیاری ئەم ناوە بکە، گەیشتم برادەرەکەم دۆزیەوە تەسلیمی ماڵێکی کردم بردیانم بۆ حەمام بە جل وبەرگی دراو پیسەوە، ناثر پاك شوشتمی کە هاتمە دەرێ سەیرم کرد جلە کۆنەکانی خۆم نەماوە بەڵکو لەسەرەوە تا خوارەوە هەمویان بۆ گۆرییوم بە تازە، خاوەن حەمام لە گیرفانی خۆی ناردی چوار کەباب دووشیش تەماتە و ماستاو چوار نانیان بۆ هێنام. باشیان وتووە کەخەڵکی دەرێ دێتە شار کە ئەگەرێتەوە پرسیاری لێ ئەکەن چیت خوارد ئەڵێت کەباب، ئینجا بە سواری عەربانە بردیانمە ماڵێك لەوێشەوە بردیانمە ماڵێکی کە بە ناسیاوی ماڵەوە مان دەرچو کە ئەوێش خوشکە (بهیە معروف[١٤]) پارەیان بۆ ناردم، رێکخراو رەوانەی هەڵەبجەیان

---

ئەندامێکی پارتی دوای بویو لێپرسراوی رێکخراوی قەلادزێ ناوێکی بۆ خۆی دروست کرد لە هەموو رویەکەوە ئێستاش باسی خورەوشت و کردەوە جوانەکانی دەکەن کە شایەتی ئەوەیە نمونەی کادرێکی حزبیکی سیاسی بیت، چەند لەسەر هەلویستی بنوسی کەمە کاتێك دووبەرەکی پەیدا بوو لە نێوان بارزانیو مەکتەبی سیاسی جەماعەتەکەی ابراهیم ئەحمەد (استقالەی) کرد وئەو مێژووە چاکەی بۆ خۆی بەجێ هێشت هەر چەندە (حەسومیرخان بارزانی) مبارك فشاری خستەسەر کە بۆ جارێکی تر بێتەوە لە داخی دوو روداو توشی نەخۆشی شیر پەنجەبوو کە یەکێکیان دووبەرەکی بوو وە ئەوەی تریان بە هۆی (روستەمی)برایەوە بوو توانیم دەستی یارمەتی بۆ درێژکەم لە کاتی نەخۆشیەکەیدا بەلام بێ هودە بوو چونکی نەخۆشی شیر پەنجە چارەسەری نیە.

[١٤] بردیانم بۆ ماڵێك ماڵی (خۆشکە معروف )پێنج رۆژ مامەوە بە خۆی ودایك و خوشکی یەوە هەمویان خزمەتیان دەکرم. ئەم ئافرەتە رۆشنبیرە لە سەرەتای ژیانیەوە بەکاری سیاسیەوە سەرگەرم بووە بگرە ئەتوانی بڵیت سەرانسەری ژیانی خۆی تەرخان کردەوە لە پێناوی خزمەت کردنی کورد کوردستاندا انشاالله بە

كردم لەوێشەوە بۆ (بارەگای بەمۆو)ئەم رووداوەم نەگێرایەوە چونكە خۆشم بە تەواوی باش تێنەگشتم!

وا خستمە سەر كتێب، ڕۆژێك لە ڕۆژان لە مامۆستا حلمی یا مام جەلال نەپرسم!

كاتێك گەیشتمە ناو برا پ.م كان هەرچەندە پرسیاریان لیٚ ئەكردم چ دوو بەدوو یا بە كۆمەڵ وەڵامی من ئەوەبوو، مسئولانی پارتی بیستویانە كە خزمەتێكی زۆرم كردوە ومانـدوو ببووم پێویستم بە پشودانە بۆیە منیان ناردە شاری سلێمانی تاكو پشوبدەم چەند جار كاك حلمی ئەی ویست پاكانە بۆ خۆی بكات، یەك سەر وڵامم ئەدایەوە هیچ رووی نەداوە تكام وایە بە هیچ جۆرێك با ئەمە لە ناوبرا پ.م كان بڵاونەبێتەوە چونكە زیان بە م.س. بە تایبەت بە شخصی تۆ ئەگەیێنی (چونكە دوژمن چاڵ بۆ بەرامبەرەكەی هەڵدەكەنێت نەوەك لێپرسراوێك بۆ پێشمەرگەكەی خۆی بەڵام لەود دەچێت ئیمرۆ بوبێت بەباو).

لەگەڵ خۆم كە بیرم ئەكردەوە ئەوەی ئەو چاڵەی هەڵكەند بووم ئەود بوو دور بكەومەوە لە كودرایەتی و ڕا بكەم بۆ لای میریی یا لە گەڵ محمود كاوانی ریگا بگرمە بەرو دوا ڕۆژم تاریك بێت، سوپاس بۆ یەزدانی مەزن بە حەقی خۆم چومەوە ریزی پ.م لە جاران زیاتر لە دەور و پشتم كۆبونەوە. دڵنیاملەوەی، هەرچەندە من ڕاستیەكەم نەئەدركاند، بەڵام ئەوان ئەیان زانی. لە جاران زیاتر هەوڵم دا كەجێ دەستم دیاربێت لە خزمەتی كوردو كوردستان دا.

مامۆستا شێخ حمەئەمین عەبابیلی لەگەڵ (٥) پ.م بەو نیازەی ئێمەش لە گەڵی برۆینە ناوچەی هەڵەبجە جەولە بكەین زۆری وت كاك حلمی

---

خەبات بوی نوسراوە بەڵام مادام ئێستاكە بزوتنەوەی كوردی بووە بە دوو بەشەوە ڕەنگە لەلایەكەی تر بە تاوانباریش لەقەڵەم بدرێت.

نەیدەویست لەغەیری خۆی ناوی کەس بلاوببێتەوە، منیش پشتم گرت بەلام ڕای ئەول ودوایی لای حلمی بوو.

ژمارەی پ،م گەیشتە ٤٠کەس ژمارەی چەکەکانمان زیادی کرد خواردنمان باشتر بوە لەجاران زیاتر بە گوندەکان دا جەولەمان ئەکرد تا وای لێهات نزیکی شارۆچکەی خانقین بووینەوە' یەکەم جار دوای انسحابی چەکداری هۆزەکان لە دەربەندیخان لە ساڵی ١٩٦١ وە هێزی پ.م یەکەم جار بە ئاشکرا ڕوو بکاتە ناوچەی جاف گەرمیان. لە بنکەی بەمۆ ٣٤ پ.م لە سیروان پەرینەوە دوای دەسەعات گەیشتینە گوندی (گۆ ڕەشە) لە سەعات ١١ شەو بە جۆرێك ماندوبوون لە دووریی گوندەکە لەسەر خەرمانێك پشومان دا هەمومان خەوتین حەرەسەکەشمان خەوت، سەگی گوندەکە سەگ وەر ئەکەن خەڵکی گوندەکە بە دەنگ سەگ وەرەو دێن کە ئەگەنە لامان ئەبینین وا چەکدارێکی زۆر هەموی لە خەو دایە نزیك ئەبنەوە کە سەرنج ئەدەن بەشی زۆرمان ئەناسن وەخزمایەتیان هەیە لە گەڵیان، ئەڵین دیارە زۆر ماندون دورکەوینەوە تاکو تێر تێر بخەون، چواریان ئەگەڕینەوە ناو گوندەکە ئەڵین خۆتان ئامادە بکەن حەیوان سەربڕن پ.م هەستن بە تێکرایی بە پیریانەوە بچین کاتێك خەبەرمان بووەوە هاوار هاوار و هەلهەلە دەستی پێ کرد بەروە رومان هاتن بە جۆرێك باوەشمان بەیەکدا کرد یەکترمان بەرنەدەدا ئێمە کە خەلکی ئەو ناوچەیە نەبویین بەشێکمان غەریب بویین لە خۆشی وشادی ئەم دیمەنە دەستمان کرد بە گریان، خەڵکی گوندەکە کە چاویان پێ کەوت ئێمە وا ئەگریین یەك سەر پیاو ژن رویان کرد ئێمە دەستیان ماچ ئەکردین وشانیان ماچ ئەکردین بە قوربانمان ئەبوون دوعای خێریان بۆ ئەکردین ئینجا خۆشکان بە تێکرایی دەستیان کرد بە گریانی خۆشی.

ئینجا ووتم: پیلانی ئێمە ئەوەیە کە بەنهێنی لە ناو گوندەکاندا (جەولە)بکەین تاکو هەڵوێستی جەماوەر بزانین.

یەك سەر ئامادە بوان لە بگزادەو شێخ و مەلاو کشاوەرز هاواریان کرد

بانگی محەمـەد بـە ئاشـکرا خۆشـە نـەمردین( پ.م )مـان دیـی ئیمـرۆ چەژنـە ڕۆژی شادییە، ژمارەی ٢٠ پ.م بەڵکو زیاتر خەڵکی دانشتوانی ناوچـەی جـاف بوون، لە ناو هۆزی جاف بـە گشتی ئـەم بـرا (٢٠)پ.م . ڕێزییکی تایبـەتییان هـەبوو بـەهۆی ئازایـەتی و فیداکاری وکوڵ نـەدەری و خواناسـی ونیشـتمان پەروەرێتیانـەوە هـەمویان جـێی شانازیی بـوون بەشـێکی زۆریـان وێنـەیان لەبەر چاوەمە، بەڵام ناوی هەندێکیانم لە بیر چوەتەوە.

لەوانـە: حسـێن حـاجی محیالدیـن، عـەلی سـەلیم بـەگ، حەمـەی مـام وەلی حەمـەی کـرم، حەمەئـەمین کـەلاری، عـەبدوالرحمن زلکـەیی، عـەزەی حــوا، رەشە جاف، قادر جاف، حسن خلیفە مالك، کـامل مـەلا ویسـی، محمـد صـوفـی، عەزەی حەمە خنان.

کـاك حسـین حـاجی و عـەزەی خـوا فـەمویان دکتـۆر رەفیـق ئـەود بۆچـی وتارێك ناخوێنیتەوە، ناوچەکەتان ئەوەندە ورمیان بەرزە وابزانم نەبێت ئـەم جەماوەر بەرێزە قسە بۆ ئێمە بکەن.

ئەوەی لە بیرم مابێت: بە دەنگە بەرزەکەی خۆم سوخەن رانیم کرد لە نـاو گوندەکە وتم ئەو هەلویستەی ئێوە نیشانەیەکە کـە دوا ڕۆژمـان روناکـە پیـاو ژن و بـەگزادەو شـێخ ومـەلا وجوتیـار لەگـەڵ هـێزی پ.م کوردسـتان بـە سـەرۆکایەتی بـارزانی هـەموی بـە تێکـرای گیـانی خـۆی فیداکاری ئـەکات بـۆ ڕزگار کردنی کوردستان بەڵی ئێوە کوردستان ڕزگار ئەکەن، پێغەمبـەر(صلی الله علیە وسلم) فەرمویەتی (من لم یدافع عن دینە وعرضە لیس منا) چەپلە هاوار هـاوار دەستـی پـێ کـرد بـژی بـارزانی بـژی پ.م کوردسـتان، بـرۆخێـت دکتاتۆر قاسم.

رووەمـان کـردە هـەرگوندێك هـەموی بـەم شـێوەیە بـە پیرمانـەوە ئـەهاتن پێشوازیان لێ ئەکردین خوشحاڵی خۆیـان دەردەبـری، یـەکێکمان نـەدییت روی گـرژ بێت، هـەر مـاڵێك روم کردوتـە ناویـان یـەك سـەر جلـو بـەرگیان بـۆ شـۆردوین بـۆ گشـت پ.م کـان بـەبێ جیـاوازی، دوای مـاوەی حـەوت ڕۆژ

گەراینەوە بنکەی شاخی بەمۆ. ژمارەمان بوو بە ٧٠ پ.م هێرشێکی گەورەمان بردە سەر ناحیەی مەیدان بە نیازی گرتنی بەلام لەبەر زۆر هێز سەرنەکەوتین.

بەم هێزە گەورەیە جەولەمان کرد لە نزیك شارۆچکەی خانەقین ئینجا هاتینە گوندێك نزیکی (حەوش کور) نزیکی ٢٠ ماڵ ئەبوون زۆر دەولەمەندو خاوەن مەرو مالاتێکی یەکجار زۆر بوون کێشەی ئابوریان نەبوو، لەناو خۆیاندا ریکو پێك بوون، رێزێکی باشیان لێ گرتین، داوایان لێ کردم وتارێك بخوێنمەوە، هەرچی ئەهات لەبرا پ.م من هەر بێ دەنگ ئەبووم ناچاریان کردم کەقسەیان بۆ بکەم.

وتم: ئێمە نزیکەی ٢٠ سەعاتە لە خزمەت ئێوەین نانی نیوەڕۆ و وئێوارە و بەیانیمان لای ئێوەی بەڕێز خوارد ئەی برایانی بەڕێز دانشتوانی گوندی (گوەرشەلە) ئاگرتان بە (تەپالەیە) خانوەکانتان بە قامیش سەریی گیراوە باران ناگیریتەوە، من نالێم ببنە پ.م کوردایەتی بکەن ئێمە ئەمشەو بە تێکرایی پاسەوانی ئێوە بوین یەکێك لە ئێمە چاوی نەچوتە خەو، هاتوین بە ناوی پ.م کوردستان داواتان لێ دەکەین کە خۆتان چاك کەن لەو جۆرە ژیانەی ئێوە تێدا رۆژگار ئەبەنە سەر لە کاتێکدا هەموتان دەولەمەندن بەم جۆرە ئەژین تکامان وایە لەم رۆژەوە جۆری ژیانتان بگۆرن خوا رازیی نابێت بەم جۆرە رۆژگارە بژین ئەگەر رەحم بە خوشتان ناکەن بەمنالەکانتان بکەن ٢٥سەعات یەك وشەباس ئەکەن (مەرەکان مەرەکان مەرەکانم).

هەرچەند وتەکانم لە شوێنی خۆی نەبوو بەلام گۆرانکاریەکی باش لەم گوندە رویدا لە روی رۆژانەیان دوای ٢٥ ساڵ خەلکی ئەم گوندەم دیت ئەوان باسیان کرد کە ئێمەش دوا بە دوای قسەکانی تو بیرمان لە بارودۆخی خۆمان کردەوە لە هەموو روویەکەوە.

بەردەوام بویین لە جەولە کردن لە دەروپشتی ناحیەی (مەیدان) وشارۆچکەی خانقین وهاوتینە گوندی حەوش کور.. لەبەر گرنگی ئەم گوندە

بەلامانـەوە دووشـەو ماینـەوە کـە گـەورەترین و کۆنـترین شـاروچکەیەو وە مێژووەکەی ئەگەڕێتەوە بۆ پێش دینی ئیسلامی بـە (٢٠٠٠) هـەزار سـاڵ جێ وشوێنی سنوری شارەکە ئیستاش دیارە نزیکەی ٣٠ دوکان ولەگـەڵ ٥٠ خـانووە بـە هـاوین فینـك و بـو زسـتان گـەرم. هەسـتی کوردایـەتیان زۆر زۆر باشـە، مامۆستا عەلی حمدی دوو مانگ لەوێ ئەمێنێتەوە لە کاتی خۆ شاردنەوەی دا.

لە بارەگـای بنکـەی شـاخی بـەمۆ بویـین کـاتژمێر ٩ی شـەو بەشـێکمان خـەوتبوین لـە ڕێگای ڕێکخـراوی شـاروچکەی خـانقین ئاگاداریـان کردیـن کـە بەیانیەکەی مووچەی ناحیەی میدان کە سەر بە شارۆچکەی خانەقینە دێت.

کاك حلمی ئاگاداری کردیین بەسەروکایەتی و سەرپەرشتیکاك حەمـەی وەلی حمەی کەرم کەوتینە ڕێگا کاتژمێر چواری بەیانی هاتینە ناوچەی ناومـاچك زۆر بەرێکوپێکی بۆسەمان بو دانان خۆمان مات کرد، یەکێك لە (پ.م )ەکان.

لە ماڵی پ.م کویخا محەمـەد نـانو ئـاوی هێنـا، کـات ژمـێر دووی دوای نیـوەرۆ سەیارەیەکی پولیس هات لە هەموو لایەکەوە دەست ڕێژمان لێ کردن کەوتنـە بۆسەکەوە چارەیان نەما تەسلیم بوون، دەست کەوتمان ڕەشاشێکی برین ودوو تفەنگی هۆلەندی بـوو دوا بـە دوای ئـەو سیارەیە، سـەیارەیەکی تاکسی هـات ویستیان پارەکە بشارنەوە بەلام ناچارمـان کـردن کـە خۆیـان پارەکـە تەسـلیم بکەن، دوا بەدوای ئەوان پاسێك وسیارەیەك هـات ئەوانیشـمان راوەسـتاند (٩) پولیس بە دیل گیران.

بە دورو درێژی ڕەوتی شۆڕشم بۆ ڕوون کردنەوە ئینجا هێنـامن بـۆ گـۆری شەهیدانی کوردو کوردستان هیتافن پیکێشـان (بـژی پ. د.ك بەسـەرۆکایەتی بـارزانی)، دیلـەکان و گشـت ئـەو هاولاتیانـەی کـە ئەچونـەوە بـۆ گوندەکانیـان بەرێزەوە بەرێمان کردن دوای لێبوردنمان لێ کردن کە بەهۆی ئەم ڕووداوە وە دواکەتوون لە ئیشو کاریان.

ئێمەش بۆ ئەوەی بەسەلامەتی بگەڕێینەوە بەرێگاکەدا نەگەراینەوە بـەڵکو گردو گرد وشاخە و شاخ ئەهاتیین، کشاوەرزێك پاسـەوانی خەرمانەکـەی بـوو

لەسەر جۆخینەکەی میلی دەمانچەی ڕاکێشابە دەنگێکی بەرز وتی ئێوە کێن لەوە زیاتر نەیەنە پێشێ، هەر چەندە هاوارمان کرد برا گیان ئێمە پ.م بڕوای نەکرد، زۆر لە برایانی پ.م گرژ بوون کە ڕوو بە ڕوی بوەستین، من ڕازی نەبووم وتم (من دکتۆر رەفیقم) دەستم بەرزکردەوە و دەنگە شقارتەیەکەم لێداو چوومە بەردەمی، کە منی دیت بە گەرمەوە پێشوازی لێ کردین هەرچی لای بوو لە خواردن ولەبەردەمی ئێمەی دانا ئینجا خودا حافیزییمان لێ کرد ڕۆیشتین، بەرەبەیان گەیشتینەوە، کیسەی پارەکە بریتی بوو لە قماشێکی خامی سپی کە لە بارەگای پ.م کردمانەوە مقداری دوو هەزار وپەنجا دیناری تیدا بوو، هەر پ.م مقداری پێنج دیاریان دایە.

من بە پارەکە دوو گیسکم پێ کری بە پێنج دینار بە خۆشی خواردمان، حەفتەیەك سەران سەر شەوان لە خۆشیدا دەستمان ئەکرد بە هەڵپەرکێ و گۆرانی من زۆرحەزم لە گۆرانی (هۆرە و قەتار الله وەیسی)کرد لەوێوە.

بە گوێرەی بارودۆخی ئەو ڕۆژە ڕوداوێکی یەکجار گرنگ بوو لە پارێزگاری دیالی کاکی کوڵنەدەر پ.م قارەمان بەم ئیشە هەستێت. چونکە لەو کاتە دەزگاکانی سەر بە قاسم پروپاگندەیان ئەکرد کە گوایە تەنها چەند موخەربێك ماونو لە ئەشکەوتەکاندا بەشەو دێنە دەرێ وەکوشەمشەمە کوێرە وان. ئەو ڕوداوەی پ.م دەنگی دایەوە و هەموو ئەو پروپاگەندانەی دەزگاکانی رژێمی قاسمی بە درۆخستەوە.

**جەولە کردن:**

کاتێك سوپای عەراق هێرش هێنا سەر کوردستان بە دەستێکی پولایین هەموو هێزێکی بە کارهێنا بوو بە هۆی ئەوەی چەکداری (هۆزەکان) لە هەموو لایەکەوە شکاو بلاوبوو نەوە لەبەر چەند هۆیەك ئەو بوو لە ١٩٦١/٩/١١ پ.د.ك. سەرۆکایەتی بارزانی بڕیاری شۆڕشی دا بە دزی و بە ئاشکرا لەسەران سەری کوردستان بارەگای پ.م دانرا.

کاتێك کە من هاتمە ریزی پ.م لە بنکەی بەمۆ تەنها لەو گوندانەی

خوارەوە هاتوو چۆیان (جەولە) ئەکرد، دەربەندی بێلولە، باخە هەنارە، بێولە، ئاوازی، خرکنیٚ، کەمناران، سەرتەك، هورین، شمشێر کولٚ.

ئێستا سوپاس بۆ یەزدانی مەزن بارودوخی پ.م گورانێکی تایبەتی بەسەردا هاتووە هێزی پ.م گەیشتە ئەوەی جەولەیکەین لە گشت ئەو گوندانەی کەوتونتە نزیك شارۆچکەی خانقین وبگەینە گەرمیان و جافایەتی، ئەمە سەرکەتنێکی گەورەیە کە گوند لە دوای گوند رێبازی شۆرشیان بۆ روون ئەکەینەوە لەهەموو گوندێك گەورەو بچوك بەچاکی پێشوازیان لیٚ دەکرێن، ژمارەمان رۆژ بە رۆژ لە زیادی دایە، ئێستا کە لە پ.م بویین ١٢٥ پ.م ئەگەر چەك هەبوایە ئەگەیشتنە ٣٠٠ (پ.م) ە

مەبست کە دەلٚیم جەولەمان ئەکرد ئەمە شتێکی زۆر گرنگە مەشخەلٚی روناکیە هەنگاو هەنگاو بەرەو پێشەوە دەنگی زولاٚلی پ.م لەگەلٚ جەماوەر یەك ئەگرێت هەستی کوردایەتی بە هێز ئەکات.

ئەمە یەکەم جارە لە دایکی گەورە بەرێزمەوە نوسراوم بۆ بێت خستمە سەرچاوم. بەهۆی رێکخراوی خانەقین، رونی کردبووەوە کە زەرورییە سەرێکمان لیٚ بدەیت، گەر بۆ یەك شەویش بێت.

نامەکەم تەسلیم بە مامۆستا حامی کرد، وتی چۆن بە تەنها جێم دەهێلٚیت، مامۆستا (ئەنوەر مائی)[٥] فەرموی تکات لیٚ ئەکەم ئەم سەفەرە مەکە چونکە خەونم دیوە، برا پ.م بە گشتی رازی نەبوون. بەردەوام گفتوگۆم لەگەلٚ ئەکردن دوای دوو رۆژ رازی بوون، خۆشم زۆرم پیٚ خۆش بوو.

خودا حافیزیم لە مامۆستا حیلمی و مامۆستا ئەنورە و گشت برایانی پ.م وحەنابی وەسمان بەگ وکورەکانی توانیم لەم ماوە کەمەدا بە گشتی

---

[٥] لەسەر ئەو مامۆستا تێکۆشەرو رۆشنبیرە چەند بنوسیت کەمە لەبارەی خۆرەوشت و ئازایەتی و زیرەکی و خوێندەواریەوە، لەهەمووی گرنگ تر ئەوەندی پەیوەندی بەرێکخراوەوە هەبو کاتێك بارزانی دەیکا بەلێپرسراوی بەرواری بالاٚ بەبروسکە ئاگادای مامۆستا ابراهیم ئەحمد دەکاتەوە دەلٚێت ئێوە رازین.

ڕەزامەندی هەموویان لە ١٠٠٪ بەدەست بێنم.

لەگەڵ‌دووبرای پێشمەرگە کەوتینە ڕێگا شەو گەیشتنە گوندی کەلار چوومە خزمەت جەنابی مصطفی بەگ جاف، بەیانیەکەی بە یەکەوە سەعات شەش گەیشتینە بەغدا، ئینجا لێك جیابوینەوە.

من چومە ماڵی خزمێکی هاوسەرەکەم کاك جەمال عەزیز خاڵی کاك حەسەن رفعت، ئێوارەکەی هاوسەرەکەم ودایکم وکمال وروبارو بازیان هاتنەلام، ئەو چاوپێکەوتنە لەگەڵ چاوپێکەوتنەکەی بەندینخانەی رمادی ساڵی ١٩٦٢ جیاوازیەکی زۆری هەبوو (سیخور) بەسەرمانەوە نەبوو بە دایکم بڵێت بە عەرەبی قسەبکە،

لەیەکەم ڕۆژەوە لە بارەگای پ.م هاتمە دەرێ رووم کردبێتە هەر شوێنێك ئەم قسانەم کردوە، ئێمە لە هەموو رویەکەوە گەلێك لە ئێوە باشتر ڕۆژگار ئەبەینە سەرو، خوشتر ئەژین ئەویش بەهۆی (ئازادیە).انشاءالله بە پشتیوانی خواو قارەمانێتی و تێکۆشان و فیداکاری برا (پ.م)ەکان بە زوترین کات ئازادی باڵدەکێشێت بەسەرتاسەری کوردستاندا.

هاوسەرەکەم وتی: (هاتبوون بم گرن بەڕێوەبەرەکەمان خێزانی شاکر خصباك، وەڵامی دابونەوە لێرە نیە ٢٥ ڕۆژ خۆم شاردەوە لە ماڵی دراوسێیەکمان (عبدالکریم الندی )کوڕی خاڵی ئەحمەد حسن بەکر، ئیشەکەیان بۆ جێبەجێکردم بە تەواوتی، باری تەندروستیم خەتەرناك بوو بەڵام ئێستاکە روو لە باشیدایە روبار لە راهباته.

کەمال وتی: چون مریشك دەورو پشتی جوجەڵەکان دەدات منیش روبارو بازیان هەمیشە بە باوەشمەوەن پێم دەڵێن (بابە، بە هۆی جەمال قادر بەگ بابان دامەزراوم بە سەرپەرشتیار (مراقب) لەگەڵ صەباح میرزا مانگانە بڕی ١٩دینار وەردەگرم.

دایکم وتی: هیچ فکری لێمەکەرەوە لە هەموو رویەکەوە ئێمە گەلێك باشترین خودا بکات کوردستان ڕزگار ببێت و تۆش بە سەلامەتی بگەڕێتەوە

ناومان ئێمە هیچمان ناوێت لە رەحمی خودا بەزیاد بێت، دایکی بازیان معاشەکەی ٤٧دینارە مانگانە ٤٥ ئەدات بە من کەمال مانگانەی ١٩دینار، مقداری ١٥ دینار ئەدات بە من، ئیدارەی پێ ئەکەین ئەگەر نەخۆش کاك بازیان وازمان لێبێنێت ئەویش زوو زوو دەیبەینە مەزاری (شێخ عەبدلقادر گەیلانی) (قدس الله سرە)

دوو دراوسێی باشمان هەیە ماڵی حمە سەعید بەگ جاف و حمە رەشید بەگ زێباخان بەهیەخان شەو رۆژ بەسەرمان ئەکەنەوە، میرحاجیش زوو زوو بەسەرمان ئەکاتەوە . پرسیاریان لێ کردم پارەت پێیە منیش وتم (بەڵی بری چوار دینارم لە گیرفاندا ئەگەر ئەتانەوێت، هەموویان پێکەنین ئەوان (٥ دیناریان دامێ).

دوای پێنج رۆژ رووم لە کادرێکی ناسراوی پارتی کرد لە کاظمیە( ناوی ناهێنم) چونکە کۆچی دوایی کردوە. دەرگای لێ کردمەوە. وتی: ناوی خۆوت مەڵی، ئەم زانی هاتوییت شوێنم پێنەدەزانی باشە خۆت هاتوییت، ئەم کارە ئەنجام بدە(.؟؟؟؟؟؟؟؟؟؟؟؟؟؟؟).

وتم: ئەمە پێنج شەوە لێرەم ئاگادارت ئەکەم چۆن ژیانم بردوتە سەر شەوێك لە ماڵی جەمال عەزیز بووم شەوێك لە ماڵی خۆمان بووم، شەوێك لە ماڵی نوری مەلا مارف بووم، دووشەو دوای سەعات دوانزەی شەو لە شارع ئەبو نەواس لە سەر تەختی چیخانە ئەخەوتم، ریشهاتوو کراس چڵکن کەسێك لە ئێوە ماڵی ئێمەی بەسەر نەکردۆتەوە جەنابتان فەرمانم بەسەردادەدەییت.

وتی: ئەمە پەیوەندی بە خۆتەوە یە بۆچی پەیوەندیت (بە پ.م) .کرد.

هاتمە دەرێ بەپێ رۆیشتم نزیکی پردی ئاسن (جسر الحديد) بو مەوە لە برا کاك بێباك کوڕی حامد بەگ جاف بە دەم پێکەنینەوە هاتە بەردەم بە گەرمەوە چاك وچۆنی لەگەڵدا کردم کەوتینە گفتوگۆ کردن بە هۆی هاوسەرەکەی وەسمان بەگ شەرف بەیانی خوشکە ئەختر خان پوریەتی

ئاگاداری من هەبوو بۆم گێرایەوە کەوا پێنج ڕۆژە لێرەم بەم جۆرە ژیانە بردوەتە سەر دوو ڕۆژە ماڵمان نازانن لە چ ماڵێکم ناشبێت بزانن چونکە ئەوان بەمە دڵ تەنگ دەبن.

وتی: ئێمە حزبی نین ماڵی ئێمە هەر کوردێکی نیشتمان پەروەر پێ ڕازی بێت ئەی خەینە سەر چاوان خودا بکات بەڕێزتان ڕازی بن ئەتوانین خزمەتت بکەین.

ماوەی ٥ ڕۆژ بە جۆرێك خزمەتیان کردم کە هەرگیز لە بیرم نەچێتەوە شەرمەزاریان کردم لە هەموو ڕوویەکەوە، ماڵەوەمان بە تێکرایی هاتنە ئەوێ ئەنجا جەلو بەرگی تازەیان بۆ کردم و رادیۆیەکی باشیان پێشکەش کردم، بە داخەوە نەم توانی منیش وەکو پێویست ئەم قەرزە بدەمەوە، ڕاستی ئەم بنەماڵەی حامد بەگی جاف بەم شێوەیە سەران سەر خزمەتگوزاریان کردووەو هەموو کورد پەروەرێك.

خودا حافیزم لێ کردن بەغدام بەجێ هێشت گەیشتمە کەلار دوو شەو مامەوە لە گەڕانەوەدابووم دوو پ.م . قالەی ڕەزا جاف و ڕەشەی ڕەزا جاف ڕێگەیان نەدام لە ڕێگای تایبەتی خۆم بگەڕێمەوە ناچاریان کردم کەنەبێت بەقسەی ئەوان ڕێگا بگرمە بەر تاکو بەسەلامەتی بگەمەوە، ئەیان وت چۆن ئەبێت دکتۆر ڕەفیق هەروا بگەڕێتەوە.

کەوتینە ڕێگا هەردە لە دوای هەردە ڕۆیشتین ئەوان بە سواری، منیش بە پیادە چونکە وام لێ هاتبوو، بەپێ زۆر باش ڕێگام ئەکرد سوار نەبووم، نزیك گوندیی (تازەدێ) چاوەڕوانبووین لە جادە بە پەڕینەوە لە پڕا ئۆتۆمبیلێکی پولیسی گومرگ چاوی بە ئێمە کەوت پولیسەکان تەقیان لێ کردین، ئەوان ڕایان کرد منیان بەجێ هێشت، هەرچەندە دەمانجەکەم هەڵکێشا هیچ شتێکم بۆ نەکرا گیرام، پولیسەکان دا بەزین یەکێکیان دەستی بە گیرفانم داکرد چی تیدابوو دەری هێنا، ئەوی کەش دوو شەپازەلەی دا بە گۆێچکەم ·من بووم بە کەوا سپی بەر لەشکر).

## دکتور رەفیق بە دیل گیرا :

بردیانمە مەخفەری قەڵای شیروانە لە ژوورێکی تەنهایی دایان نام، دەرگایان داخست زۆر ماندوو بووم، خەوتم پیشوویەکی باشم دا، نانییان بۆ هێنام زۆر باش خواردم، ئینجا چاوم نوقاند خۆم کرد بە نوستو دەستم کرد بە بیرکرنەوە و پیلان و نەخشەی تازەم چۆن بجولێمەوە، چۆن چۆنی بێت تازە تووشی هاتم ئەمە ڕۆژێك بوو مەترسیم لێ بوو هاتە پێشم، دوو ڕێگا هەیە، یەکێکیان من دیلم بە قسەو نەخشەی میری چیان پێ وتم لەسەر فرمانی ئەوان بجولێمەوە، دان بە هەمو شتێك دا بنێم، (اعتراف) تاکوو خۆم ڕزگار کەم، خۆم بە خۆمم وت ئەم ڕێگایە ناگرمە بەر بە هیچ جۆرێك.

رابردوم زۆرچاك وئاشکراو روونە لای میری مەحاڵە رزگارم بێت شاهید زۆرە بەسەرمەوە، عەقل بەکار ئەهێنم دان بە تاوانەکانم ناهێنم ماڵی خەڵك وێران ناکەم چونکی تاوانەکەم لە سێدارە دانە، ڕوژانە لە بەندیخانە سەد هەزار جار زیاتر ئەتوانم خزمەتی کوردو کوردستان بەکەم، بەرامبەر سیخوڕ وپۆلیس وچڵکاو خۆرەکان رادەوستم، هەڵوێستم هەمیشە سلبی ئەبێت، لە هەر بەندیخانەیەك رووی تێدەکەم هەوڵ دەدەم ئەو پەری خزمەتی گیراوەکانی کوردبکەم، هەتاوەکو بتوانم تەنگ و چەڵەمە بۆ کاربەدستان دروست کەم، کەی بۆم رێك کەوت رائەکەم، ماوەیەکی کە ئەم بەن بۆ لێکولینەوە خۆم ئامادەکەم بۆ پرسیار وەلام و (کاروان) ئازارو ئەشکەنجە قسەم ئامادە کرد لە ئێستاوە وەلامەکان چۆن ئەدەمەوە بەتایبەتی لەگەڵ دادوەر لیکولینەوە (حاکم تحقیق) قسە بە دەنگی بەرز ناکەم رێز لە یاسا نەگرم، کە بانگیان کردم دکتور رەفیق خۆم گێل ئەکەم چونکە من کەی دکتۆرم، ناوت رفیق مامە صادق، ئیش وکار کاسبم، کاتی خۆیی لە بەغدا دوکانم هەبوو لە خان یاسینی موادی کەرەبایی و سەعات فرۆشتن تۆ پیشمەرگەی قوربان ئەمك کارە زۆر سەختە بە من ناکرێت، لە چ شارێك جێنشینی.قەلادزێ ئەم بەڵێنەدا بە گۆری شەهیدان لە ڕۆژدوە ئەبمە

پێشرەوی بەندینخانە نەهێڵم کەس ئەمەی بدرێتی.

پۆلیسەکان لە کونی دەرگاکەوە سەیرمیان ئەکردم هەریەکە لەبەر خۆیەوە دەنگێکی لێوە ئەهات ئەیان وت ئەم هەموو خەوە بوو بەچی، کاتژمێر چواری ئێوارە سواری سەیارەی پولیسیان کردم دەستم بەستراوەتەوە، معاون پولیس ناوی جەمال ئەفەندی بە تورکمان ناسرابوو معاون پۆلیس گەمرگ بوو، دوای دەوڵەمەندی کەوتبوە بە شۆین قاچاخ ئەگەڕا ئێستاکە پ.م. بەدیل گرتوە، ئەی ویست خۆی دەرخات پ.م گرتوە هاتینە گوندی کەلار لەبەردەمی ماڵی مەحمود بەگی جاف سەیارەکەی ڕاگرت داوای ناوی کرد لە خۆشکی کەریم بەگی جاف ئەو شۆڕشگێرەی لەگەڵ مەلیك مەحمود نەمر بووەوە، خوشکە (حەبە خان) ئاوەکەی هێنا، بەڵام ڕووەو من هات وتی حەمە سەد خۆزگە ئاوا تۆم بە دیلی نەدیبایە فرمێسکی چاوی هاتە خوارێ، جەمال وای هەست کرد ئاویش بۆ ئەو ئەهێنێ، بەڵام خوشکە حەبەخان چوە ژورەوەو دەرگاکەی داخست.

دانیشتوانی گوندی کەلار بە گرتنی من دڵ تەنگ و عاجز بوون، بە جۆرێك گرژی پێویانە دیار بوو، کە منیان بە دەست بەستراوی ئەبینی بەسەرسورمانەوە ئەیانڕوانیـیە من نەیاندەزانی تەماشای من بکەن یان دەرگاکە لەسەر خۆیان داخەن، هەلوێستی حەبە خان ودانیشوانی کەلار بیروباوریی منی بە جۆرێك بە هێز کرد سوێندم بە خودا خوارد کە ئەبێ خوراگریم وقسەی خۆم بەرمەسەر.

بردیانمە بەڕێوەبەرایەتی پولیس کفری.

منیان بردە ژوری بەندکراوەکان لەسەر کوردایەتی گیرابوون بە ناوی پارتی وە، سلاوم کرد زۆر ساردبوون لەگەڵم ، زۆری پێ نەچو لەڕێکخراوەوە ولامیان بۆ هات کەئەمە (پ.م )هەریەکە لە ڕاست خۆیەوە وەلامی ئەدامەوەبە پیرمەوە هاتن وتیان چیت پێویستە، چیت ئەوێت بۆت بکەین.

شەو بانگیان کردم بۆ پرسیارو وەلام هەر ئەوەم وتەوە کە لەو بەر

وتبووم، چونکی وڵامەکەی خۆمم چاك لەبەر کردبوو،

ناوت: رەفیق مامە صادق.

دانیشتوی: قەڵا دزێ.

ئیشت: کاسبم. پێشتر، دوکانم هەبوو لە بەغدا هی (موادی کارەبایی).

هۆی چیبوو لە ناوچەی کەلار بویت: کاسبم قەرزم لای کابرایەکە ئەڵێن لەم ناوچەیە ئەژیی.

تۆو پ.م (موخەربی)..؟، ئەم ئیشە زۆر زەحمەتە بە من ناکرێت.

تۆ دکتۆر رەفیقی: نەخێر من دکتۆر نیم.

هەرچەند هەوڵیان لەگەڵ ئەدام بە هەموو شێوەیەك هەندێك جار گرژبوون لەگەڵم وە هەندێ جار قسەی خۆشیان لەگەڵ دەکردم وهەندێ جارلێیان دەدام بەڵام من هەر لەسەر قسەی خۆم سوربووم. چیم وتبوو لێی پەشیمان نەدەبومەوە.

دوای (٥) رۆژ بردیانم بۆ کەرکوك، لەوێش هەمان پرسیاریان لێ کردم دوای (حەوت) رۆژ بردیانم بۆ بەعقوبە لەوێش هەمان پرسیاریان لێ کردم، دوای (٢) رۆژ بردیانم بۆ بەڕێوەبەرایتی خانقین لەوێش هەمان پرسیاران لێ کردم، هەمان وەڵامم دانەوە.

ئیوارەیەك لەگەڵ (١٢)کەس بەندکراودا رایان گرتین ئەو پۆلیسانەیان هێنا کە بەدیل گیرابوون یەکەیەکە ئەهاتن کەسێکیان نەی وت ئەمە رەفیقە تەنها پولیسکی عەرەب زامدار بوو چاکیش ببوەوە، ئەو دەستی لەسەر سنگم دانا وتی ئەمە دکتۆر رەفیق یان پێئەوت، سێ جار جلو بەرگیان گۆڕێم هەر ئەهات ئەی وت ئەمەیە جەنابی دادوەر.

دادوەر وتی: ئەی ئێوەشی لەگەڵ نەبوون، ڕوی کردە پۆلیسە کوردەکان، بەیەك دەنگ هاواریان کرد، جەنابی دادوەر ئەمە نەبوو، ئینجا دادوەر کۆتایی بە پرسیار و وەڵام هێنا.

من لە ژوورێکدا بە تەنها بووم شەو نانیان بۆ هێنام کاتێك سەرنجم دایە لە

ناو برنجەکەدا نوسـراوێکی پێچراوەی تێدابـوو، کـە خوێندمـەوە لـە خۆشکی دڵسۆز سـنەوبەر خـان مـەلا صدیـق،هاوسـەری کـاك جمـال عبـد الرحمـن ی(دادوەر) بوو، لەنوسراوەکەیدا ئەڵێت کەسمان نانمان پێ نـەخورا، هـەمومان دانیشتوین دڵ تەنگ ومات وبێ دەسەڵات، هیچمـان بۆ نـاکرێت کـە جـەمال ڕزگاریت بکات پولیسە کوردەکان بە ڕاستی دەورێکی باشیان هەبوو لەولاو ئـەو لاوە لەگەڵ پولیسە عەرەبەکە قسە کرا بەڵام ئێمە ئەو باش ئەزانین مەحاڵە ئەوەی پۆلیسێکی کورد لـەم ڕۆژەدا بـۆ تـۆی دەکـات' عـەرەبێکی شـۆفینی بـۆ کوردی بکات، من ئەچمە بەغدا سەر لە ماڵتان ئەدەم چـاوم پـێیـان ئەکـەوێت انشاءالله کێشـەکەی تۆ ئاسان ئەبێت، ئەخرێتە قاڵبی مسئەلەی کـورد(سیاسی). چیت دەوێت، چیت پێویستە، هەرچی داوای بکەی کتوپڕ بوت ڕوانە دەکەین.

وڵامەکەی لە پشتی نامە بنوسە، تەسلیم بەو برا پولیسەی کە خواردنەکەی هێنا.

**وەڵام / بۆخوشکی بەڕێزم دایکی تـارا خان پێشکەشە :**

بەگەرمـەوە ئـەحواڵتان ئەپرسـم سوپاسـی هەسـتی کاکـە جـەمال ئەکـەم. ئاگادار بووم ڕەنگی سور هەڵگەڕا کەچاوی بە مـن کـەوت بـەدیلی، ئـەو پـەڕی سڵاو و ڕێزم هەیە بۆتـان زەحمـەتان کێشا، خواردنەکە زۆر زۆر خـۆش بـوو. هەموویم تـەواو ئـەکرد ئەگـەر نوسـراوەکەم نـە ببنیایـە، بۆچی دڵ تـەنگن ، ئەگەر من ئەم فیداکاریەم نەکردایە چۆن بـەم جـۆرە دانشـتوانی شـاروچکەی خانەقین و کفری و کەرکوك ڕێزیان لێ نـە گـرتم، ئەگـەر کێشەی کـورد کـەی جێبەجێ بوو دەست بەجێ مـن بـەر دەدرێـم، چـاوی تـارا خـان مـاچ دەکـەم. برای خۆتان ڕەفیق پشدەری.

ئینجا بۆ کاتی دووهەم بردیانمەوە بۆ بەڕێوەبەرایەتی پۆلیسی کفری. منیـان بـردە لای دادوەر هـەمان پرسـیاریان لێ کـردم، هـەر ڕۆژە لـە مـاڵێك نانیـان ئـەکرد بـە تایبـەتی مـاڵی ئەحمـەد بـەگی بابـان و دایکـی نجیب بابان وفاتح بابان و خەڵکانی کەش وەکو مەلا عەبدول و مەلا ڕەوف سەعاتچی، کـە

نانیان ئەنارد نەك تەنها بەشی من بۆ هەموو گیراوەکـان و گشت پولیسـەکان.
کاتێك ئەیان گواستمەوە پۆلیسەکان زۆریان پێ ناخۆش بوو ئەیان وت نانمـان برا.

زۆرجار خۆم بە خۆمم ئەوت ئەگەر ئەمزانی بەم شـێوەیە ڕێـزم لێ ئـەگرن زۆر دەمێك بوو خۆم بـە دەسـتەوە ئـەدا، وایـان لێ کـردم کـە بـەهیچ جۆرێـك پەشیمان نەبمەوە لەوەی کردوومە ڕۆژێك لـە ڕۆژان، بـیرم ئـەکردەوە ڕۆژ بـە ڕۆژ بیروباوەڕو هەستی نیشتمانەکەم گیانی فیداکاریم زیـاتر بـەخت کـەم لـە پێناوی کوردو کوردستان.

منیان هێنایەوە (موقف سرای شرطة کرکوك).

تاوانبارم بە دوو کێشە یەکێکیان روداوی خانقین،دووەهەم روداوی گرتن لە کەلار (کفـری)، ڕۆژێـك پاسـەوانەکە بـانگی کـردم جـل وبـەرگم لەبـەر کـرد، چومـە دەرێ سـیخورێك دەسـتی گـرتم بردیانمـە ژوورێـك دوای پێنـج دەقیقــە بەڕێوەبەری ئاسایشی کەرکوك هاتە ژورێ جەنابی نوري خیاط.

وتی: کاك حسێن سید احمدی خانەقا و کاکە ی حـاجی مـەحمود هاتنـە لام ویستیان چاویان پێت بکەوێت، بە باشم نەزانی بەڵام خۆراگربە بەم شـێوەیە من لە دەرەوە یارمەتیت ئەدەم انشاءاللە خودا لەم تەنگ و چەلەمەیە ڕزگارت ئەکات لـە چونـە دەرەوەدا چاوت پـێیـان ئەکـەوێت قسـەیان لەگـەڵ نەکـەیت، دڵنیابە کێشەکەت دوادەخەن کەرەوانەی دادگا نەکرێت، کە هاتمە دەرێ، چاوم بە کاکە ی حـاجی مـەحمود و جـەنابی کاکـە حسـێن سـید ئەحمـەدی خانـەقا کەوت بەڕاستی گەشامەوە.

## موقف سرای پولیسی کەرکوك.

هۆڵێکی گەورەیە ئاوەڕاستەکەی دائیرەی پونیسە (٥٠ X٢٠ )لـە (حـەمام و ئاودەسـت)ە کـە پەنجـەرەی تیـدا نییـە یـەك دەرگـای هەیـە چونــە دەرو

هاتنەوەی، زستان پانکە هەلدەکرێت، هاوین حەمامی ساونایە، شێتوو، دزو پیاو کوژو، سیاستمدار،هەمووی بەیەکەوە، هەواکەی بە جۆرێك پیسە کاتێ دەرگا ئەکرێتەوە ئەم بۆگەنە روو لە دەرەوە ئەکات پۆلیسەکان ٢٠ مەتر دورئەکەونەوە دوای ٢٠ دەقیقە دەتوانن بێنە پێشێ.

ژمارەمان بە گشتی ٦٠٠کەس بوو، پارتیو شیوعی هەرلایەنە بە کۆمەڵ نانمان ئەخوارد، پەیوەندیمان لەگەڵ شیوعیەکان هەبوو، کاتمان ئەبردە سەر بە وتووێژو گفتوگۆ لێکۆلینەوە لەسەر بارودۆخی کوردستان ئەدواین.

هەفتەی دوو جار لە مالّی تاهر ئەفەندی برای کاکی کاکان عمر دەبابە خواردنم بۆ ئەهات لە پرا تاهر ئەفەندی تەشریفی خۆی هات بەخێرهاتنە کرد جێگاکەی خۆم پێشکەش کرد، بریتی بوو لە درێژی ١٥٠سم وپانایی ٣٠سم.

من هەر بەردەوام بووم لە هاتوچۆ کردن بردیانم بۆ شاروچکەی خانەقین. هەولّم زۆر بۆ درا کە بەسەرکەوتویی نەجاتم بێت و، براکەم کە گەڕامەوە کەرکوك ئینجا یەك سەر منیان بردە بەندینخانەی کەرکوك بەڕێوەبەرەکەی وتی انشاللە لێرە فرمانی بەردانت دەرئەچێت، ناردیانم بۆ بەشی (محجر) ئەویش بەشێکە لە بەندینخانەی گەورەی کەرکوك.

هەفتەی چوارجار چاوپێکەوتن هەبوو، هەموو بەندکراوەکان، ئەچونە دەرێ، بەشێکی زۆری پیاو و ژن و روو یان لە من ئەکرد، لەبەر ئەوەی کەس وکارم دورە ناتوانن بێنەلام،

جارێکیان خۆشکێك هاتە نزیکم روەو من هات.

وەتی کاکە رەفیق من هاتووم بۆلای بەرێزتان دوو بە دوو دانیشتین وتم خۆوت بناسێنە.

وتی: من ناوم زیبایە خۆشکی خالید دلیرو جەعفرم حزب ناردومی بولای ئێوە نوسراوێکم هێناوە، لە گەڵ برێك پارە بریتیە لە حەوت دینار منیش زۆر سوپاسم کرد.

وتم ئەمەوێت نوسراوێك ئاراستەی (م.س) بکەم و بۆم بگەیەنیتـە شوێنی دیاری کراو.

وتی: هەفتەکەی تریان خۆم دێم یا یەکێك بە تایبەتی دەنێرم؛ نوسراوێکم ئاراستەی م.س بەرێز کرد ئەم شەرفەم بدەنێ کاتێك منیـان بـردە دادگا روو بەرووی دادوەر ڕاوەسـتم پارێزگـاری لـە کـوردو کوردسـتان بەکـەم، تکایـە شـەرەفی ئندامێتیـم بدەنـێ، لـەو ڕۆژەی گیراوم دانم نـەناوە بـەوەی (پ.م)م، دانم نەناوە بەنهێنییەکان وناوی کەسم هەرگیز نەهێناوە.

ڕێخـراوی کـەرکوك ئاگاداریـان ئـەکات کـە ڕەفیـق پشـدەری نوسـراوێکی ئاراستەی م.س بەرێز کردوە. جەنابی مامۆستا ابراهیـم ئەحمـەد پرسـیار لـە میوانە ئازیزەکانیان ئەکات لە مانە بابەکری مەحمود ئاغا ئـەبێت، ئایا ئێـوە ئـەڵێن چی داوای چی کـردوە، بەگشـتی ئـەڵێن داوای پـارێزەر ئـەکات بـەڵکو ڕزگاربێت لەم تەنگو چەڵەمەیە.

کە نوسراوەکە هەڵ ئەپچرن ئەیخوێننەوە هەریەکە لەلای خۆیەوە تەماشای ئەوەی کە ئەکات ئەڵێن بەڕاستی وشەکانی کاری کـردە سـەر هـەمومان نـاوی نەهێنیکـەی (تـەلان) بەگشـتی لەبـەری ئەکـەن، کاك بابـەکر بـۆی گێرامـەوە نهێنیکەت ئەزانین.

کودەتاکەی بەعس کراو لە ساڵی ١٩٦٣ تاکو ئەو ڕۆژەی بـەعس هـێرش هێنـا سەر کوردستان، هەر ڕۆژە یـا هـەر هەفتـە چ لـە ڕێگـای ڕێکخـراو یـا ئەوانـەی ئـەها تنـەلامان پێیـان ڕائەگەیاندین ئیمـرۆ یـا بـەیانی بـەر ئـەدرێن، ئـەم پرۆپاگەندەیە بەردەوام بوو نەشەڕ نە ئاشتی.

هاوسەرەکەم هاتە لام باسی بارودۆخی خـۆم بـۆ گێرایـەوە بـە دورو درێـژی دایکی بازیـان وتـی: خـزم و کـەس وکـاروبرادەران زوو زوو سـەرمان ئـەدەن دایکـت و کـەمال وروبـارو بازیـان باشـن موشـکیلەمان نـیـە، لەهـەموو ڕوویەکەوە، جل وبەرگ وکراس و بیجامەم بۆ هێناویت بـەم زوانـە ڕزگارتـان ئەبێت ئەمەش مقداری (١٥) دینارە بۆم هێناویت.

منیش وتم خۆشحاڵ بووم بە هاتنت بە خێر بێت بان چاو بەڵام ئەمانەی هێناوتە پێویستم بە هیچ شتێکیان نییە بە هۆی خزموبرادەران کاك جەلال عەبدالرحمن شرف و مامۆستای نیشتمان پەروەر تاهر صادق وخۆشکە لطیفە صدیق، عبید الله، هەمو شتێکیان بۆ ناردوم وپارەشم پێیە کاك فواد تاهر صادق بە یەکەوە لێرەین هەرشتێکم بوێت یا حەز لەهەر خواردنێك بکەم دایکی کاك فۆاد هەمینەخان بۆم ڕەوانە ئەکات، تەنها قاتە جلەکەم بۆ بەجێ بهێلە لە خۆشیان گەشایەوە ئاگاداری کردم کە دایکم هاتبوە قەزای کفری وتبویان لە قەزای خانەقین لەوێشەوە چووە بۆ کەرکوك وتبوویان چوەتەوە خانەقین بە ناچاری گەڕابوەوە بەغدا، وتم ڕاستی ئازارو ئەشکەنجەیەکی زۆرم دوان نازانم چۆن ئەم قەرزارنەتان بدەمەوە.

کاتێك کە ئەم گفتوگۆیەم ئەکرد لەگەڵ هاوسەرەکەم لە ژوری بەڕێوەبەری بەندینخانە بووین چونکە کاتی چاوپێکەوتن نەبوو،بەڕێوەبەرەکە یاریدەدەرەکەی دانیشتبووم زەق تەماشایان ئەکردین، بە چاوبە گویچکەش بزانن ئەلێن چی. بەڕێوەبەرەکە عەرەب بوو دانیشتوی بەغدا زۆر ڕێك وپێك بوو، پیاوێکی خراپ نەبوو، یاریدەدەرەکەی محەمەد ئەفندی طورانی پیاوێکی زۆر خراپ بوو دژ بە نەتەوی کورد، دژی ئازادی بوو محەمەد ئەفەندی ڕوی کردە هاوسەرەکەم وتی خوشکم خودا فرسەتت بدا چون ڕۆژگار ئەبەیتە سەر لەگەڵ (رەفیق) دا، پیاوێکی شەڕانیە و گیرو گرفتمان بۆ دروست ئەکات باواز بهێنیت لە بەندکراوەکان ئێمە ژورێکی تایبەتی ئەدەمێ و خواردنی تایبەتی بۆ ئەکەین، ڕۆژانەش ٢٥٠ فلسی ئەدەمێ ڕەنگە زیاتریش، ها رەفیق ئەڵێی چی؟ وتم: بەندکراوێك لەسەر دزی حوکم درابوو، وشەی زۆر ناشرین دژی بارزانی بەکارئەهێنا، چەند برایەك ڕوو بە رووی ڕاوەستان، سەجانەکان هاتنە ژوری پێنج لەو برادەرانەی ئێمەیان بردە دەرێ کە ڕەوانەی موقف سەرای پۆلیس بکەنەوە محەمەد ئەفەندی بێ دەنگ بوو، بەرامبەر تاوانبار کە چونکە تورکمان بوو، منیش چومە پێشی داوای محەمەد ئەفندیم کرد، کە

جەنابی هات ئاگادارم کرد ئەم پێنج برادەرانە بێنەوە ژۆرێ، من تاوانبارم، کە هاتنەوە ژۆرێ، رووم کردە محەمەد ئەفەندی ئێمە میوانی بەڕێزتانین تۆ پیاوێکی ژیریت ئێمە میوانین لای ئێوە حوکم نەدراوین شوێنەکەمان هیچ عەیبی نییە، چاوەڕوانی رەحمەتی خودای مەزنین کەلە چ کاتێك بڕیاڕی بەربونمان دەر دەچێت.

جەنابی بەڕێوەبەر تکایە چاوت لە ئێمە بێت چونکە محەمەد ئەفەندی خراپە وگیروگرفتمان بۆ دروست ئەکات لەکاتێکدا بەلێندەرەکە (مقاول) بە ئاشکرا دزیمان لێ ئەکات کەچی لایەنگیری ئەکات، روو بەڕوو پێی وتم رۆژی ٢٥٠ فلست ئەدەمێ، هەڵوێستی محەمەد ئەفەندی ئەمەیە، سوپاس بۆ جەنابی محەمەد ئەفەندی کە دەیەوێت یارمەتی من بدات با ئەم یارمەتیە گشتی بێت چونکە من ناتوانم خۆم لەبەندکراوەکان جیابکەمەوە، وا دەردەکەوت بۆم بەڕێوەبەر لەگەڵ محەمەد ئەفەندیدا لە مەسئەلەی پارەدا شەریکن.

هاوسەرەکەم بە دڵخۆشی خودا حافیزی لێ کردم، بەرەو بەغدا کەوتە ڕێگا. ئەوەیان نەئەزانی کە گفتم داوە بە خودا کە لە رۆژی بەدیل گیرام، لە هەر بەندینخانەیەك بم ئەبێت روو بە رووی دوژمن ڕاوەستم.

## بەندیخانەی کەرکوك

بنایەکی کۆن و لە سیەکانەوە دروست کراوە رووبەری ٥٠٠٠مەتر زیاترە کە لە دەرگای سەرەکی دێتە ناوەوە گوڕەپانێکە درێژییەکەی ٥٠مەتر و پانای ٢٠ مەتر، ئەنجا لە دەرگایەکی کە دێتە ژورێ، ئیدارەی بەندینخانەی گەورەیە دەرگایەکی لەسەرە ئەچیتە گۆڕپانەکە درێژایی ١٥٠ م وپانایەکەی ٢٠ مەترە دە ژووری ٣X٤ تێدایە وا بزانم ٥ هۆڵی گەورە و حەمام چەند ئاودەستێکی تێدایە.

سجانەکان (پاسەوان)بەندینخانە شەو رۆژ لە گوشەکانی سەربان رادەوستان بە چەکەوە دەهاتنە ژورەوە بۆ ناوبەندکراوەکان بە چەکەوە قەدەغەبوو،

ڕۆژی دوو جار سەرژمێریان ئەکردێن، ڕۆژانی چاوپێکەوتن (مواجهە). بەندکراوەکان سەرژمێرئەکران ئەنجا ئەوانەی هاتوون ئەچنە دەرێ، کە لەکاتی هاتنە ژوورەوەیان هەریەکە لەسەر مەچەکی دەستی نیشانەیەکی لێ دەدەن.

ژمارەمان ٦٠٠ کەس بوو.

حوکم نەداربوین بە تاوانی لایەنگری پارتی (بارزانی) دەست بەسەر بوین (محجز)، (تەمەن گەورە، لاو، دەوڵەمەند فەقیر، ئاغا جوتیار، شێخ مەلا. مامۆستا و قوتابی خوێندەوار بێ سواد)، لەسەر یەك سفرە بە تێکڕایی نانمان ئەخوارد بۆ نمونە(کاك حسن کەڵە مێرد) چوار مریشکی بۆ ئەهات، منیش بەسەرکردنەوەم زۆر کەم بوو بەڵام لەسەر یەك سفرە دائەنیشتین، ماموستاکان دەرسیان ئەوتەوە بۆنمونە کاك حمە نوری توفیق و تەهای برای و فواد تاهر صادق، من خۆم خەتم زۆر ناخۆش بوو، کاك حمە نوری توفیق ئەوەند لەگەڵم خەریك بوو سوودی زۆر باشم لێ وەرگرت، ئەم ماوەیە لە ناو خۆماندا بە هیچ شێوەیەك شەر ڕووی نەدا، دەنگ و باسمان بە جۆرێك ئەزانی زۆر کەس ئەهاتەلامان سەری سورئەما، تەواوی ڕۆژەکە خەریکی لێکۆڵینەوە ڕۆژێك ئەفسەرێکی کورد بە ناوی احمد حسن بە ٢٠ ساڵ حوکم درابوو، لە سەر ئەوەی فەرمانی ئامر لوای جێبەجێ نەکردبوو کە هێرشی بباتە سەر پ.م هینایانە بەندینخانەو لە ژورێك دایان نا بە جۆرێك ڕێزمان لێ گرت، یەکە یەکە هەر(٦٠٠) کەسە کە چوینە، خزمەتی بۆ دڵنەوایی کردنی دوژمن سەریی سورما لێمان.

لە ناو خۆمان دا ئەوەندە ڕێك وپێك بووین بە هیچ جۆرێك جیاوازی لەنێوانمان دا نەبوو دوو ئەندامی لیژنەی مەرکەزی پارتی هەفتەی جارێك قاپەکانیان ئەشوشت.

**تێبینی:**

ئاگاداریەك بۆ سەرکردەکانی کورد، ئائەمەی لەسەرەوە نوسیومە

نمونەیەك بوو لە كوردایەتی و دڵسۆزی ئەو خەڵكە بۆ كورد، تو گۆری ئەو شەهیدانەی كە خوێنییان ڕشت لە پێناوی ئازادی ئەم گەلە داماوە، بۆ واتان لە كورد كرد براتان بە برا بە كوشت دا وئینجا سەروەت و سامانی وەچەی شەهیدان وكوردتان هەمووی كۆكردەوە لە بانقەكانی دەرەوەی وولآت داتان نا.

گفتوگۆ و لێكۆڵینەوە لە نێوان بەعس و شۆڕشی بارزانی دا زۆری بێ چوو كاتێك حكومەتی قاسم ڕوخا لە یەكەم ڕۆژەوە چاوەڕوانی بەردان بوین.

شەڕ دەستی پێ كردەوە لە نێوان بەعس و شۆڕش(بارزانی)، دوای چەند ڕۆژێك بەیانییەك هەمومانیان كۆكردەوە ناوی ٢١ كەس لەبەندكراوەكانی خوێندەوە منیش یەكێك بووم لەوانە كە خۆمان ئامادە بكەین گواسترابنەوە، یەكێك لە برایان هاتە لام وتی بەناوی هەموو بەندكراوەكان ئاگادارت ئەكەم كاك رەفیق تۆ گۆریی شەهیدان ئیمرۆ ڕۆژێكی خەتەرناكە هێمن و بێ دەنگ بە شعر وهتاف كێشان مەكە با نەبیتە هۆی كوشتنی ئەم بیست كەسە، بەڵێنم پێ دا لە جێگای خۆم بێ دەنگ ئەبم، هەر دەرچوین برادەرێك دەستی كرد بە هتاف كێشان و سرودی هەر ئەڵێن كوردین، وت: هەر تەماشای سەرو گوێلاكی منی ئەكرد كە دیتم بە تەنهایە منیش ڕووم كردە برادەرەكانی كە وتم ئەمەش تاوانی منە ئەنجا من دەستم پێكرد بە تێكرایی سرودمان خوێندەوە، هتافمان كێشا بژی كوردو كوردستان بە سەرۆكایەتی بارزانی، كاتێك چوینە دەرێ لەشاری كەركوك ئەفسەركە دابەزی و وتی:

(ئەزانن بۆم هەیە تێكرا بە گوللە هەموتان بكوژم ئاگر دەبارێت ئێوەش خۆتان بە پێی خۆتان ئەچنە ناو ئاگرەكە وئیتر بێدەنگ بوین). كە گەیشتینە هەولێر بردیانین بۆ موقفی سەرای پۆلیس شەو لەوێمانەوە، بەیانیەكەی بردیانین بۆ موسڵ، یەك سەرمنیان جیاكردەوە، بردیانم بۆ _موقف سرای پۆلیس موصل) ناو گیراوەكان كە بە تاوانی حزبی شیوعی گیرابوون.

قاتێك جلی تازەم لەبەردا بوو وساكێكی تازەم بەدەستەوە بوو شێوەیەك

لەوە ئەچوو کە تازە لەفرۆکە دابەزیووم، سلاوم کرد ئینجا لەبەردەرگاکە لەسەر پیلاوەکانم دانیشتم. یەکێك لە شیوعیەکان چاوی بە من کەوت بوو لە موقف سەرای کەرکوك، دەستی گرتم و لای دانیشتم بە هەموویانی ناساند منیش وەکو ئەوان، خۆم ڕوت کردوە، تەنها دەرپێ سیبەکەم لەمبەردامایەوە.

هەموویان دانشتوای موسڵ بوون یەك کوردیان لەگەڵدا بوو، ئەویش من بووم، (دکتۆر وئەفسەرو مامۆستا و قوتابی و کرێکار و جوتیار) هەمو چینایەتیەکانی حزبی شیوعی لێرەن.

ژمارەمان ۸۰۰کەس بوو لە ژورێکی ٤X٦ دا بوون، هەموو بە دەرپێیەکی سپییەوە دانشتوون دوو تەنەکەی لێ بوو یەکێکیان بۆ(میز و ئەو ئەوی کەیان بۆ پیسایی) بەهۆی بۆنی پیس و بۆگەن و گەرماوە هەفتەی یەکەم دوو کەس مرد و هەشت کەسیان بردە نەخۆشخانە. دوای دە ڕۆژ وشەو منیان بردە لای بەرێوەبەری پولیس هەمان پرسیاری لێ کردم وەلامم

دایەوە، ئاگاداری کردم کە ڕوانەی (محکمەی فەوری)دادگای بە پەلە کراویت.

وتم. بۆ بهجت کشموله نامەیەکم هەیە، ئەگەر بوت ئەکرێت بۆم رەوانەکە، برا شوعیەکان بویان باس کرد بووم، کە مرۆڤێکی باشەو لە خانەوادەی کشمولەیە.

گەڕامەوە شوێنی خۆم نامەیکم ڕەوانە کرد بۆ بەهجەت کشموله داوای دوو شتم لێ کردبوو. یەك ئاگاداری ماڵەوەم بکات. دووهەم دە ڕۆژە لێرەم ئەگەر مانگ تەواو کەم دەمرم.

دایکم سەری دام، نوسراوێکی کاك عەتا محەمەدی پێبوو، بردبویی بۆ ئەم زاتە لە بنەماڵەیەکی موسلاوی ناسراو حاکم بوو.

بەدایکمی وتبوو دوو تاوانی لەسەرە، ئەوراقەکانی تەواو نییە دوا دەخرێت شانسی خۆی.

منیان کردە سەرکار (مراقب) ڕۆژی ۷جار ئەچومە دەرێ ژورەکە شەوان

تاکو سەعات ٩شەو ئەچومە دەرێ ئاوم ئەهێنا، ڕۆژی دوو جار ناوی هەموو ئەوانەی لێرە لە لیستەیەك ناویان ئەنوسم، ژمارەیان ١٨٠ کەسە ڕۆژی جارێکیش ئاوێك بە خۆم دا ئەکەم لە گۆرپانەکە، مسئولی موقف رئیس عرفایەکی خەڵکی تلعفر بوو تورکمان بوو پیاوێکی باش بوو لەگەڵمان هەفتانە ٥ دیناریمان ئەدایە ٤ دیناریش بۆ جێگرەکەی ناوی شحاتە بوو پیاوێکی زاڵم بوو یەکجار زۆر خراپ و درندە بوو لە حەیوان ئەچوو.

ڕۆژێك لەسەر ناوی (دنخە )یەك ٣٩ کەس گیرا بوو( دوای دوو ڕۆژ ٣٨ دنخەیان بەردا یەك دنخە مایەوە لای ئێمە).

لەرێگای شاگردی چێشتخانەکە پەیوەندیم بە ڕێکخراوی پارتی کرد زۆر بەرێك وپێکی ڕۆژانە ئاگادارم ئەکردن.

شاگردی چێشتخانکە ڕۆژی دوو جار ئەهات خواردنی بۆ ئەهیناین، منیش نیوەرۆ وئێواران لیستەم بۆ ئەکرد بۆ جۆریی خواردنەکەمان.

ماوەی دوو مانگ سەر کار (مراقب)بووم ئەم سێ روداوە سەرنجی ڕاکێشام، بە شوێن دنخە ناوێك ئەگەڕان ٣٩دنخەیان گرت شەش جار لیستەم کرد دوای ٣٨ دنخەیان بەرەڵلاکرد یەك دنخە مایەوە.

قەشەیەکیان بە جل وبەرگی کەنیسەوە هێنابوو (٢)شەو (٣)ڕۆژ ئازارو ئەشکەنجەیان دا دانی بە تاوانەکانی نەنا جێ شانازی بوو لە شوێنی خۆم دامنا تەداویم کرد لە ڕێگای ڕێکخراوەوە ئاگاداریان کردم کە ئەمە پیاوێکی قەشەی مەزنە نیشتمان پەروەرێکی ناسراوە، لێی بپرسە بزانە چ پێویستیەکەی هەیە، ئەویش زۆر خۆشحاڵ بوو کە لە موقفی سەرا پارتی بەم جۆرە بەهێزە.

وتی: خوشحاڵ ئەبم کە پەیوەندیم لەگەڵ بکەیت ئەڵێن (ئەوەندە ئاگادار بم ئەڵێن ئێستا لەپاریسە).

کوردێکی ناوچەی برواری بالاتەمەنی ٥٠ ساڵان ئەبو شێت بوو ڕۆژی یەك دوو جار دارکاری ئەکرا قسەی ناشیرنی بە عەبدسەلام عارف و عەرەب ئەگوت

جار جاریش به بارزانی.

لاوێکیان هێنا تەمەن ١٨ساڵان بوو، ڕێکخراو ئاگاداری کردم، ئەمە کوردێکی تورکیایە، (پ.م )گیراوە بری حوت دیناریان بۆ ناردبوە.

ئێوارەی چوارشەمە (رئیس عرفان)ەکە هات و داوای پارمەتیەکەی کرد ئەچووەوە بوە پشودان خۆی و جێگیرەکەشی، پارەم بۆ کۆکردنەوە، ڕۆژی دووشمەو دەگەڕانەوە.

ڕۆژی پێنج شەمە دوای سەعات دوو نائب عەریفی پۆلیسی تازە هات، ناوی ئازاد کردنی بەندێکی هێنا، کاتێك سەرنجم دایە ناوی شێتەکە و ئەو برا (پ.م)ی تازە هاتوە ناوی خۆیان وباکو باپیریان وەکو یەکە. داوام لەبرا کوردەکەی تورکیا کرد، ناوت هاتوەوە بەردراویت، ئەچیتە دەری ئەمەش ناونیشانی چێشتخانەکەیە ڕوو بکە لای ئەوان ڕزگارت ئەکەن، لەسەر خۆبە با شکت لێ نەکەن.

وتی: ئەی تۆ، ولامم دایەوە من حەواڵەی دادگای کتوپر کراوم (محکمە الفوریە) بەهۆی راکردنی تۆوە کێشەکەم زیادو کەم ناکات، ڕزگارت بێت من لەچاودێری لا ئەدەن ڕەنگە یەك دوو شەو دارکاریم کەن. خودا حافیزی بێت ئەو رۆیشت من مامەوە ڕۆژی یەك شەممە داوە ئەو برا کوردەی تورکیایان کرد من بە کابرام شتیم وت دوات ئەکەن، شەو هێنایانەوە!

من لە ترسان لەلایەن فکرم ئەکردەوە، ئایا ئەم برایە ڕزگاری بووە، لەلایەکی کەشەوە ئایا توشی چ ئازارو ئەشکەنجە یەك نەبم.ئەی ئەو برایەی لە چێشتخانەکە کار دەکات دیارنییە؟

من ئەوەم نەئەزانی کەئەم شتانە زۆر روویی داوە لای ئەوان و زۆر بە گرنگی ناڕواننە ئەم کارەوە.

شەوی چوارشەمە بردیانم بۆلای بەڕێوەبەری پۆلیس، ئەمە دووهەم جارە لە بەردەمی راوەستم، خۆم بە فەقیری ومەلولیو لاوازی نیشان دا وا راوەستام بوو کە من جێگای ئەوە نەبم شەك و گومانم لێ بکرێت.

- پرسیاری کرد جەنابی بهجت کشمولە چۆن ئەناسیت.؟.

- ...ە: من لە ساڵی ١٩٥٤وە لە بەغدا ژیانم بردوتە سەر زۆر خەڵکی نەناسم.

- ...ی: توشی تەنگ و چەڵەمەیەکی گەورە هاتبوییت بەڵام ئێمە لە ناو ...ن جێبەجێمان کرد چەنکە زۆر کەس نان براو ئەبوو کێشەکەمان ...ی پێ هێنا، کوردێکی کەمان هێنا ناچارمان کرد دانی بەو تاوانانە دانا ... ئێمە ئەمانەوێت، زۆرجاری کە کە گیراوێك را دەکات یەکسەر ئەچین ...خ چیەك ئەهێنین. لە جیاتی کابرای گیراوی ڕا کردوو . من زۆر پارامەوە ... بەهیچ جۆرێك دەستم لەم ئیشەدانیە. چونکە هیچ یەکێك لە مانە خزم ... من خەڵکی قەلادزێم.

...تی: بەیانیەکەی رەوانەی (مخفەری پۆلیس دواسە) ئەکرێیت.

...تم: خودای مەزن پشتیوان بێت انشاللە خۆشی لە خۆت ئەبینی.

...ەخفەری پۆلیس دواسە لە مەسڵ.

...ە چوار پولیس بەدەست کەلەبچە و زنجیر کراوەوە بردیانم بۆ لای ...ێومبەری پۆلیس نزیکەی دە دەقیقە ڕاوەستام روو بە رووی هەر ...ماشای ئەکردم منیش هەردوو چاوم بریبوە زەوی فەقیر و بێ دەسەڵات ...وەستا بووم لە خزمەتی پیاوێکی تەمەنی (٤٥- ٥٠)ساڵان.

...تی/ کەلەبچەکەی بکەنەوە دوای ئەوە وتی دانیشە و ناردی خواردنم بۆ ...ات، ئەنجا قسەی لەگەڵ کردم وتی باش ئاگاداری کێشەکەتم، ٣ زورمان ...یە، یەکێکیان هی دزو پیاو کوژ،دووهەم بەتاڵە بۆ ئەوانەی خەتەرناکن، ...ێهەمیان حەوت مامۆستای تێدایە ئەتنێرم بۆ لای ئەو مەسیحیانە ...ەرجێك کێشەم بۆ دروست نەکەیت وەکو موقف سرای موصل، وا دیارە ...ستەت بەهێزە.

وتم:واستە خودایە، انشاءالله لە رەوشتم رازی ئەبیت، هیچ لە خۆم شك ...بەم بە ناحەق گیراوم، ئەم تاوانەیان بۆ دروست کردوەوم.

منیان بردە ژوورێکی زۆر رێکو پێك وپاك بوو، بەندکراوی لێ بوو خەڵکی

(القوش برتله)بوون، بە هۆی داستانی (دنخه)ناویان بیستبووم، تاوانبار بوون کە شیوعیین: بەرێز و زانا و پاکو دڵسۆز ونیشتمان پەروەر بوون، و: یەکێکیان سیاسەتمەدار بوو،

بەهۆی ئەم برایانەوە شارەزایەکی باشم پەیدا کرد، لە سیاسەتدا، یەکجار زۆر ڕێزیان لێ گرتم، ئەم دە ڕۆژە میوانداریەکی بێ ئەندازە و ڕێك و پێك خزمەتیان کردم، بە ئاواتەوەم لە ساڵی ١٩٦٣ تاکو ئێستا بگەمەوە، جارێکی تر بە داخەوە دوای دە ڕۆژ ڕەوانەی کەرکوك یان کردمەوە، هاتمەوە شوێنە ناخۆشەکە موقف سەرای پۆلیس کەرکوك.

سوپاس بۆ یەزدانی مەزن دەستێکی بە دەسەڵات هەبو یارمەتی ئەدا، چونکە دوو جار بردیانم بۆ (مەحەکەی فەوری) دادگای پەلە هەر و ئەهاتمەوە کەرکوك.

دوای حەوت ڕۆژ ڕەوانەی (معتقل عسکەری کەرکوك) کرام، کە چومە ژۆرێ چاوم بەو برایانە کەوت کە لەبەندیخانەی کەرکوك بە یەکەوە بووین کە ژمارەیان ٢١ کەس بوو دوریان خستێنەوە و ئاگاداری دەنگ و باسی یەکتری نەبووین لەوانە مامۆستای نیشتمان پەروەر کاك حمە نوری حمە تۆفیق مسئولی برایانی پارتی بوو، ڕاستی لێرەش خزمەتێکی گەورەی ئەکرد لە هەمو ڕویەکەوە ڕێزی لێ دەگیرا ئەو مسئولی نێوان پارتیو شیوعی بوو.

**معتقل عەسکەری کەرکوك:**

لە ژێر چاودێری سوپادا بووین لە هەمو ڕویەکەوە هەتاکو خواردن وەکو میوانێك بەڵام چۆن میوانێك، دوو ئەفسەر مسئول بوون، یەکێکیان نەقیب ئەدریس خەڵکی موصل بوو، عەرەبێکی نیشتمان پەروەر بوو، ڕێزی زۆر دەگرتین جێگرەکەی کورد بوو بە ناخێری گیانی هەتاکو بڵێیت خراپەی لەگەڵ ئەکردین، چونکە کوری سەرۆك هۆزێك بوو، لە جاشە ناودارەکان.

شوێنەکە بریتی بوو لە دوو هۆڵی گەورە کە ڕووبەری هەریەکەی (٢٠x٧٠)م کە بە بلۆك دروست کرا بوو، سەرەکەی چینکۆ بوو وە شوێنی

چەك و فیشەك بوو، ژمارەی ئەو بەندکراوانەی کە لە هەردوو هۆڵەکەدا بەندکرابوون زیاد لە ٦٠٠ بەندکراو ئەبوین بە ناوی پارێزگاری کردن لە بەرژەوەندی گشتی حکومەتی بەعس ئێمەیان بە تابوری پێنجەم لەقەڵەم دابوو بەڵام حوکم نەدرابویین هێشتا استخباراتی سوپا لە دورو نزیکەوە چاودێری ئەکردین، ئێمە نەمان ئەزانی کام سەرباز سیخورە هەمویان جل و بەرگی سەربازیان لەبەردەکرد، پاسەوان بەتێکرایی سەرباز بوون. لە هەمووی سەیرتر ئەوەبوو نزیکەی ٢٠ قاز پاسەوان بوون بەسەر دوو هۆڵەکەوە. چوار دەردی هەردوو هۆڵەکە (تەلبەند) کرابوو، بە بەرزایی ١٨٠سم، چاوپێ کەوتن لە دەرەوە دەکرا قەدەغەبو کەس بێتە ژورێ خواردن و شتومەك وەردەگیرا سەربازەکان تەماشایان ئەکرد ئەنجا ئێمە وەرمان دەگرت، بەڵام زۆر ڕێکوپێك بوون.

هۆڵێکیان شیوعی وپارتی بەیەکەوە بویین.

قاعەکەی کە هەمویان سەر بە پارتی بون (بارزانی) بەشی زۆریان دانشتوانی شارۆچکەی کویسنجاق بوون لە مامۆستا وقوتابی زۆریانم ئەناسی لەوانە خزمێکم بە ناوی (حمید عبدالله کۆیی) لەگەڵیان بوو.

هاوین بە بەردەوامی گەرم بوو شەو ڕۆژ، بەڕاستی دەرەوە گەلێك باشترو خۆشتر بوو لە هەموو ڕوویەکەوە بەڵام هۆڵەکە یەك سودی هەبوو ئەویش ئەوە بوو خۆر نەدەهاتە ژورێ، زستان زۆر سارد بوو نوستنی دەریی لە هەموو رویەکەوە باشتر بوو، قاعەکە تەنها ڕێگای بارانی گرتبوو کە تەڕنەبین.

**دەنگ و باس:**

مامۆستا حمە نوری حمە تۆفیق سەرپەرشتی ئەکردین بە هەمومان یەك رادیۆمان هەبو هەر جارە بەندێك لە ژێر پەتوەکەیدا گوێی لێ ئەگرد.دەنگ وباسەکەی لەسەر کاغەزیەك ئەنوسیەوە تەسلیم بە مامۆستا حمە نوری

ئەکرد ئەویش بەسەر شانەکانی دا دابەشی ئەکرد، ئەوکاتە بلاّدەبوەوە بەسەر هەموومانە ڕۆژێك رادیوکە، لای من بووکـە سەرۆکی کۆماری ئەمریکا جۆن کەندی تیرۆرکرا.

بەشی سیخوری (استخباراتی سوپا) بیستبویان کە رادیۆمان هەیـە، چەند جار بەتێکرایی هەمومان یان دەبردە دەرێ ماوەی ٣سـەعات دەگەڕان لـە جل وبەرگو نوێنو ساك هەموشتێکیان. کـە دەهاتینـە ژۆرێ جاریکی کەش دەیان پشکنین بەلاّم هەرچی یان دەکرد رادێوکەیان بۆ نەئەدۆزرایەوە، چونکە لەناو خۆمـاندا خـائینی تیـادا نـەبوو، بۆیــە هـەرچیان دەکـرد نـەیان ئـەتوانی بیدۆزنەوە.

رادێوکە جۆریی سلقەری بچوك بـوو لـە نـاو بوتلّی نـایلونێکی زەرد،دامـان نابوو لەگەلّ ٢٠بوتلّی نـایلونی زەردی کـە پـر لـە ئـاو لـە ئاودەست بـەجێمان هێشیبوو، ئەوبوتلەی رادێوکەی تێدا بوو لە ژێـرەوە لاستیکەکە کۆن کرابـوو جێ ی شك نەبوو، لەگەلّ کاتی دەنگوباس ئەهاتە دەرێ.

منیان گواستەوە بۆ ئەو قاعەی کە هەمویان پارتین، خۆم زۆرم پێ خۆش بو ئەنجا لێرە لە دەنگو باسی کەس و کارم باشتر ئاگادار بووم.

جارێك خوشکە لطیفة صدیق عبد الله خۆشکی دکتۆر ارجمنـد و مـەحمود دلێر وەلاّمی بۆ ناردبووم چیت پێویستە حەز لە خواردنی چ دەکەی.

ولاّمم بۆ ناردەوە (بەرماوەی خواردنی خۆتان)زۆریی زیادە.

خوشکە لطیفة صدیق عبدالله خواردنی بۆ هێنا بوو، نەقیب ئدریـس وتـی (ئەمە خواردنی مەولودە چونکە پێنج کیلۆ گۆشتیان کردبوو بە شفتە.)

گۆڕانی سیاسی روی دا لەنێوان خودی خۆیان و ئەومبو عبـد السلام عـارف کودەتای کرد بەسەر بەعسدا. گفتوگۆ دەستی پێ کرد" لـەنێوان بـارزانیو عبـد السلام عارف لەرێگای پارێزگاری سلێمانی عبـد الـرزاق ئـەنجا لـە نـاو خۆمـان پروپاگندەی بەردانمان دەستی پێ کردەوە،

کمـالی بـرام هاتــە لام ئاگـاداری کـردم دەربـارەی بـەردانمان کـە انشـاالله

بەتێکرایی بەرئەبین،

## هاتنی رەشید مصلح

## سەرۆکی دادگای سوپای گشتی:

رۆژێك جەنابی رەشید مصلح بو خۆیو چەند ئەفسەرێکەوە هاتە ناو قاعەکە، یەکەم کات بەراستی گەشاینەوە لەدڵی خۆمان وا هەستمان کرد یەك سەر بەرمان ئەدات چونکە ئەمان زانی کە یەکێك لە مەرجەکانی بارزانی ئەوەیە بەندەکان ئازاد بکرێن، ئەمیش ئەیکات بە پیاوەتی خۆیی نەك هی بارزانی، چونکە سەرۆکی دادگای سوپای گشتییە. وە زۆرباش ئەیزانی کە ٦٠٠ بەندکراوی بێ تاوانین و تاوانەکەمان تەنها ئەوەیە کە کوردین.

وتی ئێوە چەتەن، پیاوکوژن، تیرۆرستن، پ.م بوون کاتی خۆی هێرشێکی زۆرتان کردوتە سەرمان. ئێوە بە خوارایی نەگیراون بۆیە لێرەیان داناون چونکە مەترسیتان لێ ئەکرێت و دژ بە حکومەتن، بە جۆرێك کرژبوو بەرامبەرمان لەوە ئەچو توتنی خواردبێت، هەرچی کینەیەکی لە لەشیا وە کۆکردبوەوە پێی رشتین.

چاوەروانم کرد تاکو لە قسەکانی کۆتایی هات.

رۆیشتمە بەردەمی راوەستام سڵاوم لێ کرد وتم جەنابی سەرۆکی دادگای سوپای عێراق رێگام ئەدەیت چەند قسەیەك لە خزمەتان بکەم.

وتی: قسەبکە.

وتم: ئێمە خۆشحاڵ بویین بە هاتنی بەرێزت ئەم خەڵکانەی بەرامبەرت راوەستاون بریتین لە (مامۆستاو قوتابی کاسب و جوتیارو کرێکارو)، ماوەیەکی زۆرە دورخراوەنەتەوە لەماڵ ومناڵیان دان بە تاوانەکانی خۆم دا ئەنێم من (پ.م ) بووم و دەستگیر کراوم بە ناوی ئەوەی دەستم هەیە لە گرتنی دوو تفەنگ ویەك رشاشی بردیین وبردنی (٢٠٥٠) دووهەزارو پەنجا

دینار تاوانبار کراوم ئەمانەی ڕاوەستاون تەنها ئەوە نەبێت باقی تاوانەکەیان ئەوەیە کە کوردن.

جەنابی رەشید مصلح وتی: ڕەفیق ناوت ئەبەن بە دکتۆر رەفیق داوای بەردانت ئەکەن.

وتم: پارەو چەکەکە لای بارزانییە، هاتوچۆی بارزانی ئەکەیت بۆ گفتوگۆ کردن ولێکۆلینەوە منیش بە تاوانبار دا ئەنێت.

ڕەشید مصلح بە تورەیەوە چوە دەرێ لەبەر خۆیەوە بۆڵە بوڵی لێ ئەهات.

بەگشتی برادەران لە دەوروپشتم کۆبونەوە هەرمیەکە لەلای خۆیەوە خۆشحالی خۆی دەربڕی سوپاسیان کردم.

وتم: من لەیەکەم ڕۆژەوە بەدیل گیراوم ئەم بەڵێنەم داوە کە لە بەندینخانەکان ئەبێت دەوری سەرەکییم هەبێت، من برا بچوکی ئێوەم خودای مەزن رزگارمان کات ئازادبین لەدەست ئەم شوڤینیانە، من خزمتکاری کوردو کوردستانم.

دوای پێنج ڕۆژ سەربازێك هات ئاگاداری کردم کە نەقیب ئەدریس داوات ئەکات.

وتی: برات هەیە ناوی کەمال بێت؟ فەرموی دانیشە چونکە ئەوندە بە ئازایانە بەرامبەر سەرۆکی دادگا قسەت کرد، لە ژێر خەیمەکەی من دانیشە چاوت بە براکەت کەوێت چاشتان بۆ دێت بە کەیفی خۆتان گفتوگۆ بکەن.

وتم: زۆر سوپاسی بەرێزت ئەکەم من شتێکی نهێنیم نییە هەمووی ئاشکرایە.

کمال: وتی وامزانی بەربویت لەسەر داواکردنی بارزانی ئیمرۆ بەیانی بەرئەبیت من لێرە ئەبم.

وتم: بەریشم بدەن لە بەغدا بەرئەبم، چاوەڕوانم کە لە ماڵەوە.

چەند ڕۆژێکی پێ نەچوو منیان بردە لای بەرێوەبەری پۆلیسی کەرکوك لەوێشەوە ناردیانم بۆ ئاسایشی بەغدا، بەتەلەفون ئاگاداری مامۆستا صالح

ـخی یان کرد کـه رەفیـق مـان بـەردا،مامۆسـتا صالح لـه گـەڵم قسـەی کـرد، ـێکمان دانا که یەکتر ببینین.

یەکسەر چومەوه ماڵەوه دەسته بەنرخەکانی دایکـم مـاچ کـرد، ئـەولاو ـۆلای هاوسەرەکەم ماچ کرد چاوی کەماڵ گیان و ڕوبارو بازیانم مـاچ کـرد. خۆشحاڵ بوون به هاتنەوەم به سەربەرزیی بەم شـێوەیه چونکـه نزیکـەی ۱۱ ـڵم لەبەندیخانه بردبووه سەر.

سوپاس بۆ یەزدانی مەزن که دەسەلاتی بارزانی (کورد) بەم شێوەیه بـەهێز ـی ڕزگار کرد لەدەست ئەم زاڵمه شۆفینیانەی وەکو (ڕەشید مصلح) انشاءالله خودای مەزن ئەو برایانەشم ڕزگاریان ئەبێت.

ماوەی پێنج ڕۆژ له ماڵەوه بووم به تەواوی پشـووم دا سـەردانی زۆر کەسم کرد، سوپاسی خزمانی بەگ زادەی جافم کرد لەسەر ئـەوەی زۆر مـاندوبوون پێمـەوه، ڕەنگـه مەترسـیان پـەیدا کردبێـت کـاتێك گیرامنـەوەك اعـترف ـەسەریارمەتیەکانیان بکەم.

دووجار دوو به دوو لەگەڵ مامۆستا صالح یوسفی کۆبومـەوە. یەکـەم قسـەم لەگەڵ یوسـفی کـرد باسـی بـەردانی ئـەو برایانـەم کـرد کەلـه بەندیخانـه معتەقل عەسکەری ڕۆژگار ئەبەنه سەر، بەدوور درێژی باسی بارونۆخی ئەو ڕۆژەی بۆ کردم، هەروەها لەگەڵ مامۆستا عبد الرحمن زبیحی علماء، لەگەڵ ئەو برا نیشتمان پەروەرانه دانیشتم که له نزیکەوه ئاگادارن له کێشەی کورد، لەبەر ئەوەی من له بەندینخانـه ومعتـەقل عەسـکەری بـووم ئەو ڕوودوه دڵ تەزێنه بەرپابوئەویش ئەوه بوو دوژمن ئەم چەند سـاڵه پیـلان و تـەکتیکی بۆ دادەڕشت که دوو بەرەکی دروسـت بکـات لـه نێـوان سـەرکردەکانی کـورد دا ئەوه بوو توانی سەرکەوتو بێت لەپیلانەکانیدا.

**تێبینی:**

دەربارەی دووبەرەکی لەنیوان بارزانی ومەکەبی سیاسی ئەم باسـه بـه دورو

درێژی ئەخەمە بەرچاوی خۆێنەری بەرێز، هەرچی لە لەودیو پەردەوە شاردراوەتەوە ئەیخەمە ڕوو، باسێکی تایبەتی ئەبێت لەم کتێبەم کە ئێستە لەبەر چاوی خۆینەری ئازیزە.

کەوتمە ڕێگا بەرەو شارۆچکەی قەلادزێ خۆشەویستم گەیشتمە مالێ جەنابی باوکی بەرێزم دەستە پیرۆزەکانیم ماچ کرد، خۆشحال بوو بەوەێ پێی هەستابوم لەبەندیخانە، ئەنجا دەستی باوەژنم ماچ کرد، چاوی خۆشك و براکانم یەکەیەکە ماچ کرد. سەردانی خزمانم کرد یەکەم جار چومە خزمەت مامم دەستە بەنرخەکانیم ماچ کرد.

بەیانیەکەی چومە ناحیەی سەنگە سەر ڕوەو بارەگای بارزانی گەیشتمە پرسگا کاك (تەها بامەرنی) سکرتێر بو ولە ژێر خەیمەکەی دانیشتبوو سلاوە کرد کەسەری هەلبڕی منی دییت هەلساو خۆشحالی خۆیی پێنیشان دا.

وتی: بارزانی ئەزانێت کەبەر بوییت، چوار ڕۆژ لەمەو بەر نەحوالێ پرسیت وەلامان نارد بۆ لای باوکت لە قەلادزێ.

دەستی گرتم بەیەکەوە چوینە ژورێ بۆ خزمەت بارزانی.

بارزانی کە چاوی بە من کەوت بەجۆرێك پێشوازی لێ کردم، شەرمەزارێ کردم لەبەرم هەلساو لە تەنیشت خۆیی دایئنام، دەستە پیرۆزەکانیم ماچ کرد. ناوە ناوە قاچم بە ناچاری درێژ ئەکرد بەرامبەر سەرۆکی کوردو کوردستان فەرموی قاچت درێژ کە، بەلام تەنیشتەکەم ناوە ناوە دەستێکی لەکەلەکەە دەدا، یەعنی قاچت درێژ مەکە، بارزانی چاوی پێکەوت فەرمووی ئەمە هی بەندینخانەیە باش ئەبێت، بارزانی گەلێك لەمن زیاتر ئاگاداری دەنگ وباسی بەندکراوەکان بوو، کەبە چ جۆرێك ئازارو ئەشکەنجەیان داون، ئەنجا باسی منی کرد کە بەرامبەر سیخورەکان خۆڕاگر بووم بە جۆرێك باسی کرد شەرمەزاری کردم ناچار بووم قسەکانی بلێم کە بەندەی بچوکتان ئەو پیە نیم، باسم ئەکەیت، ئەنجا فەرموی حلمی ناشریف بۆیە باسی خراپەی تۆی دەکرد چونکە تۆ ئازا بوییت، ئەنجا هێرشی هێنایە سەر م.س. کە پارمتیە

ـــوم. ئەنجا بەرامبەر م.س. هەرچی خودا پێناخۆشە، یەك لەدوای یەك ـخـقیقە زیاتر ئەوەی وتی ئەی وتەوە.

ـتم:جەنابی سەرۆك ئەمانەی باس کرد خراپ بۆیان باس کردویت،حلمی ـنی سەریف بە هیچ جۆرێك خراپەی نەکردووم، کاتێك لە بەندیخانە بووم ـرتی زۆر یامەتییان داوم لە هەوو ڕوبەکەوە زۆر ئاگاداری من بون، زۆر جار ـرعشیان بۆ ڕەوانە کردووم.

ـسێ کەس لە خزمەتی دانشتبوون (مەحمود ئاغای عەباس ئاغای پشدەر)[٢٦] ـری یا برازای فتاح ئاغای هەرکی وعەبدالله ئاغای پشدەری.

ـهەموو هێرشێکی بۆ سەر م.س تەنها من ولامم ئەدایەوە، بەلام جەنابی

---

[٢٦] دۆستێکی نزیکی بنەماڵەمان بوو هەمیشە لەماڵی ئێمە ئەمایەوە لە هات وچۆکردن جەند جار لە خزمەتی دابووم، ئاوم بەدەست دا کردووە، ولاغەکانم بۆ ئاوئەدا جار جار، ـوکم وەکیلی بوە، وتبووی حاجی مامە کوڕەکەت رەفیق شێتە، بارزانی بە جۆرێك بە خێرهاتنی کرد ئەگەر بە چاوی خۆم نەمدیبایە بڕوام نە دەکرد ئەویش لەقەی لە ڕزقی خۆی دا بەدەستی خۆی ماڵی خۆیی وێران کرد بەم بەرگەریی لە جەماعەتی جەلالی نەکرد.

مەحمود ئاغا کوریی گەوریی عەباس ئاغایە ، پیاوێکی دەوڵەمەند باشترین ئەسبو مایین و ـرترین سەگی هەبوو، زاڵم، پیاوکوژ، لە ساڵی ١٩٥٢دا حەیوانەکانی (بەکری قەساب) دەبات بەتاڵانی، باوکم هەفتا دینار ئەداتە مەحمود ئاغا ئەنجا حەیوانەکان تەسلیم بە خاوەنەکەی ئەکاتەوە، ساڵی ١٩٦١ جارێکیان پ.م بە گوندیی (چۆم خەرکە) پەرئەبێت لە نزیك ماڵی مەحمود ئاغا، سەگەکانی ئاغا پەلاماری پ.م، ئەویش لە تەرسی گیانی خۆی تەقە لە سەگەکە ئەکات و ئەی تۆپێنێ ئاغاش خەریك ئەبێت پێشمەرگەکە بکوژێت، سەرۆك بارزانی ئەچێتە گوندی چۆمخەرکە بۆ ئەوەی (پ.م) ڕزگار بکات.

گوندی چۆم خەرکە.

پێشەکی مەلا زادە و جاغ زادەو مامەش- رسول ئەحمەد ئاغا بووە، بەلام واهات عەباس ئاغا داگیری ئەکات، ئێستاکە کەوتوتەوە ژێر دەستی خاوەنەکەی خۆی کە جوتیارەکانن، لە خودای مەزن بەزیاد بێت خودا زوڵم قەبوول ناکات.

فەتاح ئاغای هەرکی ومەحمود ئاغا چەقۆیان تیژ ئەکرد هانییان ئەدا کە رۆژێك زوتر م.س لەناوبەرێت سەری یەکەیەکە ببڕیت.

وتم: ئەگەر رێگام پێبدەیت لە خزمەتت هەستم، بەرێزتان باوکی گەورەمانیت وەکو ئاگاداریم (جەلال) خۆی بە کوری بەرێزتان دادەنێت هەموو م.س. ئامادەیە فەرمانی بەرێزتان جێبەجێ بکات.

فەرموی: سەری باوکت بدە بەڵام زوو زوو سەری میش بدە.

چونەلای کاك لقمان بارزانی، خانوەکەی بە تەنیشت بارەگای بارزانییەوە بوو، لەو کاتەدا دەنگی گورانی بێژێکی تۆمار ئەکرد.

وتی: ماوەیەك بەندکرابووم هەر چاوەڕوان بووم کە سەردانم بکەیت کاتێك کە بەر بووم ئەحوالم پرسی وتییان گیراوە، ئیمرۆش زانیم لێرەیت بڕیارم دابوو سەردانت بکەم لە قەلادزێ لە ماڵی باوکت.

وتم: حەمەی خولەی لەیلێ لێرەیە هاتبوو خزمەتت بەداغەوە رێگیان نەداوە ئایا لە بیرت چوە مانگی ١٠جار میوانداری تۆو عبیداللەی ئەکرد،وڵامی نەبوو چونکە ئەوانە پیاوەتیان زوو لەبیر ئەچێتەوە،

بەیانیەکەی چومە شارۆچکەی رانیە سەردانی مام جەلالم کرد لە ماڵی شێخ حەمید میوان بوو، کە چومە خزمەتی عبدالله ئاغای پشدەری قسەکانی منی ئەگێڕایەوە ئەیکرد بە هی خۆی جارجاریش تەماشای منی ئەکرد، من.

**مەحمود عەباسی مەحمود ئاغای پشدەری:**

**تێبینی:**

لە ساڵی ١٩٥٨ ئەم زاتە مەزنانە لە ماڵی بەندە بوون بۆ نانخواردنی نیوەڕۆ کاکە زیاد ئاغا و شێخ لەتیف، شێخ مەحمود، مەسعود محەمەد، ئیبراهیم ئەحمەد، عبیداللە بارزانی، لقمان بارزانیو شێخ صادق بارزانی، (تەمەن

-مەرنی)[17].

پرسیار لەکاك تەها بامەرنی کرا کە هۆی چیبوو خودی خۆت پارێزگاریت
- خاوەن شکۆ نەکرد یەکسەر هێزەکەت بە تێکرایی تەسلیم کرد.

بەرێز تەها بامەرنی بەم جۆرە باسی هۆی تەسلیم کردنی بە شۆرشگێرانی
- تەموزی ١٩٥٨ کرد. وتی:

لە ١٩٥٨/٧/١٢ ئاگاداریان کردم کە ئامادەگیرییت هەبێت چونکە خاوەن شکۆ
فەیصەلی دوهەم لە ١٩٥٨/٧/١٤ بەیانیەکەی تەشریفی سەفەر ئەکات بۆ تورکیا.
بەیانیەکەی ١٩٥٨/٧/١٤ خەبەرمان وەرگرت کە جموجولێك هەیە لە ناو شاری
بەغدا تولەفونات بە گشتی پچراوە.

چومە ژوری کۆشکی رەحاب کە سەردانی وصی عەبدالاد بکەم لەسەر
فرمانی خۆیی لە نهۆمی دووهەم هاتە خوارێ کراسێکی سپیو پانتۆلێکی
خاکێ لەبەر بوو زەردەخەنەی ئەهات گاڵتەی پێدەدات ئەوکاتەی گفتوگۆیی
لەگەڵ من ئەکرد.

وصی وتی: تەها چەند کەسانێك لە سوپا بەم گێرەشێوێنیە هەڵستاون
ژمارەیەکی زۆر کەمن خۆت ڕاگرە بەرامبەریان تاکو هێزی سوپامان لە
دیوانیەوە ئەگاتە ئێرە ئەو کاتە هەمویان دەست گیر ئەکەین.

تەها وتی: کاتێك دەرچووم ژمارەیەکی سەربازیکەم خۆیان بەئەرزدا داوە
ڕووبەڕووی کۆشکی مەلیکی' ئەفسەرێك هاتە بەرامبەرم سڵاوی لێ کردم
یەکترمان ئەناسی باسی ڕێبازی شۆڕشەکەی بۆ کردم بە سەرۆکایەتی

---

[17] تەها بامەرنی وطن حر وشعب سغي امر لواء حرس الملكي

لە بنەماڵەیەکی ناسراو دەرچوی کۆلیژی ئەرکانی سوپا، کوردێکی نیشتمان پەروەر
بڕواوەری نەتەوایەتی بوو ، ئازا ، زیرەك بەپێ توانا خزمەتی زۆری کوردی کرد، لە
کۆبونەوەیەکی جەماوەری لە بەغدا لە کاتێکدا سەرۆکی هێزی گەل یەکەم قسەی وتی:
وطن حر وشعب سعید.

عەبدلکریم قاسم وتی: کە دانراوم ئاگادارت کەم. کاتی خۆی لە فەلەستین ئەو ئامر فەوج بوو منیش لە فەوجەکەی قاسم کارم ئەکرد، پەیوەندی دۆستایەتیمان زۆر بەهێز بوو.

تەها وتی: بڕیاری شەخصیم دا پاڵپیان پێوە بدەم بە هەموو توانایەکەوە پشتگیریان بکەم یارمەتیان بدەم.

فەرمانم دەرکرد بۆ لیوای مەلیکی کە ئێمە بە هیچ جۆرێك دژی ئەو برا سەربازانە ناوەستین، داوای تەقەمەنیان کرد چیان ویست بەزیادەوە تەسلیمم کردن.

یەکێك لە دانیشتوان پرسیاری لە کاك تەها بامرەنی کرد هۆی چی بووە مەلیك کوژرا کاك تەها وەڵامی دایەوە ئێمە بە هیچ جۆرێك (لواء الحرس الجمهوری)تەقەمان لە تفەنگ نەهاتە دەر وە ئەو هێزەی هاتبوو کە مەلیك و وصی بە دیل بگرێت ئەوانیش دوای ئەوەی ڕێبازی من ئاشکراو رون بودو فەرمانی ئەویان پێ نەبوو تەقە بکەن.

بەڵام وەکو زانیمان کوردێکی مەندەلی (مندلی) لەسەربانی کۆشکی رەحاب تەقەی لەسەربازەکان کرد، ئەوبو لە هەموو لایەك دەست کرا بە تەقە کوژرا زامدار هەبوو مەلیك و وصی کوژران، هاوسەرەکەی وصی عبدالله زامدار کچی ئەمیر ربیعەی کوتە، وە ئەفسەرێکی کوردیش زامدار کرا (مصطفی بانەیی).

تەها وتی: رفعەت حاجی سری بەشی زۆری لە ماڵی ئێمە بوو، من گلەیی لێ کرد هۆی چی بو کە ئاگادارت نەکردم، رفعەت لە وەڵام دا، عەبدالکریم قاسم ئەی وت دلنیام تەها لەگەڵ ئێمەیە پشتگیرمان ئەکات لەسەعاتی سفر زوو زوو سەردانی سەرۆك بارزانیم ئەکرد چ لەسەنگەسەر چ لە شارۆچکەی رانیە.

بارزانی فەرموی سەعیدی حەمە ئاغای میرگەسور لەگەڵ خۆت ببە بەیەکەوە بگەڕێنەوە، فەرمانەکەم جێبەجێ کرد.

دوای هەرەسەکە سەعیدی حمە ئاغای مێرگەسور لە بەندینخانە رایات بەفەرمانی سەرۆك بارزانی تیرۆر ئەکرێت.

حەز ئەکەم بە خوێنەری بەرێز رابگەیەنم کە لێرە ڕادەوەستم ولە کتێبی سێهەم دا لەبەر چری زۆری باباتەکان، لەوەوە دەست پێدەکەمەوە کە ئامر بەتالیۆنی ٩ ) قەرەاغ وهەڵدێم بۆ ناو حکومەت زۆر بە چاکی باس لە رووداوەکان دەکەم وەکو عەرەبە کە دەڵێ (علي و علی اعدائي) وە هەروەها باس لە رووداوەکەی (٦٦) دەکەم بە ووردو درشتی یەوە وەزۆر شت هەیە، لەم رووداوە دا کە (نادیارە) خەڵك بەبێ هیچ مەعلوماتێك نان وپیازی پێوە دەخوات هەربۆیە پێم باشە لە داخی ئەو کەسانەی تفەنگ دەنێت بە تاریکیەوە باس لە سلبیاتو ئیجاربیاتی ئەم رووداوە بکەم.

ئەی جەماوەری کوردی بەشەرەف، ڕۆڵەکانی شێخ مەحمود و شێخ سەعیدی پیران و قازی محمدو مەلا مصطفی بارزانی، ئەی دانیشتوانی کوردستانی باشور ئەی ئەوانەی کەئامادەن گیانی خۆتان بەخت کەن لەپێناوی سەقام گیر بونی ئازادی و دیموکراتی یەت و سەربەخۆیی ڕاستەقینە بۆ کورد، ئەی ئەوانەی پەیمان تان داوە هەتا پەتی سێ دارە نەگاتە ملتان وەکو (لیلی قاسم) و هاوڕێکانی واز لەخەبات نەهێنن لەپێناوی کوردا سەرنج بدەن لەم ڕاستی یانە:

ئەم بەشە تایبەتە بەگەڕانەوەی سەرۆك بارزانی، وە پەردە لادان لەسەر ئەو ڕاستی یانەی کەخۆم بەشەخصی ئاگادار بووم، ڕوونی دەکەمەوە ئەو دووبەرەکی یەی کەئێستاکە بەردەوامە و نەیهێشتوە تینویەتی ئەو شۆڕش گێرانە بشکێنێت کە تینوی سەروەری میللەتی کوردن وەکو نمونەی سەرکردە( بەدر خانەکان)، لەکوێوە هاتووە و چۆن بووە وتاوانبارەکان کێن..؟ بەو نیازەی کورد پەروەران بەرچاو ڕوون بن لەدوژمنانی گەلەکەیان چونکە دار ئەڵێت( ئەگەر تەور دەسکی لەخۆم نەبێت نامبڕێتەوە) کوردستانەکەمان دابەش کراوە بەسەر چوار دەوڵەتدا ( عیراق و ئێران و تورکیا و سوریا) لەناو خۆیاندا لەسەر هەموو شتێك ناڕێکن تەنها لەسەر ئەوە نەبێت کە کورد ببێت بەدەوڵەت من مرۆڤێکم لە چاو ئێوەدا بێ دەسەڵاتم و عەقڵیشم بەهەموو شتێك ناشکێت ئەو ڕاستیە دەزانم ئەی باشە ئەو پیاوە گەورانەی کەلەسەر حسابی خەڵکی شارەکەی خۆیان بەرژەوەندی یە حزبیەکانیان بنیاد دەنێن دەست تێکەڵ دەکەن لەگەڵ ئەو دوژمنانەدا بەناوی سیاسەتەوە نازانن ئەوە کارێکی نابەجێیە..؟

ئەگەر پەیوەندیت هەیە بەهەموو وڵاتەکانی دەرەوە ئەمە کارێکی باشە بەڵام چۆن..؟

بەو شێوەیە باشە کەخۆت و حزبەکەت بکەیت بەپردێك بۆ ئەوەی خەڵکی وولاتەکەت بەسەریدا تێپەڕێت لەژیانێکی کولە مەرگی ناخۆشەوە بۆ ژیانێکی

ئاسودە و پڕ کامەرانی لەژێر ئاڵای کوردستانێکی ڕزگار کراودا نەوەك خەڵكی وولاتەکەت بکەیت بەپردێك و خۆت و ئەو دەوڵەتەی کەئارەزوی لێ بێت بەسەر یا تێپەڕێت و چۆنیان بوێت بەو شێوەیە بەرژەوەندیەکانیان بچەسپێنن لەناو خەڵکدا ئەگەر ئەمە خیانەت نەبێت ئەی چیە..؟

لەکاتێکدائەگەر هەموو حیزبەکانی کوردستان خۆیان لەچوارچێوەی یەك جەبهەی کوردستانی گەورەدا پیشان بدەن ئەوە مانای ئەوەیە ٤٥ ملیۆن کورد بوو بەیەك لەم کاتەدا تۆ بەلای کەمەوە (٣ ) ملیۆن کورد نوێنەرت دەبێت لە وولاتەکانی دەرەوەدا چ پێویستیەکت بەعیراق و ئێران و تورکیا و سوریە دەبێت ڕێگات بدەن بچیت بۆ دەرەوەی وەلات یان نا، بۆ نمونە لەحیاتی تۆ بەتەنیا بچیت بۆ ئەمریکا و چاوەڕوانی پێشوازی بیت ئەو کاتە وەزیر دەرەوەی ئەمریکا خاتوو( مادلین ئۆلبرایت) خۆی دێت بۆ کوردستان ئەڵێت چیتان دەوێت بۆتان بکەم وەهەموو دانیشتوانی کوردستان بەپیریەوە دەچن چونکە وەکو زانراوە ئەمریکا تەنها لەدوای بەرژەوەندی خۆی دەگەڕێت وەتۆ لەم کاتەدا دەبیت بەخاوەنی ٤٥ ملیۆن و خاوەنی نەوتێکی زۆر و ئاو و کانزایەکی زۆر وەهەر وەها خاکێکی بەپیت و بەبەرەکەت بۆ کشتوکاڵ ئیتر تۆ ئەتوانی یارمەتی ئەو بدەیت لەو دوو لایەنەوە نەوەك ئەو یارمەتیت بدات. لەهەموو ساتێکدا تۆ دەتوانیت پەیوەندی بکەیت بەو شوێنەوە کەخۆت ئەتەوێت لەجیهاندا بەلام ئێوە ئیستغلالی ئەو دوو بەرەکیەتان کردوو کەلەناو کوردستاندا هەیە بەتایبەتی کوردستانی باشوور بۆ ئەوەی بتوانن لەبەرژەوەندی تایبەتی خۆتان هاتو چۆی ئەو چوار دەوڵەتە ئیقلیمیە حەلاڵ بکەن، هەروەها بۆ ئەوەی ئەگەر دەستی دووژمنانی میللەتەکە شت گرتووو هێناتە ناو وولاتەکەوە بتوانیت پاساوی بۆ بهێنیتەوە لەلای خەڵک بەگشتی و میللەتەکەت بەتایبەتی.

خۆتان زۆر چاك ئاگاداری ئەوەن ئەگەر بێتوو گۆڕانکاری یەك بەسەر داهاتوی عیراقدا بێت و ئەو گۆڕانکاریە لەبەرژەوەندی تورکیا و ئێران

ـــ ـرگاکانتـــان لێ دادەخــەن و بــەهیچ شــێوەیەك نایــەڵن هــاتوچۆ ـتەکانیانەوە بکەن وەلەگەڵ ئەوشدا خەراپەتان ئەکەن هەر بۆ نموونـە: بۆ ـ عەرەسەکەی( ٧٥) ئێران و تورکیا چۆن گۆڕان بەرامبەر بەکورد و کونـە ـــێن لێ کــردن بەقەیســەری بۆیــە ئامۆژگــاری ســەرکردەکان دەکـــەم ـحەرەسەرەکانی من بەووردی بخوێننەوە پێش ئەوەی بڕیاری تیرۆر کردنـی ـە ژن ومناڵ ومنداڵم جێ بەجێ بکەن، هەرچەندە هەتا ئێستا سوودتان لە ـ ـەوو وەرنەگرتووە،بۆیە پێم باشە کەلەم بەشەدا بەچاکی ماهیەتی ئـەو ـەر دەوڵەتە و پیلانەکانیان بەهۆی کوردەوە بـۆ لە نـاو بردنـی کورد ڕوون ـکەمەوە.

## شۆرشی ١٤ تەموز مویارەك سالی ١٩٥٨:

ـسەرەتاوە لەزۆر لەناوچەکانی کوردستان گرژی پەیدا بوو لەنێوان پارتیو ـیوعی.

ـیوعیەکان: بەشی زۆری چینی چەوساوە( جوتیارو کرێکـار) چونـە پاڵیـان ـەران سەری عیراق بەتایبەتی لەکوردستان ئەوان بەهێزتر بوون، هەروەها ـوان دەستیان خستە نـاو کادرەکانی پـارتی بەنــهێنی، لەلایــەکی کەشــەوە ـیوعیەکان دەیـان وون کۆمارەکـەمان ساوایە لـەم ڕۆژە ناسکەدا نـابێت هیـچ ـاکاری یەك لەحکومەتی زەعیم بکەین ئەم حاڵە چـوو بـۆ بـەردەمی دەورو ـتی زەعیم لەوانە سکرتێرەکەی( وصفي طاهر) بـوو وە ئـەندامانی دادگـای ـۆرش ( مـاجد محمـد امـین) بەتەنها[١] (کاك فتـاح سـعید شـالی)یـەکێك لــەو ـفسـەرانەی کەبـە( ضبـاط الأحـرار) نـاو ئـەبرێن پشـتگیری لـەپارتی دەکـرد،

لەبنەماڵەیـەکی ناســراوی هاتونەتـە دنیـاوە لەسـلێمانی، نیشـتیمان پـەروەر، بەشـداری ـشۆرشـی ١٤ تمـوز دا کـردووە، ئـەندامێکی سـەرەکی دادگـای شۆرشـی بـوو، یارمـەتی داو ـجەماعەتی مـام جەلال بـوو) زیـرەك، پـاك، ئـازا لـەناو عەرەبـە نەتەوەییـەکاندا ڕێـزی تایبەتی هەبوو.

شیوعیەکان زۆر بەلگەیان بەدەستەوە بوو پڕو پاگەندەیان بۆ خۆیان دەکرد ؛ ئەیان وت لەبەر ئەوەی بارزانی ماوەیەکی دورو درێژە لەڕوسیایە گومانی تێدا نییە کە بارزانی شیوعیە.

پارتی دیموکراتی کوردستان: لەهەموو چینەکان لەدەورو پشتی کۆبونەوە لە جوتیارو کرێکار و قوتابی و کاسبکار و شێخ و ئاغا و مەلا، پارتی پڕ پاگندەی خۆی دەکرد لەناو جەماوەر کەبارزانی سەرۆکی پارتیە وەبە ئاشکرا دەربارەی مافی کورد دەدوان و ئەیان وت لەم بارو دۆخەی ئێستاکەی عیراقە پێویستە حکومەت دان بنێت بە مافی کوردا وەخوێندن ببێت بەزمانی کوردی لەکوردستانی باشوور دا .

سیاسەتمەداران بەتایبەتی وجەماوەری کورد بەگشتی چاوەڕوانی هاتنەوەی بارزانی بوون ئەیان وت ئەگەر بارزانی بگەڕێتەوە لەکام گروپ ئەبێت (شیوعی یان پارتی)..؟

دوای ئەوەی نزیکەی ١٣ ساڵ ژیانی لە( منفی) بردە سەر لە ڕوسیاوە کەگەڕایەوە عیراق یەکەم شەو لە( میوانخانەی خیام لە باب الشرقی) دابەزی بەیانیەکەی گواستیەوە بۆ میوانخانەی (سمیر امیس لەسنك) لە بەغدا دانیشتوانی عیراق بەگشتی و جەماوەری کورد بەتایبەتی ڕوەو بەغدا هاتن بۆ ئەوەی بەچاوی خۆیان لەنزیکەوە بەخزمەت ئەم شۆڕشگێڕە قارەمانە کۆڵنەدەرە بگەن.

بەجۆرێك پێشوازی لێ کرا کە جێی سەر سوڕمان بوو لەدەرەوە و ناوەوەی عیراق ئەو ڕۆژە گەورەترین کەسایەتی لەسەران سەری کوردستان تەنها مصطفی بارزانی بوو، بەگشتی زۆرمان پێ ناخۆش بوو کەلە وتارێکی دا لە عیراق فەرموی مـن سەربازێکی زەعیمـم چونکە کەسایەتی بارزان هاوشانی کەسایەتی زەعیم بوو گەلێك زیاتریش.

بارزانی دوای گەڕانەوەی بۆ عێراق پۆستی سەرۆکایەتی حزبی پارتی پێ دەدرێت بەم کارە جەماوەرێکی زۆر لەدەورو بەری پارتی کۆ دەبنەوە، نە

خۆی ئەوەی ٨٠٪ خەڵك خۆیان بەجەماوەری پارتی لەقەڵەم بدەن
...یەکان جەماوەرێکی زۆر کەمیان بۆ بمێنێتەوە لەیەکەم ساتەوە توانی
...وتی باڵ بکێشێت بەسەر مەکتەبی سیاسی و لیژنەی مەرکەزی دا
...وو رویەکەوە وەهەر یەکە کاری خۆی بۆ دیاری بکات بۆ نموونە
...ستا حمزە عبدالله پێشوازی لەبەشی زۆری کەسایەتیە عەرەبیە و
...یەکان ئەکرد چونکە من یەکێك بووم لەپێشوازی کران زۆربەی پیاوە
...ەکانم نەدەناسی بۆ نموونە من جەنابی ( نور الدین محمودم) نەدیبوو
...رموی ئەمەویت بەتەنها چاوم بەبارزانی بکەویت پەنام بۆ مامۆستا
...: عبدالله هێنا چونکە ئەو ناسراو بوو خەڵکیشی لەئێمە زۆرتر ئەناسی.
...ۆستا ابراهیم احمد و کاك نوری شاویس بەتەنها لەباخچەکە
...شتبون کەس بەلایاندا تێپەڕ نەدەبوو، لەکاتێکدا کەبارزانی کاتی نەبوو
...ك بەتەنها ببینێت، ژمارەی خەڵك ئەگەیشتە نزیکەی ( ٤٠٠-٥٠٠) کەس
...م خەڵکە لەساحەی پشتەوەی میوانخانەکە کۆدەبونەوە ئینجا لە باڵکۆنی
...وانخانەکەوە بارزانی ڕۆژانە وتاری بۆ جەماوەرکە ئەخوێندەوە.

## پەیوەندی نێوان مصطفى بارزانی و عبدالكريم قاسم

بەواتای پەیوەندی نێوان کورد و حکومەت

قاسم لەیەکەم دیداری لەگەڵ بارزانی ئەڵێت ئامۆژگارییەکم هەیە: ئیمڕۆ
تۆ گەورەی هەموو کوردیت، تکام وایە لەڕابوردودا هەرچیەك کراوە
بەرامبەرت چ لەلایەن سەرۆك هۆزەکان یان هەر مرۆڤێك بەشەخصی
کردویەتی برامبەرتان لەبیر خۆتی ببەیتەوە لەم ڕۆژەوە لەم بارو دۆخەدا
پێویست بەوە ئەکات لاپەڕەیەکی سپی تازە هەڵدێتەوە بەراەبەر هەموو
سەرۆك هۆزەکان و گشت ئەو خەڵکانەی خراپەیان کردوویت ئینجا بەناو
هەموو هۆزەکان دا بگەڕێیت و بەیەك چاو تەماشای هەموو کورد بکەیت
ئەمە سود بەخش ئەبێت بۆ کۆمارەکەمان چونکە دوژمنمان یەکجار زۆرە

باكونێك (ثغرة) نەدۆزنەوە لەوێوە بێنە ژورێ جارێ ئێمە كۆمارێكی ساوایـ لە سەرەتاوە هەرچی پێی بلێی ناكۆكی لەنێوان زەعیم و بارزانی دا نەبو بەتایبەتی بارزانی بەردەوام لەناو جەماوەر دا لەكۆڕی دانیشتنی تایبەتی ـ ئەیوت: من سەربازێكی زەعیمم . وەبارزانی ئەوەی ویستویەتی لە (٩٠٪)ی بـ جێ بەجێ كراوە، بۆ نمونە: منێكی كە لەهیچ كون و قوژبنێكەوە نیـ نەبووم كاتێك ئەی فەرموو ئەم نامەیە بەرە بۆ وەزارەتی بەرگری یا ـ (وصفی طاهر) كەسكرتێری قاسم بوو یا بۆ عبد الباقی كاظم كەبەڕێوەبەر ـ گشتی پۆلیس بوو بەبێ یەك و دوو هەرچی داواكاریەكانی ناو نامەكە ـ بارزانی هەبوو جێ بەجێیان دەكرد چونكە قاسم ئاگاداری ئەوانەی كردبو كەلەسەرەوە ناومان هێنا بوون داواكاریەكانی بارزانی ڕەت نەكەنەوە.

بارزانی ئامۆژگاریەكانی قاسمی پشت گوێ خستوە پیادەی نەكرد ـ بۆیە ئەو پەڕی دۆستایەتی بەهێز كرد لەگەڵ چەند سەرۆك هۆزێك دا بە ـ ئەوەی دوژمنایەتی بارزانی كردبوو لەڕابودوودا بەهێزتەرە ڕەشەكەی هەر وـ خۆی مایەوە و نەگۆڕایەوە و ناگۆڕێتەوە، ڕۆژێكیان ئاگاداری سەرۆ ـ بارزانیم كرد لە (محمود حمزە بگ شاسوار) ئەیەوێت بێتە خزمەتت فەرمو ـ ئەمە لە خۆی ئەناسیت..؟

وتم : [٢] (حمزە شاسوار) قائمقام بوو لەقەڵادزێ دۆستێكی دێرینی بارز ـ بوو، وتی ئەم سەگبابە هەر ماوە، حەقی كوشتنی هەیە چونكە خراپـ ئێمەی زۆر كردوە. وتم: گەورەم یەكجار زۆر بەتەمەنە لە مردن دایە بـ

---

[٢] كاتێك حكومەتی عیراقی هاتە قەڵادزێ بۆ یەكەم جاری لەساڵی ١٩٢٨ حمزە شاسـ بەیەكەم قائم قام دانرا ئەم پیاوە زۆر ئۆژنە پەرست و لەهۆزی دەلۆ بوو وە زۆر ـ زیرەك و ئیداری بوو دوو كوڕی هەبوو محمود و فەرهەند لەدوای ١٤ ی تەموز لەـ عبدالسلام عارفەوە یەكسەر (محمود) یان كەئەفسەر بوو خانەنشین كرا. (احمد ـ تاوانەی كەسەر بە بارزانی یە گیرا بوو من ڕزگارم كرد لەسێ دارە دان كاتێ قائمقام ـ لەدهۆك كوڕێكی دڵسۆزو نیشتیمان پەروەر بووە دەرچووی كۆلیجی یاسایە.

ـ ـنی دۆستایەتیم هەیە لەگەڵیاندا کاك محمود و کاك احمد هەردوکیان
ـ ـیکی نیشتیمان پەروەرن. ڕۆژێك وتم: گەورەم[2] (اسعد ئاغای شێتنە)
ـ ـێ بێتە خزمەتت، فەرموی ناوی ئەم سەگبابەت هێنا ئیمرۆ نانم پێ
ـ ـرێت، وتم: کمال عوسمان ئاغا بۆی گێڕامەوە کەقاسم ئاگاداری
ـ ـێردکانی کردوە اسعد ئاغا هەر کاتێك ویستی بێتە لام دوای مەخەن.
ـی: خراپەی ئەم سەگبابە لەهیچ دەفتەرێك جێگای نابێتەوە.

ـرێکیان کەسێك هاتبوو جلو بەرگێکی زۆر ڕێك و پێکی لەبەردا بوو
ـەنی ٥٠ ساڵ ئەبوو لە باخچەی خانوەکە بەبێدەنگی و کلۆڵی و فەقیری
ـێستا بوو ئەگەر ئەو جل و بەرگەی لەبەر نەبوایە دەموت ئەوە سواڵکەرە
ـێك بارزانی لەژورەوە هاتە دەرێ ڕووەو باخچەکە ئەم برایەش چووە
ـەردەمی دەستی ماچ بکات بارزانی فەرمانی دەرکرد کەبیکوژن من و کاك
ـنی عزیز ڕزگارمان کرد لەدەست پاسەوانەکانی ئەم مرۆڤە لەرێگای کمال
ـوسمان ئاغا ئەگاتە عبدالکریم قاسم بۆ شکات کردن.

چەند جۆرە خەڵکێك ئەهاتنە خزمەت بارزانی لەم بابەتانەی خوارەوە ، بۆ
ـوونە: لەساڵانی پێشو (فلان) ئاغا، یا( فلان) شێخ گوند یا ئەرزیان لێ داگیر
ـرەوە، یا کەسوکاری کوژراوە، ئەمەو چەندەها کێشەی تر باری سەرۆکیان
ـێر قورس کرد بوو لەهەموی گرنگتر چەند دۆستێکی دێرینی خودی خۆی
ـەرۆك هۆزە ناسراوەکان پێیان ڕا ئەگەیاند کەیاسای ( گۆڕینی کشتوکاڵ)
جێبەجێ بکرێت ئەوان ژیانیان زۆر زەحمەت دەبێ، لەکاتێکدا ئەگەر ئەو
ـایە دەرنەچوایە شۆڕشەکەی قاسم ناو نەدەبرا بەشۆڕشی ١٤ تموز.

ـەندێك لەکادرانی پارتی لەسەر بەشداربوونیان لەکارەساتەکانی شەواف و
ـەرکوك دا بەبێ ئاگاداری بارزانی، دەستگیر کران لەپارێزگاکانی موصل و

[2] ـچلەکانەود شان بەشانی سوپای عیراقی خزمەتی کوردووە بەبونەی چالاکی لەزەمانی
ـغاییدا پلەی (راند) یان داوەتێ لەسوپای عیراقی لەگوندی شێتنە دا دائەنیشت
ـجۆرێك خراپەی بارزانییەکانی کردووە بەنوسین کۆتایی نایەت.

كەركوك وەئەم كارە سەربەخۆيانەى ئەندامنى پارتى هەتا دەهات گرژ
نێوان قاسم و بارزانى زياد دەكرد تورانيەكان و عەرەبە شوفينيەك
دەستێكى بالآيان هەبوو لەگرتنيان دا. سەرۆك هۆزى زێبارى (احمد زێبارى
لەموصل تيرۆر كرا، كەباوكى (ئەرشەد زێبارى) يە لەسالى شەستەكان
وەئەوانەى بەو كارە هەستا بوون يەكێكيان لەوانەى لەسالى ( ١٩٦٣) يەكترم
ناسى پێيان دەوت (مەلكۆ بارزانى) لەبەغدا ناويان ئەهێنا بەباوك
(جەميلە) وەژنێكى رووسى هەبوو ماڵەكەيان لەئيسكانى غەربى بەغدا بۆ
كاتێك هاتو چۆى بارزانيم دەكرد لەسەنگە سەرو لەڕانيە ئەو يەكێك بۆ
لەبارزانىيەكانى نزيكى مەلا مصطفى دەفتەرێكى بچوكى پێ بوو بەئاشك
ئەوەى هاتوچۆى بارزانى دەكرد دەينوسى.وەلەناو خەلكدا بە( سيخوڕ
ڕوسيا) ناوى دەركرد بوو بەلآم هەر بەئاشكرا چالاكيەكانى خۆى ئەنجام دەد
كەشەڕ دەستى پێ كردەوە لەسالى ( ١٩٧٤) دا لەبەغدا مايەوە، لەكاتى تەسب
كردنى ڕاپۆرتێك لەلايەن كوردێكى خەلكى مەندەلىيە وەبەكارمەندێك
سەفارەتى رووسى لەبەغدا لەسالى (١٩٧٥) دا ئەم (كوردە) دەست گير دەكرێ
لەدواى لێكۆلێنەوەيەكى زۆر دان بەوە دادەنێت كەئەمان تۆرێكن سەر بە
روسيا وە (مەلكۆ بارزانيش) سەرۆكى ئەم تۆرەيە دەم و دەست (ملكۆ بارزا
دەست گير دەكرێت لەدواى ئەوەى كەلەميش دەكۆلنەوە دەلێت باوكى ئەرشە
زێبارى بەبڕيارى مەلا موستەفا كوژراوە مىن سەر بە ڕوسيام هاوسەرەكە
كەميێى دەلێن دايكى( جەميلە) ڕوسىيە وەكوشتنى ئەم زێبارىيە يەكێك بو
لەو هۆيانەى كەقاسمى گرژ كرد بەرامبەر موستەفا بارزانى چونكە بارز
پەيمانى دابوو بەقاسم كەچى تر خوێنى كەس نەڕێژێت وەمن پەيتا پە
مەكتەبى بارزانيم لەهەنگاوەكانى لێكۆلێنەوەكە ئاگادار ئەكردەوە چونكە
بەلايانەوە گرنگ بوو ئەم پياوە لەسێ دارە بدرێت، بەلآم لەگەلْ ئەوەشدا
زۆر هەولم دا لەرێگاى تايبەتى خۆمەوە كەلەسێ دارە نەدرێت وەيارمەتى
بدەم بەلآم هەر لەسێ دارە درا.

لەپڕا لەو بارو دۆخە ناسکەدا تیرۆر کردنی [4] (صدیق میرانی شقلاوە) بلاو بۆوە کەلە بۆسەیەکدا بەدەستی محمود کاوانی بەپیلانی بارزانی ئەنجام درا لەئەنجامی ئەمەدا دوژمنانی بارزانی(پارتی) ئەمەیان خستە پال مامۆستا ابراهیم احمد، هەرچەندە تیرۆر کردنی بەبڕیاری گشتی م.س. نەبووە بەڵکو بەتەنها بارزانی و محمود کاوانی نەبێت کەسی تر ئاگادار نەبوو بەلام دوژمنانی کورد کێشەکەیان گەورە کرد، بەجۆرێك قاسم گەیشتە ئەو باوەڕەی کەبارزانی کێشەی زۆری بۆ دروست دەکات.

بارزانی کەهەستی کرد قاسم نارازییە لێیان پێنج نامەی تایبەتی ڕەوانە کرد بۆ سەرۆك هۆزەکان لەوانە جەنابی عباس ممند ئاغا ( سەرۆك هۆزی ئاکۆ) کەهێزی چەکدار کۆبکەنەوە و مانۆڕێکی چەکداری ئەنجام بدەن بەرامبەر حکومەتی بارزانی ئەو پیلانەی دارشت بەو نیازەی کەعبدالکریم قاسم داوای چارەسەرکردنی کێشەکانی لێ بکات،چونکە بارزانی وای دەزانی حکومەت زۆر لاواز بووە.

**بارودۆخی حکومەتی عبدالکریم قاسم لەدەرەوەو ناوەوە:**

لەدەرەوە ئەم دەوڵەتانە پیلانیان دادەڕشت کەچۆن حکومەتی قاسم لاواز بکەن ئینجا بەرەو ڕوخانی بەرن ( ئێران و تورکیا و دەوڵەتەکانی کەنداو سوریاو ئەمریکا و بریتانیا).

لەناویشەوە بەعس و عەرەبە شۆفینیەکان و تورانیەکان.

بەلام دەوڵەتە ئیشتراکیەکان و ئەوانەی سیاسەتی روسیایان پەسەند ئەکرد

---

[4] یەکێکە لەپیاوە ناسراوەکانی خۆشناوەتی، ماوەیەکی زۆر ئەندامی پەرلەمان بووە بەهۆی ئەوەی جێ نشینی شقلاوە بوو خەڵکێکی زۆر لەکوردو عەرەب بەخزمەتی گەیشت بوو، دۆستێکی دێرینی کمال عوسمان ئاغا بوو،خودی قاسم زۆر ڕێزی لێ دەگرت، مرۆڤێکی کۆنە پەرست بوو، لەناو چینی چەوساوە بە ڕقەوە تەماشا ئەکرا چونکە دوژمنی ئازادی بوو ڕۆژێك لەڕۆژان لەگەڵ بزوتنەوەی کوردی دا نەبووە

لەدەرەوەی وولات پشت گیری لێ دەکرد.

لەناویشـەوە حزبـی شـیوعی بەشـی زۆری هـێزی دیموکراتـی لەعـەرەب بەتایبەتی عەرەبی شیعەو جوتیارو کریکار و چینی چەوساوە وەبەشێکی کوردی نیشتیمان پەروەریش پشت گیرییان لێ دەکرد.

بارو دۆخی کورد لەهەر چوار پارچەکەی کوردستان لەساڵی ١٩٦١

تورکیا:ئێمە کوردمان نییە، ئێمە تورکی شاخاویمان هەیە.

سوریا:ئێمە کوردی مهاجرمان هەیـە، بەگشـتی ئـەم کوردانـەی لـێرە ئـەژین لەتورکیاوە هاتوون.

ئێران:حکومەتی شاە لەئێستگەو ڕۆژنامەکانی دا ڕوونی ئەکردەوە و ئەیوت دانیشـتوانی وولات بەگشـتی( ئـارین) لـەنێوانیاندا هـیـچ جـۆرە جیاوازییـەك نییە، بەڵام کورد بۆی نییە ناوی منداڵەکانی بەکوردی بنێ، کـورد لەقوتابخانـە بۆی نییە بە کوردی قسە بکات و بخوێنێت. بەڵام هەڵوێستی عیراق بەرامبەر بەکورد ئـەوە بـوو لەدەسـتوریدا نوسـرابوو کـە عـەرب و کـورد هاوبەشـن لـەم نیشـتیمانە، وەزیـری کـوردی هەیــە، و پـارتێکی سیاسـی کـورد بـەناوی (پ.د.ك)ەوە بەئاشکرا کارو بارو بیرو باوەڕەو بۆ چوونی بۆ جێبەجێ کردنی کێشەی کورد لەڕۆژنامەی خەبات کەزمان حاڵی پارتییە بەهەموو ئەو دەنـگ و باسانە بەزەقی و بەئاشکرا بـڵاوی ئـەکردەوە کەلەبـەرژەوەندی حزبەکـەیدا بوو.

پێشەکی هیچ جیاوازییەك نەبوو لەنێوان مرۆڤێکی عەرەب و کورد، هەموو مرۆڤێکـی کـورد لەراسـی خۆیـەوە بـەئیش و کـاری تایبـەتی خـۆی هەڵدەستا(کاسـب، جوتیـا، قوتـابی، مامۆسـتاسـەرباز، ئەفسـەر، خوێندکـار، لەدانیشـتگا، لەنەخۆشخانەکان) بزوتنـەوەی کـوردی لەهـەموو لایەکـەوە ڕۆژ بـەڕۆژ بـەرەو پێشـەوە ئەڕۆیشـت، ئەگـەر بەگشـتی لـەعیراق هـەڵبژاردن بکرایە٣٤٪ دانیشتوانی عیراق کورد دەردەچو، ئەو بنەماڵانەی زیاتر لە سەد ساڵ بـوو کوردستانیان بـەجێ هێشت بـوو هاواریـان ئـەکرد ئـەیانگوت ئێمـە

باپیرمان کوردە، ژمارەی کورد ڕوو لەزیاد بووندا بوو، شارۆچکەی خانەقین ١٠٠٪ کورد بوو ، وەکەرکوك ٨٥٪ کورد بوو ١٥٪ تورکمان بوو وەچوار مالّی عەرەبی لیّ بوو کامێشیان بەخێو ئەکرد، بەلاّم موچە خۆری زۆری لیّ بوو کەعەرەب بوون ئێستاکە ٧٥٪ دانیشتوانی کەرکوك (عەرەبە) ، (دووبز) ٩٥٪ کورد بوون ئێستاکە ( دووبز) بۆەتە ( دبس) لە ٩٥٪ عەرەبن، ئەمەی باسم کرد نمونەیەکە، هەروەها شێخان وسنجار و تلعفر و زەمار، وەسنورمان نزیك جبل حمرین بوو بەلاّم ئێستاکە دور لەهەولێر بە دە کیلۆ متر عەرەبە، بەم شێوەیە بڕوات هەولێریش کورد تیایدا ئەبێتە ٥٠٪، وەبەهەمان شێوە لەهەموو کوردستاندا.

## جۆری چەکەکانی بارزانی ( پارتی ) و حکومەت عبدالکریم قاسم :

هێزی حکومەت: بریتی بوو لە تازە ترین چەکی شەستەکان کە پێك هاتبوو لە: فرۆکە،تانگ،زریپۆش، طوپ، هەموو جۆرە چەکێکی سوك، هەموو جۆرە هۆیەکی گواستنەوە، تەقەمەنییەکی زۆر، ئامێری گەیاندن وەکو تەلەفون و لاسلکی، نەخۆشخانە، خەزێنەی پڕ، سوپایەکی شارەزای مەشق کردووی رێك و پێك، خواردن و جل و بەرگێکی زۆر بۆ سوپاکە.

هێزی کورد چەکی جەنگی جیهانی یەکەم(١٩١٧) ، تفەنگی ئینگلیزی، تفەنگی هۆلّەندی، تفەنگی سێ تیری فەرەنسی ،تفەنگی برنەو، تەقەمەنییەکەیان تەنها ئەوە بوو کەپێیان بوو، هاتو چۆ کردن بەوولاّخ یان بەپێ بوو، نەخۆشخانەیان نەبوو، نامە بەهۆی پۆستە چییەوە(تەتەر) بەدەست دەگەیشت.

بەلاّم پارتی لەسەرانسەری کوردستان دا هێزێکی جەماوەریی پتەوی هەبوو

وەبەشی زۆری کوردستانی باکور و کوردستانی ڕۆژهەڵات وەکوردەکانی سوریە دوعای خێریان بۆ ئەکردین و وەبەپێی توانای خۆیان بەنهێنی و بەبێ ئاگاداری حکومەتەکانی( سوریا و تورکیا و ئێران) مەوە هەندێك یارمەتی شۆڕشیان ئەدا.

بەفەرمانی بارزانی خاڵی پشکنین دانرا لەزۆربەی کوردستاندا، ئەم کارە بەتەواوی گرژی لەنێوان قاسم و بارزانیدا دروست کرد.

ڕوون کردنەوە: هێرشی سوپای عیراق بۆ سەر کوردستان دوای کۆنگرەی پێنجەمی پارتی بوو من لێرە پێشم خستووە لەبەر ئەوەی ئەمەویێت لە داهاتودا بەدوورو درێژی لەسەر کۆنگرەی پێنج بنوسم.

بەفەرمانی عبدالکریم قاسم بەرامبەر بارزانی هەموو هێزێك بەکار هات وەکو هێزی ئاسمانی و هێزی تانگ و زیپۆش (الیات) لەئەنجامدا لەماوەیەکی کورتی چەند ڕۆژێدا هێزە چەکدارەکانی بارزانی لەسەرانسەری کوردستانا تێك شکا.

چەکدارەکانی هۆزی پشدەریش شان بەشانی چەکدارەکانی شۆڕش دژ بەهێزەکەی عبدالکریم قاسم ڕاوەستا بوون، بەڵام تەنها تیرەی( بابکر سەلیم ئاغای پشدەر) نەبێت لەجیاتی هێرش بەرنە سەر دووژمن ئەو بارو دۆخەیان بەهەل زانی و هەڵوێستێکی زۆر نامەردانەو نامرۆیانەیان نواند، ئەوە بوو هێرشیان بردە سەر گوندی(دێلۆو مێرتکە) کەسەر بەهۆزی (مامەش) بوون، هەر دوو گوندەکەیان تاڵان کردوو سوتاندیان وەچەند کەسانێکیان لێ کوشتن و مناڵێکیشیان بەلانکەوە سوتاند هەڵوێستی ئەم ستەمکارە زیانێکی زۆری گەیاند بەباری رامیاری شۆڕشەکە لەو ناوچەیەدا، چونکە حزبی شیوعی ئەم هەلەی قۆزتەوە و لەئەنجامدا بەیانێکی بڵاو کردەوەو تیایدا باسی لەوە دەکرد کەئەم شۆڕشە چەند (ئاغا و کۆنە پەرست و دەرەبەگ)ێك دەیبات بەڕێوەو دژی ١٤/تەموزی پیرۆز ڕاوەستاون لەهەمان کاتدا شیوعیەکان دەستی یارمەتیان درێژ کرد بۆ ئەم دوو دێیە بەنهێنی ئەوە بوو لیژنەیەکیان

پێکهێناو بەناوی دانیشتوانی شارۆچکەی قەڵادزێ وە بەسەرۆکایەتی تۆفیقی حاجی صادق کەمامی منەو سەر بەشیوعیەکان بوو ئەو کارمیان ئەنجام دا.

## سەرۆکی پارتی دیموکراتی کوردستان مصطفی بارزانی:

هەرچەندە حزبی پارتی لیژنەی مەرکەزی و مەکتەبی سیاسی و سکرتاریەتی هەبوو، وەکو هەموو رێکخراوو(پارتێك) کەلەجیهاندا هەیە، بەڵام خودی بارزانی هەموو شتێك بوو لەڕووی بڕیارو دەستەڵاتەوە (ستالین)ێك بوو بۆ خۆی بەسەر کوردستانەوە.

مامۆستا (همزە عبداللە) و جەماعەتەکەی ئەیان وت(پ.د.ك)کۆتایی پێ هات، دەبێت لەمەو دوا بەگوێرەی پرۆگرام و ئایدۆلۆجیەتی مارکس هەلسوکەوت بکەین و بچینە پاڵ حزبی شیوعی، مام جەلال دوور خرایەوە بۆ یەك ساڵ، ئەو کاتە من تەنها قوتابییەکی گوێ گربووم لەکاروباری(رامیار)ی‌دا، برای بەڕێز و مامۆستای نیشتیمان پەروەرم مامۆستا(جمال نەبەز) بۆی روون کردمەوە ئەگەر بێت و مامۆستا(هەمزە عبداللە) لەم بارودۆخە ناسکەی بزوتنەوەی کوردیدا هەوڵ بدات پارتی بەرێتە ناو حزبی شیوعیەوە ئەوا ئەبێ بڵێین حزبێکی نەتەوایەتی هەبوو کەهەوڵی بۆ رزگار کردنی کوردستان دەدا ناوی پارتی دیموکراتی کوردستان بوو. بارزانی گوێی لەم قسەیەی من بوو کەبە مامۆستا همزە عبداللە م وت ئەگەر لەبەر خودی بارزانی نەبێت ئێستاکە چەقۆیەك لەسکت ئەدەم، وەپاش ماوەیەك مامۆستا همزە عبداللە چەند جارێك پرسیاری لێ کردم کەکێ تۆی هاندابوو دژی من، منیش هەر دەم داوای لێ بووردنم لێ دەکرد لەسەر ئەو کارە نارەوایەی کە ئەنجامم دابوو بەرامبەری.

سەرۆك بارزانی لەماوەیەی چەند سەعاتێکدا ئەو چوار شۆڕە سوارەی کەبڕ بڕەی پشتی(پارتی) بوون کەپێیان ئەوتن ( فرسان الاربعە) (مامۆستا همزە عبداللە کەسکرتێری ( پ.د.ك) بوو و صالح حیدەری و نزاد احمد عزیز ئاغاو

خسرەو تۆفیق) ی دوور خستەوە من یەکێك بووم لەوانەی کە ئەم هەنگاوە زۆر پێ خۆش بوو، (مامۆستا ابراهیم احمد بەفرمانی بارزانی کرا بە سکرتێری ( پ.د.ك) بارزانی کەسەرۆك و باوکی گەلی کورد بوو تێکۆشەرو فیداکاربوو وەکەسایەتی ئەم پیاوە مەزنە هەموو شتێك بوو لەلای جەماوەر ئینجا دوا بەدوای بارزانی کەسایەتی مامۆستا ابراهیم احمد بوو کەهەموو شتێکم لەخودی ئەم زاتە گەورە و زانا تێگەیشتووە ئەهاتە بەر چاو وام بیر ئەکردەوە ئەگەر ئەم دوو زاتە مەزنانە بەیەکەوە رێکخراوی پارتی ببەن بەرێوە و نەخشە بکێشن بۆ پتەو کردنی حزبەکە هەموو جەماوەری کورد لەدەورو بەریان کۆ دەبێتەوە و کوردستان رزگاری ئەبێت.

لەکۆنگرەی (پێنج) ی پارتی دا چەند کەسانێك چونە خزمەت مصطفی بارزانی بە پارانەوە و دەست ماچ کردن بۆ ئەوەی بارزانی بەشداری بکات لەکۆنگرەکەدا، بەڵام جوان نییە کەمن لێرە باسی بکەم هەرچەندە قسەکانی بیستراوە و بڵاو بۆتەوە کەبەچ جۆرێك هێرشی بردە سەریان کەئەوە لایەق نەبوو بەم پیاوە مەزنە کەبەو شێوەیە لەسەر منبەرەوە سوکایەتی ئاراستەی هەموو ئەو سەرکردانەی کەهەڵیان بژارد بوو بۆ پۆستی سەرۆکایەتی بەتایبەتی (ئەو دڵسۆزو نیشتیمان پەروەرانەی کەنوێنەری راستە قینە و پێشرەوی کورد بوون) بکردایە کۆنگرەی پێنجەمی ( پ.د.ك) بەکورتی و بەکوردی بو بەهۆی ئەوەی کەچارە نوسی دوا رۆژی کورد ببەستێتەوە بە (پ.د.ك) وەکە ئەویش لەژێر باڵی شەخصی سەرۆك مصطفی بارزانیدا بوو تەنها خۆی خاوەن بڕیار بوو لەهەڵبژاردنی هەر یەك لەم (سێ) رێگایانەی خوارەوە بۆ کورد (ئاشتی - سلم) (شەڕ - الحرب) ( ئاشبەتاڵ _ انهاء الحركة الكردية).

بەداخەوە ئەم تێکۆشەرو زاناو سیاسەتمەدارو پسپۆرانەی کورد بەم جۆرە دوا رۆژی کوردیان تەسلیم بەجەنابی مەلا مصطفی بارزانی کرد، لەکاتێکدا لەماوەی ئەو (١٣) ساڵەی کەدوور لەووڵات بوو هیچ پەیوەندیەکی نەبوو بە

رێكخراوی پارتی‌یه‌وه.

مام جه‌لال له‌ساڵی ١٩٥٦ كه‌ له‌روسیا له‌گه‌ڵ بارزانی كۆبوبوه‌وه‌ و دوو به‌دوو گفتوگۆیـان له‌سـه‌ر ئـاینده‌ی كورد كردبـوو، شـاره‌زایه‌كی باشـی پـه‌یدا كـرد له‌ماهیه‌تی بارزانی.

(مامۆستا ابراهیم احمد و كاك نوری احمد طه) یه‌كـه‌م كـه‌س بـوون چونـه‌ خزمـه‌ت بـارزانی لـه‌ رۆمانیـا وه‌ تاگه‌ڕانــه‌وه‌یان چــه‌ند جـارێك دانیشـتنیان له‌گه‌ڵ بارزانیدا ئه‌نجام دابوو، كه‌گه‌ڕانه‌وه‌( كاك نـوری شاوه‌یس و كـاك عمـر دبابـه‌ و كـاك علی عبـدالله)یـان به‌نـهێنی ئاگــادار كــردەوه‌ له‌ماهیــه‌تی مــه‌لا مصطفی بارزانی له‌هه‌موو ڕویه‌كه‌وه‌ و وه‌ئه‌م ئاگاداری‌یه‌ هـه‌تا ئێستاش هـه‌ر به‌نهێنی ماوه‌ته‌وه‌.

جه‌نابی[٥] (میر حاج) چونكه‌ شاره‌زای كه‌سایه‌تی بارزانی بوو ڕایی به‌ده‌ست خۆی بوو دوای ماوه‌یه‌ك خۆی دوور خسته‌وه‌ له‌شه‌خصی بارزانی تاكو كۆچی دوایـی كـرد كـه‌س بـه‌مـه‌ی نـه‌زانی كـه‌هۆی چـی بـوو. بـۆ نموونـه‌ : جارێكیـان بارزانی ئه‌چێته‌ سه‌ردانی میر حاج كـاك فـواد عـارف ئـه‌بات له‌گـه‌ڵ خـۆی بـۆ ئه‌وه‌ی ده‌رگای لێ بكاته‌وه‌، كاك فواد له‌ده‌رگای ماڵیان ئه‌دات ئه‌ڵێت بیكه‌ره‌وه‌، میر حاج وتبووی له‌به‌ر خاتری تۆ ده‌رگا له‌ مه‌لا مصطفی ئه‌كه‌مه‌وه‌.

له‌ساڵی ١٩٧٤ سه‌ردانی جـه‌نابی شـێخ عوسمـان كـوڕی شـێخ احمـد بـارزانی م كـرد له‌بـه‌غدا لـه‌ماڵی خۆیـان كه‌چوومـه‌ ژووری جـه‌نابی مـیر حـاج م بینــی ئه‌گریا زۆرم لا ناخۆش بوو ئه‌م پیاوه‌ مه‌زنه‌ هۆی چییـه‌ ئـاوا ئـه‌گری، بـه‌ڵام دوایـی تـێ گه‌یشـتم بـۆ دوا ڕۆژی میللـه‌تی كـورد ده‌گریـا كـه‌ تاریكـه‌ چونكـه‌

---

[٥] ده‌رچووی كۆلێژی سه‌ربازی‌یه‌، ئازا، زیره‌ك، شۆڕشگێر، سیاسه‌تمه‌دارێكی كورد، نیشتیمان پـه‌روه‌ر، نمونـه‌ی ئـه‌خلاق، له‌شۆڕشـی بـارزان و لـه‌كۆماری مـهاباد به‌شـدار بـووه‌، له‌گـه‌ڵ بارزانی و هاوڕێكانی ڕۆیشته‌ روسیا، له‌دوای ١٤ تموز ١٩٥٨ له‌گه‌ڵ بـارزانی گه‌رایـه‌وه‌ عـیراق، گه‌رایـه‌وه‌ بـۆ سـوپا به‌پلـه‌ی عقیـد، لـه‌وه‌زاره‌تی بـه‌رگری (مـترجم) بـوو له‌هـه‌مان كات لـه‌ كۆلێژی سه‌ربازی (كلیه‌ اركان) ده‌رسی ئه‌وته‌وه‌.

ئەیزانی مەلا مصطفی کوردستانی پێ ڕزگار ناکرێ وەبەرەو هەڵدێری دە مەکتەبی بارزانیم ئاگادار نەکردەوە لەو هەڵوێستەی میر حاج، جەنابی میر حاج خۆشحاڵی خۆی دەربڕی کەیارمەتی شێخ عوسمان ئەدەم، فەرمو داواکارییەکم هەیە ئەویش ئەوەیە سەیارەی تازەی نییە، لەسەر داواکردنی میرحاج لەکویت سەیارەیەکی مارسیدسم بۆ هێنا بەقاچاخی بەپارەی خۆی لەکاتێکدا هاتنی شێخ عوسمان بۆ بەغدا هەموو هەوڵدانێکی بۆ ئەوە بوو کەهۆزی بارزانی سەرانسەری بکەوێتە ژێر دەستی حکومەت، سەیر ئەوەیە میر حاج ئەمەی بەباش ئەزانی، بەڵام من بەردێکم لەسەر دانا. ئەو تاوانبارە سەرەکییانەی کە بارزانیان کرد بەسەرۆك بەسەر کوردەوە ئەم کەسایەتیانە بون ( مامۆستا ابراهیم احمد مام جەلال و نوری شاوەیس و علی عبدالله و عمر دبابە و نوری احمد طه و صالح یوسفی)، ئینجا هەموو ئەوانەی کەلە کۆنگرەکەدا بەشدا بوون ئەوانیش کەم تەرخەم بوون لەبڕیارەکەیاندا، (تەنها دوو کەس نەبێت هیچ تاوانێکیان نییە)، یەکەمیان: شەخصی بارزانی بوو چونکە ئەم دەستەڵاتە بە زۆر چەسپاندیان بەسەریا، دووەم: مامۆستا حلمی علی شریف کەتاکە کەس بوو دوای قسەکانی بارزانی کەتەواو بوو، وتی: ئەم کابرایە لەسەرەتای قسەکانیەوە هەتا کۆتاییەکەی سوکایەتی بە ئێمە کرد بە( جوێن) دان، وەئەگەر کابرایەك ڕازی نەبێت سەرۆکی من بێت بۆچی دەستی ماچ کەم بەزۆر بیکەم بەسەرۆکی خۆم، وەئەوە بوو دوای ئەو هەموو سوکایەتییەی کەبارزانی پێی کردن هێشتا هەر بە مەمنونی کردیان بەسەرۆك وەپێغەمبەری ئازیزیش(صلیالله علیه وسلم) دەفەرموێت (من أعان ضالماً سلطه الله علیه) ئەگەر بەگشتی پێشنیارەکەی (مامۆستا حلمی شریف) یان پەسەند بکردایە لەکۆنگرەی ( پێنجەم)دا ، کورد تەنها دوو حیزبی ڕێکخراوەیی نەتەوەیی سیاسی دەبوو کەیەکێکیان حزبەکەی (بارزانی) دەبوو وەئەوەی تریشیان حزبی(پ.د.ك) دەبوو بەبێ بارزانی.

سەرکردایەتی (پ.د.ك) ماوەی ئەو (١٢) ساڵەی کەبارزانی لەروسیا (نەفی)

کرا بوو، وێنەی ئەم زاتەیان بەجوانترین شێوە دەکێشا بۆ ئەو خەڵکە و ڕۆژانە لەهەموو بڵاو کراوەکانیاندا باسی چالاکیەکانی مەلا مصطفیـیان دەکرد بۆ ئەو خەڵکەو دەیان وت (ئەگەر مەلا مصطفی نەبێت کورد کۆتایی دێت، مەلا مصطفی جەنەڕاڵە لەڕوسیا، مەلا مصطفی ئەوەندە ئازایە هەوڵی داوە بەشداری لەجەنگی میسر دا بکات، وە هەموو ساڵێك ئەیان وت: مەلا مصطفی ئەم بەهارە دێتەوە و کوردستان ڕزگار دەکات ،......هتد) بەم شێوەیە پرو پاگندەیەکی زۆر بڵاو کرایەوە بۆ خودی بارزانی.

هەر بۆیە کاتێك بارزانی گەڕایەوە بۆ عیراق هەموو خەڵك بەو ئاواتەوە بوون کەبەخزمەت ئەم زاتە پیرۆزە پایە بەرزە بگەن و دەستەکانی ماچ بکەن.

بەم شێوەیە ئەگەر بهاتایە وَ( مەلا مصطفی) حزبێکی بۆ خۆی بەتەنیا دروست بکردایە ئەوا زیاتر لە ٧٥٪ ی جەماوەرەکەی لەگەڵ دەبوو، وەئەگەر بەهەمان شێوە سەرکردایەتی(پ.د.ك) بیان ویستایە پشت نەبەستن بە مەلا مصطفی و بیریان لەکەمی و پوختی بکرادایەتەوە و هەڵ نەخەڵەتانایە بەزۆری و بۆری و سەبریان بگرتایە لەسەر ئەو لاوازی و کەمیـیەی کەتوشیان دەهات کەلەوانە بوو لە ٢٥٪ ی جەماوەرەکەشیان پێوە نەمایە، بەدڵنیایی دەڵێم ئەم بارو دۆخەی سەرکردەکان تەنها چەند ساڵێك وا دەمایەوە چونکە ئەو خەڵکە لەماهیـیەتی مەلا مصطفی بەتەواوەتی دەگەیشتن ئەوسا لە ٧٥٪ جەماوەرەکە ڕوویان دەکردەوە ئەو سەر کردە بەتوانا و ڕۆشنبیرانەو تەنها لە ٢٥٪ ی ئەو خەڵکە لەگەڵ (بارزانی) دا دەمانەوە کەبریتی دەبوون لەسەرۆك هۆزەکان وەبارزانی ئەبوو بەسەرۆکی حزبێك وەکو حزبی ( پارێزگاران) ی ئێستا، وەسەرکرادایەتی پارتیش بێ گومان حزبێك ئەبوو کە هەموو دووژمنانی کوردستان سڵیان لێ دەکردەوە و وەئەو دوو بەرەکی و شەڕی برا کوژیانەش ڕووی نەئەدا کەئێستا هەموو کوردێکی بەشەرەف پێوەی ئەناڵێت.

دانیشتوانی کوردستان بەگشتی مەشخەڵی ئازادی و ڕزگاری کوردستانیان

لەسەرۆکایەتی بارزانیدا دەبینیەوە، جەماوەر ئەم هەنگاوەیان پەسەند کرد بەجۆرێك کەلەبەر دەمی زۆری بارەگاکانی( پ.د.ك) دا ئاهەنگیان دەگێڕا بۆ دەربڕینی خۆشحاڵی خۆیان و هەموو هیتافێك و پڕو پاگندەیەك بەناوی سەرۆك بارزانی ئەکرا.

بەم بۆنەیەوە کەکۆنگرەی پێنج بەم شێوەیە سەرکەوتوو بوو بنکەی هاولاتیان(قاعدە) جەماوەر بەگشتی بڕیاریان دا هەموو هەنگاوێکی سەرکرادایەتی لە ١٠٠٪ جێ بەجێ بکەن و گیان و ماڵ و سامانی خۆیان فیدای ئەم سەرکرادایەتی‌یە پیرۆزە بکەن وەکوێرانە بەبێ ئەوەی هیچ پرسیارێك بکەن بەرەو مردن مل بنێن وا چو بووە مێشکیانەوە کەهەرکامێکیان بکوژرێت شەهیدن، وەبەندەی خزمەتکاری کوردستانیش یەکێك بوو لەوانە.

سوپاس بۆ یەزدانی مەزن کەماوم لەژیاندا ئەم ڕاستی‌یانە ئەخەمە بەر چاوی جەماوەر.

**حکومەتی قاسم لەچەند جەبهەیەك شەڕی دەست پێ کرد:**

یەکەم: هەموو هێزو توانایەکی لەڕێگای سوپاوە خستە گەڕ، ئەوە بوو هێرشێکی دڕندانەی بردە سەر سەرانسەری کوردستان.

دووەم: دەستی کرد بەگرتنی هەموو ئەو کەسانەی کەسەر بە(پارتی بارزانی) بوون بەناوی تابوری پێنجەوە (طابورالخامس) .

سێیەم: بۆ ئەوەی ناشیرین نەبێت لەبەر چاوی خەڵکی عیراق بەگشتی و کورد بەتایبەتی ئەی وت ئەمە شەڕێکە لەگەڵ (چەتەکاندا) دا.

چوارەم: بۆ ئەم مەبەستە تاوانباری گەورەو سیخوڕ (کمال عوسمان ئاغا) کەوتە جموجۆڵ و پەیوەندی کرد بەسەرۆك هۆزەکانەوە بەمەبەستی سوك کردنی بارزانی، ئەوە بوو یەکەم سەرۆك هۆز شێخ احمد بارزانی بوو وەهێنایان لەمیوانخانەی سمیر امیس دایان نا، من کەچومە خزمەتی ئەفسەرێکی سیخوڕی تورکمان خەڵکی شارۆچکەی کفری چاودێری ئەکرد و

جۆم نەکرا بەتەنها لەگەڵی گفتوگۆ بکەم، بەڵام شارەزای ژوورەکەی بووم کات زمێری چواری بەیانی خۆم گەیانە ژوورەکەی لەمیوانخانەکە پاسەوانی بەر دەرگاکەی وای دەزانی کارمەنی میوانخانەکەم کاتێك چوومە ژووریٚ شێخ لەخەودا بوو کەکەوتینە قسە کردن زۆر باش لە ووشەکانی حاڵی نەدەبوم، هەستام بانگی جەنابی شێخ (محمد خالید) م کرد ئەویش لەخەودا بوو ئاگادارم کرد بۆیە وا زوو هاتووم کەسیخوڕەکانی لیٚ نەبێت هەرچەندە شەرمەزارم کەجەنابتانم لەخەو کرد بەڵام مەبەستم ئەوەیە کەمن و جەنابی شێخ احمد لەیەك حاڵی بکەیت لەبەر ئەوەی بەڕێزتان سۆرانی باش دەزانن.

وتم : من دڵسۆزێکی ئێوەم خۆم وەکو مرۆڤێکی بارزانی داناوە، پیلانی ڕژێمی قاسم لەهێنانی ئێوە بۆ ئێرە ئەوەیە کە دوو بەرەکی بخەنە ناو هۆزی بارزانەوە بەتایبەتی لەنێوان جەنابی شێخ احمد و مەلا مصطفی بارزانی دا، ئێوەش هۆزی بارزان بەسەر مەشخەڵی شۆڕش و کوردایەتی ناو بانگتان لەسەرانسەری کوردستان بڵاو بۆتەوە، بەندە هاتوم ئاگادارتکەم مەترسیەکی زۆر گەورەی هەیە لەم کاتەدا پشت لەمصطفی بارزانی بکەیت شۆڕشی کوردی بە جۆرێك لاواز دەبێت ڕەنگە ئاشبەتاڵی لەدوا بێت، ئێمەی کورد ئەگەر هەمووومان یەك ببین و دوو بەرەکی لەناوماندا نەبێت ڕەنگە بگەینە ئامانجی خۆمان انشاءالله. بارودۆخی زەعیم ڕوو لەخراپییە کورسییەکەی ڕۆژ بەڕۆژ زیاتر بەرەو لەقی دەڕوات.

شێخ فەرموی: ڕاستە تۆ دڵسۆزی بەڵام سەرکردەکانی کورد وەهانین. ڕەفیق ئیشی کوردان پوچە، کورد ئاڵۆزو بڵۆزی ئەکات پاش دوو ڕۆژ دوای چاوپێکەوتنەکەم شێخ احمد چۆن لەگەڵ مندا قسەی دەکرد بەهەمان شێوە دووا بۆ ئێستگەی بەغدا بەشی کوردی.

ئەنجامی هێرشەکەی ڕژێمی قاسم بۆ سەر کوردستان سەرکەوتوانە بوو لەهەموو لایەکەوە چەکدارەکانی هۆزەکان شکان،بەشی زۆری بڵاوی کرد، بارزانی تەنها( ٤٠٠-٥٠٠ )چەکداری لەگەڵ مایەوە بۆ نمونە( شێخ حسین

بۆسكين) دوو كەسی لەگەڵ مابوو لەئەنجامی ئەو گرتنە كوێرانەيەی كە قاسم دەستی پێ كرد بوو، من و ٣٨ كەس بەر ئەو(ڕەش بگيرە) كەوتين وەبردينيانين بۆ بەنديخانەی رمادی.

لەبەند كراوەكاندا تەنها سيانيان پارتی بوون ئەوانی تر تاوانەكەيان ئەوە بوو كە كورد بوون وەمنيش يەكێك بووم لەوانە وەبەند كردنم هۆكارێك بوو كەئاگاداری ڕووداوەكانی دەرەوە نەبم بەهيچ شێوەيەك.

كاتێك لەبەنديخانە دەرچووم كاك( عگيد صديق) هەندێك ڕووداوی بۆ گێڕامەوە وەهەروەها كاك علی عەسكەريش بەهۆی ئەوەی كاتی خۆی لەخزمەتی خودی بارزانی دا بوو ئەويش هەمان ڕووداوی بۆ گێڕامەوە كەئەويش ئەوەيە:

هێزی چەكداری هۆزەكان دەشكێن و بڵاوەی لێ دەكەن بارزانی دەچێتە ناوچەی(بەرواری باڵا) نزيك سنوری توركيا لەگەڵ ٥٠٠ چەكدار، چەند نوسراوێك ئاڕاستەی چەند حكومەتێك دەكات لەوانە توركياو سوريا داوايان لێ دەكات كەخۆی و هێزەكەی وەرگرن بەپەنا هەندە( لاجيء) بەڵام هيچ كام لەو دوو حكومەتە ڕازی نابن بەداوا كاريەكەی بارزانی.

بارزانی بەپێی بڕياری كۆنگرەی (٥) بۆی هەبوو لەبەر بەرژەوەندی گشتی هەموو بڕيارێك بدات هەر وەكوو ڕونم كردۆتەوە بۆی هەيە لەو(سێ) خاڵانەی پێشتر باسم كردوون بەبۆچونی خودی خۆی هەرچيەك بەڕاست بزانێت فەرمانی لەسەر بدات.

ئەوە بوو لەبەرواری يانزەی ئەيلول ١٩٦١ دا شۆڕش بەر پا بوو بەفەرمانی بارزانی.

لەبەرواری ١٩٦١/٩/١١ شۆڕشی ئەيلول بەرپا بوو، ئەی دانيشتوانی كوردستانی باشور سەرنجێك بدە لەپێش ڕۆژی(١٩٦١/٩/١١) ئەو كاتە سنوری كوردستان گەيشتبووە( جبل حمرين) وەئێستاش بزانە سنورەكەمان لەكوێيە..؟

بەهۆی ئەو بڕيارە هەڵەيەی بارزانيەوە چ زيانێكی گەورە لەكوردو

كوردستان كەوت. ڕۆژانــە لەتەلـەفزیۆن و ئێستگەو ڕۆژنامـەو گۆڤارەكانیـاندا
باسی شۆڕش یانزەی ئەیلول دەبیستین، بۆیە پێم باشە هەندێك ڕاستی گرنگ
لەسەر شۆڕشی ئەیلول بخەمـە بـەر چاو بـۆ چاوڕونی ئەوانـەی كەشارەزانین
وەبیری ئەوانەشی بهێنمەوە كەلەبیریان چۆتەوە، من زۆر دڵنیام لـەوەی كـورد
بەشۆڕش نـەبێت ڕزگاری نـابێت، چونكە حـەق ئەسێنرێت، حــەق نـادرێت
وەتاكە ڕێگـا چارەیـەك ئەگـەر هـەبێت بـۆ ڕزگـار كردنـی كـورد لـەچنگی ئـەو
چوار دەوڵەتـە تەنـها شۆڕشـە، بـەڵام كـام شـۆڕش، شۆڕشـێك كـەدوو هۆكـاری
سەرەكی ببیات بەڕێوە كەئەویش (عەقل و هـێزە) چونكـە ئەگـەر بێتـو بـیرو
بۆچونەكان هەمووی چوون یەك نەبێت وە ئاگاداری هەڵوێستی جیهان نەبیت
بەرامبەر شۆڕشـەكەت،وەهـەروەها بـەرژەوەندی گشـتی جـەماوەرو هەڵوێستی
دراوسێكانت بەرامبـەر بەتۆ، هەمووی چوون یـەك نەخـەیت لەگـەڵ سـازدانی
چەكدارێكی زۆر و ڕەچاوكردنی جۆری چەكەكەت و كات وشوێنی شۆڕشەكەو
باری ئابووری لێك نەدەیتەوە زۆر بەزەحمەت شۆڕشەكەت سەر دەگرێت.

بۆیە من بۆچونم وایە یەكێك لەو هەڵە گەورانەی كەئـەنجام دراوە لەلایـەن
سەركردەكانی كوردەوە ئەوە یەكێكیانە ئەگەر ئەم بڕیـارە لـەجیاتی ١٩٦١/٩/١١
كە بەهەڵە (اشـتباە) درا لـە( ١٩٧١/٩/١١) بدرایـە واتـە لـەدوای دە سـاڵ بڕیـاری
شۆڕش دەرچوایە ئێمە ئێستاكە دەوڵەتێكی كوردی سەر بەخۆمان هەبوو.

بۆ نمونـە وا دەركـەوت سـەرۆك صـدام حسـین لەئێمـەوە فێر بـووە هـەموو
هەڵەیەك بەسەركەوتن دا بنێیت.

لەساڵی ١٩٦٣ بەهۆی سەرۆك بارزانی لەبەغدا بـەریان دام یەكسـەر هاتمـەوە
ماڵێ دوای پشودانێكی چەند ڕۆژی یەكەم كەس چاوم بەمامۆستای تێكۆشەرو
ڕۆشنبیرو سیاسەتمدار صالح یوسفی كـەوت سوپاسـی هەسـتی برایانـەم كـردو
ئەویش خۆشـحاڵی خـۆی پـێ نیشـان دامـو وتـی: هـەموی هـەوڵدان و كوششـی
بارزانی بوو كەتۆی ڕزگار كرد چونكە میریی بڕیاریان دابوو كەبەر نەدرێیت،
بەتەنها و دوو بەدوو زیاتر لەیەك كات ژمێر باسی بـارودۆخی ئـەو ماوەیـەی

بۆ کردم کەمن تیایدا بەند کرابووم کە چ جۆرە ناکۆکیـەك هەیـە لـەنێوان بارزانی و مەکتەبی سیاسی جەماعەتی ابراهیم احمد.

من گوێم دەگرت جار جاریش پرسیارم لێ دەکرد بۆ ئەوەی هەندێ شتم بۆ روون کاتەوە تاکو بزانم حەق لای کێیە.

لەگەڵ مامۆستا یوسفی لەئەنجامی ئەو دانیشتنە من هیچ رەنێیەکی خۆمم دەرنەبڕی ، رێك کەوتین کەیەکتر ببینین پێش ئەوەی بەغدا بەجێ بهێڵم.

چاووم بەخەڵکێکی زۆر لەرۆشنبیران و نیشتیمان پەروەر و سیاسەتمەدارانی کورد کـەوت لەوانـە مامۆسـتا عبدالرحمن زەبیحـی (علمـاء) لەئـەنجامی ئـەو چاوپێکەوتنانـەدا زۆر بـاش لـەرووداوەکان تێگەیشـتم، رۆژێکیـان چـەند سەعاتێك دەرگام لەسەر خۆم داخست بـەبیانووی ئـەوەی کەتـەواو نیـم پشو ئەدەم، والله سەرم سوڕما خۆم بەخۆمم ئەوت رەنگە ئەمە خـەون بێـت ئەمـە ئەگـەر بـەو شـێوەیە وابێـت کەواتـە (ناقوسـی خەتـەر) لێ داوە و ئـەبێ چاوەڕوانی چارەنوسێکی رەش بکـەین والله لـەو رۆژەوە ئەمـە بڕیـارم بـووە سوێندم بەخوای تاك و تەنها خوارد لەسەر ئەم رایەی خۆم سوور بم .

لەدانیشتنی دووەم جارم دا لەگـەڵ مامۆسـتا صالح یوسـفی دەسـتمان کـرد بـەگفتوگۆ کـردن لەئـەنجامدا هەڵوێستی(مایع) واتـە روون و ئاشـکرا نـەبوو هەرچەندە بەلای بارزانیدا زیاتر بایی دەدا بەڵام رای کۆتایی قـەد بـڕ نـەبوو (حاسم).

وتم: ماۆستا حەز ئەکەم لەئێستاوە رایـی خۆمـت بـۆ بـاس بکـەم تـاکو بـاش ئاگادار بیت، من لایەنگری هیـچ کامێکیـان نـابم رەنگـە ئـەم هەڵوێستەی مـن زیـانێکی سیاسـی و مـادیم لێ بـدات بـەڵام ویژدانـی خـۆم تووشـی ئـازارو ئەشکەنجە ناکەم بەوەی بچمە پاڵ لایەنێکیان لەکاتێکدا لەهەموو کەس زیاتر ئاگاداری راستیـیەکانم ئینجا رێگام بدە با بەبۆچونی خۆم تیشك بخەمە سـەر رووداوەکانی کە ئەم ماوەیە رووی داوە:

١.وەکو بـۆم دەرکـەوتوە حکمـەتی عـیراقی لـەپاڵ سـوپاکەیدا هـەموو

هێزو توانایەکی خۆی بەکار هێنا، ئێستاکە پیلانی تازە دادەڕێژێت بۆ لەناو بردنی شۆڕشەکەمان لەڕێگەی دوو بەرەکی لەنێوان بارزانی ومەکتەبی سیاسی داو مەبەستەکەش ڕوون و ئاشکرایە .

٢.بارزانی ئەڵێت لاوازی ئێمە لەبەر چاوی حکومەت هۆی ئەوەیە کەدوو سەرکرایەتیمان هەیە یەکێکیان لەسۆران ئەوی تریشیان لەبادینان، لەکاتێکدا من سەرۆکی حیزبم بەو بڕیارەی لەکۆنگەری پێنج دا دەرچووە بۆم هەیە سەرپەرشتی هەموو کوردستان بکەم بەڵام جەماعەتی ابراهیم احمد ڕێگام نادەن .

٣.مەکتەبی سیاسی، بارزانی تاوانبار ئەکەن بەوەی دەیەوێت دوو بەرەکی بخاتە نێوانمانەوە ئەیەوێت بەهێز سەرپەرشتی کوردستان بکات وەبەعەشایەری بەرەنگاری ڕووداوەکان ببێتەوە لەگەڵ عبدالسلام عارفدا. لەکاتێکدا عبدالسلام عارف هیچ هەنگاوێکی نەناوە بۆ نزیك بوونەوەد لەکورد تەنها داوای (هودنە) نەبێت واتە نەشەڕ نەئاشتی.

مامۆتا صالح پرسیاری کرد ئایا چ ڕێگایەك ئەگریتە بەر..؟

وەڵامم دایەوە انشاءالله ڕێگایەك ئەگرم کەخزمەتی کوردو کوردستانی تیاکەم چونکە لەخودا بەزیاد بێت بەتێگرایی شێخەکانی بارزانی دۆستایەتییەکی زۆر چاکم هەیە لەگەڵیاندا لەساڵی ١٩٥٦داوەهەموو توانای خۆم بەکار دەهێنم بەڵکو نەیەڵم ئەم دوو بەرەکییە ڕوو بدات.

وتی: خۆش حاڵ بووم کەئەمە بۆچوونتە، ئەوەندەی من ئاگادار بم بارزانی زۆر تۆی خۆش دەوێت، نامەیەکی ئاڕاستەی بارزانی کرد دەربارەی من، گەیشتمە لای بارزانیو نامەکەم دایەو خستیە ژێر دۆشەکەکەیەوە نەیخوێندەوە چونکە ئەوەندە بەگەرمەوە پێشوازی لێ کردم نامەکەی پشت گوێ خست.

**بارزانی و دانیشتنەکانی :**

ئەو ماوەیەی کەسەردانی بارزانیم دەکرد چ لەسەنگەسەر یا لەشارۆچکەی

ڕانیه ئەوەی من تێبینیم کرد بەبەردەوامی لەهەوڵی ئەودا بوو کەزەمینە سازی بکات بۆ ئەوەی بەتەواوەتی. باڵا دەست بێت بەسەر کوردستاندا وەئەمەی دووپات دەکردەوە لەدانیشتەکانیدا نەوەك بەتەنها بۆ من بەڵکو بۆ هەموو کەسێك دۆست بوایە یان دوژمن، هێرشی دەبردە سەر جەماعەتی ابراهیم ئەحمەد دەیوت: ئەمانە (١٤) کەسن نەیان هێشتووە کەس بگاتە پلەی مەکتەب سیاسی و لیژنەی مەرکزی، تاوانی ئەخستە پاڵیان کەئەمانە پیاو کوژو ماڵ خۆرن ناموس و شەرەفی کوردیان خستۆتە ژێر قاچیانەوە، خۆیان ناوناوە بەمەکتەب سیاسی ئیمبراتۆرییەتی ماوەتیان هەیە خەڵك نان نیە بیخۆن ئەوانیش بەئارەزووی خۆیان خواردن خواردنەوە دەخۆن مانگانە (٧٠) دینار ئەدەن بەجۆ بۆ مریشك و عەلەشیشەکانیان بەلاماری ناموس و شەرەفی کوردیان داوە وەبەتایبەتی [٦](مجید گورگ، [٧]مەلا ماتۆڕ، حلمی ناشەریف ، حمە امین قەرج، عومەر تەنەکە و، بلەی ئەحە ڕەش ، هەردوو نورییەکەو، عەلەی کەچەڵ ، جەلۆ) دەیانەوێت زاڵ بن بەسەر کوردستاندا.

## بارزانی بەم شێوەیە پیلانەکانی خۆی پیادە دەکرد:

١.لەگەڵ هەموو کۆمەڵە خەڵکێدا کەدادەنیشت هەر یەکە بەگوێرەی

---

[٦] ئەندامێکی پارتییە کادرێکی پێشکەوتو نیشتیمان پەروەر لەناو چەی کۆیەو قەلادزێ و ڕانیە کەسایەتییەکی ناسراوە ڕێزی هەیە لای جەماوەر وەبەگشتی دەرەبەگەکان و سیخوڕەکانی ئەو ناوچەیە دژایەتی ئەکرد چونکە ئازاو زیرەك بوو.

[٧] مامۆستا مەلا عبدالله بەسواری ماتۆڕ بەناو جوتیارەکاندا گەڕاوە لەوەوە پێی دەڵێن مەلا ماتۆ پیاوێکی خوێندەوار زیرەك ئازا، یەکێکە لەوانەی جێی شانازی یە وەجێ دەستی دیارە لەبزوتنەوەی ڕزگاری خوازی کوردستاندا بەهۆی نیشتیمان پەروەری و پاکی و دڵسۆزییەوە بۆ نیشتیمانەکەی دوای (١١ی ئازار) مایەوە لەبەغدا لە١٩٧٤دا کەشەڕ دەستی پێ کردەوە لەوێ گرا بەوەزیر ،

کەسایەتیـیەکەی گفتوگۆی لەگەڵ دەکردن، ئەگەر ئاغاو شێخ مـەلا بوایـە ئـەوا ئـەو هێرشـەی کەلەسـەرەوە بـەکورتی باسـم کـردووە بەشـێوازێك دەکـردە سـەر جەماعـەتی بـاڵی مەکتـەبی سیاسـی ابراهیـم احمـد کەقەناعەتی پێ دەکردن و وای لێ دەکـردن کەلـەدەوری کۆببنـەوە تەنـها دوو کەس نەبێت چۆکیان بۆ دانەنان ئەوانیش لەداهاتودا لەگەڵ نـاوبژی کەراندا ناویان دەهێنم وسەرۆك هۆزەکانی وا حاڵی کردبوو ئەگەر بێت بارزانی سەرکەوتن بەدەست بێنی بەسەر باڵای مەکتـەبی سیاسـیدا ئـەوا هەموو شتێك لەبەرژەوەندی ئەواندا دەبێت.

٢.کەنوێنەری حکومەت دەهات بارزانی داوای لەمەکتەبی سیاسی دەکرد کەپێویستە بەژداربن بـۆ گفتوگـۆ کـردن، بـۆ نموونـە جارێکیـان جـەنابی (تایەر یەحیی) سەرۆك وەزیرانی رژێم دێت بـۆ گفتوگـۆ کـردن، بـارزانی رووی تێ دەکات و دەڵێت من هیچ داواکاریەکم نییە ئەمانە (مەکتـەبی سیاسـی، واتـە ابراهیـم احمـد) داواکاریـەکانیان کۆتـایی نایـەت لـەوێدا مامۆستا ابراهیم احمد بەناچاری مافـەکانی نەتەوایـەتی کورد بـۆ تایـەر یەحیی شی دەکاتەوە وەداواکاریەکانی کوردی پـێ رادەگەیـەنێت وەبـۆی روون دەکاتـەوە کەشۆرشـی کوردی تەنـها لـەپێناوی ئـەو مافانـەدا بـەرپا بووە وەخوێنی رشتووە، وەپێـی دەڵـێ ئێـوە تـا ئێستا هیـچ هـەنگاوێکتان نەناوە بۆ گۆرینی بـارو دۆخـی ئێمـەی کـورد کـەچی داوا لەئێمـە دەکـەن بریارەکانتـان بـۆ جێبـەجێ بکـەین، لـەو روانەگەیـەوە حکومـەت بـەرچاوروون بـوو کەجەماعـەتی ابراهیـم ئەحمـەد نایانـەوێت لەگـەڵ حکومـەتدا ئـەم کێشـەیە چارەسـەر بکـەن ئەگـەر حکومـەت هـەموو داواکاریـەکانیان جێبـەجێ نـەکات، حکومـەت سیاسـەتی خـۆی گـۆری بـەوەی کەپێویسـتە پشـتی بـارزانی بگرێـت وەیارمـەتی بـدات دژ بـە جەماعەتی ابراهیم ئەحمەد، وەئەم کارەی حکومـەت یارمـەتی بـارزانیدا بۆ ئەوەی بەشی زۆری سەرۆك هۆزەکان لەدەوری خۆی کۆ بکاتەوە.

٣.مەکتەبی سیاسی جەماعەتی ابراهیم احمد: لەیەکەم ڕۆژدا پارێزگاری سلێمانی حاجی (عبدالرزاق) لەگەڵ بارزانی کۆبووەوە بە مەبەستی (هودنە) لەنێوان عبدالسلام عارف و بارزانی وەمەبەستیان چارەسەرکردنی کێشەی کورد بوو لەبنە ڕەتەوە وەدانانی نەخشەیەك بۆ ئەو مەبەستە؛ هەموو هەوڵێکی مەکتەبی سیاسی جەماعەتی ابراهیم احمد لەم کاتی هودنەیەدا بۆ ئەوە بوو کەبارزانی بڕیارێك نەدات لەخۆیەوە هۆکارێك بێت بۆ دوو بەرەکی لەنێوانیاندا، وەئەیانوت ئێمە بەهەموو هەڵوێستەکانی ئێوەی بارزانی ڕازین ئەگەر ئەڵێن (شەڕ -شەڕ) (ئاشتی-ئاشتی) وەبەهەموو شێوازێکیشەڕ ڕاگرتن ڕازین تەنها ئاشبەتاڵی لێ دەرچێت، هەرچی هەوڵێکیان دا لەگەڵ بارزانیدا هەمووی بێ سوود بوو ناچار بوون کەپەنا بەرنە بەر کەسایەتییەکانی کورد بەڵکو بتوانن هەولێ لەگەڵ بارزانیدا بدەن بەتایبەتی سەرۆك هۆزەکانی هۆزی ئاکۆ [8](عباسی مەمەند ئاغ) و[9](جەنابی کاکە زیادی حەمە ئاغای کویسنجق) بەلام هەوڵەکانیان بێ هودە بوو دوا بەدوای ئەمانیش چەند کەسایەتییەتییەکی تریش کەوتنە نێوانیانەوە بۆ ئەوەی دوو بەرەکی ڕوو نەدات وەك جەنابی [10](شێخ لەتیفی شێخ مەحمود) وەمامۆستای مەزن [11](مەسعود محمد) بەلام هەر بێ ئەنجام بوو، لەدوای ئەمان وەفدێکی کوردی لەبەغداوە هات دڵخۆشی کەوتە ناو دڵی هەموو جەماوەرەکەوە ئەیانوت گومان نیە ئەمانە سەر ئەکەون،

لەسەر شێوەی دادگا وتووێژو پرسیاریان دەکرد دوای پرسیارو وتووێژێکی زۆر لەگەڵ بارزانیدا جەنابی(ڕەشید عارف) کەسەرۆکی وەفدەکە بوو

---

٨ لەبەشی سێیەمی کورد، دوژمنی خۆت بناسە بەدوورو درێژی باسی دەکەم.

٩ لەبەشی سێیەمدا باسی دەکەم.

١٠ لەبەشی سێیەمدا باسی دەکەم.

١١ لەبەشی سێیەمدا باسی دەکەم.

بەبارزانی دەڵێت هەڵسە تۆ بچۆ دەرێ چاوەڕوان بکە هەتا لەگەڵ مامۆستا ابراهیم ئەحمەدیشدا وتووێژ دەکەم، بارزانی لەوەڵامدا بەزەردەخەنەیەکەوە دڵێت بەسەر چاو، لەگەڵ ئەوەشدا کەئەم وەفدە سەرکەوتوو بوو بەڵام بەداخەوە دوای سێ ڕۆژ هەر یەکەیان پاساوێك بۆ خۆی دێنێتەوە بۆ ئەوەی بگەڕێتەوە بۆ بەغدا وەهەندێکیان دەیان وت:

( منداڵەکانمان مەکتەبیان هەیە،ماڵەوەمان نەخۆشە، ئیشەکانم پەکی دەکەوێت، دەرمانەکانم لەگەڵ خۆم نەهێناوە....هتد) .

خودا ڕوو ڕەشی دونیاو قیامەتتان کات کەلەو کاتەدا بەو شێوەیە گەڕانەوە،لەساڵی ١٩٦٩دا لەجەنابی ڕەشید عارفم بیست کە لەو (١٢)کەسە (٨)هەشتیان نەیان ویستبوو بگەڕێنەوە بەڵام کەحکومەت زانی بووی سەرکەوتوون لەکارەکەیاندا فەرمانی گەڕانەوەیان دەرکرد بوو.

بارزانی دوو هەفتە بەناوی پشوو دانەوە چوو بۆ پشتی (دۆڵە ڕەقە) لەناوچەی ئاکۆ وەشێخ لەتیفی شێخ مەحمود و کاکە زیاد ئاغاو عەباسی مەمەند ئاغا جێگری بوون بەڵام هیچ دەسەڵاتێکیان نەبوو ئەم بەڕێزانە زۆر بەپەرۆش بوون بۆ سەقام گیر بوونی ئاشتی وەهەوڵێکی یەکجار زۆریشیان دا بەڵام بێ سوود بوو ،هەتا دەهات گرژی ڕوو لەزیاد بوون بوو لەنێوان بارزانی مەکتەبی سیاسی جەماعەتی-ابراهیم ئەحمەد دا وەکار گەیشتە پرو پاگندە بۆ یەکتر و دەیانوت بارزانی بەپرتەقاڵ و سێو شۆڕشی فرۆشت، ئینجا مەکتەبی سیاسی جەماعەتی ابراهیم ئەحمەد دەست و بازوویان بەکار هێنا بەڵام سەرکەوتوو نەبوون وەبارزانی لەسەر قسەکەی خۆی سوور بوو دەیوت ئەبێ ئەم (١٤)کەسە نەمێنن.

بەشی زۆری ئەو خەڵکانەی کەلە دەوروپشتی بارزانی بوون هانیان ئەدا کەنابێت بەهیچ جۆرێك جەماعەتی ابراهیم احمد بمێنێتسەرۆك هۆزەکان دەوری سەرەکیان هەبوو لە ئاژاوەنانەوە( تەنها چەند کەسانێك نەبێت). چونکە بیرو باوەڕیان وا بوو ئەگەر بێتو باڵی( م.س) جەماعەتی ابراهیم

احمد نەمێنێ ئەوانیش کێشەی جوتیاریان نامێنێت ومبەشێك لەو ڕۆشنبیر و سیاسەتمەدارانەی لەدەوری مەلا مصطفی کۆبوونەوە بەو نیازەی ئەگەر ئەو چواردە کەسە دوور بکەونەوە ئەوان بچنە جێگایان وببنە ئەندامی(م.س) و لیژنەی مەرکەزی و چەندێك ئاگادار بم لێیان ناویان دەنوسم لە کتێبی سێیەمدا، بەشێکی زۆر لەو ئەفسەرانەی کەپەیوەندیان بەشۆڕشەوە کردبوو چونە پاڵ بارزانی وەهەندێکیان دەورێکی زۆر خراپیان هەبوو بەتایبەتی عزیز عقراوی.

حزبی شیوعی چاوەڕوانی ئەوەی ئەکرد کەمەکتەبی سیاسی نەمێنێ بۆ ئەوەی بتوانن جەماوەر بەگشتی لە دەوری خۆیان کۆ بکەنەوە، بارزانی لەهەموو دانیشتنێکی لەگەڵ حزبی شیوعی دا ئەی وت: هەرچی گرژیەك کەڕوی داوە لەم ناوچەیەدا هەتاکو ئێستاکە جەماعەتی ابراهیم احمد بەر پرسیارن لێی وە ئەوان بەو کارانە هەستاون من بەهیچ شێوەیەك ئاگادار نەبووم.

بەندە... بەردەوام بوم لەهاتووچۆ کردن لەنێوان بارزانی و مەکتەبی [redacted] جاریش دەچومە ماوەت جارێکیان( پ.م)یەك بەناوی کاك احمد هۆرێنی. بەمام جەلال و مامۆستا حلمی علی شریفی وت: با دکتۆر ڕەفیق لەگەڵمان بێت بۆ بەمۆ چونکە خەڵکی ناوچەی هۆرێن و شێخان زۆر ڕێزی لێ دەگرن، مامۆستا ابراهیم احمد فەرموی بەکوشتنی مەدەن جارێ ئیشمان زۆر پێی ماوە، ڕۆژێکیان لەکاتی نان خواردن لەخزمەتی ئەو پیاوە مەزنانە بووم مامۆستا ابراهیم احمد دکتۆر عزیز شەمزینی و کاك علی عبدالله کاتێك نانیان هێنا برنج و شلەی فاصۆلیای سادە بوو، مانم گرت ئەمە ناخۆم ئێوە مانگی (٧٠) دینار ئەدەن بە جۆ بۆ مریشك وعەلەشیشەکانتان، ناردیان کەبابم بۆ هات.

زۆرم وت چ بەنهێنی، چ بەئاشکرا، چ لەبەر چاوی کۆمەڵ بەجەنابی سەرۆك بارزانی و هەروەها بەبرادەرانی مەکتەبی سیاسی بەداخەوە نەگیشتمە ئەوەی کە من دەم ویست کە ئەم دوو بەرەکیە ڕوونەدات، بەهیچ

جۆرێك بەرژەوەندی گەلی کورد لەسەرانسەری کوردستانی باشور لەم دوو بەرکیە دا نییە، لەکاتێکدا من هەست بەم مەترسییە بکەم کە سود بەخشی ئەبێت تەنها بۆ رژێمی عیراق و ئینجا حکومەتی تورکیا هەمیشە دوژمنی کوردو کوردستان وحکومەتی شای ئێران کە پەیتا پەیتا بلاوی ئەکاتەوە ئێمە لەرەگەزی ئارییین، و حکومەتی سوریا ئەلێت کوردی مهاجرمان هەیە، خۆم لەگەلْ خۆم ئەم پرسیارانەم لەخۆم ئەکرد لاوازی شۆرش دوا رۆژی ئەم دوو بەرەکییە بەرەو چی مان ئەبات.

رۆژێك سەرۆك بارزانی فەرموی ئاگاداری خۆت بە دوژمنت هەیە.

وتم: لەهەموو دانیشتنێکم چ بەنهێنی چ بەئاشکرا زۆر باش بۆ برایانی مەکتەب سیاسیم روون کردۆتەوە کەبەبێ بارزانی هیچتان بۆ ناکرێت هەر وەکو چۆن روو بەرووی بەرێزتان رامگەیاندووە کەبەیەکەوە نەبێت ناتوانن کوردستان رزگار بکەن بەلام دوو بەرەکی خەتەر ناکێکی کوشندە ئەبێت بۆ دوا رۆژی کورد، بەگەورەیی خۆت بم بەخشە بەندە (رەفیق بارزانیم) بەرێزتان رێگاتان پێ داوم کە لە خزمەت جەنابتان قسە بکەم رۆژێك لەخزمەتتدا نانم ئەخوارد لە میوانخانەی سمیرامیس فەرموت تۆ وەکو لوقمان تەماشا دەکەم،هەر بۆیە حەز دەکەم پێت رابگەیەنم ئەوانەی باسی منیان بۆتۆ کردووە هەر ئەوان لەم شەوانەدا لەمالی باوکم بوون لەشارۆچکەی قەلادزێ پێیان دەوتم بۆ ناچیتەوە بەغدا لەناو مالْ و مندالەکەی خۆتدا دانیشیت خەریکی کاسپی بیت تازە لەسایەی سەری مەلا مصطفی و ابراهیم ئەحمەدەوە کورد هیچ بەهیچ ناکات، گەورەم گومانم نییە ئەمانە بەخراپم باس ئەکەن چونکە مەترسییان هەیە جێگایان پێ لەق بکەم.

والله ناوم نەهێنان، بەداخەوە ناویان نابەم ئەم دوو برا بەرێزانە وایان ئەزانی کەجەماعەتی ابراهیم احمد نەمێنێ ئەوان ئەچنە جێگایان بەلام ئێستا دەربەدەرن.

نەمامۆستا ابراهيم احمد توانی جێگای مامۆستا همزه عبدالله بگرێتەوە نە ئەو برایەش ئێستا کە لەلەندەنە و نە مامۆستا حبيب محمد کەریم ومنه مامۆستا علی عبدالله! یەك لەدوای یەك بۆیان ڕون و ئاشکرا بووە!

کاتێك ئەم برا ئازیزانە کتێبەکەم ئەخوێننەوە( کاڵەك بەئەژنۆی خۆیان ئەشکێنن) هەست بەڕاستی قسەکانم ئەکەن، هەر وەکو کاك عزیز عقراوی لەساڵی ١٩٨١ لەسوریا بەڕاشکاوی فەرموی بەدەستی خۆم ماڵی خۆمم وێران کرد ئەو ڕۆژەی کەچوبویتە لای شێخ احمد بە شوێنتا ئەگەڕام کەئازارو ئەشکەنجەت بدەم، بەڵام ئێستاکە دەرکەوت هەڵوێستی تۆ ڕاست بوو.

جا ئەوەی هەتاکو ئێستا لەژیاندا ماوە با ئەو نهێنییانەی کەلایەتی ڕۆژێك زوتر بڵاوی کاتەوە وەکو خوالێخۆش بوو مامۆستا همزه عبدالله لەگەڵ خۆی نەیباتە گڵەوە، وەئومێدەوارم کە ڕابردوی خۆی نوسیبوتەوە نەوەکانی بڵاوی کەنەوە بۆی.

بەیان و قسەو گرژی بەتەواوەتی پەرەی سەند برایانی مەکتەبی سیاسی بەیەکجاری شارۆچکەی ڕانیەیان بەجێ هێشت چونە ماوەت دکتۆر عزیز شمزینی گیرا، ئینجا گەیشتە گرتن و شەڕ.... ناقوسی خەتەر ناك دەستی پێ کرد.

ئێوارەیەکیان چومە خزمەت بارزانی لەشارۆچکەی ڕانیە فەرهادی کوڕی لوقمانی لەسەر کۆشی خۆی دانا بوو، لەپڕ دیلێکیان لەجەماعەتی( م.س) مامۆستا ابراهيم احمد هێنا ژورێ کەناوی کاك عوسمان عوزیری چەرمەگایی بوو.

بارزانی یەکجار زۆر قسەی توندو ناخۆشی پێ وت ئێمە لەشوێنی خۆمانەوە شەرممان ئەکرد کەسەرۆکی کوردو کوردستان ئەم وتە نابەجێیانە بەکار ئەهێنێت دژی مرۆڤێکی بێ دەسەڵات و دژی جەماعەتی ابراهيم احمد، ئینجا بەکڵاشەکەی خۆی دەستی کرد بە لێدانی، من و دوو کەس لەخزمەتی دا بووین تەماشای منیان دەکرد کەدەستی بگرم بەجۆرێك

گرژ بوو منیش ترسام بەڵام رێگەیەکی کەم دۆزیەوە کەواز لەکاك عوسمان بێنێت،وتم گەورەم کاك لوقمان زۆر شۆخە بەڵام فەرهادی کوڕی نەك شۆخ نیە بەڵکو پیس و پۆخەڵە وەرێگەم بدەرێ بالەگەڵ خۆم بیبەمە دەرەوە دەست و دەم و چاوی بۆ بشۆم وتی: رەفیق ئەوە زۆر خۆشەویستە بابازیانی کوڕت لەسەر خێر مندالی ببێت ئینجا دەزانی ئەوە چەند خۆشەویستە، سوپاس بۆ یەزدانی مەزن بارزانیم واسەر قالْ کرد کاك عوسمان عوزێری لەبیر چوەوە. لەمانگی تەموزی سالی ١٩٩٩ لەکوڕی کاك صابر بارزانیم پرسار کرد ئایا کاك فەرهاد ئێستا لە ئەمریکایە جل و بەرگی رێك وپێکو پاکوتەمیزە یاهەر وەکو تەمەنی پێنج سالان وایە لەوەلامدا وتی: هەر وایەو نەگۆراوە.

لەشارۆچکەی رانیە چومە خزمەت سەرۆك بارزانی فەرموی لەم رۆژانە کۆنفراس ئەبەسترێت لەقەلادزێ ئەندامانی تازەی لیژنەی مەرکەزی مەکتەبی سیاسی هەڵدەبژێردرێت ئینجا بریاری کۆتایی ئەدرێت بۆ دور خستنەوەی ئەم ١٤ کەسە بەپێی فەرمانی کۆنفراس ئەبێت هەرچیەکی چەك و پارە و شت ومەکی حزبیان لایە( ممتەلەکاتی حزب) تەسلیم بەئەندامانی تازەی لیژنەی مەرکەزی بکەن وە ئەگەر سەر پێچی بکەن سزا ئەدرێن ئەو کاتە ئمبراتۆریەتی ( امبراتۆر) یەتی ماوەت بە هێز لەناو ئەبرێت.

وتم: گەورەم بروا مەکە هەروا بەئاسانی تەسلیم بن بایی ئەوە خەڵکیان لەگەلْ دایە، ئایا رێگایەکی کە نییە ئاشتبونەوەی تێدا بێت.

وتی: ئەمە بریاری کۆنفرانسە ئەبێت خۆیان تەسلیم بکەن با کەس بەکوشت نەدەن و خۆشیان رسوای دونیاو قیامەت نەبن وەئەگەر دەزانی بەقسەت دەکەن برۆ پێیان بلْێ.

وتم: کارێکی زۆر سەختە کێشەکە هەتاکو دێت گەورەتر دەبێت.

وتی: رەفیق برۆ خۆت هەڵبژێرە بۆ ئەندامی لیژنەی مەرکەزی پارتی.

وتم: گەورەم سوپاست ئەکەم کەبەرێزتان بەم جۆرە بەتەنگ منەوەن بەڵام بۆ ئاگاداریت بەندەی بچوکتان بۆم نییە خۆم هەڵبژێرم چونکە من ئەندامی پارتی نیم.

بەگرژی‌یەوە وتی:ئەی تۆ چیت..؟

وتم: گەورەم من پیاوێکی سەگ وسەگبابو بێ عەقڵم ماڵ و منداڵم بەجێ هێشتووە وازم لەئیش و کارم هێناوە خۆم توشی ئەو بەڵایە گەورەیە کردووە کە دوای‌یەکەی کۆتایی نایەت.

ماوەی چەند دەقیقەیەك تەماشای کردم، هەردوکمان یەکسەر بێ دەنگ بوین، ئینجا یەکسەر تەشریفی هاتە دەرێ ڕۆیشتەوە بۆ گوندی(سەرکەپکان).

چومەوە سلێمانی لەوێوە چوومە ناحیەی ماوەت، ئەحواڵی برایانی مەکتەبی سیاسیم پرسی پێیان وتم: لەماڵی بابکر ئاغای پشدەری میوانن.

لەخزمەتیاندا نانی بەیانیشمان بەیەکەوە خوارد، لەوە ئاگادار بوون من بۆ ناوبژی گەیشتبوومە لایان، کەوتینە گفتوگۆ کردن، بەڵام ئەو وتووێژەی کە لەنێوان من و جەنابی سەرۆك بارزانی‌دا ڕوویدابوو کەخۆم هەڵبژێرم باسم نەکرد.

وتم: لەو سەعاتەی گەیشتومەتە خزمەتتان هەر خەریکی قسەی خۆش و پێکەنین و ئاگاداری دوا دەنگ و باس نین، ئێوە سێ ڕێگاتان لەپێشە یا ڕاکەن، یاشەڕ کەن، یاخۆتان و هەموو شتو مەکی‌حزب و (مومتەلەکاتی حزب) تەسلیم بەبارزانی بکەنەوە ماوەیەك هەر یەکە تەماشای یەکتریان ئەکرد کەوتنە گفتوگۆ کردن بەڕا شکاوی، مامۆستا ابراهیم فەرمووی شێخ احمد بارزانی ئێمە باش ئەناسێ ڕێزمان هەیە بۆی وەهەروەها بۆ شێخ محمد خالد، جەنابی شێخ احمد چوار کەسی زۆر خۆش دەوێ عمر دبابە و مام جەلال و کاك احمد دزەیی، عمر و جەلال لایەنگرن، کاك احمد دزەیی جارێکیان چۆتە خزمەتی دەربارەی ڕێك کەوتن لەنێوان ئێمە و بارزانی

سەرکەوتو نەبوو بەڵام تۆ ڕەفیق یەکێکی لەوانەی کە شێخ تۆی زۆر خۆش دەوێت ئەگەر بچیتە خزمەتی، گومانمان نییە سەرکەوتوو ئەبێت ئێستا کاك نوری شاوەیس لەسلێمانییە بچۆ بۆ ئەوەی چاوت پێی بکەوێت تاکو تەدابیری چوون و هاتنەوەت بۆ بکات.

وتم: ئەگەر هاتوو جەنابی شێخ احمد بارزانی تەشریفی هێنا ئێوە هەڵوێستان چۆن دەبێت.

وتی: هەر کاتێك تەشریفی گەیشتە کویسنجق ئێمە هەموو ئەندامانی سەرکردایەتیمان دەگەینە شارۆچکەی ڕانیە، شێخ چ دەفەرموێت وەچۆن بڕیاری کۆتایی ئەدات ئێمە هەموو قسەکانی ئەو لە ١٠٠٪ جێ بەجێ ئەکەین تەنها ئاشبەتاڵی لێ دەرچێ من خۆم ئەمە ئامانجم بوو کە نەهێڵم بگاتە مریشکە ڕەشە، بەرەو سلێمانی ڕۆیشتم چومە ماڵی کاك نوری شاوەیس بەهۆی خوشکی ڕۆشنبیر و نیشتیمان پەروەر ناهدە شێخ سەلام چاوم بەکاك نوری کەوت بەدورو درێژی قسەم بۆ کرد دوعای خێری بۆ کردم. سەیارەیەکی جێبی تازەیان بۆ گرتم بۆ ماوەی حەوت ڕۆژ لەگەڵم دابێت کرێکەی( ٥٥) دینار بوو حزب پارەیان نەبو، خوشکە ناهدە لەگیرفانی خۆی ئەم پارەیەی دا.

وتی: لەبەر خاتری کاك ڕەفیق بەڵکو سەرکەوتو بێت، بڕوانە ئەندامانی(م.س) خاوەنی ٥٥ دینار نەبوون، ئەو کاتە ( حزب فەقیر میللەت دەوڵەمەند) ئێستاش بەهەمان شێوە ئەندامانی ( م.س) پارەیان لەگیرفاندا نییە بەڵام ئەوانەی لەدوایانەوە دەڕۆن یەکێکیان تەنها سەفتەی دەیی پێیەو ئەویتریشیان دۆلار بەڵام لەبیت المال( سبحان من يغير الأحوال).

دوو بەدوو لەگەڵ برای شۆفێر کەوتینە ڕێگا من خەوم لەخۆم خست بیرم ئەکردەوە لەوەی قسەکانم ئەوەندە ڕێك و پێك بێت بتوانم سەرنجیان ڕاکێشم زوو زوو( آية الكرسى)م دەخوێند دەپاڕامەوە لەخودای مەزن کەشێخ احمد بەوە ڕازی بێت لەگەڵ مندا تەشریفی بێت گەلی کورد ڕزگار کات لەم

تەنگ و چەڵەمەیەی کەتوشی هاتووە، ئێوارەکەی درەنگانێك گەیشتینە ناحیەی مێرگە سوور.

لەژێر ساباتەکەی جەنابی شێخ محمد خالد دانیشتم خەبەریان دایە یەکسەر هات بەگەرمەوە بەخێر هاتنی کردم کەوتینە گفتوگۆ کردن ئاگادارم کرد هاتوم ئەمەوێت پشت گیریم بکەی بەهەموو توانایەکتەوە.

وتی: کاك احمد دزەیی هاتبوو بۆلای شێخ من ڕەوانەم کرد، ئێمە تۆمان خۆش دەوێت من هاتومەتە ماڵت ڕێزت هەیە لای ئێمە دووەم جارە پەنامان بۆ دێنیت، حزبی ئیمڕۆ ئیشیان بەمن و تۆیە، ئینجا کەوتە گلەیی لەحزب و لەسەرۆك بارزانی و زیاد لە کاتژمێرێك بەردەوام بوو هەر جار جار ئەم وت قوربان ڕاست ئەکەی.

فەرمووی پەردی (چاما) بەبۆردومانی فرۆکە تێك چووەو وەرێگای ئۆتومبیل لەنێوان میرگە سورو چامە نییە با ئوتۆمبیلەکە لێرە بێت بەیانیەکەی ڕەوانەت ئەکەم بۆ خزمەت شێخ، ئەمە دەسەڵاتی منە وەشێخ باشت ئەناسێ پێویست بەنامە ناکات.

بەیانیەکەی کەوتینە ڕێگا بەچوار بارزانی دوو ئێستریان پێ بوو یەکجار ڕێگاکە ناخۆش بوو نیو کاتژمێر سواری ئێستر ئەبووم دوو کاتژمێریش بەپێ دەڕۆیشتم، یانزەی شەو گەیشتینە لای شوانێك زۆرم برسی بوو میوانداریەکی ئەوەندە ڕێك و پێکی کردم خواردنێکی ئەوەندە خۆشی دامێ کەئەمە یەکەم جار بوو لەژیانم دا خواردنی وا خۆش و بەلەزەتم خوار دبێ زۆرم گێڕاوەتە شوانەکە مەریی دۆشی شەکری تێ کرد دەستم کرد بەخواردن نازانم هۆی ئەوە بۆ زۆرم برسی بوو چونکە نیوەڕۆکەی لامان دا لای ماڵێکی دەوڵەمەندترین کەس لەبارزان خاوەن (٥٠٠) سەر مەڕ بوو نانی نەدایێ، ئینجا شوانەکە بەفری دەرهێنا لەئەشکەوت وچایی پێ لێنا.

یەکی شەو گەیشتنە (هاوینە هەواری سەری کۆڕێ و هۆڕێ) چوینە ژێر سابات، شێخ نەزیری کوڕی شێخ احمد بەخێر هاتنی کردم وتی شێخ

ئەفەرمویت ڕەفیق ماندووە با پشو بدات بەیانیەکەی چاوم پێی دەکەویت، بەجۆرێك ماندوو بووم یەکسەر خەوتم بەیانیەکەی کاتژمێر هەشت خەبەرم بۆوە چاوم کردەوە لەژێر ساباتێکدام درێژیەکەی( ١٢م) و پانایی‌یەکەی(٦م) بوو زۆر ڕێك و پێك و پاکو تەمیز بوو سەیرانگایەکی دیمەن جوان لەسەرانسەری ساباتەکەی بەردێکی لەشێوەی کورسی نیوەی لەژێر گڵدایە وەبەشێکی لەدەرێ، دوای نان خواردن تەشریفی شێخ هات زیاد لە ٣٠ کەس دانیشتبوون هەمووماں هەستاین خۆمان نزم کردەوە تاکو ناو قەد کەس تەماشای دەم و چاوی نەدەکرد دوای دانیشتن لەسەر بەردەکە و پشوو دانێکی دوو دەقیقەیی ئیشارەتی بەدەست دا کەهەر یەکە لەجێی خۆی دانیشت.

هەڵسام چومە خزمەتی دەستە پیرۆزەکانیم ماچ کرد بەگەرمەوە بەخێر هاتنی کردم خۆشحاڵی خۆی دەربڕی ڕوی کردە دانیشتوان باسی دڵسۆزی منی بۆ کردن بەرامبەر بارزان، ئینجا باسی بەندیخانەی( بصرە) ی کرد ئێستاکە وا لەسەری (کۆڕێ و هۆری) بەیەکەوە دانیشتویین.

وتم: قوربان لەگەرمای بەندیخانەی بصرە خەڵۆزت ئەگەشاندەوە چات پێ لێ دەنا دەستی کرد بە پێکەنین.

فەرموی ڕەفیق ( عیال) ماڵ و منداڵ چۆنن، چ حاڵە لەگەڵ مصطفی چۆنن!

وتم: گەورەم جەنابی شێخ لەدورەوە هاتوم قسەم زۆر پێیە ئینشاءالله نائومیدم ناکەیت وحەج هاتۆتە بەر دەمت خزمەتێکی گەورە دەبێت لەدنیاو لە قیامەتدا، هەر بۆیە داواکارم جەنابتان ئاوێ بکەن بەو ئاگرەدا

وورده وورده لەسەر خۆ بارودۆخی ئەو ڕۆژەم بۆ باس کرد لە ١٤ ی تەموزەوە ئەو ڕۆژە موبارەکە کە کوردی لەدەست حوکمی پادشایەتی ڕزگار کرد بەرێزتان لەگەڵ شێخ لەتیف دا لەبەندیخانەی بصرە بوون هاتمە (محطة قطار) ئێستگەی شەمەندەفەر بەچ جۆرێك پێشوازیتان لێ کرا، ئینجا

مصطفى بارزانى بەسەربەرزى گەڕایەوە بەڵام دوژمنانى عێراق چ لەدەرەوە یا ناوەوە پڕو پاگندەو تەکتیکیان بەکار هێنا لەنێوان عبدالکریم قاسم و مصطفى بارزانى تاکو گەیشتە ئەوەی شەڕ ڕوو بدات بەداخەوە زیانێکی گەورە بوو بۆ ئێمەی کورد لەسەرانسەری کوردستان چونکە تازە خەریک بووین خۆمان بگرین بەدەستی خۆمان ئاگرمان بەردایە ماڵی خۆمان، ئێمە بوین بەهۆی ئەوەی حوکمی عبدالکریم قاسم بڕوخێت، عبدالسلام عارف بەشەریکایەتی بەعسیەکان حوکمیان گرتە دەست بەهەموو هێزو توانایەکیانەوە بەکاریان هێنا، ئینجا عبدالسلام عارف کودەتای کرد بەسەر بەعسیەکان داو حوکمی عێراق کەوتە ژێر دەسەڵاتی عبدالسلام عارف.

شۆڕشەکەمان بەسەرۆکایەتی مصطفى بارزانى توانى ڕاوەستێت بەرامبەر هێرشە دڕنداکەی عبدالکریم قاسم و عبدالسلام عارف و (بەعس) بۆیان دەرکەوت بەشەڕ ناتوانن زاڵ بن

عبدالسلام: عەرەبێکی شوفین دژ بەکورد بەتایبەتی بەئێوەی بارزانى ڕابردوی ئەم زاڵمە خوێن مژە ڕوون و ئاشکرایە لای جەماوەری کورد.

حکومەتەکەی پیلانێکی گەورەیان بەدەستەوەیە لەدەورووپشتی بارزانى هەڵدەسوڕێن کە کێشەی کورد بە ئاشتی جێبەجێ ئەکەن دوو مەبەستی هەیە لەوە، یەکەمیان دوو بەرەکی دروست بکات لەنێوان بارزانى و(م.س) جەماعەتی ابراهیم احمد، دووەم پێویستی بەپشودانە وەبتوانێت بەتەواوەتی حوکمی عیراق بخاتە ژێر دەستی، وەهەروەها بەعسیەکان دوور بخاتەوە لەریزی سوپا و شوێنی گرنگ، ئینجا کەبەهێز بوو هێرش دەست پێ دەکاتەوە.

مصطفى بارزانى و جەماعەتی ابراهیم احمد بەیەکەوە بەهێزن بەڵام کەجیابونەوە کورد بەگشتی لاواز دەبێت، ئەو کاتە ئەبنە دوو باڵ بەرامبەر بە حوکومەت ئەو هێزەیان نابێت.

گەورەم من لەخۆمەوە هاتوم بەڵام برادەرانی مەکتەبی سیاسی ابراهیم

احمد _ عمر دبابە_ جەلال تاڵەبانی_ نوری شاویس_ نوری احمد گـه -
وتیان بەپێویستی ئەزانین ئێمەش بێینە خزمەتی بەڵام ڕێگا لە ئێمە گیراوە
شوێنێك نییە پێیدا بڕۆین دەستمان بگاتە ناو دەستە پیرۆزەکەی شێخ احمد
ئەوان بەگشتی سڵاوو ڕێزیان هەبوو ئەیانوت تەنها شێخ دەتوانێ چارەسەری
ئەو بارودۆخەی ئێستا بکات ئێمە بەهەموو فەرمانێکی ڕازین چۆن چۆنیمان
ڕێك دەخات لەسەر پەیڕەوێکی تازە تەنها بەمەرجێك ئاشبەتاڵی تێدا
نەبێت.

من بۆم نییە کەس تاوانبار بکەم مصطفی بارزانی گەورەمە باوکمە
ئەویش ڕۆژێك فەرموی تۆ وەك لقمان تەماشا دەکەم ومبرادەرانی (م.س)
ڕێزم هەیە بۆیان.

ئەم دوو بەرەکییە ئەگەر چارەسەر نەکرێت دوا ڕۆژی کورد خەتەر ناك
دەبێت ماوەی (١٠) دەقیقەی پێچوو بەگشتی دانیشتوان تەماشای شێخیان
ئەکرد فەرموی ئەی عباس ئاغا کاکە زیاد و شێخ لەتیف بۆچی چاری
ئەوەیان نەکرد.؟

وتم: قوربان جەنابی عباس ئاغاو کاکە زیاد و شێخ لەتیف هەوڵێکی
زۆریان دا هیچیان بۆ نەکرا ڕاستی هەرسێکیان جێی شانازین لەهەموو
ڕویەکەوە،بەڵام مصطفی بارزانی بەقسەی نەکردن.

فەرمووی ئەی تۆ مصطفی زۆری خۆش دەوێیت

وتم: هەرچەندە هەوڵم دا هیچم بەهیچ نەکرد

فەرمووی: ئەی ئەو کوردانەی لەبەغداوە هاتبوون

وتم: هاتنیان سودی زۆر بوو بەڵام دوای سێ ڕۆژ کێشەکەیان وەکو خۆی بە
جێ هێشت وا دیار بوو هاتبوون سەردانێکی ناوچەکە بکەن.

وتی: ماوەیەك پێش ئێستاکە مصطفی لێرە بوو نارەزایی خۆی پیشان دا
دەربارەی کردەوە ناشیرینەکانی مسئولانی حزب وەکو مەلا ماتۆڕ و مجید
گورگ و ابراهیم احمد کەبەچ جۆرێك ئازارو ئەشکەنجەی خەڵکیان داوە،

پۆلیسەکانی میری بەم شێوەیە لەگەڵ خەڵك نەجوڵاونەتەوە.

وتم: گەورەم جەنابی شێخ من نەهاتوم بڵێم ئەوانەی جەنابی مصطفی بارزانی ناوی بردون خەڵكێكی باشن، بۆم ڕوون کردەوە کەروناکیەك لەمەسئەلەی کورد بەدی ناکەم، بەڵام بەیەك بوون ڕێك کەوتن لەناو خۆمان دوژمن ناچار دەکەین چۆك دا بدات بەرامبەر کێشەکەمان ئەوان هەریەکە لەلایەن خۆیەوە ئەوەی کەتاوانبار ئەکات، تەنها جەنابتان ئەتوانن لەمە بکۆڵنەوە کامیان تاوانبارن.

فەرموی ڕەفیق زۆر ئاڵۆزە چ بکەین باشە..؟

وتم: سەیارمیەکم پێیە لەمێرگە سوور ئێستاکە بکەوینە ڕێگا شەو دەگەینە ماوەت هەموو (م.س) جەماعەتی ابراهیم احمد لەخزمەتتدا دەبن وپێکەوە دەچنە خزمەت مەلا مصطفی بارزانی، وەبەندەش لەخزمەتتدا دەبێت بۆلای بارزانی، جەماعەتی مەکتەبی سیاسی وتیان کەی جەنابی شێخ گەیشتە کویسنجق هەواڵمان پێ ئەگات ئێمە هەموومان دێینە ڕانیە بۆ خزمەتی.

فەرمووی ئایا حکومەت هاتنی منی پێ ناخۆش نابێت...؟

وتم: بەدڵنیاییی زۆری پێ ناخۆش ئەبێت چونکە ئەمە وەکو خەنجەرێکی ژەهراوی وایە لەپشتی عبدالسلام عارف بدرێت.

فەرموی: ڕەفیق دێم دوای نان خواردن

ئەم خەڵکانەی دانیشتبوون لەخۆشیان گەشانەوە لەپڕا کابرایەك هەستایە سەر پێ ڕووی لەجەنابی شێخ کرد دەستی کرد بەقسە کردن دوای ناسیمەوە ناوی [12] (کاك عیسی) بوو .

[12] یەکترمان ناسی لەساڵی ١٩٥٩ هاتوچۆی بارزانی ئەکرد ئەو کاتە لە(حبانیة) جێنشین بوو، بەسۆزانی و بادیانی باش ئەدوا، ڕێکخستندا زۆر شارەزا بوو، ڕەئی و دەسەڵاتی لەلای شێخ هەبو، ڕێزیان لێ دەگرت، شوێنی تایبەتی لەژێر خەیمەیەك بەتەنها هەبوو نوێنەری لایەنێك بوە، دژی باڵی سیاسی جەماعەتی ابراهیم احمد بوو.

وتی: کاك ڕەفیقم ناسی زۆر هاتوچۆی بارزانی دەکرد کەپرسیم وتیان دڵسۆزی بارزانیە من شکم لەدڵسۆزی نییە بەڵام من باشتر ئەزانم لەکارو باری حزبایەتی لەم ڕۆژانەدا کۆنفرانسی پارتی لەقەڵادزێ کۆ دەبێتەوە جەماعەتێکی تازە هەڵدەبژێرن دەبنە ئەندامی م.س ولیژنەی مەرکەزی یەکسەر جەماعەتی ابراهیم احمد ئەو١٤ کەسە دەردەکرێن ئەبێت هەرچی بەڵگە نامەکانی حزب هەیە تەسلیم بەپارتی کەنەوە لەپارە و چەك و ئینجا( امبراطوریە تی ماوەت) بەجێ بهێڵن ئەو دوو بەرەکیە ئێستاکە دروست بووەو لەنێوان بادینان و سۆراندا هیچی نامێنێت جەماوەر بەگشتی لەدەورو پشتی بارزانی کۆ دەبێتەوە، پارتی لەمەولا زیاتر بەهێزتر دەبێت لەناوەوەو لەدەرەوە.

کاك عیسی لەکۆتایی قسەکانیدا وتی: کاك ڕەفیق دڵسۆزە بۆ کورد بەڵام بە خۆڕایی خۆی ماندوو ئەکات، ئەم گۆڕانکاریە دوو بەرکی و شەڕ دروست ناکات چونکە گۆڕانکاریە تازەکان بە هەڵبژاردن دەبێت لەکاتی کۆنفرانسەکەدا یاسای و شەرعیشە

وتم: قوربان جەنابی شێخ وەکو نمونەیەك ئەمەشت بۆ بگێرمەوە هەرچەندە سەرم ئێشاندی(بین المغرب والعشاء یفعل الله مایشاء) دونیاکە هەروەك خۆیەتی و ناگۆڕێ بەڵام خەڵکەکە هەرگیز وەکو خۆی نامێنێ دەگۆڕێ مەلا مصطفی گەڕایەوە عیراق کەگەیشتەوە بەغدا یەکەم کات لەمیوانخانەی خیام دابەزی کۆمەڵێك خەڵك لەخزمەتی دانیشتبون بەندەی بچوکتان یەکێك بوو لەوانە گومانم نیە لەوەی جەنابت بکر ئاغا_ بکر عبدالکریم دەناسی، شێخ فەرموی باش ئەیناسم بکر ئاغا مرۆڤێکی( زیخە) واتە ئازایە.

جەنابی بکر ئاغا لەو کاتە جگەرەی دەگێڕا بەناو میوانەکاندا، مام جەلال بە ڕویەکی گرژەوە پاکەتە جگەرەکەی لێ سەندو وتی:

(ئەم شەرەفە نادرێت بەتۆ) بەم شێوەیە مام جەلال جگەرەی بەناو

میوانە ئازیزەکان دەگیرا، دوای چەند ڕۆژێکی تر مەلا مصطفی هێرش دەباتە سەر(ماوەت)و نە مەلامصطفیو نە مام جەلال بەشداری ئەو شەڕە ناکەن بە شەخصی بەڵکو تەنها فەرمان دەردەکەن وەکێ دەکوژرێت..؟ لەخەڵکێکی بەسەزمان و بێ دەسەڵات و فەقیر زیاتر.

وەلەکۆتایی شەڕەکەدا هەر یەکەیان بەکوژراوەکانی خۆیان دەڵێن شەهید. هەردوو لا تاوانبارن بەم دوو بەرەکییە، بەڵام لەکۆتایی دا دەشکێتەوە بەسەر هۆزی بارزاندا، جەنابی شێخ تۆش باوکی کوردی و جێی باوەڕی ئەو خەڵکەی ئێستاکە چارەسەرکدنی ئەم بارو دۆخە دێتە سەر شانی تۆ وەئەگەر چارەی نەکەییت لەدوا ڕۆژدا بەشاهێدی ئەو خەڵکە ئەمە ڕوو ئەدات کەلەخزمەتتدا دانیشتبون (پاش بیست ڕۆژی کە یان بیست حەفتەی کە، یان بیست ساڵی کەیان صەد ساڵی کە، یان دووصەد ساڵی کە، ئەگەر کابرایەك جامانەیەکی سوری لەسەر بێت، خەڵکی دەستی بۆ درێژ دەکەن دەڵێن ئەو کابرایە جامانەی سوری لەسەرە ئەمە بارزانییە، کابرای بارزانی لەترسا جامانە سورەکەی لەسەر خۆی دەکاتەوە دەیخاتە ژێر جلەکانی دەیشارێتەوە)؛ شێخ هەر خەریکی دارتاشین بوو بەڵام یەکجار زۆر گرژ بوو، فەرموی ڕەفیق دوای نان خواردن قسەی لێ دەکەین و هەستا.

من لەخزمەتی چوومە دەرێ دەستە پیرۆزەکانیم ماچ کرد، بەپێکەنینەوە تەماشای کردم دەستی خستە سەر شانم فەرموی(چێ دەبێت) واتە باش دەبێت منیش وتم انشاءالله بەسایەی خودای مەزن و جەنابتانەوە. ژمارەی ئامادەبوان ئەگەیشتە (٣٠)سی کەس، برایەکی بارزانی بەتەمەن دیار بوو لێپرسراو بوو لەدانانی جۆری ئەو خواردنەی کەئامادە کرا بوو بۆ میوانەکان، هەر سینییەك بۆ دوو کەس بەشێك برنج و شلە و بەشێك شۆربای لەسەر بوو بەتەواوەتی نانیان دابەش کرد، ئینجا بەدوو کەس سینییەکی (مس)یان هەڵگرتبوو دایان نا لەبەر دەما تەماشای خواردنەکانم

کرد یەکە یەکە! ئینجا ڕووم کردە تەنیشتەکەم جەنابی [13](سوار ئاغای شێرۆانی مەزن) دانیشتبوو داوام لێ کرد کەبەیەکەوە نان بخۆین فەرموی( نەشێ _ فضلناکم بعضاً علی بعض) دەستم کرد بە نان خواردن بەلاّم نەم دەزانی چۆن چۆنی دەست پێ بکەم خواردنەکان بریتی بوو لەم جۆرە خواردنانە (برنج و دوو جۆر شلە و گۆشتی مریشك و گۆشتی حیوان و گۆشتی حیوانی کێوی و کاستەرو ماستاوو نان) دڵم خۆش بوە بەئارەزوی خۆم لەسەر خۆ دەستم بەسەر سینیەکەدا گرت، خۆم بەخۆمم وت ڕفیق ئاوا میوانداریت لێ بکەن گومانم نییە بەم شێوەیەش شێخ دڵت خۆش دەکات أنشاءالله.

دوای نان خواردن جەنابی شێخ گەڕایەوە شوێنی تایبەتی خۆی کەکەپردکە بوو.

وتی: ڕەفیق ئەم نامەیە تەسلیم بە مصطفی بکە، ئەگەر ئالۆز و بلۆزی کرد یەکسەر بگەڕێوە، ومرە خۆم دێم (سێ) جار ئەم دەستەواژەیەی دووبارد کردەوە ئینجا ڕوی کرد مرۆڤێك بەناوی(مەلا) فلاّن ناوی نازانم وتی: لەگەڵ ڕەفیق دەچیتە لای مستتەفا لەوەکیلایەتی منەوە قسەی لەگەڵ بکە ئەگەر ئالۆزو بلۆزی کردەوە ڕەفیق نەیتوانی بگەڕێتەوە وەرەوە خۆم دێم.

وتم: قوربان حەزم کرد لەخزمەتت دا ماوەیەك بمێنمەوە بەلاّم بارودۆخی ئێستای کورد خەتەرناکە دوعای خێرم بۆ بکە بەڵکو بەبۆنەی نامە موبارەکەکەی بەرێزتانەوە خودا ڕوحم بەگەلی کورد بکات ئاوێك بەو ئاگرە دابکرێت و بکوژێتەوە، ئینجا دەستە بەنرخەکانیم زیارەت کرد و دوعای تەمەن درێژیم بۆ کرد و خودا حافیزیم لێ خواست.

وەهەروەها خواحافیزیم لەگشت ئامادە بووان کرد بەتایبەتی کاك عیسای

---

[13] یەکێکە لەبارزانیەکان لەدانیشتوانی شیروانی مەزن لەساڵی ١٩٩٨ پرسیارم کرد بۆیان ڕوون کردمەوە کە بەفەرمانی نەوچیرڤان کوژرا

بەڕێز خودا شەرمەزاری دونیاو قیامەتی بکات انشاءالله ماوە لەسەر ئەم تاوانەی پاکانەیەك بۆخۆی دەکات چونکە من ڕونم کردۆتەوە ئەگەر ئەم نەبوایە، تەشریفی شێخ دەهات بۆ لای سەرۆك بارزانی بەهۆی ئەوەوە ئەمە برا کوژیە رووی نەدەدا، ئێستاکە ئێمەی میللەتی کورد لەقوناغێکی کەم بوین(فیدرالی) مان هەبوو داوای سەر بەخۆیی‌مان دەکرد ڕاستی کاکە عیسی تاوانێکی گەورەی کرد بەرامبەر( ٤٥ )چل ملیۆن کورد.

لەهاتنە دەرەوەم سوار ئاغا و شێخ نەزیر چەند شەقاوێك شان بەشانی من هاتن و بەڕێیان کردم.

وتم: جەنابی شێخ نەزیر بەچ جۆرێك قسە لەگەڵ جەنابتان بکەم چونکە ئەگەر بەڕێزتان نەبوایە گفتوگۆ کردن و هەوڵ و تێکۆشانم لەگەڵ جەنابی شێخ دا بەهۆی کاك عیسی‌وە بەفیرۆ ئەچوو فەرموی هەموو کارێك لێرە ئەنجام بدرێت بەفەرمانی خودی شێخە، بەڵام من بۆچونی تۆم بەڕاست زانی بۆ بەرژەوەندی بارزان بۆیە پشت گیریم لێ کردیت وەحەزم دەکرد شێخ بۆ خۆی بێت بەڵام بەداخەوە تۆ سوور نەبوویت لەسەر ئەوەی شێخ بێت. یاداوای منت کردبایە، چونکە شێخ تۆیی خۆش دەوێت دڵی ڕازی ئەکردیت.

لەگەڵ مەلا وەکیلەکەی شێخ کەوتینە ڕێگا بەیاوەری بڕا بارزانیەکان کەشێخ محمد خالد ناردبوی لەگەڵمان بەرێ کەوتین، لەدوو لاوە پشتم بەهێز بوو بە نامەی شێخ و وەکیلەکەی، کەهاتین بەرەو ژور دەبوینەوە شەومان بەسەر هات، لەگەڕانەوە بەرەو خوارەوە ئەهاتین، لەهاوینە هەواری سەری کۆرێ هۆرێ تاکو گەیشتینە گوندی چامە بەروناکی، گوندەکانی سەر ڕێگامان ئەوانەی بەتەنیشتیان دا ڕۆیشتین لەچوار ماڵ تاکو( ١٠) دە ماڵ پێك هاتبوون گوندەکەیان زۆر بێ ئاوو بوون(شیناییەکانیان) لەچەند گوندێکدا ژمارە (١٠) دە بڕ بامیەو (١٢) دوانزە بڕ تەماتەو (١٠) دە بڕ باینجان بوو، لەڕێگا لامان دا لای ئاژەڵدارێکی دەوڵەمەندی ناسراو لەناو هۆزی بارزان خاوەن(٥٠٠) سەر ئاژەڵ، نانی نەداینێ بەڵام چامان خواردەوە،

خاوەن ماڵ وتی لەبەیانیەوە(٤٥) میوانم بەری کردوە. ناوچەیەکی شاخاوی زۆر سەخت و زۆر ڕوت بوو.

شەو گەیشتینە میرگەسور جەنابی شێخ محمد خالد ڕێگای پێ نەداین کەبگەڕێینەوە، زۆر زۆر سوپاسی دڵسۆزی جەنابی شێخ و کاك نەزیرم کرد کەبە چ جۆرێك پێشوازییان لێ کردم و یارمەتی دام انشاءالله ئەم نامەیەی شێخ کۆتایی بەم گرژیە ئەهێنێ وەمن هەموی لە خودی بەڕێزتان ئەبینم کەبەڕێزتان دەستت هەبووە بۆ ئەوەی بەدەست بەتاڵی نەگەڕێمەوە. وتی: شێخ تۆی خۆش دەوێت ئەوەی بۆ تۆی کرد شتێکی گەورەیە، ئایا ڕۆژگارێك ئەگەر پێویستیت بەیارمەتی بێت بچیتە لایان ئەوەی تۆ کردت ئایا پاداشتەکەت ئەدەنەوە.

وتم: جەنابی شێخ محمد خالد ئەوەی من پێی هەستام سودێکی یەکجار زۆری دەبێت بۆ سەرانسەری کوردستان بەتایبەتی بۆ جەماعەتی ابراهیم احمد و وەشەخصی مەلا مصطفی و هۆزی بارزان بەلام بۆ خودی خۆم ڕەنگە زەرەری هەبێت.

خودا حافیزینم لەجەنابی شێخ و ئەو برا بارزانیانەی لەهاتوچۆکردن یاوەرمان بوو کرد.

ناحیەی مێرگە سورمان بەجێ هێشت ڕووەو سلێمانی هاتین لەڕێگا دوو بەدوو لەگەڵ وەکیلەکەی شێخ کەوتینە وتووێژ کرن دەربارەی کێشەی کوردو ئەوبارو دۆخەی کە ئێستاکە کورد تیایدا ئەژی خۆی وا پیشان دەدا کە ئەتوانێت ڕوو بەڕووی بارزانی هەموو جۆرە قسەیەك بکات چونکە جەنابی شێخ ئەحمەد بارزانی ناردویەتی بۆ چونەکانی لەگەڵ مندا یەکی ئەگرتەوە خودی خۆم زۆر خۆش حاڵ بووم بەهاتنی ئەو ئەموت بەڵکو بارزانی ناچار بکات کەمل کەچ بێت بۆ نامەکەی شێخ جەماعەتی ابراهیم ئەحمەدیش بەتەواوەتی لەسەر نەخشەیەکی تازە لەبەر بەرژەوەندی گشتی مل کەچ ببن و لەگەڵ بارزانی دا بەیەکەوە کارو باری پارتی بەرن بەڕێوە.

هەشتی شەو گەیشتینە سلێمانی بڵاوو بووەوە کەرەفیق پشدەری لەگەڵ وەکیلێکی شێخ ئەحمەد بارزانی گەڕاوەتەوە، برادەرانی پارتی جەماعەتی ابراهیم ئەحمەد داوایان لێ کردم ئەبێت ئەمشەو بەرێ بکەویت بۆ بارەگای بارزانی لەبەر ئەوەی بارودۆخی ئێستا زۆر گرژە، کەوتینە رێگا لە لەکانی وەتمان لاماندا نان بخۆین، خاوەن چێشتخانەکە هەستی کرد ئێمە بۆلای بارزانی دەچین بۆ چارەسەر کردنی کێشەکە پارەکەی لێ وەرنەگرتین لەخۆشیاندا.

کاتژمێر یەکی شەو گەیشتینە بارەگای بارزانی لە( سەرکەپکان)، داوام لەلێپرسراوی پرسگاکە کرد کە سەرۆك ئاگادار بکاتەوە دەمەوێ بچم بۆ خزمەتی لەئەنجامدا کاك مسعود و کاك ئدریس هاتن بەرەو پیرم و ئاگاداریان کردم بارزانی لەپشودایە وەپرسیاریان لێ کردم هۆی چییە بەم کاتە درەنگە هاتویت بۆلای بارزانی..؟ منیش نوسراوەکەی شێخ احمدم تەسلیم کردن لەسەر داوا کردنی خۆیان وە(مەلا)ش کە وەکیلی شێخ احمد بوو لەوێ مایەوە، بەلام خۆم بەتەنها گەڕامەوە شارۆچکەی ڕانیە چونکە پێیان وتم بەیانییەکەی چاوەڕوانت ئەکەین شەو زۆر درەنگ بوو ڕووم نەهات بچمە هیچ ماڵێك لەسەر کورسییە تەختەکانی چایخانەیەك پاڵ کەوتم و خەوتم لەدەنگی ماست فرۆش و میوە فرۆش خەبەرم بووەوە

دوای گەیشتنم بۆ بارەگاي بارزانی پرسگەیان داخست و وتیان ئەمرۆ بارزانی چاوی بەکەس ناکەوێت بەلام وەکو سەرنجم دایە ئەو شوێنەی کەبڕیارە بارزانی لێی دانیشێت یەك کەس بێگانەی لێ نەبوو وەلە من زیاتر یەك سۆرانی تر بۆی نەبوو بێتە ئەو جێگەیە وەهەروەها پاسەوانێکی زۆر پارێزگاری جێی دانیشتنەکەو خودی بارزانیان دەکردو دوور بەدوور وەئامادەبوان پێك هاتبوون لە(ئیدریس و مسعود و حەمەد ئاغای مێرگە

سوور و ئەو(مەلا)[4] میەی کە نوێنەری شێخ احمد بوو) ئینجا پاش تاوێك جەنابی مەلا مصطفی هات بۆلامان بەگەرمەوە بەخێر هاتنی کردم هەواڵی پرسیم لەهەموو ڕویەکەوەوە ڕوی کردە ئامادەبوان و فەرموی ئێوە وەکو من (ڕفیق) ناناسن من حسابی کەسێکی بارزانیم بۆ کردوە کاتێك من لەدەرەوەی وولات بووم خزمەتێکی زۆری بنە ماڵەی ئێمەی کردووە کەگەڕامەوە عیراق لەیەکەم ڕۆژەوە چۆتە دڵمەوە وەلەخزمەتکردندا بەردەوام بووە وەهەرگیز پشتی لەئێمە نەکردووە ژمارەی(٤٠) پالتۆی بۆ ناردبووم وەدەرمانێکی زۆری کڕیوە لەگیرفانی خودی خۆی و چۆتە ڕیزی پێشمەرگەوە و وەکو دکتۆر خزمەتی کردەوە وەکاتێك گیراوە ناوبانگی هەیە کەبەچ جۆرێك لەبەندیخانە بەرامبەر (میری) ڕاوەستاوە، سەرۆك بەردەوام بوو لەباسکردنی چالاکی و فیداکاری و ئازایەتی من بۆ ماوەی نیو سەعاتێك، بەبەردەوامی من ئەم وت قوربان من بەو جۆرە شایەنی باس کردن نیم، بەڵام ئەو هەر بەردەوام بوو لەباسەکەی، وەبارزانی بەجۆرێك سوور بوو لەسەر باسکردنی چاکەکانی من و دڵسۆزی من بۆ ئەوان و خۆشەویستی ئەوان بۆ من. لەدڵی خۆمدا ئەم وت: بەڕاستی جێی شەرم و احراجیە ئەم باسە بۆ خەڵك بگێڕمەوە، گومانم نەمابوو لەوەی کەنامەکەی شێخ احمد بارزانی جێی خۆی گرتبێت.

دوای ئەوەی کەتەواو بوو لەباسی چاکەکانی من تۆزێك وەستاو ئینجا ئاراستەی قسەکانی بەئەنازەی (١٨٠) پلە گۆڕی بەرامبەرم و لەماوەی (١٠) دەقیقە دا لەپیاوێکی زۆر باشەوە بووم بەپیاوێکی زۆر خراپ قسەکانی بۆنی ئەوەی لێ دەهات کەمن وێنەم نییە لەخراپەکاریدا لەجیهاندا ئینجا بارزانی بەتوڕەیی و بێتاقەت و ناوچەوانێکی گرژەوە کەمرۆڤ سامی لێ دەکرد،

---

[4] یەکێکە لەناسراوەکان لەناو هۆزی بارزاندا وەمەلا موستەفا لەبنەماڵەی ئەم پیاوە زۆر نەترسا ئەوە بوو کەشەڕ دەستی پێ کردەوە لەساڵی(١٩٧٤) خۆی و کوڕەکانی خرانە بەندیخانەی شۆڕشەوە و لەدوای مۆرکردنی ڕێکەوتن نامەکەی جەزائیر، بارزانی یەکەم کار کەپێی هەڵسا لەناو بردنی احمد ئاغاو کوڕەکانی بوو.

باوەرتان هەبێت کونە مشکم لێ بووبو بە قەیسەری، دونیا لەبەر چاوم تاریك بوو فەرمووی ئەڵێم وەرە خۆت هەڵبژێرە بۆ لیژنەی مەرکەزی ئەڵێت من ئەندامی پارتی نیم، لەدوای ئەوەش ئەچی شکاتم لێ دەکەیت لای شێخ احمد..؟ بۆ من ئاشکرا و ڕوونە تۆ مرۆڤێکی(خائن)یت، هەرچی خۆدا پێی ناخۆشە لەقسەی سوك ڕوو بە ڕوو پێی وتم وە ئەوەی دەی وت دوپاتی ئەدەکردەوە زۆر بەتوندی هەڕەشەی لێ دەکردم کەئەمە یەکەم جارە لەسەرانسەری ژیانم دا ئاوا بەزیندویی بریندار بکرێم(لەسەگبابەوە پیایە هات بە هەموو ڕەچەڵەکما چووە خوارەوە بجوێن) وەلەوتە ناشیرینەکانی بەردەوام بوو ماوەی یەك کات ژمێر لەم ماوەیەدا چەند جارێك ئدریس و مسعود ئەیان ویست بابەتەکە بگۆڕن، وەحەمەد ئاغای میرگە سوور زۆری بۆ هاتو وتی مەلا مصطفی کاتێك سەعیدی کوڕمت ناردە بەغدا تۆ پێت ڕاگەیاندم لەرێگەیەکی زۆر ئەمینەوە دەینێرم و تەسلیم بەرفیق پشدەری دەکەم چونکە وەکو (لوقمان) ی کورم وایە، دوای ئەوەی مەلا مصطفی تاقەتی چوو لەجوێن دان ئینجا ڕووی کردە( مەلا) بەجوێنەوە کەنوێنەری (شێخ احمد) بوو بە چوارمشقی دانیشتبوو لەوە دەچوو بەحاڵ هەناسەی تیا ما بێت وەتەماشای ئەم لاو ئەو لای نەدەکرد وەخوا خوایبوو خودا ڕزگاری بکات لەو دانیشتنە بەڵکو بەسەلامەتی بگاتەوە ناو ماڵ و منداڵەکەی، خۆم بەخۆمم وت( ڕەفیق) چاوت نەفرێت ئەوا ئەویش سەرەی هات.

ئینجا مەلا مصطفی پێی وت چەند ڕۆژێك لێرە بوویت وەبەباشی خزمەت کرای وەبری(٥٠) دینارم دایتێ وتت ئەچمەوە ماڵێ، هەی چاوت کوێر بێت بەملی شکاوت چی تۆی گەیاندە لای (شێخ احمد) هەی درۆزنی (موناڤق) (کۆمەڵێك جوێنی زۆر ناشرینی پێدا)، وەلەدوای ئەمە ئیتر هەواڵیم نەبیستەوە و نازانم چی بەسەر هات.بەڵام بەهیچ جۆرێك ئەو قسانەی بارزانی کردی ئەم گرتە دڵ چونکە لەناخی خۆمدا سێ اعتبارم بۆ دانابوو یەکێکیان ئەوە بوو وەکو باوکم سەیرم دەکرد و دووەمیشیان سەرۆکی کورد

بوو وە سێیەمیشیان لەبەرچاوم بوو ئەگەر ئەوەی مەلا مصطفی پیلانی بۆ دارشتووە جێبەجێی بکات ئەوا بە دوو بەرەکی و کورد کوژی و لەناو بردنی بزوتنەوەی کوردی کۆتایی پێ دەهات، ئینجا کاتی نان خواردن هات مەلا مصطفی هەستاوو وتی بابچین نان بخۆین، منیش وتم: من برسیم نییە و نانیش ناخۆم و وەلامی نامەکەی(شێخ احمد)م دەوێت دوا بەدوای ئەم قسەیەی مندا بارزانی زۆر بەگرژترو وەتورەتر لەیەکەم جار رووی کردە ئامادەبوان وتی:سوێند بەخوا ئەمجارەیان( رەفیق) رزگاری نابێت لەبەردەستمدا و هەر دەیکوژم)، ئینجا من یەکسەر بێدەنگ بووم چونکە زانیم وتوویژ لەگەڵ ئەم پیاوەدا بێ سودە وەخواخوام بوو رزگارم بێت لەدەستی و نەکوژرێم.

لەبەر ئەوەی زۆرم برسی بوو وەدەرونیشم مورتاح بوو بەوەی کەئەو ئەرکەی خستبومە سەر شانی خۆم بۆ سەروەری میللەتی کورد گەیاندمە جێی خۆی ، دوو کفتەم خوارد، دوای نان خواردنەکە کاك( ئدریس وکاك مسعود و حەمەد ئاغا) پارێزگارییەکی زۆریان کردم و رەوانەیان کردمەوە بۆ رانیە لەگەڵ مەفرەزەیەك پێشمەرگەدا وەلەوێشەوە دوو پێشمەرگەم لەگەڵدا هات هەتا چناروك چونکە کاك عزیز عقراوی موبارەك بیستبووی من بەو کارە هەڵساوم فەرمانی پشکنینی ماڵی باوکمی دا بوو لەقەلادزێ بەو بیانوەی کەمن چەکم لەماڵەوە شاردۆتەوە.

وەلە ساڵەکانی( ١٩٨٥-١٩٨٦) دا کەهاتوچۆم دەکرد لەنێوان یەکێتی و پارتی دا چەندەها جار بەپێکەنینەوە ئەو دانیشتنەی من و مەلا مصطفیم بەبیری کاك مەسعود ئەهێنایەوە چۆن بەتورەییەوە هاواری کردوو وتی( سەگباب) وەئەوانیش هەموویان دەستیان دەکرد بەپێکەنین.

گەیشتمە کۆیسنجاق چومە ماڵی خزمێکی خۆم، یەکەم رۆژ سەردانی شاعیری نیشتیمان پەروەر و دڵسۆزو ( عوسمان عەونی) م کرد و حەوت رۆژ لەکۆیە مامەوە گوێم لەقسەی خەڵك ئەگرت و بەبێ ئەوەی خۆم بەشداریان

بکەم و هیچ قسەم نەدەکرد، ڕووم دەکردە هەر ماڵێك و دوکانێکو چایخانەیەك یان هەر شوێنێك کەخەڵك تیاییدا کۆدە بووەوە بەتێگرایی هەموویان باسیان لەبارو دۆخی ئێستای کوردستان دەکرد، هەر یەکە لەڕاستی خۆیەوە لێکدانەوەو بۆچونی خۆی دەردەبڕی کەلەزۆربەیان نزیك بوومەوە سەرنجم دا هەموویان باسەکانیان لەیەك تەوەرەدا دەخولایەوە و ئەیان وت: ئایا ڕێك دەکەون.؟ کوردەکانی بەغدا هیچیان بۆ نەکرا..؟ ئایا جەماعەتی ابراهیم احمد دان دەنێن بەکۆنفرانسەکە تازەکەدا..؟ وەئایا بارزانی هێرش دەکاتە سەرماوەت..؟، بەڵام من بەهیچ شێوەیەك بۆچونی خۆمم نەئەدرکان، ڕۆژی حەوتەم سەردانی کاك( عوسمان عەونی)م کردەوە بۆ دووەم جار لەوێ چاوم بەمامۆستای نیشتیمان پەروەر مێژوو نوس( طاهر صادق) کەوت و کاك( عوسمان عونی) پرسیاری لێ کردم وتی:هۆی چی بوو لەمنت شاردەوە کەچوی بۆلای شێخ ئەحمەدو مەلا مصطفی..؟ وەتکام وایە ڕووداوەکانم بۆ بگێڕیتەوە لەنوکەوە، منیش لەسەرەتای گەشتەکەمەوە بۆم گێڕایەوە هەتا لای مەلا مصطفی هاتمە دەرەوە، ئەویش وتی: بەگوێم بکە چونکە من لەتۆ شارەزاترم ئەم نامەیە شێخ ئەحمەد ناردویەتی بۆ مەلا مصطفی، مەلا مصطفی زۆر پێی نارەحەت بووە چونکە هەرچی ئەو پیلانانەی کە دایرشتوە هەمووی پوچەڵ کردۆتەوە، وەدڵنیام ئەو هەڵوێستەی کەمەلا مصطفی نواندویەتی بەرامبەر بەتۆ تەنها شانۆیەك بووە و هیچی تر، وەلەنیەتیدا نەبووە تۆ بکوژێت چونکە خۆت دەزانیت ئەگر بیویستایە بتکوژێت بەئاسانی دەیکوشتیت وەبۆیە وای کردووە کەتۆ واز لەو هاتوچۆیە بهێنێت و نەچێتەوە لای شێخ ئەحمەد، ئینجا گوێم بۆ ڕاگرە بامن چەند ئامۆژگاریەکت بکەم، وەکو بیستومە ئەو بنەماڵەیە تۆیان خۆش دەوێت و هەموو شتێکت لێ قبوڵ دەکەن وەچەندیشت پارەت پێویستە من دەدەمی بەمەرجێك بچێتەوە بۆلای شێخ ئەحمەد، بەڵام من بەگوێم نەکرد.

دوا بەدوای گەڕانەوەم لەکۆیە چوم سەردانی(هەولێرو بەغدا و خانەقین و کەلار و سلێمانیم کرد) سەرنجی ئەو خەڵکەم دەدا بەبێ دەنگی و سەیرم دەکرد خەڵکی بەگشتی باس لەهەمان بابەت دەکەن کە دانیشتوانی کۆیە لەناو خۆیاندا باسیان لێوە دەکرد بەڵام من بەهیچ شێوەیەك بەشداری ئەمانیشم نەدەکرد بەڵکو تەنها بەگوێ گرتن کاتم لەگەڵ دەبردنە سەر وەلەدوای تێپەڕبوونیچەند ساڵێك بەسەر ئەم ڕووداوەدا چاوم کەوتەوە بەبەڕێز( حەمەد ئاغای میرگە سوور) و پێی وتم: ئەو شەوەی کەتۆ (مەلا)ت لەبارەگا بەجێ هێشتوو پێیان وتیت بارزانی سبەینێ بەیانی چاوی پێت دەکەوێت، ئەو شەوە فشاریان خستبوە سەر (مەلا) و بەناچاری هەرچی ڕووی دا بوو لەنێوان تۆو(شێخ احمد) دا هەمووی بەدوورو درێژی بۆ بارزانی گێڕابووەوە وەدیار بوو نامەکەی شێخ ئەحمەد زۆر توند بوو وەلەهەمان کاتدا بارزانی ئەیزانی هیچی دەسەڵات نییە بەرامبەر بەشێخ ئەحمەد، هەر بۆیە بەو شێوە گرژییە مامەڵەی لەگەڵ کردی بۆ ئەوە تۆ بترسیت و نەگەڕێیتەوە بۆلای شێخ ئەحمەد چونکە ئەگەر ئەو پیاوە بەرێزە بهاتایەتەوە لەگەڵتا ئەو کاتە مەلا موستەفا نەیدەتوانی لەفەرمانی شێخ ئەحمەد دەربچێت و دووبەرکیش ڕوی نەئەدا.

ئینجا کەلەمێشکی خۆمدا بەراوردم کرد لەنێوان قسەکانی بەڕێز( حەمەد ئاغا) و وەئامۆژگارییەکانی مامۆستا(عوسمان عەونی) دا ئەوجا بۆم دەرکەوت کەمن تاوانبارم و ئەبوایە بچومایەتەوە لای شێخ ئەحمەد. هەر بۆیە داوای لێبوردن لەگەڵی کورد بەگشتی و لەخێزانی ئەوانەی لەڕێگای دووبەرەکی دا کوژران بەتایبەتی ئەکەم، کەئەم ئیشەم کۆتایی پێ نەهێنا، وەئەمەش لەنەزانیمەوە بوو.

وەلەناخی خۆمدا بڕیارم داوە ئەگەر ڕۆژێك لەڕۆژان پارەم بێتە دەست و ببم بەخاوەنی خانوی خۆم پەیکەرێکی گەورە بۆ(شێخ ئەحمەد) دروست دەکەم لەباخچەکەمدا.

## تێبینی

لێرەدا ڕادەوەستم واتە لەساڵی (١٩٦٣) وە ڕووداوەکان دەپچڕێنم هەتا ساڵی (١٩٨٤)، وەلەکتێبی سێیەمەدا (أنشاءالله) باس لەڕووداوەکانی ئەو چەند ساڵە بەدوورو درێژی دەکەم.

لەساڵی ١٩٨٤دا لەکاتێکدا کە( ی.ن.ك) و ڕژێمی بەعس لەگفتوگۆ کردندا بوون بۆ چارەسەرکردنی کێشەی کورد، لەسەر فەرمانی سەرکردایەتی(ی.ن.ك) پەیوەندیم بەزۆرێك لە سەرۆك جاشەکان کرد بەنیازی هێنانەوەیان بۆ ڕیزی شۆڕش، کاتێك کەشەڕ دەستی پێ کردەوە منیش چومە خزمەت (مام جەلال) بۆ (دێی سێروان) وەپێم وت: ئەوە من هاتومەتەوە و لەخزمەت کوردستان دام، ئەویش وتی: لەبارەگایەك دانیشە هەتا لەماوەی مانگێکدا کارێکت بۆ دیاری دەکەین، منیش چومە دێی(کۆڕوان) کەبارەگاکەی کاك نەوشیروانی لێ بوو پێم وت کاك نەوشیروان میوان قبوڵ دەکەیت..؟ ئەویش لەوەڵامدانەوەدا وتی: خوادەکات تۆ بە ئێمە ڕازی دەبیت ئەتخەمە سەرچاو،لەماوەی ئەو چەند ڕۆژەدا کەلەلای کاك نەوشیروان بووم زیاد لەپێویست خزمەتی کردم وەلەدوای (١٣) ڕۆژ لەبەرواری (١٩٨٥/٥/٤) لەکات ژمێری (٤)ی عەسردا کاك نەوشیروان پێی ڕاگەیاندم سەر لەمام جەلال بدەو وکاك(ملازم عمر)یش لەگەڵ خۆتدا بەرە کاتێك گەیشتمە خزمەتی کاك عمر عبدالله کە لێپرسراوی(دەزگای کاروباری پێشمەرگە) بوو دوای سڵاو ئاگادارم کرد کەکاك نەوشیروان فەرمویەتی لەگەڵ بەڕێز (ملازم عمر) دا بچمە خزمەت(مام جەلال)، کاك عمر وتی: ئینشاوالله سەرکەوتو دەبێت و وەلەگەڕانەوەدا نانی ئێوارە لای من دەخۆیت ئینجا ئەوتی بەخەلۆزەکەدا کردو ئاگری لێ بەرداوە، من بەتەنها هاتمە دەرەوە و بەرێ کەوتم بۆلای مام جەلال کە( ١٠) دەقیقە دوور بوو لەبارەگاکەی (ملازم عمر)ەوە ، گەیشتمە لای مام جەلال (هێرۆ خان) و (سید مجید) ی لابوو زۆر بەگەرمەوە پێشوازی لێ کردم ویەکسەر وتی: کاك

ڕەفیق دەتەوێت كوردستان ڕزگاری بێت..؟

ڕەفیق: كێ هەیە نەیەوێت كوردستان ڕزگاری بێت.

مام جەلال: تۆ هەوەست لێ بێت كوردستان ڕزگار دەكەیت.

ڕەفیق: من...!

مام جەلال: بەڵێ خەڵك دەست درێژ دەكات و دەڵێن ئەمە بوو كوردستانی ڕزگار كرد.

ڕەفیق : مام جەلال، ئەمجارەیان بەتەمای چیم لێ بكەیت و چیت بنیاد ناوە..؟

مام جەلال: ئێمە تەنها ئاسمان ماوە تەقەی لێ بكەین، ئەگەر بێت و لەگەڵ كوڕانی مەلا موستەفادا ئاشتمان بكەیتەوە وكوردستان ڕزگار دەبێت و كورد كێشەی نامێنێت.

ڕەفیق: ئەمە قسەی دڵتە، یان پیلانە ومیان وتەیەكی كاتییە، وەداواكارم لێت كەلەدۆستایەتی ئەوانەم نەكەیت،

مام جەلال: لەكەیەوە پەیوەندیت پێیانەوە نەماوە.

ڕەفیق: لەو ڕۆژەوە كەخۆم و پێنج كەسەكە لە( ی.ن.ك) جیابوینەوە و بازیانی كوڕم نارد بۆلای ( كاك مسعود) بەمەبەستی یارمەتی دانم بۆ دامەزراندنی حزبێك و ئەویش وەڵامی دامەوە بەنامەیەك و دەڵێت ( یارمەتیت دەدەم بەڵام لەمەو دوا نامەم بۆ بنێرە بەناوی (هێرۆ خانەوە) وەلەلایەن ئێوەوە دەست گیر كرام وە[17]( مختار عبدالله غەریب)ی

[17] ماوەیەك پێشمەرگە بوو لەگەڵ گروپە سیاسییەكاندا، (ی.ن.ك) بڕیاری گرتنیان دەركردبوو لەگەڵ چەندكەسانێكی تردا، مامۆستا مەلا دەڵگەیی نامەیەكی بۆ ناردبوم كە ئەو پیاوە خەڵكی قەڵادزێیەو دژی ڕژێمە وەچالاكی گەورەی ئەنجام داوە بەرامبەر بەڕژێم وەچەند جارێك زامدار كراوە بۆیە دەبێت لەگەڵ مام جەلال دا قسە بكەیت كە لێیی خۆش بن؛ لەسەر داواكارییەكەی من مام جەلال لێی خۆش بوو وەهاتە ناو ڕیزەكانی یەكێتییەوە، ڕوداوێك ڕووی دابوو شایەت هەبوو بەسەریەوە

مرافیقەکەمتان کوشتو وەمنتان بەبەند کراوی لای خۆتان هێشتەود پەیوەندیم پیانەوە نەماوە .

مام جەلال: دوو نامە دەنوسم یەکێك بۆ مەلا دەلگەیی و ئەوەی تریشیا بۆ[18] ( کوێخا سمایلی تەلان) کەپشتگیری بکەن لای کاك مسعود بۆ ئەوەی سەرکەوتو بیت لەم کارەتدا.

ڕەفیق: من دەبێت کاغەز بنوسم بۆ کاك مسعود بڵێم ئاگات لەو پیاوە بەرێزانە بێت.

مام جەلال: دەکەواتە من نامەیەکی سپیت بۆ ئیمزا دەکەم، تۆ وەکیلی من بە.

ڕەفیق: بازیانی کوڕیشم کە( پ.م)یە لەمەکتەبی عەسکری لەگەڵ خۆمە

---

کەئەم تاوانبارە لەم ڕووداوەدا برادەرانی کۆمەڵە دەیانویست لەسەر ئەو کارە لەسێ دارەی بدەن وەئەمجارەشیان توانیم ڕزگاری بکەم کەجیابوومەوە لەمام جەلال بەو نیازەی حزبێك دابنێم کاتێك دەزگیر کرام کتوپڕ موختاریان کوشت بەڵام دوای کوشتنی بەچەند ساڵێك یەکێتی لە بەیانێك دا بەشەهیدی یەکێتی نیشتیمانی کوردستانی لەقەڵەم دا وەبەپێشمەرگەیەکی نیشتیمان پەروەر ناویان دەبرد.

[18] تاکە سەرۆك هۆزە لەکوردستاندا کەخاوەن دۆنمێك زەوی نییە و کێشەی نێوان خۆی و جوتیاری نییە لەگەڵ ئەوەشدا یەکێکە لەسەرۆك هۆزە(سەخی)یەکانی کوردستان عادەتیان وایە کەمیوانێك ڕوو دەکاتە دیوەخانەکەیان خۆیان پێشوازی لێ دەکەن و وەلەڕۆیشتنەوەشدا خۆیان بەڕێی دەکەن هەر هەموو هۆزەکەی دەست دادەنێن کەئەو بەسەریدا بڕوات وەهەرکەسێك ناکۆکیەکی هەبێت لەو ناوچەیە ئەو بەهانایانەوە دەچێت کەسایەتی‌یەکی شۆڕش گێڕو ونیشتیمان پەروەرە و ڕابوردویەکی پاکی هەیە،وەزۆر دڵسۆزە بۆ نیشتیمانەکەی وەجێی ڕێزە لەلای هەموو گروپە سیاسی‌یەکان چونکە ژیانی خۆی بەخت کردوە لەپێناوی کوردو کوردستاندا توشی ئازارو ئەشکەنجەیەکی زۆر بووە و چەندەها جار گیراوە و دورخراوەتەوە وەبەشداریشی لەهەموو شۆڕشەکانی کوردستاندا کردووە باسی چاکەی ئەم پیاوە و کوڕەکانی(احمد و محمود) بەکتێبێك کۆتایی نایەت(غني عن التعریف) ئەگەر دەتەوێ قسەکەی من تاقی بکەیتەوە بچۆ بۆ دوکانی سەرەوە بڵێ ماڵی کوێخا سمایلی تەلان کامەیە و مانگێك میوانی بە ئنجا بۆت دەردەکەوێت کەچۆن پیاوێکە

دمبیەم.

مام جەلال: ئەگەر سەرکەوتوبویت ئەوا ئەڵێم مـن ناردومـەو وەئەگـەر شکستت هێنا دەڵێم ئەوە ڕەفیق پشدەرییە ئاگام لێ نەبووە و هەزار شتی وای کردووە.

چاو پێکەوتنەکەم لەگەڵ مام جەلال دا کۆتایی پێ هێنا بەخواحافیزی ئینجا گەڕامەوە بۆلای بەڕێز ( کاك عمر عبدالله) ، وەکاك (عومەر) پرسیاری لێ کردم شێری یان ڕێوی..؟

وتم: من قەد ڕێوی نەبووم هەر شێرم..

کاك (عمر) بەدەستی خۆی مریشکەکەی کرد بەشیشەوە لەسەر ئاگرەکە برژاندی و ئینجا کردی بە پاروو وەدای بەدەستمەوە لەم کاتەدا کاك( موستەفا چاو ڕەش) فەرمووی ئەو غەزەلە چییە..؟ منیش لەترسی مام جەلال لەگەڵ ئەوەشدا کەئەم پیاوە برای شیرىمە وەزۆریشم خۆش دەوێت ڕاستییەکەم بۆ نەدرکاند.

کەگەڕامەوە بۆ بارەگای کاك نەوشیروان شەو لەخزمەتیدا بووم و وەبەیانییەکەی هەر یەکەمان ڕۆیشتین بەلایەکدا. وەمن و بازیانی کوڕم لەڕۆژی(١٩٨٥/٥/٧) دا بەڕێ کەوتین لە (٩) ی مانگ گەیشتینە گوندی ( شۆکی) کەمەڵبەندی (یەکی) یەکێتی لێ بوو وەماوەی دوو ڕۆژ لەوەێ ماینەوە ئینجا بەڕێیان کردین بۆ گوندی باراو بۆلای برادەرێکی دڵسۆزی یەکێتی کەناوی شێخ نوری بووە وەڕیش سپی دێیەکە بوو، ئەم دێیە هەرچەندە لەسنوری دەسەڵاتی یەکێتیدا بوو بەڵام پارتی زاڵتر بوو تیایدا، پێش ئەوەی بگەینە دێکە توشی( شێخ نوری) بووین و لەگەڵ ئەودا چوینەوە ماڵی خۆیان و نانی نیوەڕۆیان بۆ هێناین کەبریتی بوو لەهێلکە و ڕۆن، بەڵام پێش ئەوەی دەست کەین بەنان خوارد خێزانەکەی فەرمووی: ڕاوەستن ئینجا ڕووی کردە شێخ نوری و وتی: ئەمانە بەڕۆژی نیوەڕۆ لەگەڵ مەفرەزەیەکی یەکێتیدا هاتنە ناو دێکەوە و بەچەکەوە وەئێستاش پرسیاری لەبارەگای پارتی دەکات و

دمیەوێت بەچەکەکانیانەوە بەئازادی بچنە ناو پارتییەوە، هەر بۆیە هاواری کردو وتی (بەزاتی خوا ڕێکەوتنە)، ئینجا شێخ نوری ڕووی کردە (سەبری خانی) کچی و فەرمووی بڕۆ مریشکەکەیان بۆ سەربڕە، خێزانەکەی شێخ نوری وتی: ئاخر هەر ئەو مریشکەمان هەیەو هێلکەکەریشە، بەڵام شێخ وتی: سەگباب ئەڵێم بڕۆ سەری ببڕە ئەوا کورد خەریکە ڕێك دەکەوون لەناو خۆیاندا. دوای نان خواردن عەرزی جەنابی شێخ م کرد وتم: بازیانی کوڕم بۆ بگەینەرە لقی چواری پارتی، لەهەمان ڕۆژدا بازیانی کوڕم و شێخ نوری بەڕێ کەوتن بۆ لقی چوار وەلەوێ بازیان چاوی کەوتبوو بەجەنابی (دەروێش ئاغا) کەکوردێکی شۆڕش گێڕو نیشتیمان پەروەرو ناسراوە، وەبە (دەروێش ئاغا)ی ڕاگەیاندبوو کەباوکم لەدێی باراو چاوەڕوانەو وەدەیەوێت بچێت بۆ خزمەت( کاك مسعود بارزانی)، دوای ئەوەی وەڵامی بروسکەکەی دەروێش ئاغا دێتەوە بە(ڕەزامەندی) بەیانیەکەی بەڕێز(دەروێش ئاغا) خۆی و مەفرەزەیەکی پێشمەرگە هاتن بۆ پێشوازی کردنم و پێی وتم ئەمە (عدم تعرض)ێکە بەناوی حاجی ئەحمەدەوەیە بۆ تۆمان کردووە بەچەکەوە کە گەیشتیتە خاڵی پشکنینی ئێرانیەکان پیشانیان بدە، ئینجا چووینە بارەگای لقی چوار شەو ماینەوە بەیانیەکەی بەڕێ کەوتین بەرەو نوسینگەی پەیوەندییەکانی پارتی لەمەریوان، لەوێ چاوم کەوت بەبرای دڵسۆزو شۆڕشگێڕ و نیشتیمان پەروەر کاك فایەق تۆفیق کەناسراوە بە

(فایەقە ڕەش) بەڕێوەبەری نوسینگەکە بوو لەڕێی خۆیەوە من وبازیانی بەڕێ کرد بۆ(م.س) پارتی دیموکراتی کوردستان لەڕاژان، لەسەعات (٨)ی سەر لەبەیانی ڕۆژی ١٩٨٥/٥/١٨ لەمەریوانەوە بەڕێ کەوتین و لەسەعات (٣,١٥)دەقیقەی هەمان ڕۆژدا گەیشتینە بارەگای مەکتەبی سیاسی پارتی لەڕاژان.

بە درێژایی ڕێگای نێوان مەریوان و ڕاژان هیچ قسەیەکم لەگەڵ بازیان و ئەو برا پێشمەرگە پارتییەی کەلەگەڵماندا بوو نەکرد، چونکە هەموو هەست

و بیرو هۆشێکم لەلای ئەوە بوو کەگەیشتمە ئەوێ چۆن دەست پێ بکەم وبڵێم چی بۆ ئەوەی چیتر خوێنی رۆڵەی میللەتەکە بەهەدەر نەرژێت و وەکو ساڵی(١٩٦٣) م لێ نەیەتەوە کەنەمتوانی نێوان بارزانی و (م.س) جەماعەتی (ابراهیم احمد) یەکبخەمەوە و بەدڵ دەپارامەوە لەخوا ئەمجارەیان بەسەرکەوتوویی بگەڕێمە وەزۆر دڵخۆش بووم بەوەی کەمن راسپێردرام کە بەم کارە پیرۆزە هەڵسم خۆم بەخۆم دەوت: رەفیق هەرچەند مام جەلال تۆی ناردووە بەڵام تۆ خۆت بەلایەنگری هیچ لایەك نازانێت و وەهەردوولا بەیەك چاو سەیر دەکەیت، (انشاءالله) سەرکەوتویت لەم کارەتدا کاتێك گەیشتمە پرسگەی مەکتەبی سیاسی یەکسر منیان برد بۆ ژووری بەڕێوەبەرایەتی کە ( شوکری نێرۆیی)جامانەیەکی سوری لەسەر دا بوو، بەڕێوەبەر بوو وەزۆر بەرگەرمی بەخێر هاتنی کردم، هەتا ئەو چوو بەکاك مەسعود رابگەیەنێت من لەماندویەتی خۆمدا لەسەر یەکێك لەو دۆشەکانەی کە دا خرابوو پاڵ کەوتم وەدوای بیست دەقیقە پێیان وتم فەرموو بچۆرە ژورەوە،کەچوومە ژوورەوە چەند کەسایەتی‌یەکی گەورەی پارتی دانیشتبون بەڵام من لەناو هەموویاندا تەنها(کاك مسعود و مامۆستا علی عبدالله )م ئەناسی، دەست بەجێ مامۆستا علی عبدالله لەگەڵ ئەو کەسایەتی‌یانەی تردا بەیەکتری ناسانین، من ناویانم بیستبوو بەڵام بەخزمایەتیان نەگەیشتبووم کەپێك هاتبوون لەمانە(فاضل میران، مامۆستا مەلا عبدالقادر، فرانسۆ حەریری، د. رۆژ، ملازم یونس رۆژبەیانی) بەگەرمەوە بەخێر هاتنیان کردم.

رووم کردە کاك مسعود و پێم وت: من و تۆ لەو رۆژەوە کە( باوکت لێم تورە بوو وەزۆر هێرشی کردە سەرم وەتۆ و کاك ئدریس یارمەتیتان دام بۆ گەڕانەوە) چاومان بەیەك نەکەوتووە وەپەیوەندیەکانمان تەنها بەنامە بووە بەیەکەوە، ئەوانەی دانیشتبوون لەخزمەت کاك مسعود دا بەسەرسوڕمانەوە گوێیان لێ دەگرتم چونکە هیچیان ئاگاداری ئەو پەیوەندی‌یە تایبەتی‌یە نەبوون کە بەدرێژایی رابوردوو بەبەردەوامی هەمبوو لەگەڵ( مەکتەبی بارزانی) دا.

هەر بۆیە ئامادەبوان بێجگە لەکاك مەسعود وا تێگەیشتبون کەمن لەلایەن ڕژێمەوە نێردراووم وەبەو نیازەی خۆم زیاتر بناسێنم بەو بڕێزانەی کەدانیشتبوون چەند یادەوەرییەکم بۆ کاك مەسعود گێڕایەوە باسی شاهیدییەکەی( حبیب محمد كريم)م کرد کەلەسەر من دا بووی لەدادگای شۆڕشی ڕژێم وەچۆن و بەچ شێوەیەك وەڵامم دایەوە، وەکۆتاییم بەباسەکان هێنا بەگلەییەك وتم: کاك مەسعود بۆ ئەوەندە سست بوویت لەوەڵامدانەوەمدا کەداوای پشتگیریم لیٚ کردیت بۆ دانانی حزبێکی تازە.

کاك مسعود ڕووی کردە کاك علی عبدالله و فەرمووی کاك ڕەفیق دەناسیت..؟، کاك عەلیش فەرمووی: من ئەمزانی کەمەلا مصطفی زۆری خۆش دەویێت بەڵام ئاگاداری ئەوە نەبووم کە بەدرێژایی ئەم چەند ساڵە پەیوەندی تایبەتی هەبووە بەمەکتەبی بارزانییەوە، ئینجا کاك مەسعود بەدوورو درێژی باسی منی بۆ کردن بەجۆرێك کەزۆر پێی سەر بەرزبووم، وەئەو باس و خواسە بوو بەهۆکارێك کە بۆ ئامادەبوان ڕوون ببێتەوە من وەکو نوێنەرێکی ڕژێم نەچومەتە ئەویٚ بەڵکو وەکو کادرێکی(ی.ن.ك) هاتوم و مەبەستیشم یەك خستنەوەی ئەو دوو حزبە بەجەنگ هاتووەیە.

ڕووم کردە کاك مسعود و وەرەقە و قەڵەمێکم دایە و پێم وت: ئەگەر تۆو مام جەلال ئیستقالە بکەن کورد ڕزگاری دەبێت، کاك مسعود قەڵەمەکەی گرت بەدەستییەوە بەمەبەستی ئیستقالە نوسین، منیش دەستیم گرت بەتوندی و وتم: تۆمارکەرێك(مسجله)ێکم بۆ بێنن بۆ ئەوەی بەئەمانەتەوە هەرچیم پێیە بۆ ئێوەی باس بکەم لەگەڵ بیرو بۆچونی خۆمدا لەلای ئێوە بمێنێتەوە بەتۆمارکراوی بۆ مێژوو، ئەوانیش لەسەر داواکارییەکەی خۆم تۆمارکەرێکیان هێناو دووجار تاقییان کردەوە و ئینجا وتیان فەرموو چیت هەیە بیڵیٚ: منیش بەدوورو درێژی دەقی ئەو گفتوگۆیەم بۆ گێڕانەوە کەلەنێوان من و مام جەلال دا ڕوویدابوو تەنها ئەوە نەبێت مام جەلال فەرموبوی (کوڕانی مەلا مصطفی) بەڵام من لەویٚ گۆڕیم بە(پارتی

ـموکراتی کوردستان) لەدوایی دا وتم من بۆچوونی خۆمم هەیە بۆ ئەم ـڕاکارییەی( مام جەلال)، من ناتوانم کەفیلی مام جەلال ببم و بڵێم بەدڵەوە ـنی ناردووە و ڕاست دەکات، بەڵام ئەوەندە هەیە من خۆم بەدڵێکی پاکەوە ـتومەتە لاتان بۆ ئەوەی ڕێکتان بخەم وەمن تەنها لەو وتانە بەر پرسیارم کەخۆم دەیکەم.

کاک عەلی فەرمووی ئیمڕۆ کاک مەسعود لەبەر تۆ زۆر ماوەتەوە وەئێستاش کاتی حەوانەوەی هاتووە و ڕۆژی شەممە دا دەنیشینەوە و بەتەواوەتی قسەی ـەسەر دەکەین، منیش وتم بۆ کورد ڕزگاری بووە تا هەینی و شەممە هەبێت، ـەم کارەی کەمن بۆی هاتوم کارێکی زۆر گرنگە و کێشەی میللەتی کوردە هی ئەوە نییە ڕۆژێك دوا بخرێت، ئینجا کاك مەسعود کەزانی من زۆر سورم لەسەر دوا نەخستنی دانیشتنەکە، بڕیاری دا کەسبەینێ هەینی کات ژمێر(٢)ی پاش نیوەڕۆ دابنیشینەوە بۆ لێکۆڵینەوە لەو کارە. بەڵام پێش ئەوەی کاك مەسعود هەڵبسێت پێم وت: جاران کەدوو سەرۆك دەوڵەت دانیشتنیان بکردایە بەچەك و تەقەمەنییەوە بەرامبەر یەکتردا دادەنیشتن، بەڵام ئێستاکە ئەگەر بیانەوێت دابنیشن بۆ گفتوگۆ کردن لەسەر مەسەلەیەك دەچنە چێشتخانەیەکی گەشت و گوزاری پلە یەك(مطعم سیاحی درجة اولی) بۆ ئەوەی دانیشتنەکەیان لەکەش و هەوایەکی خۆش دا ئەنجام بدەن وەکۆتایی دانیشتنەکەشیان بهێنن بەخواردنێکی بەلەزەت، هەر بۆیە داواکارم لەدانیشتنەکەی سبەینێ دا( سێوو کاهو ڕێواس) لەبەردەمماندا دابنێن چونکە کەمن ناوی مام جەلال م هێنا تۆ گرژ دەبیت ئەوسا سێوێك بخە ناو دەمت ئاو بەمتدا دێتە خوارێ و گرژییەکەت نامێنێت، هەموو ئامادەبوان بەم قسەیە دەستیان کرد بەپێکەنین و کاك مەسعود هەستا چووە دەرەوە لەکات ژمێر(٤,٢٠)دەقیقە دا وەمن یەکێك بووم لەوانەی کەبەرێمان کرد هەتا دەرگاکەی دەرەوە.

دوا بەدوای ئەودا هەموو ئامادەبوان چونە دەرەوە بۆ پیاسە کردن

لەدەشتێکدا کەنزیکەی(٥٠٠) م لەبارەگاکەوە دوور بوو بەڵام تەنها کاك (علی عبدالله) بەشداری نەکردن، منیش ئەو پیاسەیەی ئەوانم بەهەل زانی بۆیە چومە ناویانەوە بۆ ئەوەی باس لەگرنگی ئەو رێکەوتنە بکەم بەنسبەت ئەوان و هەموو میللەتی کوردەوە دوای ئەوەی بەتەواوەتی بابەتەکانم بۆ روون کردنەوە ئەم بەرێزانە هەر هەموویان خۆشحاڵی خۆیان دەربڕی (فاضل میران، د.رۆژ شاوەیش، مامۆستا مەلا عبدالقادر، یونس رۆژبەیانی) تەنها یەکێك ئەو رێکەوتنەی پێ باش نەبوو کەهەتا ئێستاش بۆچونی گۆڕانکاری بەسەردا نەهاتووەو هەرپێی خۆش نیە کە کورد ببێ بەحکومەتی ئەویش (فرانسۆ حەریری)یە، شەو لەخزمەت مامۆستا (علی عبدالله) دا بووم زیاترلە(٢) کات ژمێر لەسەر گرنگی ئەو رێکەوتنە دووایین بەڵام بەجۆرێك جۆشحاڵ بوو بەو کارە کەئێستا نازانم چۆن باس بکەم.

سەر لەبەیانی رۆژی هەینی سەعات (٨,٣٠) دقیقە من و بازیان چوینە (رەزائی) یە بۆ خۆشتن لەیەکێك لەگەرماو (حەمام) ە کاندا دوای ئەوە لەلای گوڵ فرۆشێك چەپکێك گوڵی گەورەمان کڕی بە(١٠٠٠) تومەن و بەنوسینێکی گەورە لەناوەڕاستەکەیم نوسی (خوالێخۆش بوو باوکی گەلی کورد مەلا مصطفی بارزانی، لەژێریدا نوسیم نوێنەری(ی.ن.ك) رەفیق پشدەری) ئینجا بردم لەسەر مەزارەکەی دامنا لەگوندی هەلاج وتم: بەرێز (بارزانی) داوای لێ بوردنت لێ دەکەم، دەبوایە زوتر هەوڵم بۆ ئاشتبوونەوە بدایە بۆ ئەوەی چی تر کورد لەیەکتر نەکوژن وە( انشاءالله) لەم کارەم دا سەرکەوتو دەبم بۆ خزمەتی کورد و کوردستان، لەکاتی قسەکانمدا پاسەوانی مەزارەکە بەسەر سوڕمانەوە گوێی لێ دەگرتم.

گەڕامەوە بۆ گوندی ڕاژان و سەعات(٢) دەستمان کردەوە بە کۆبونەوە لەکەش و هەوایەکی زۆر خۆش و دڵفرێندا دیار بوو ئەو قسانەی کەرۆژی پێشتر بۆم کردبوون جێی خۆی گرتبوو چونکە بەگشتی مامەڵەیان نەرم و نیان تر بوو لەرۆژی پێشوتر وە(یەقین)م بۆ دروست بوو کە هەر هەموویان

دیەنگری ئەو پرۆسەیەن، هەر بۆیە لەسەرەتای وتەکەمدا وتم: دوای ئەوەی گفتوگۆکانی نێوان ڕژێم و (ی.ن.ك) شکستی هێنا ئێستا ئەرژێم کێشێك بۆ ی.ن.ك) دادەنێت وە ئەنێرانیش کێش بۆ ئێوەی دادەنێت، چونکە ئێوە ناکۆکن لەنێوان خۆتاندا، وەهەتا بەم شێوەیە بمێننەوە جێی بایەخ نابن لەلای دوژمن، ئایا دەتانەوێ( ڕەفسەنجانی) خودی خۆی بە فرۆکە بێت لەلای ئێوە دابەزێت..؟ ئەگەر ڕێکەون لەناو خۆتاندا ئەوە بەچاوی خۆتان دەبینن.

ئایا دەتانەوێت (صدام) نوێنەری خۆی بنێرێتە لاتان..؟ ڕێکەون(صدام) بەرەو پیرتان دێت و باوەشتان بۆ دەکاتەوە.

ئێوە لەدوای هەرەسەکەی(١٩٧٥) ەوە لەکوردستانی باشور پچڕاون وەشوێنەکەتان ئەوەندە دوورە ئەگەر مەفرەزەیەکتان بیەوێت بچێتە سلێمانی بە( سێ) ڕۆژ ئەگاتە ئەوێ ئەگەر لەدەست سەربازەکانی ڕژێمیش ڕزگاریان بێت ڕووبەڕوی پێشمەرگەکانی یەکێتی دەبنەوەو بەم شێوەیە ئەو مەفرەزەیە یان ناگەڕێتەوە یا بەهیلاك دەچێت، پێم باشە زۆر بەووردی بیر لەپێشنیارەکانم بکەنەوە چونکە ئەگەر ئێوە ڕێك بکەون لەگەڵ یەکێتی دا، ئەو مەفرەزەیەی کەباسمان لێوە کرد لەجیاتی توشی بەرەنگاری بونەوە بێت لەگەڵ یەکێتی دا ئەچێت لەبارەگاکەیان ئەحەوێتەوە و کارەکەی خۆی سەرکەوتوانە ئەنجام دەدات و بەسەلامەتی دەگەڕێتەوە بۆلاتان، کەواتە ئێوە زۆر سودمەند دەبن ئەگەر ڕێکەون لەگەڵیاندا، جا بۆیە داواکارم پێش ئەوەی لەم ژوورە بچنینە دەرەوە بڕیارێکی(بنەبڕ) (حاسم) بدەن وحەز ئەکەم بۆ جاری دووەم دووباتی بکەمەوە کەلەهەموو سەرێکەوە ئێوە سودمەند دەبن ئەگەر بەم پەلەیە ڕەزامەندی خۆتان دەربڕن بۆ ڕێکەوتن ئەوسا مام جەلالیش ناتوانێت ئەم هەڵوێستە مەردانەیەی ئێوە لەبەر چاوی خەڵك بشارێتەوە.

لەئەنجامدا هەر هەموویان بەتێکڕایی لەسەر بڕیاری کاك مەسعود ڕەزامەندی خۆیان دەربڕی بۆ گفتوگۆ کردن لەگەڵ مام جەلال دا وەپێیان

وتم هەر ئێستا بەپەلە بازیانی کورت بنێرەرەوە بۆلای مام جەلال بۆ ئەوەی بڕیاری ڕەزامەندی ئێمەی پێبگەیەنێت.

ئێوارەی شەممە ۱۹۸۵/٥/۲۰ بڕی ۲٤۰ دیناری عیراقیان بۆ بازیان کۆکردەوە لەناو خۆیانداو و لەگەڵ نجم الدين ناوێکدا کە(پ.م) لقی چوار بوو بەڕێیان کرد و پێیان وت ئەمشەو دەچن لە (ڕەزائی)یە دەمێننەوە بەڵام بەهیچ شێوەیەك قسەی لەگەڵدا ناکەیت ئەم تەنها کاری ئەوەندەیە ئەگەر گیرایت دەگەڕێتەوە هەواڵمان دەداتێ.

بازیانی کوڕم کەگەڕایەوە بۆلای من بەدوورو درێژی ئەم گەشتەی بۆ گێڕامەوە و وتی: (٤) ی بەیانی لە (ڕەزائی)یە دەرچوین و (٥) ی ئێوارە گەیشتینە لای کاك (فایەقە ڕەش) لەمەریوان وەخەریکی نان خواردن بوو لەوێ نەیهێشت دانیشم نان بخۆم پارووەکی بۆ کردم وتی لەگەڵ ئازاد قەراغی دا (کەئەندامی لق بوو) هەر ئێستا بەڕێ کەون، وەدوو سەیارەش پاسەوانی داینێ بۆ ئەوەی بەسەلامەتی هەواڵەکە بگەیەنمە جێی خۆی، کات ژمێر(۷) ی ئێوارە گەیشتمە بارەگای لقی چوار بۆ خزمەت دەروێش ئاغا وەئەویش بەهەمان شێوە لەنان خواردن دا بوو ماسییەکی بۆ کردم بەلەفەو وتی بەگۆڕی( ئەورەحمان ئاغا) ی باوکم شەو لێرە نامێنێتەوە دەبێت هەر ئێستا بەپەلە نامەکە بگەیەنیتە ئەو دیوو، مەفرەزەکە هەتا کێوی ( حاجی مەمەند) پاسەوانییان کردم کەکۆتایی سنوری ئێران بوو لەوێشەوە بەتەنها چومە ناو یەکێتییەوە بۆ بارەگای مەڵبەندی یەك لەشۆکێ سەعات(۹,۳۰) دەقیقە، وەلەوێ لەماڵی کاك جەبار فەرمان چایەکەم خواردەوە و لەگەڵ (مامۆستا صالح) دا بەڕێ کەوتین بۆ پیری شەوکێڵ وەکەگەیشتینە ئەوێ لەوێش تەسلیمی کاك حمە امین خەجێی کردم و پێی وت: ئەم کوڕە ئەمانەتە لەملی تۆداو دەبێ هەر ئەمشەو بیگەیەنیتە گاپیلۆن،( ۱۲) ەی شەو گەیشتمە گاپیلۆن، بەم شێوەیە لەماوەی دوو ڕۆژدا لەڕاژانەوە گەیشتمەوە دێی(سێروان) لەناوچەی مەرگە بۆ خزمەت مام جەلال، سەعات (۷)ی بەیانی

ڕۆژی سێیەم چوومە بەر دەرگای بارەگاکەی مام جەلال و نامەکەی باوکم تەسلیم بەپاسەوانەکە کرد، نامەکەی بردە ژوورەوەو هاتەوە دەرێ و وتی مام جەلال نەخۆشەو کەس نابینێت، ئینجا منیش بەڕاشکاوانە گەڕامەوە ژورەکەی کاك ملازم عمر و پێم وت:پاسەوانەکە ئەڵێت مام جەلال نەخۆشەو کەس نابینێت، دوای ئەوەی نانی بەیانیمان پێکەوە خوارد لەگەڵ ( کاك ملازم عمر و کاك مصطفی چاو ڕەش و کاك شێرکۆ بێکەس دا) کاك ملازم عمر و کورسییەکی بۆ دانام بەرامبەر بارەگاکەی مام جەلال و فەرمووی: دانیشە و مەجولێ هەتا لەبارەگاکەی دێتە دەرەوە و چاوت پێی دەکەوێت، دوو شەو و دوو ڕۆژ لەو جێگایەدا دانیشتم نەم دی بێتە دەرەوە، لەڕۆژی سێیەمدا سەعات(١٠)ەی سەر لەبەیانی کاك(ملازم عمر) وتی: ئەوە هەر لێرە دانیشتوی..؟ منیش وتم ئەی نابێت یانگم بکات ئینجا بچمە خزمەتی، بەتوڕەیی‌یەوە وتی هەستە پێشم کەوە و بردمیە بەردەم دەرگای ژورەکەی مام جەلال وەهەرچەندێك پاسەوانەکە وتی مام جەلال کەس نابینێت بەڵام ئەو گوێی نەدایەو دەرگاکەی کردەوەو پێی وتم فە رموو ئەوە(مام جەلال) چاووم بەبەرێز مام جەلال کەوت دەستەسڕێکی پێبوو وەدەستی کرد بەکۆکەو فەرمووی: وەکو خۆت ئاگاداری سێ ڕۆژە نەخۆشم و چاووم بەکەس نەکوتووە، بەخێر بێیتەوە، ئنجا فەرموی: ئەو گوڵە چییە باوکت لەسەر مەزاری مەلا مصطفی دایناوە کەی من ناردوومە بۆ ئەوە وەچۆن باوکت لەو ماوە کەمەدا توانی چاوی بە( مەسعود بارزانی) بکەوێت و قایلی بکات، ئەگەر ئەوە پیلانی نێوان ڕەفیق و مەسعود بارزانییە..؟! من حەمەی باقیم نارد (٢٢)ڕۆژ لەڕاژان مایەوە چاوی بەمەسعود بارزانی نەکەوت من لەمە ناگەم،لەکۆتاییدا نامەیەکی دامێ لەگەڵ(١٥٠)دیناردا و وتی ئەمە وەڵامەکەی منە، کاتێك کەگەڕامەوە ڕاژان (٩) ڕۆژم پێ چوو بوو هەر کەسێکیانم ئەبینی ساردییەکی پێوە دیار؛ بوو دوای ئەوەی بازیان هاتەوە بەنامەکەی مام جەلالەوە چاو پێکەوتنم کرد لەگەڵ مەکتەبی سیاسی دا لەگەڵیاندا دانیشتم

و نامەکەی مام جەلال یشم پێشکەش کردن بەبێ ئەوەی باسی ئەو بەسەر هاتانە بکەم کەبازیان بەدوورو درێژی بۆی گێرامەوە،هەر هەموویان ناوەرۆکی نامەکەی مام جەلال یان زۆر بەدڵ بوو بەلاَم پێیان وتم ئێمە کۆبوونەوەی لەسەر دەکەین و وەلاَمت دەدینەوە نامکەیەکم نووسی بۆ بەرێز (مام جلال) وتیایدا باسی ئەوەم کرد کەسەرکەوتوم لەئیشەکەمدا بەلاَم تۆزێك بڕیارەکەیان دوا دەکەوێت لەبەر ئەوەی لەسەری کۆدەبنەوە وەهەمان نامەم بۆ کاك نەوشیروان کاك ملازم عمریش نارد ؛وەلاَمدانەوەی ئەم نامەیە لەلایەن پارتییەوە چوار مانگ ونیوی خایاند وەلەماوەی ئەم چوار مانگ و نیوەدا ئەم شتە سەرکییانە ڕووی دا..

١.داوام لە کاك مسعود کرد چەند ساڵێکە بەخزمەت جەنابی شێخ محمد خالید بارزانی نەگیشتووم حەز دەکەم سەردانێکی بکەم ، ژمارەی تەلەفونەکەییم لێ وەرگرت و قسەم لەگەڵ کرد و ئاگادام کردەوە کاتێك گەیشتمە ڕاژان هەواڵی بەرێزتانم پرسی وتیان لە( کەرەجە) انشاءالله بەم زووانە دێمە خزمەتت ئەگەر لێرە برادەرانی پارتی وەرەقەیەکی ڕێ پێدان (عدم التعرض) م بۆ بکەن و بەرێم بکەن بۆلای جەنابتان.

دوای ئەوەی هەموو ئیشێکی گەشتەکەیان بۆ جێ بەجێ کردم برادەرێکی پارتیان لەگەڵ نارد پێکەوە چوینە تاران لەوێوە چوومە کەرەج بۆ خزمەت شێخ محمد خالید بارزانی کەچاوی پێم کەوت زۆر بەگەرمەوە پێشوازی لێ کردم، بەدوورو درێژی باسی ئەو یادەوەریانەمان کرد کە لەساڵی ١٩٥٦ هەمان بووە بەیەکەوە زۆر هەواڵی مال ومنداڵەکانمی پرسی ئینجا ئەو ڕۆژەم یاد خستەوە کە چوبوومە خزمەت باوکی(شێخ احمد بارزانی) بۆ ئەوەی ئەو دوو بەرەکییەی نێوان بارزانی مەکتەبی سیاسی ابراهیم احمد نەهێڵم ومتێم گەیاند کەئێستاش هەر بۆ هەمان مەبەست هاتومەتە خزمەتت و وا پێویست ئەکات کەجەنابتان پشت گیرییەکی تەواوم بکەن بۆئەوەی هیچی تر خوێنی کورد بەدەستی کورد نەڕژێت،

هەموو ئەندامانی سەرکردایەتی یەکێتی نیشتیمانی کوردستان سڵاوو ڕێزیان هەیە بۆ جەنابتان و بەتایبەتی بەڕێز مام جەلال و کاك نەوشیروان وەئەم هاتنەی من بۆلای جەنابتان بەئاگاداری ئەوانە بۆ ئەوەی بەشێوەیەکی برایانە پشتگیری لەو ڕێکەوتنە بکەیت بەو ئومێدەی زۆر هەوڵ بدەیت بۆ سەرکەوتنی ئەم پرۆسەیە،

شێخ محمد خالید: من بەهەموو جۆرێك پشتگیریت لێ دەکەم بۆ ئەوەی ئەم کارە سەرکەوتو بێت بەڵام دەبێت تۆ زۆر بەسەبر بیت و وەکو جارەکەی تر وا نەکەیت کەناردمیتە لای شێخ احمدی باوکم بەهەڕەشەیەکی مەلا مصطفی ڕات کرد و وازت لەڕێکەوتنەکە هێنا ئەمجارە وا نەکەیت باشە وەئەبوایە ئەو ڕۆژە بیرت لەوە بکردایەتەوە ئەگەر تۆ نێردراوی شێخ احمد بارزانی بیت چۆن مەلا مصطفی دەتوانێت بتکوژێت، بەڵام بەهەر حاڵ شێخ ئەحمەد لەساڵی(١٩٦٢) دا پێی فەرمویت (ئیشی کوردان پوچە) ، بەڵام مرۆڤ دەبێت بەبەردەوامی بەدوای کاری خێردا بگەڕێت و مادام تۆ هاتویت بۆ ئەم کارە وئێمە تۆمان خۆش دەوێت بۆیە بەهەموو شێوەیەك پشتگیریت دەکەم ئینجا پرسیاری لێ کردم تاچ ڕادەیەك ئاگاداری هەواڵی (عبید الله و لوقمان و سابیر و شێخ عوسمان) وەبارزانیەکان هەیت چونکە ئێمە هەموومان ئەزانین کەنزیکترین هاوڕێی عبید الله بوویت.

وتم: من کە لەساڵی( ١٩٧٦)دا دەستگیر کرام و لە (١٩٧٩)دا ئازاد کرام دوای ئازاد کردنم بەماوەیەکی کەم چوومە دەرەوەی وڵات ولەساڵی (١٩٨٢)دا گەڕمەوەو چومە ڕیزی پێشمەرگە لەناو یەکێتیدا، بەڵام پێش دەستگیر کردنم هەوڵێکی زۆرم لەگەڵ عبید الله دا دا بۆ ئەوەی یاری بەئاگرو بەنزین نەکات بەهەر حاڵ من دەگەڕێمەوە کە ئەمجارە هاتمەوە بەدوورو درێژی هەواڵی هەموویانت بۆ دەهێنم .

وتی: سڵاوو ڕێزم هەیە بۆ مام جەلال و کاك نەوشیروان لەزمان منەوە

ئاگاداریـــــان بکـــــە کـــــە زۆر بلامـــــەوە گرنگـــــە هـــــەوانی (بارزانییـەکان و عبیـدالله، لوقمـان، شێـخ عوسمـان)م بـۆ بنێرنـەوە ئینجـ فەرمووی نەوشیروان چۆن کەسێکە..؟

منیش لەولامدا بەدوورو درێژی باسی کاك نەوشیروانم بۆ کرد.

گـەنجێك لەسـوچێکی ژوورەکـەدا دانیشـتبوو زۆر سـەرنجی منـی ڕاکێشـ چونکە ئێمە نزیکەی سێ سەعاتێك گفتوگۆمان کرد ئەو بەهیچ شێوەیەك بەژداری نەکردین وام ئەزانی کەڕو لاڵە کەجەنابی شێخ محمد هەستی بەوە کـرد مـن ئەمـەوێ بـزانم ئـەم کـوڕە کێیـە دەسـت پێشکەری کـردوو فەرمووی ئەوە کوڕی گەورەی ئدریسە و ناوی ( نەوچیرڤانە) .

وتم: ئەمە لەئدریس ناکات چونکە ئەگەر بەپێنج ووشـە قسـەی لەگەڵ ئدریـس دا بکـەیت ئـەو بـە (١٢)ووشـە بەشـداریت دەکـات ومئـەوە بـۆ سـێ سەعات دەچێت یەك ووشە لەدەمی نەهاتۆتە دەرەوە.

**تێبینی:**

(ئەو باسانەی کەلەدەمی مام جەلالەوە بۆ شێخ احمدم کردبوو هەمووی دروست کراوی خۆم بوو).

٢.کـــاك مســـعود بۆچوونـــی هەڵـــەی هـــەبوو لەســـەر هـــەندێك لەکەسـایەتییەکانی نـاو یـەکێتی نیشـتیمانی کوردسـتان، بەتایبـەتی بەرامبەر کاك نەوشیروان، منیش هەوڵی ئەوەم دەدا کەبۆچوونەکەی بـۆ ڕاسـت بکەمـەوە بۆیـە پێـم وت: مـن پێـش ئـەوەی بێـم بـۆ ئـێرە(١٣)ڕۆژ میوانـی کـاك نەوشـیروان بـووم، ڕۆژێکیـان کـاك نەوشیروان لێـی پرسـیم دیارنیت..؟ وتم: ژورەکەی تۆم بەجێ هێشت و ئێستاکە لای کـاك حەمـە تۆفیقـم و ترسـاوم لـەوەی شـتێکت بدزرێـت و وەبڵێـن ڕەفیـق پشـدەری ناردویەتی بۆ (مخابرات)ی ڕژێم، کاك نەوشیروان وتی: بۆ تۆ میوانی منی یـان میوانـی حەمـە تۆفیقـی ..؟ مـاوەی ئـەم(١٣)ە ڕۆژە زۆری کاتـەکانمان بەیەکەوە بەسەر دەبرد، بۆیە کەسـایەتی ئـەم پیـاوەم بەکەسـایەتییەکی

كورد بەرومرو خەم خۆری ئەم میللەتە هەڵسەنگاند وەباوەڕم بەوە هەیە كەئەم پیاوە گوێ بۆ هەموو كەسێك و هەموو بۆچونێك ئەگرێت ئەگەر لەگەڵ ئایدۆلۆجیای كۆمەڵەشدا نەگونجێت بە(١٨٠) پلە بەمەرجێك لەبەرژەوەندی گەلی كوردا بێت.

راستە دەركردنی بڕیاری ڕێكەوتن لەسەر بۆچونی هەموو ئەندامانی مەكتەبی سیاسی دراوە، بەڵام بناغە دارشتن بۆ ئەو بڕیارە و هاتنی من لەخودی نەوشیرواندا دەبینمەوە ئینجا بۆ كاك مەسعودم شی كردەوە كە نەوشیروانێك سكرتێری كۆمەڵە بێت وەئەندامی سەركردایەتی یەكێتی بێتوو وەبەئەنازەی تاڵە موویەك دڵی نەیەت لەمام جەلال دوور بكەوێتەوە لەگەڵ ئەوەشدا من لەبارەی جیابونەوەی لەگەڵ مام جەلال دا زۆر گفتوگۆم لەگەڵدا كردبوو، زۆر ئاسایی بێت بەلاتانەوە كەهەرچی بڕیارێك لەیەكێتی نیشتیمانەوە دەربچێت ئەو جێبەجێی بكات ١٠٠٪ .

٣.ئەوەی لای من زۆر زەحمەت بوو كاك( فرانسۆ حریری) بوو چونكە ئەو بیرو بۆچونەی بۆ ڕووداوەكان جیاواز بوو لەگەڵ هەموو ئەندامانی مەكتەبی سیاسی ولیژنەی مەركەزیدا وەئەم پیاوە كلیلی مێشكی( مەسعود و ئیدریس) بوو وەجێی باوەڕیان بوو بەهەموو شێوەیەك وەئەوان چییان پێ بوتایە لە١٠٠٪ جێبەجێ دەكرد بەبێ ئەوەی گوێ بداتە ئەوەی كە ئەو شتە ڕاستە یان نا وەبەهەمان شێوە وتەی ئەم لای كاك مەسعود و كاك ئیدریس گەڕانەوەی نەبوو، ئەگەر بەدەست ئەو بوایە حەزی دەكرد كەمام جەلال لە ئامێری قیمەی قەسابی بدات ئینجا دوا بەدوای ئەو هەموو یەكێتی، چونكە یەكێتی تاكە حیزب بوو كە بەرامبەر ئیمپراتۆرییەتی مەلا موستەفا ڕاوەستاوە، ئەم جۆرە زەلامانە زۆر بەزەحمەت بۆچونی خۆیان لەسەر ڕووداوەكان دەگۆڕن، كێشەی من هیچ كام لەئەندامانی مەكتەبی سیاسی نەبوو بەكاك مەسعودیشەوە بەڵام تاكە كەسێك كەئەترسام ببێت بەكۆسپ لەڕێگای كارەكەم دا

كاك(فرانسۆ) بوو هەر بۆيە ناچارى كردم كەكەسايەتى خۆم بگۆڕم و (استنساخ)ى بكەم لەسەر كەسايەتى كاك( فرانسۆ) بۆ ئەوەى بتوانم لەم پياوە نزيك ببمەوە نەيەڵم ببێتە كۆسپ لەكارەكەم دا بۆيە شێوازى وتەكانم لەگەڵ ئەم كابرايە دا گۆڕى و بۆم ڕوون كردەوە كەمن خۆم بەدڵسۆزى خودى بنە ماڵەى مەلا مصطفى دەزانم وەئەو يادەوەرىيانەم خستەوە يادى كەلەگەڵ سەرۆك مصطفى بەرزانىو هەموو بنەماڵەىكەياندا لەساڵى (١٩٥٦) ەوە هەمبووە، ئەوە بوو بە پشتيوانى يەزدان لەو پيلانەم دا كەكێشا بووم بۆ نزيك بوونەوە لە(فرانسۆ) سەركەوتو بووم. چونكە ئەو هەرچىيەكى بفەرمووايە منيش هەمان وتەى ئەووم دووبارە دەكردەوە بۆ نموونە:

دوو ڕۆژنامەنوسى ئيتالى هاتبوون بۆ ڕاژان كاك فرانسۆ هات بۆلام و وتى وەرە چاوپێكەوتن لەگەڵ ئەم دووانە دا بكە، منى پێشكەش بەڕۆژنامە نوسەكان كردو وتى: ئەمە ناوى ڕەفيق پشدەرىيەو سەرۆكى وەفدى يەكێتى نيشتيمانى كوردستانەوە هاتون بۆ ڕێكەوتن لەگەڵماندا، لەكۆتايى چاو پێكەوتنەكەمدا لەگەڵ ڕۆژنامەنووسەكاندا يەكێكيان ڕووى كردە كاك (فرانسۆ) و وتى ئەم پياوە نوێنەرى پارتى ديموكراتى كوردستانە نەوەك نوێنەرى يەكێتى من قسەكانى بلاوناكەمەوە، ئەم ڕۆژنامەنوسە بۆيە وا تێگەيى بووچونكە هەرچى پرسيارێكيان لێ دەكردم بەدڵى فرانسۆ وەلامم دەدايەوە ئينجا لەدڵى خۆمدا وتم (الحمدلله) كەتوانيم وا لەفرانسۆ بكەم كە دژ بە ڕێكەوتنەكە هەڵوێست نەكرێت.

٤.لەماوەى ئەم چوار مانگ و نيوەدا هەموو هەوڵێكم بۆ ئەوە بوو كەئەندامانى مەكتەبى سياسى و ليژنەى مەركەزى سارد نەبنەوە لەو ڕێكەوتنە، ئەوە بوو بەچاوى خۆم بەرهەمى ماندوبونەكەمم بينى و ئەو پياوانە وايان لێ هاتبوو كەلەمن زياتر بەپەرۆش بوون بۆ ڕێكەوتن، بە تايبەتى ئەم بەڕێزانە( مامۆستا على عبدالله ، د. ڕۆژ، كاك فاضل ميران،

كاك وشيار زێباری، كاك يونس ڕۆژ بەيانی، مامۆستا مەلا عبدالقادر) وە هەموو كادرانی پارتی پاڵپشتی ئەم ڕێكەوتنەيان دەكرد وەزەلامێكم نەبينی كەنارازی بێت بەڕێكەوتن؛ لێرەدا پرسيارێك بەرەو ڕومان دەبێتەوە ئەويش ئەوەيە باشە ئەگەر ئاوا بەو شێوەيە هەر هەموو پارتی ئەو ڕێكەوتنەيان پێ خۆشە بۆچی من چوار مانگ چاوەڕوانی وڵام بووم..؟ كەچومە بنچ و بنجەوانی مەسەلەكەوە بۆم دەركەوت كەپارتی بريتی‌يە لەدوو كەس ( يەكەم ئدريس دووەم مەسعود) ە، وەلەيەكەم ڕۆژەوە كەمن لەڕاژان بووم كاك ئدريس لەدەوەی وڵات بوو وەخودی كاك مەسعوديش نەی دەتوانی بەبێ ڕەزامەندی كاك ئدريس بڕيار بدات وەڕای دووەم كەئەبێ وڵاتانی دەرەوە ڕەزامەندی دەربڕن لەسەر ئەم ڕێكەوتنە ئەوەی لەمن ئاشكرا بوو ئەو دەوڵەتە ئێران بوو بەڵام لەپشت ئێرانيشەوە دەوڵەتێكی تر هەبوو كەتەنها (ئدريس و مەسعود) دەيان زانی. لەو ماوەيەدا چەند كەسانێك بەمنيان وت چاوە ڕوانی چی ئەكەيت بۆ نارۆيتەوە لەوانە( كاك خورشيد شێرە) بوو وڵامم ئەدانەوە من بەهيچ شێوەيەك تازە ئێرە بە جێ ناهێڵم ئەگەر ڕێكيش نەكەون من پارتيم و ناگەڕێمەوە، (رجل مخابراتم زۆر چاك ئەمزانی كە عيراق و ئێران وتوركيا بەهيچ جۆرێك پێيان خۆش نەبوو ئەم كارە سەركەوێت هەر بۆيە پەيمانم دابوو بەخوا هەتا ئەم كارە سەرنەخەم نەگەڕێمەوە بۆ عيراق).

٥.جەنابی كاك ئدريس گەڕايەوە، من داوای چاوپێكەوتنم نەكرد لەگەڵيدا، چەند كەسێك لەخۆيان( پاراستن) بوون ئەهاتن بۆلام و ئەيان وت:ئەوە كاك ئدريس هاتۆتەوە بۆ داوا ناكەيت چاوت پێی بكەوێت..؟منيش لەوەڵامدا ئەموت ئێستا سەری قاڵە كەدەستی بەتاڵ بوو خۆم ئەچم داوای دەكەم و چاوم پێی دەكەوێت، ڕۆژێكيان كاك فرانسۆ حەريری هاتە لام لەو كاتە دا( مو) بەنێوانماندا نەدەچوو وتی:

كـاك ڕەفيـق ڕەحمـەت لـەدايك و بـاوكت... لـەو ڕۆژەوە كـاك ئدريـس هاتۆتەوە چاوەڕوانی ئەوە بـوو كـەتۆ داوای چاوپێكـەوتنی بكـەيت بـەڵام ناچارت كرد كەوا من بنێرێت بـۆلای تـۆو خـودی خـۆی دەيـەوێت چـاوی پێت بكەوێت.

بەشێوەيەك پێشوازی كرام لەلايـەن كـاك ئدريس بارزانیيـەوە ئـەدوت من مامی ئەوم و يەكێكم لەبنە ماڵەی بـارزانی، دوای بـاس كردنـی چـەند يادەوەرییەكی نێوانمان يەكسەر دەستمان كـرد بـەگفتوگۆ كـردن لـەبارەی ڕێكەوتنەكەوە (چونكە كـەهاتبووەوە هـەمو شـتێكيان لـەبارەی منـەوە بـۆ باس كردبوو) وەپێی وتم: ئـەو وتانـەی بۆيـان تۆمـار كردبـووی دوو جـار گوێم لێ گرت وەحەز دەكەم كەتێم بگەيەنيت لەماهيەتی جـەلال، ڕۆژێـك بوو كەلـە هـەندەران بـوو(پاراسـتن) بـوو وەپـەيوەندی بـەخودی خۆمـەوە هەبوو نـازانم چی وای لێ كـرد كـەئاوا بەرامبـەرمان بگۆڕێـت و يـەكێتی دروست بكات و توشی دوو بـەركيمان بكـات، جـەلال كـات بـەدڵی خـۆی هـەڵدەبژێرێت ئەيـەوێت كـەوتی شـەڕ، شـەڕ، كەويستيشـی ئاشـتی هەڵبژێرێت بـەدوای ڕەفيق پشدەری دا دەگـەڕێت و ڕوو بـەڕووی ئێمـەی دەكاتەوە ئينجا لە كۆتايی قسەكانی دا وتـی: انشـاءالله سـەركەوتوو دەبيـت لەم كارەدا.

دوای ئەوەی بەتەواوەتی دڵنيا بووم لەوەی كاك ئدريس زۆر پێخۆشحاڵە بەم ڕێكەوتنە ڕوخسەتم لێ خواست و هاتمە دەرەوە، دوای هاتنە دەرەوەی من كاك ئدريس باسی من دەكات و دەڵێت ئەگەر ئێمە دۆستێكمان هەبێت لەسەر ڕووی زەميندا ڕەفيـق پشـدەرييە، تـۆ بڵـێی ڕۆژێـك ئيشـێكی تێـم نەكەوێت بۆ ئەوەی پاداشتی ئەو چاكانەی بدەمەوە( ئـەم هەواڵـە يـەكێك لە پاسەوانەكانی بۆيان گێڕامەوە كە لەو كاتەدا لەوێ ئامـادە بـوو وەبۆيـە ناوی پاسەوانەكە نابەم چونكە ماوەو لەهەولێر دەژی ئێستا) .

دوای ئـەوەی كـاك ئدريـس ڕازی بـوو لەسـەر ڕێكەوتنەكـە وەڵامـی

نامەکەیان دامەوە وەلەرێگەی ماموستا علی عبداللە و پێی وتم ئەو نامەیەی کەسکرتێری یەکێتی نیشتیمانی کوردستان ناردبووی بۆ رێکەوتن ئەوە ولامەکەیەتی لەلایەن پارتی دیموکراتی کوردستانەوە وەئەو پەڕی سلاوو رێزمان هەیە بۆ گشت برایانی یەکێتی وەهەر وەها سلاوی کاك مەسعودیشیان پێ بگەیەنە ئینجا پێی وتم کاك رەفیق ئیتر چیت ئەوێ ئەوەی چوار مانگ ونیوە چاوەڕوانی دەکەیت ئەوە ولامەکەیەتی انشاءاللە بەسەلامەتی دەچیت و بەسەلامەتی دەگەڕێیتەوە بەلام پێش ئەوەی سبەینێ دەربچیت سەردانێکم بکە بۆ ئەوەی رێگایەکت بۆ دابنێم چۆن بگەڕێتەوەو توشی کێشە نەبیت لەرێگا.

عادەتی کاك علی عبداللە وا بوو کەئێوارە خواحافیزی لێ بکردیتایە بەبێ گومان ئەبوایە بۆ بەیانیچاوی پێت بکەوتایە پێش ئەوەی بڕۆیێت بۆ ئەوێ کە بە جێتهێشت بەهیچ شێوەیەك گلەییت نەبێت وەئەم کارە لەهەموو کارێکی زیرانە تر بوو، ئەم پیاوە بەڕاستی شایەنی باس کردنە لەهەموو ڕوویەکەوە بەلام بەداخەوە ئیمبراتۆریەتەکەی مەلا مصطفی بارزانی بەگێژی نامۆژگارێکەی ئەم پیاوە ژیرە ناکەن .

**تێبینی**:

ئەو ماوەیە کە چاووم بەبرای بەرێزو نیشتیمان پەروەر کاك قادر عزیز دەکەوت لەرەزائیە خۆمم دەشاردەوە چونکە مام جەلال ئاگاداری کردبوومەوە بێجگە لە پارتی چاووم بەهیچ گروپێکی سیاسی تر نەکەوێت .

وەهەروەها عزیز محمد سکرتێری حزبی شیوعی لەو ماوەیەی کەمن لەوێ بووم هاتبوو بۆ سەردانی پارتی داوای لەکاك علی عبداللە کردبوو کەپچم و چاووم پێی بکەوێت بەلام من لەترسی مام جەلال سەرانسەر ئەو ڕۆژە خۆمم وون کرد لەم پیاوە بەڕێزە ، خۆم زۆر خۆش حال دەبم

کەچاووم پێی دەکەوێت چ لەبیابان بێت یا لەشاخ یا لەئاگر.

بەیانی‌یەکەی دوای ئەوەی چوومەوە خزمەتی کاک علی عبدالله خوا حافیزیمان لەیەکتر کرد و لەگەڵ ئەندامێکی لیژنەی مەرکەزی دا بەرێی کردم ئەو ڕۆژە سەر لەئێوارەکەی گەیشتینە گوندی (ئاڵوەتان) لەبارەگای پارتی دیموکراتی کوردستان لاماندا ئینجا ڕوخسەتم لێ خواست و وتم من ئەچم سەردانێکی ماڵی(سەلیم ئاغای بایز) دەکەم ئەمە دۆستێکی دێرینی باوکم بووە کاتێك کە چوومە ئەوێ وتم من کوڕی حاجی مامەی حاجی صادقم زۆر بەگەرمی پێشوازی‌یان نەکردم چونکە لە ڕێگای پارتی‌یەوە چووبومە لایان وەگومانی ئەوەیان لێ دەکردم کەسەر بەپارتی بم (چونکە کۆماری ئیسلامی ئێران بەیارمەتی پارتی شەڕیان لەگەڵ دیموکراتی ئێران کردبوو وەپێشمەرگەیەکی زۆریان لێ کوشتبوون وەڕایان ماڵی بوون لەزوبەری ناوچەکانی ئێران).

بۆ نیوەڕۆی ڕۆژی دوایی گەیشتمە گوندی شێنێ و چومە بارەگای یەکێتی لە(زەڵێ)بەبروسکە ئاگاداری بەرێز (مام جەلال)م کرد کە لەئیشەکەمدا سەرکەوتووم و داواکارم ڕێگایەکم بۆ دانێی کەپیایدا بگەڕێمەوە لاتان ، دوای دوو ڕۆژ وەڵامی بروسکەکی دایەوە وتی: لەڕێگای قەڵادزێوە مەگەڕێرەوە مەترسی هەیە وەبچۆ چاوت بە( فلان) کەس بکەوێت لەفلان گوند ئەو ئەتوانێت ڕێگای گەڕانەوەت بۆ ئاسان بکات، کەلێمکۆڵی‌یەوە ئەم کەسایەتی‌یە سەر بەکۆماری ئیسلامی بوو لەهەمان کاتدا ئیش وکاری یەکێتیشی بەڕێوە دەبرد لەو ناوچەیە گەیشتمە لای، خۆمم پێ ناساند وەئینجا وەرەقەیەکی (عدم تعرض) ی بۆ کردم هەتا بارەگای مام جەلال لەگەڵما هات وە ئەو ماوەیەی نێوان ڕاژان و بارەگاکەی مام جەلالم بەپێنج ڕۆژ بری.

گەیشتمە پرسگەکەی مام جەلال پێیان وتم دەیەوێت نامەکە ببینێت، ئینجا دوای نیو سەعات وتیان مام جەلال داوات دەکات، کاتێك چوومە

ژوورەوە و چاوی پێم کەوت بەدەنگی بەرز فەرمووی (لیس للانسان الا ماسعی) وە منیش لەوەڵامدا وتم: (وان سعیه سوف یری) ئینجا زۆر بەگەرمەوە بەخێر هاتنەوەی کردم وتی من تۆم نەناردووە گوڵ لەسەر مەزاری مەلا مصطفی دابنێیت.

وتم: من بۆیە چووم رێکتان بخەم و هەرچی لە بەرژەوەندی میللەتی کوردابێت دەیکەم

وتی: دەنگ وباسی ئەوێ چییە بۆم بگێرەرەوە

وتم: من نەچووم قسەی ئێوە بەرم بۆ پارتی و هی ئەوانیش بێنم بۆ ئێوە

وتی: لە ناوخۆیاندا وەزعیان چۆنە..؟

وتم: لەدڵسۆزی و تەبایی برایەتی زیاتر هیچی ترم نەدی و هەر یەکەیان بەگوێرەی پلەو پایەی خۆیان بەکارو فەرمانەکانیان بەرێکوپێکی هەڵدەسن ورێکخراوێکی باشیان هەیە کاك مەسعود سەرۆکایەتی دەکات وەکاك علی عبدالله سکرتێرە و ..هتد)

وتی: مادام تۆ بۆ منی باس ناکەیت بامن بۆ تۆی باس بکەم ئەو پلانە چۆن دابەزیوەتە خوارەوە(ئدریس لێپرسراوی یەکەم مەسعود لێپرسراوی دووەمە)وەبەم شێوەیە، باشە قەد بووە نامەیەك بنێردرێت و دوای چوار مانگ ونیو وڵامەکەی وەرگرێتەوە..؟

وتم: بۆ ئەو ئیشە ئەوەندە ئاسانە کە بە یەك دوو هەفتە وڵام بدریتەوە..؟

ئینجا مام جەلال نامەکەی دایەوە دەستم و وتی: برۆ کاك نەوشیروان ببینەو سبەینێ نیوەرۆ وەرەوە لەلای من نانی نیوەرۆ بخۆ.

**تێبینی:**

هەر لەوماوەیەدا د. رۆژیش هەمان پرسیاری لێ کردم و وتی:هەواڵی ئەولا چییە منیش وتم من هاتووم رێکتان بخەم نەهاتووم قسە بێنم بەرم.

بەسەیارەیەك ناردمی بۆلای كاك نەوشیروان كەبارەگاكەی لە هەڵەدن بوو كاك نەوشیروان زۆر بەگەرمەوە بەخێر هاتنەوەی كردم نامەكەم تەسلیم كرد دوای خوێندنــەوەی فــەرمووی ئەمــە شــتێكی زۆر باشــە وەخۆشــحاڵ كەسەركەوتوو بویت لەم كارەدا، لەو شەوەدا كە لەلای مامەوە بەدوورو درێژی باسی هەڵوێستی ئەندامانی پارتیم بۆ كـرد وەبـۆم ڕوون كـردەوە ئـەوان زۆر شادمانن بەم ڕێكەوتنە وەهیچ گرفتێك نەهاتۆتە ڕێگام بۆ ئـەنجام دانـی ئەم كارە. كـە ڕۆژ بـووەوە هەتا درەنگانێك هـەر بـەردەوام بویـن لـەو توێـژەدا گەڕامـەوە لای مـام جـەلال زۆر درەنـگ بــوو وەمـام جـەلال نـائومێد بوبـوو لەگەڕانــەوەم كـەچاوی پێــم كـەوت زۆر گــرژ بــوو لــەوەی دوا كـــەوتبووم لەمەوعیدەكــەی نێوانمــانا لەبــەر ئــەوەی مـــن نەوســـتم و ئــەویش حــەز لـەخواردنی خـۆش دەكـات دوو بـەدوو بەتەنـها دانیشـتین خواردنێكـی زۆر خۆشی ئامادە كـرد بـوو پێكەوە خواردمـان و هـەر وەكو كـاك فـاضل مـیرانی دەڵێت: (كەس نییە وەكو مام جەلال بزانێت سفرە بڕازێنێتەوە)، لەكاتی نـان خواردنەكەدا پێم وت: شێخ محمد خـالد وكـاك مسعود هەریەكە بە تەنها داوایان لێ كـردم كـە بـە دوورو درێـژی ئاگاداریـان بكەیتـەوە دەربـارەی (عبیداللەو لقمانو سـابیرو شـێخ عوسمـان)و بارزانیـیەكانی تـر كە دیار نین، چی دەزانیت بەهۆی منەوە پێیـان ڕابگەیـەنیتو هـەروەها داوای هەواڵی ئەو بارزانییانـەیان دەپرسـی كـە لـە قوشـتەپەدان، ئینجـا مـام جـەلال فەرمووی: چاوت بە كاك (شـوكەتی حـاجی مشیر) بكـەوێت ئـەو هەواڵی ئەوان دەزانێتو فەرموی: جارێكیـان لـە (عـزت الـدوری) هـەواڵی (عبیداللە)م پرسی، لە وەڵامدا وتی: (اللە یرحمە) دوای پارە دەكەوت. مام جەلالم بەجێ هێشتو دوای چەند ڕۆژێك چوومە سـەرگەڵو بـۆ لای كـاك (شوكتی حاجی موشیر) بۆ ئەو مەبەستە، ئەو كاتە لێپرسراوی كاروباری پێشمەرگە بوو لە هـەولێر بە دوورو درێـژی باسـی ئەو بارزانییانەی بۆ كردمو فـەرمووی: لـە مـانگی (٣)ی سـاڵی ١٩٨٤دا لـە گوندێكـی نزیـك

مەولێر ڕۆژێکیان حەوت ئافرەت هاتنە لام پرسیاریان لێ کردمو وتیان تۆ ناوت چی‌یە؟

منیش وتم ناوم شەوکەتە، سێ جار لەسەر یەك ئەو پرسیارەیان لێ دووبارە کرمەوە.

ئینجا وتیان: لە چ هۆزێکی؟

ووتم: لە هۆزی (جاف)م ئەمجارەش سێ جار لێیان دووبارە کردمەوە.

وتیان: تۆ چیت؟

ووتم: من پێشمەرگەم.

وتیان: پێشمەرگەی کێیت؟

وتم: پێشمەرگەی کوردستانمو هی یەکێتی.

وتیان: ئامانجو بیروباوەڕتان چی‌یە؟

وتم: کوردستان رزگار دەکەین.

★ وەکو بیستومانە ئێوە لە گفتوگۆدان لەگەڵ ڕژێم، باشە تۆ (تەئکید)ی لەوەلامەکانی خۆت؟

- ئەی دایە بۆ درۆت لەگەڵ بکەم.

★ پێش ئەوەی کوردستان رزگار بکەن وەرن ئێمە رزگار بکەن، پیاومان لەگەڵدا نەماوەو ئەوەی نێرینە بێت لە (١٠) ساڵ بەرەو خوارن لە گەڵماندا، ئایا دەزانی ئێمە چۆن پارێزگاری لە خۆمان دەکەین؟ ئەم حەوتەمان کە وەستاوین هەر یەکەمان لایتێك دەگرین بە دەستمانەوە (ئێشك) دەگرین لە دەوروبەری خێزانەکانمان بۆ ئەوەی ئەگەر شەو ئەو جاشە نامەردانە بەسەرماندا بدەن بیکەین بە لایت لێدانو هاوار کردن بۆ ئەوەی نەتوانن کچەکانمان بەرنو کاری نابەجێیان لەگەڵدا ئەنجام بدەن، بە ڕۆژیش چەند ئۆتۆمبیلێکیان بەناوماندا هاتوچۆ دەکەن جاشو ئاسایشی تیادایە چاویان بەهەر کچێکی ئێمە بکەوێت یەکسەر پەلاماری دەدەنو دەیفڕێننو دوای (٦-٧) ڕۆژ بۆمان دەهێننەوەو بەم شێوەیە بڕوات کچمان تیادا نامێنێت.

کاك شەوکەت فەرمووی: لەو کاتەدا کە ئەم ئافرەتانە ئەم رووداوانـەیان بـۆ دەگێڕامەوە (کاك سابیر رەسول‌و سەفینی مەلا قەرەم) لـەلام دانیشـتبوو، کـە گوێیان لە قسەی ئەم ژنە بوو بـەناوی هەموویانـەوە قسـەی دەکـرد زۆر گـرژ بوون‌و بڕیارماندا بە هەرسێکمان چارەسـەرێك بـۆ ئـەم خەڵکە بدۆزینـەوەو نەیەڵین ئەم کارە دووبـارە بێتـەوە، دەسـت بـەجێ مـام جـەلالمان بـە بروسـکە ئاگـادار کـردەوە، لـەوەڵامدا فـەرمووی: (دەسـت بـەکار بـن بەرامبـەر ئـەم دیاردەیەو گوێ مەدەنە ئەو گفتوگۆیـەی کـە هەمانـە لەگـەل رژێمـدا، چونکـە ناموسی کورد بەلای ئێمەوە پیرۆزترە لەو گفتوگۆیەو هیچ باکی ئەوەم نـیـیـە لەگەل حکومـەت دا لەسـەر ئەمـە تێکـی بدەمـەوە)، ئینجـا زۆر بـەڕێزەوە خواحافیزیم لە ئافرەتەکان کردو پێم وتن بڕۆنەوە ئێمە لەم ساتەوە دەست دەکەین بە بەرگری کردن لە ئێوە بە هەموو.شێوەیەك.

دوای ئەوە هەرسێکمان لـەناوخۆماندا کۆبوونـەوەمان کـردو بڕیـاری یەکـەم هەنگاومان دا کە چـی بکـەین. دەسـت بـەجێ چوومـە قوشتەپەو رووم کـردە ئامر مەفرەزەکەی سوپا کە لێپرسراوی پارێزگاری کردن بوو لە بارزانی‌یاکان. پێم وت ئێوە لێرەن بەو ناوەوە مەترسیتان هەیە لە پێشمەرگە بەڵام ئێمە لە گفتوگۆداین لەبەر ئەوە پێویست ناکات ئێوە لێرە بن خۆمـان پارێزگـاری ئـەم ناوچەیە دەکەین، هـەر چـەندە ئەفسـەرەکە وتـی ئێمـە بـە فـەرمان لـێرەین‌و نـاڕۆین، بـەڵام مـن زۆرم بـۆ هێنـان وتم: بـڕۆن‌و بڵێـن دەریـان کردیـن، دوای قسەکەی من کە زانیان ئێمە زۆر گرژین، ئەو جێگایەیان بەجێ هێشت.

بەسەرپەرشتی کاك سابیر رەسول دوو کەرتی پێشمەرگەمان بـۆ پارێزگـاری لـەوێ دانـا کـە لـەو مەسـەلەیەمان کۆڵیـەوە.سـەیرمان کـرد جاشـەکانی (سـید قهار)و (شێمەی هاروون) شان بە شانی ئاسایش‌و هەوالگر بـەم کـارە چەپەڵە هەڵدەسان‌و ئینجـا بۆسـەمان دەرکـرد بـۆ ئـەو دوو (بـەرازیلی)یـە سـپـیـیە کـە دەهاتنـە ئـەو نـاوە کچـی جوانـی بارزانی‌یەکانیان دەفڕانـدو دەیـان بـردن بـۆ (ئاسایش‌و هەوالگری‌و لێپرسراوانی بەعس)و دوای چەند رۆژێك بە کوژراوی

یان بە ئەتك كراوی لە دەورو پشتی قوشتەپە فڕێیان دەدانەوە، دوای ماوەیەك بەردەستمان كەوتن‌و ئەو دوو كەسەی بەم كارە هەڵدەسان لەناومان بردن‌و، ئۆتۆمبیلەكانمان دایەوە بە ڕژێم‌و وتمان ئەو سەیارانەمان دۆزیوەتەوە، ئێمە بە ئاشكرا لایەنگری بارزانی‌یەكانمان دەكرد بەبێ ئەوەی گوێ بدەینە ئەو ناكۆكی‌یەی نێوانمان چونكە ناموسی كورد لەسەرو ناكۆكی‌یەوە بوو لەلای ئێمە، بەڵام جاشەكان ئەوەیان نەدەزانی ئەوەبوو شەڕی (قۆریتان) لەسەر ئەم مەسەلەیە رووی دا لە نێوان ئێمەو جاشەكاندا، لە ئەنجامدا (٧) جاش كوژران‌و دوو پێشمەرگە زامدار بوون، پاش ماوەیەك ئەو خوشكە بارزانی‌یە بە تەمەنەی كە سەرپەرشتی دەكرد هاتەوە بۆ لامو وتی:

* زۆر سوپاستان دەكەین لەسەر ئەو هەڵوێستە مەردانەتان، بەڵام هێشتا كێشەیەكمان ماوە، ئەویش ئەوەیە ئەو كەسانەی دیاری كراون لە لایەن رژێمەوە بۆ سەرپەرشتی كردنی ترومپای ئاوەكە زۆر ئازارو ئەشكەنجەمان دەدەن، منیش یەكێكم نارد لە دوورەوە چاودێری ترومپاكە بكات، كاتێك گەڕایەوە وتی: ئەو كەسەی لەسەر ترومپاكەیە كام كچەی جوانە ناوی دەداتێ‌و قسەی نابەجێی لەگەڵ دەكات‌و كاری نابەجێیان بەرامبەر دەكات‌و هەوڵ دەدات هەڵیان خەڵەتێنێ بە زۆر شت.

ئینجا ئەوانیشمان دوور خستەوەو خۆمان ئاومان دابەش دەكرد، شەوێكیان مەفرەزەیەكی جاشەكان بە دزی‌یەوە هاتبوون ترومپاكەیان شكاندبوو، ئێمە هەموو ئەو كارە نابەجێیانەمان بە مام جەلال راگەیاندپێمان وت پێویستی‌یەكی زۆریشیان بە یارمەتی هەیە، ئەوەبوو مام جەلال (١٠٠٠٠٠) سەد هەزار دیناری بۆ سەرف كردین ترۆمپایەكی باشمان كڕی بە (٨٠٠٠) هەشت هەزار دینارو باقی پارەكەشمان دابەش كرد بەسەر بارزانی‌یەكاندا.

كاك شەوكەت فەرمووی: ئەوەی سەرنجی راكێشام ئەوەبوو كابرایەك هاتە لامان ناوی (مام صالح بارزانی) بوو وتی:

* هاتووم سوپاسی ئێوە بكەم‌و ئەو پەڕی رێزو سڵاوم هەیە بۆ بەڕێز مام

جەلال، بەناوی هەموو ئەو پیاوانەوە دورخراونەتەوە لە قوشتەپەو مـن بەتەنها لێرە ماومەتەوە بۆ ئەوەی منیش نەکەومە بەردەستی رژێم چاڵێکە هەڵکەندووە لە ژووری نوستنەکەم دا قولاییەکەی (٢م) دوو مەتردو خواردنو نوستنم ماوەیەکی زۆرە هەر لەو چاڵەدا بووە، ئینجا کە زانیم دنیا خامۆشەو دەستو دایرەکەی رژێم لەو ناوە نەماوە، هاتمە دەرەوەو ئێستاش من بچوکی ئێوەمو هەرچی فەرمانێکتان هەیە لە خزمەتتاندام.

- پێم وت نامەوێت ببیتە پێشمەرگە لەلای من، بەڵام لەبەر ئەوەی دانیشتوانی قوشتەپە هەموویان بارزانین، پێم باشە ببیتە لێپرسراوی ئەو دوو کەرتەی دامان ناوە لەو ناوە بۆ پاراستنی ئێوە، لە خۆشیدا دەستی کرد بە گریان.

منیش لە گەڕانەوەمدا دەقی قسەکانی کاك شەوکەتم کرد بە راپۆرتێكو دام بە (کاك مەسعود)و خۆشم چووم بۆ کەرەج بە هەمان شێوە بە ئەمانەتەوە قسەکانی مام جەلالو کاك شەوکەتم بۆ گێڕایەوە.

ئەوەی راستی بێت هەواڵی بارزانییەکان رووداوێکی ئەوەندە شەرمەزاری بوو نەمدەزانی چۆن بیکەم بە راپۆرتو بیخەمە بەر دەستیان یان بە قسە پێیان بڵێم.

ئەوەی من تێبینیم کرد لەو ناوەندەدا هەتا کاك نەوشیروان نەیفەرموو رازیم لەسەر ئەم رێکەوتنە مام جەلال بە هیچ شێوەیەك رەزامەندی خۆی بۆ دەرنەبڕیمو هەروەها هەموو ئەو هەڵسوکەوتانەی کە بەبێ پرسی ئەوانو لە خودی خۆمەوە ئەنجامم دابوو مام جەلال زۆر پێی دڵ گران بوو، کاك نەوشیروان بە پێچەوانەی ئەوەوە زۆر دەست خۆشی لێ کردم.

لەدوای حەوت رۆژ (مام جەلال) وەڵامی نامەکەی مەکتەبی سیاسی پارتی دایەوە بەنامەیەكو بردمەوە بۆ رازان، ناوەڕۆکی نامەکە زۆر دڵخۆشکەر بوو، و بووە هاندەرێك بۆ من کە هەست بە ماندوویەتی نەکەم.

دوای ئەوەی سەرکەوتوو بووم لەوەدا کە هەردولا قایل بکەم بە رێکەوتن،

کارەکەی من چووە قۆناغێکی تازەوە ئەویش ئەوە بوو هەوڵ بدەم خاڵی ناکۆکی نێوانیان کەم بکەمەوە، دوای پێنج جار هاتوچۆ لە نێوانیاندا توانیم ئەم قۆناغەشیان بە سەرکەوتویی ببڕمو لە جاری پێنجەمم دا کە لە راژان بووم، نیوەڕۆ ماموّستا مەلا عبدالقادرو کاك فەرانسۆم دەعوەت کرد بۆ نان خواردنی نیوەڕۆ، پێش ئەوەی ئەو پیاوانە بێن بۆ لام لە سەعات (١٠)ی سەر لە بەیانی فڕۆکەکانی رژێمی عێراق بۆردومانی گوندی (زێوێ)یان کرد کە گوندێکی ئێرانییەو (١٠) کم دوورە لە راژانو بەناوچەی (تەرگەوەرو مەرگەوەر) ناسراوەو سەر بە رەزائیەیەو ٩٠٪ی دانیشتوانی ئەم دێیە ئاوارەی پارتی بوونو زۆربەشیان بارزانی بوون، لە ئەنجامدا (٤٠٠) کەس کوژران کە بەشی زۆری کوژراوەکان منداڵ بوو چونکە بۆردومانەکە قوتابخانەیەکی گرتەوە، رووداوێکی زۆر دڵتەزێنو ناخۆش بوو، بە بۆچوونی من لە بۆردومانی قەڵادزی زیاتر بوو، بەهۆی ئەم کارەساتەوە (٤٢) رۆژ چاوم بە کاك مەسعود نەکەوت چونکە بەیانی هەڵدەستا دەچوو بۆ ناو کەسو کاری شەهیدان هەتا بانگی مەغریب، لەگەل ئەوەشدا پارتی زۆر خراپەی کوردی ئێرانو دیموکراتی ئێرانی کردبوو بەڵام هێشتا ئەو خەڵکە گوێیان نەدەدایە ئەو شتە، خەڵکی ئەو دەوروبەرە بە لۆریو تراکتۆر خواردنیان بۆ لێقەوماوانی ئەو دێیە دەهێناو لەبەر ئەوەی کوژراوەکان کەسیان نەدەناسرانەوە گۆڕی بە کۆمەڵیان بۆ هەڵکەندنو من بەناوی یەکێتییەوە چوومە ماڵی زۆربەی ئەو شەهیدانەو سەرخۆشیم لێ کردنو لە گۆڕاستاندا لە مەراسیمی بە خاك سپاردنی تەرمەکاندا بەشداریم کرد.

لە دووری یەك کیلۆمەتر لە گوندی زێوێ سەنگەرێکی ئێرانی لێ بوو چەند دۆشکەیەکی بەسەرەوە بوو لەگەڵ چەکی دژی فڕۆکەو ئێرانییەکان وایان بڵاوکردبووەوە ئەم سەنگەرە بۆ پارێزگاری بارزانییەکان لێرە دانراوە، سەعات (١٠)ی سەر لە بەیانی کە فڕۆکەکانی رژێمی بەغدا هات بۆردوومانی گوندی زێوێی کرد یەك دۆشکە لەم دۆشکانە گوللەیەکی نەتەقاند بەرەو

رووی فڕۆکەکانی (صدام)و پێ دەچوو بۆ پارێزگاری ئەوان دانەنرابێت بەڵکو بۆ خەڵکی ئەو دێیە دانرابێ نەوەك رۆژێـك لـە رۆژان ئـەم بارزانییانـە بەرامبەر دەسەڵاتی کۆماری ئیسلامی راوەستن، خەڵکێکی زۆر لەوانـەی لێیان قەومابوو بـە کۆمـەڵ دەهاتن بـۆ (م.س) پارتی بـۆ یارمـەتی دان کـە خـەڵك دەهات وەڵامیان دەدایەوەو دەیانوت چاوەڕوان بکەن لە لقی یەکەوە یارمـەتی دێت ئەوساکە دەتان دەینێ، بۆ نمونە علی شعبان هات بۆ لای کاك مەسعودو کاك ئیدریس، گوێم لە قسەکانیان بوو بە گوێی خۆم کاك عەلی دەیوت خراپ لێمان قەوماوە ئێمە نزیکەی ٥٠ ماڵین ئێوە لـە ئێمـە ناپرسـنەوە کـەچی نوێنەرانی ئیسلامی هاتنە لامان وتیان جیا ببنەوە لە مەسعودو ئیدریس لـە شوێنێکی تـر داتـاندەنێین‌و هـەموو پێویستییەکانتان جێ بـەجێ دەکـەین‌و هەر ماڵەی (٥٠٠) پێنج سەد دینارتان دەدەینێ، بەڵام ئەگـەر ئێمـە بمرین لـە برسانا یارمـەتی لـە کۆماری ئیسلامی وەرنـاگرین چونکـە ئێمـە خۆمـان بـە کوڕی بـارزانی دادەنێین‌و بۆیـە رووما‌ن کردۆتـە ئێـوە شـتێکمان بـۆ بکـەن. وەڵامیان دانەوە لە لقی یەکەوە یارمـەتیتان بـۆ دێـت‌و بەسـەرتاندا دابەشـی دەکەین، لـە کاتێکدا روون‌و ئاشـکرایە دوای هەرەسـەکە هـەرچی سـەروەت‌و سامانی پارتی هەیە لە خزمەت بنەماڵەی بارزانیدا بوو، و دەستیان بەسـەردا گرت، بەڵام هەرچی سەروەت‌و سـامانی بنەماڵەی بـارزانی هەیـە لـە خزمـەت بانقەکانی ئەورووپادا بوو.

لە جاری شەشەمدا کە گەڕامەوە بۆ راژان کاك ئیدریس فەرمووی بـۆ دوو بـەیانی دەچیـت چـاوت بـە (حـاجی مصطفـوی)[١٩] دەکـەوێت کـە لێپرسـراوی

[١٩] لە کاتێکدا کۆبونەوە بوو لە نێوان کۆماری ئیسلامی و کوردستانی ڕۆژهەڵات لەشاری نەمسا نوێنەری کۆماری ئیسلامی حاجی مصطفوی بوو وە نوێنەری کوردستانی ڕۆژهەڵات د.قاسملو بوو کە سکرتێری حزبیدیموکراتی ئێران بوو دوای چەند دانیشتنێك وا خۆیان پیشان ئـەدا کەپرۆسـەی ڕێکەتنەکـە زۆر بـەچاکی دەچێت بـەڕێوە بـەڵام لەناکاوێکدا بـەو پیلانـەی دایان ڕشتبوو بەسەرپەرشتی حاجی مصطفـوی ئـەو پیـاوە مەزنـە نـاودارەی

ئازەربایجانی غەربییە، ئێمەو هەموو گروپە سیاسییەکان پەیوەندی بەو کابرایەوە دەکەین‌و تۆ لەو چاوپێکەوتنەدا دەبێ بیگەیەنیتە ئەو باوەڕەی کە رێکەوتنی نێوان یەکێتی‌و پارتی هیچ زیانێکی نابێت بۆ کۆماری ئیسلامی‌و بگرە سوودمەند دەبێت.

وتم ئایا ئەو کابرایە زانیاری هەیە بەوەی من لە (ئاسایش‌و هەواڵگری‌و سیخوڕی) نوسینگەی صدام دا کارم کردەووە؟ وتی: زۆر چاکت دەناسێت، ئاگادارمان کردووەتەوەو پێمان وتوە (رفیق مانای ئیدریس‌و رەفیق مانای مەسعود). وتم: دەتانەوێ چۆن لەگەڵی بدوێم‌و چی لەگەڵدا باس بکەم؟ وتیان: عەیب نییە ئێمە تۆ فێری چۆنیەتی وتووێژ کردن بکەین، دوای دوو رۆژ منیان بردە بارەگای (ئیتلاعاتی) ئازەربایجانی غەربی‌و لەماوەی ئەو دوو رۆژەدا زۆر بە چاکی لە مێشکی خۆمدا دام ڕشتبوو چی بەو کابرایە بڵێم، کە چوومە ژوورەوە منیان بە تەنها لەو دیوی مێزێکەوە داناو خۆشیان بەرامبەرم لە دیوەکەی تر (٤) کەس بوون، دوای سڵاوو خۆ پێ ناساندن، وتم:-

★ من فارسی نازانم دەمەوێت ئەو وەرگێڕەی کە بۆم دەهێنن کورد بێت یان عەرەب (من راستم نەکرد لەوەدا کە فارسی نازانم چونکە بەشی ئەوەد تێدەگەیشتم بەڵام مەبەستم ئەوەبوو کابرا بە فارسی جارێك پرسیار دەکات لێی وەردەگرم‌و جارێکی تر کە بۆم وەردەگێڕن لە مێشکی خۆمدا بە باشی لێکم دەدایەوە بۆ ئەوەی ئەو وەڵامەی دەیدەمەوە لەجێی خۆیدا بێت).

جاری یەکەم سێ رۆژ لەسەر یەك گفتوگۆمان کرد، رۆژی چوار سەعات لە هەموو جارێکدا کە تەواو دەبووین (حاجی مصطفوی) منی بە سەیارەکەی

---

کوردیان تیرۆر کرد لەهیچ زەمانێکدا گلەیی لەکورد نەکراوەن، هەرچەندە کوڕانی مەلامصطفی زۆرچاك دەیانزانی بەدەستی مصطفوی د.قاسملو تیرۆرکراوە زۆر بەئاشکرا پێشوازییەکی گەرم‌وگەورەی لێکرا لەهەوارگەی صلاح الدین هەرچۆن کاك عبدالله ئوج ئالان دەستگیرکران بۆ رۆژی دوای کردیان بە پشوی ڕەسمی لەهەرێمی پارتی دا.

خۆی دەهێنایەوە بارەگای پارتی لە (ڕەزائیـیـە)و بـەیانیش خـودی خـۆی سەعات (٩) دەهات بە شوێنمدا، لەیەکەم ساتەوە چاوم کرایەوە لەگەڵ ئەو کابرایەدا بە شێوەیەك مامەڵەم لەگەڵ دەکرد کە من کابرایەکی کەم نیەو نوێنەری کوردم بە گشتیو ئەو دوو لایەنە بەتایبەتی، هەر بۆیە لە دوای یەکەم دانیشتنەوە من کۆنترۆڵی دانیشتنەکەم کرد، بە شێوەیەك گفتوگۆم لەگەڵدا دەکرد کە ئەو فوتابیـیە لەبەردەستمدا پێش ئەوەی لێکۆڵینەوە دەست پێ بکەین داوام لێ کرد بە تۆمارکەرێك گفتوگۆکانی نێوانمان تۆمار بکات بۆ ئەوەی ڕاستیـیەکان لای خۆیان بمێنێتەوەو نەتوانن شتم بۆ دروست بکەن.

* یەکەم پرسیار لێی کردم وتی چەند جار هاتووی بۆ ئێرە؟ بۆ تا ئێستا سەردانی منت نەکردووە؟ و بەچ شێوەیەك لەنێوان عیراقو ئێراندا هاتوچۆ دەکەیت؟

- پێنج جار چووم بۆ ڕاژانو ئەمە جاری شەشەمەو مام جەلال بەمنی نەوتووە سەردانت بکەم من بەناو کوردستاندا هاتوومو ئەو سنوورەی کە تۆ باسی دەکەیت لەلایەن خۆتانەوە دروست کراوەو کێشە بۆ من دروست ناکات.

* دوای ئەو هەموو خوێنە کە ڕژا مام جەلال چۆن ڕازی بوو لەگەڵ صدام دانیشێت؟

- هەموو شەڕێك هەر بە ئاشتی کۆتایی دێت، صدام چەند دوژمن بێت کە دەستی درێژ کرد بۆ میللەتی کورد کوردیش دەست دەخاتەوە ناودەستیو پەشیمان بونەوەش لەلایەن مام جەلالەوە نەبوو بەڵکو (صدام حسین) بە فشاری تورکیا ڕێکەوتنەکەی هەڵوەشاندەوە.

* بە چ نیازێکەوە وا بە گەرمی دەتەوێت پارتیو یەکێتی ڕێك بخەیتەوە؟

- یەکخستنەوەیان هۆکارێك دەبێت بۆ نەمانی گرژیو ئاڵۆزی لەناوچەی کوردستانداو دەبن بەهێزێك کە زۆر بە ئاسانی دەتوانن بەرامبەر بە دوژمن کە (صدام)ە ڕابوەستن، ئەو کارەی کە من پێی هەڵساوم ئەوە ئیشی ئێوەیەو

دەبوایە لە مێژەوە ئەم کارەتان ئەنجام بدایە چونکە هێزی یەکێتی پارتی بەیەکەوە زۆر سود بەخش دەبوون بۆ ئێوە.

* پارتی دۆستمانن بەلام (مام جلال) بە بەردەوامی دژایەتیمان دەکات و شان بە شانی پێشمەرگەکانی دیموکرات شەڕمان لەگەڵ دەکات.

- زۆر حەز دەکەیت بزانیت کێ هۆکارە لەم دژایەتییەی یەکێتی بۆ ئێوە؟ هۆکاری سەرەکی ئێوەن چونکە زۆر بە زەقی دژایەتی یەکێتی دەکەن و تاوان نییە ئەگەر ڕێکخراوێکی سیاسی وەکو یەکێتی لەگەڵ دیموکراتدا دۆست بێت، ئێمە هەموو کوردین، ئەی بۆچی بۆ ئێوە حەلاڵ بێت لە ئێرانەوە لەگەڵ (حزب الله)ی لوبنانی پەیمان ببەستن! بەلام بۆ ئێمە کە هەردوولامان کوردین حەرام بێت؟

ئینجا کە هەستم کرد بە تەواوەتی (کۆنترۆڵی) دانیشتنەکەم کردووەو هەروەها کێشەی ڕازی بوونی ئێرانم نەماوە بۆ ڕێکەوتنەکەی ئەو دوو حزبە، ئەو هەلەم قۆزتەوەو پێشنیارم کردوو وتم:

- ئەگەر دەتانەوێت سنووری ئێران بچێتە جبل حمرین و ئەنقەرە من لەژوورێك دا بنێن و بەناوی مستر x)ەوە چیم پێ وتن جێ بەجێی بکەن، ئەگەر لە دوای شەش مانگی تر سەرکەوتوو نەبوون لە سێدارەم بدەن، حوکمی زاتی بدەن بە دیموکراتی ئێران لە هەموو کارێکتاندا سەرکەوتوو دەبن، هەموو کوردستانی باشووری دێتە پاڵ ئێوە چونکە کورد بە زۆر بەستراوەتەوە بە عەرەبەوە لە ساڵی (١٩٢٢) کە حکومەتی عێراقی دامەزراوە، لەبەر ئەوەی ئێمە نەتەوەیەکی ئارین و ئێوەش ئارین کەواتە ئێمە لە ئێوەوە نزیك ترین تا عەرەب و ئەو ڕێکەوتنە سێ قۆڵیەی نێوان کوردستانی باشوورو دیموکراتی ئێران و کۆماری ئیسلامی ئەگەر سەر بگرێت هۆکارێکی سەرەکی دەبێت بۆ زوو لەناو بردنی (ڕژێمی بەغدا) و سەرکەوتنەکەش بۆ کۆماری ئیسلامی دەنوسرێت.

بەلام کە ناوی دیموکراتم هێنا دەم و چاوی حاجی مصطفوی زۆر گرژ بوو

بەشێوەیەك غەزەبی لێ دەباری، هەستم کرد دەیەوێ هێرش بکاتە سەر خوالێخۆش بوو (قاسم لۆ)، دەست پێشکەریم کردو بەهیچ جۆرێك ڕێگام نەدا ناوی ئەو پیاوە مەزنە بەخراپە بهێنێت، هەر بۆیە پێش ئەوەی دەم هەڵبێنێت پێم وت ئەگەر بێتو بەخراپە باسی ئەم پیاوە بکەیت منیش باسی گەورەکانی شیعە دەکەم.

ئینجا مصطفوی وتی: ئێمە دەوڵەتێکی ئیسلامین‌و ئیسلامیش سنووری نی‌یە، با دەرنەچین لە باسەکەی خۆمان، با باسی یەکێتی بکەین، ئێمە وەکو تۆ وتت ئاریین‌و دراوسێی یەکین، ئەگەر من مردم دەبێت تۆ بچیتە ژێر جەنازەکەم لەبەر ئەجری دراوسێتی، لەبەر ئەوە وا پێویست دەکات پەڕەیەکی سپی هەڵدەینەوە لەنێوان خۆماندا.

- لەم کارەدا دەبێت ئێوە دەست پێشکەری بکەن‌و ئێوە لاتان روونە لەسەرەتاوە تا ئێستا یەکێتی دژی شا بووەو یەکێتی یەکێك بووە لەو حزبە چەکدارانەی کە شان بە شانی هەموو جەماوەری ئێران بەشداری لە ڕاپەڕینەکەی ڕووخانی شا دا کردووەو گومان لەوەدا نی‌یە لە هەموو شارێکی ئێراندا بەلای کەمە شەهیدێکی داوە.

* ئەو شەهیدانەی تۆ باسیان دەکەیت ئەوانە لە ڕاپەڕینەکەدا شەهید نەبوون بەڵکو کاتێك لەگەڵ دیموکراتدا بەرەنگاری ئێمە بوونەتەوە کوژراون.

لە کۆتایی دانیشتنەکەدا مصطفوی وتی: با لەنێوان من تۆدا لەم دەقەیەوە پەڕەیەکی تازە هەڵدەینەوەو بۆ ئەوەی بە هەردووکمان بتوانین پەیوەندی‌یەك دروست بکەین لەنێوان ئێران‌و یەکێتی‌داو پێم باشە هەرچی شتە ئیجابی‌یەکان هەیە لەم دانیشتنەدا بۆ مام جەلالی بگێڕیتەوەو بە زووترین کاتیش بگەڕێیتەوە بۆ ئێرە.

خوا حافیزیمان لە یەکتر کردو گەڕامەوە بۆ مەکتەبی سیاسی پارتی، لەوێ کاك ئیدریس‌و کاك مەسعەدو کاك علی عبداللە لێیان پرسیم دانیشتنەکەتان چۆن بوو؟ تەنها بە دوو ووشە وەڵامم دانەوەو وتم: (سەرکەوتوو بووم

لحمدلله)، وەڵامی نامەکەی مام جەلال‌یان ئامادە کردبوو بۆ رۆژی ئایندە بەرێ کەوتم بۆ لای مام جلال.

کە گەیشتمەوە بارەگای مام جەلال لە یاخ سەمەر، ئەوەی شایەنی باسە لە هەموو تازەگەرییەك لە رێکەوتنکەدا ئاگادارم کردەوەو ئینجا بە دوورو درێژی چاوپێکەوتنەکەی نێوان من‌و حاجی موستەفەویم بۆ گێڕایەوە؛ لەهەموو چاوپێکەوتنێکمدا لەگەل هەردوولا هەنگاوێك زیاتر لەیەکتر نزیك دەکردنەوە.

دیار بوو ئەو قسانەی حاجی مصطفوی کردبووی، جێی سەرنج بوو لەلایەن مام جلال، هەر بۆیە زۆر بە پەلە منی ناردەوە بۆ ئەوێ لە پێنج رۆژ زیاتر نەیهێشت لەو ناوە بمێنمەوە، بەڵام پێش ئەوەی بڕۆم پی‌ی وتم، ئیشەکەی تۆ بوو بو دوو ئیش یەکێکیان حاجی مصطفوی‌و ئەو تریان پارتی، بەڵام یەکەم جار گرنگەکەیان ئەنجام دەدەیت‌و دەچیت بۆ لای حاجی مصطفوی بەبێ ئاگاداری ئەندامانی پارتی، کە لەوێ تەواو بوویت ئینجا بچۆ بۆ بارەگای پارتی.

بەڵام کە گەیشتمە ئێران ئەو کارەم ئەنجام دا کە ویژدانی خۆمی پێ مورتاح دەبوو بەرامبەر بە میللەتی کورد، چونکە من یەکەم هەنگاوم هەڵهێنایەوە بۆ ئەم رێکەوتنە پەیمانم دابوو بەخوای خۆم کە ئەم دوو حزبە بکەمەوە بەیەك‌و چی لەبەرژەوەندی میللەتی کورددایە ئەوە پیادە بکەم‌و لە هەمان کاتدا من لە ناخی خۆمدا گومانم لە دۆستایەتی ئێران هەبوو بە هەموو شێوەیەك، هەر بۆیە وەکو هەموو جارێك یەکەم جار رووم کردە (راژان) بۆ خزمەتی (کاك ئیدریس‌و کاك مەسعودو مامۆستا علی عبدالله)و دوای ئەوەی کارەکانی خۆمم بە تەواوەتی ئەنجام دا ئینجا چوومەوە لای حاجی مصطفوی‌و پێم راگەیاند مام جەلال پێخۆشحاڵە کە لاپەڕەیەکی سپی پێکەوە هەڵدەنەوە. لە رۆژی ئایندەدا چاومان بەیەکتر کەوتەوەو کۆتایی قسەکانی بەوە هێناو پی‌ی وتم: گەشتێك بکە بۆ تاران بۆ ئەوەی چاوت بە

(ڕەفسنجانی) بکەوێت، منیش لەوەڵامدا وتم: بەداخەوە مـن نـاتوانم بچم بۆ ئەوێ چونکە مام جەلال روخسەتی بینینی جەنابتی زیاتر نەداومەتێ.

لەماوەی دوو رۆژدا سێ جار کۆبوونـەوەم کـرد لەگـەڵ حـاجی موسـتەفوی ئینجا گەڕامەوە بۆ لای مام جـلال بەنامەیـەکی مەکتـەبی سیاسـی پارتـیـیەوە کە چەنـد پێشنیارێکی تـازەی تیـادا بـوو بـۆ پێـش خستنی پرۆژەکـەو زیـاتر لەیەك نزیك بوونەوەیان.

گەڕامەوە چاوم کەوت بە مام جـەلالو نامەکـەی مەکتـەبی سیاسـی پـارتیم دایەو پێم وت: چاوم بە حاجی مصطفوی کەوتووەو زۆر رێـزو سـلاوی هەیـە بۆ جەنابتانو چاوڕوانی شت بکە.

ئینجا بۆ جاری هەشتەم گەڕامـەوە راژان و ئـەم جارەیـان لەگـەڵ مەکتـەبی سیاسی پارتیدا باسمان لە چۆنیەتی دەست نیشان کردنی جێگایەك دەکرد کە نوێنەرانی هەردوو لا لە ئەندامانی مەکتەبی سیاسی روو بەروو دابنیشـن بـۆ ئەوەی کێشەکانیان لـە نزیکـەوە چارەسـەر بکـەنو مـن پێـم وتـن: نوێنـەرانی یـەکێتی ئامـادەن خۆیـان بێـن بـۆ لاتـان لـە راژان بـە نـهێنێ بـە مـەرجێك پاسەوانیيان بکەن لە هاتنو رۆشتنەوەیانداو کەس لەم شتە ئاگادار نەکەنەوە هەتا دەگەڕێنەوە شوێنی خۆیان، و لە کۆتـایی دانیشـتنەکەدا مامۆسـتان علـی عبدالله فەرمووی: دەبێـت نوێنـەری کۆمـاری ئیسـلامیش لـەو کۆبوونەوەیـەدا بەشدار بێت لە گـەڵماند چونکە ئێمـە لـە خـاکی ئێـراندا ئـەو کۆبوونەوەیـە دەکـەین. منیـش وتم باشـە دوو گروپـی سیاسـی کـورد کـە لـە بـەرژەوەندی میللەتەکەی خۆیان کۆ دەبنەوە چ پێویست دەکات بێگانەیەکی وەکـو کۆمـاری ئیسلامی بەشدار بێت لە رێکەوتنی نێوانیاندا.

من بەم هەڵوێستەی پارتی زۆر گـرژو دلگـران بـووم لـە دوای گفتوگۆیـەکی زۆر قەناعەتم پێ هێنان کە یان لە (قەڵا توکان) یان لە دێی شێنێ دانیشین چونکە ئـەم ناوچانـە لـەناو عـێراقدان نـەهی پارتیـیـەو نـە هـی یـەکێتی، ئێرانیش بۆی نـیـیە بەشـدار بێـت لـە دانیشـتنەکەداو بـۆ سـەلامەتی هـەموو

دیەك (وشەیەکی نهێنی)م دانا لە نێوانمانداو کاك مەسعود وتی تەنها خۆت ئەو جفرەیە دەگەیت و کەس تێ ناگات، منیش وتم دەمەوێت تەنها خۆم تێ بگەم و کەس تێی نەگات بۆ سەلامەتی هەردوولاتان.

پێم وتن: دەگەڕێمەوە بۆ لای مام جەلال یان بە بروسکە یان خۆم دێمەوە ئاگادارتان دەکەمەوە لە کات و شوێنی دیاری کراو بۆ دانیشتنەکە.

کە گەڕامەوە بۆ بارەگای مام جەلال بۆم باس کرد کە ڕێککەوتووین لەسەر (قەلا توکان)و داوام لێ کرد بڕێك پارەم بۆ سەرف بکەن بۆ ئەوەی هەموو مەسرەفی دانیشتنەکە ئێمە بیکێشین، کاك نەوشیروان فەرمووی چەندت پارە پێویستە وەری بگرە لە دارایی، دوای ئەوەی پارەم وەرگرت (٥) ڕۆژ لەناو برادەرانی یەکێتیدا مامەوە ئینجا گەڕامەوە بۆ ڕاژان، لە گەڕانەوەمدا کە دوو ڕۆژم پێ چوو زۆر دڵخۆش بووم بەوەی سەرکەوتوو بووم لەم ڕێکەوتنەدا بەجۆرێك نەمدەزانی چی بکەم لە خۆشیدا، بەلام ئەم خۆشییە لەوەدەچوو تا سەر نەبێت، ئەوەبوو کە گەیشتمە ڕاژان دوای چاوپێکەوتنم کرد لەگەڵ کاك مەسعودو مامۆستا علی عبدالله دا، بەهیچ شێوەیەك وەلامیان نەدامەوە، زۆر سەرم سوڕما لەم هەڵوێستەیان چونکە لەیەکەم ڕۆژەوە هەتا ئەو کاتە شتی وا لەگەڵ مندا ڕووی نەدابوو، خێرخوایەك هات (نامەوێت ناوی بەرم چونکە لە هەولێر دادەنیشێت) پێی وتم مەفرەزەیەکی پارتی تەفروتونا کراوە لە هەولێر بۆیە نایانەوێت چاویان پێت بکەوێت، ئێنجا خۆم بە خۆمم وت: ڕەفیق دانیشەو بیر کەرەوەو بزانە چۆن لەگەل ئەم کارەساتەدا مامەڵە دەکەیت، بەلام من کۆڵم نەداو هەر سوور بووم لەسەر ئەوەی چاوم پێیان بکەوێت، بە ناچاری ناردیان بە شوێنمدا، کە چوومە ژوورەوە حەوت کەس لە لێپرسراوان دانیشتبوون، ڕەش داگیرسابوون لە توڕەییدا، کە بۆیان باس کردم چی ڕوویداوەو چۆن مەفرەزەیەکی یەکێتی مەفرەزەیەکی پارتی لەناو دەبات بە غەدرو خیانەت لە کاتی میوانداری کردنیاندا، هەموو مووی لەشم هەستا لە توڕەییداو بەبێ دەنگی چاوەڕوانم دەکرد لە قسەکانیان ببنەوەو کاك

مەسعودو کاك علی عبدالله لە تورکیادا قسەیان بۆ نەدەکرا، دوای ئەوەی هەموویان لە قسەکانیان بوونەوە، لە کاتی قسەکانی ئەواندا لە مێشکی خۆمدا بیرم لەوە دەکردەوە چۆن ئەو رووداوە پینەکەم، رووم کردە هەموویان‌و وتم: ئەوەی باستان لێوە کرد راستە رووی داوە، بەڵام من چەند بەڵگەیەکم هەیە ئیسپاتی دەکات ئەو رووداوە بە فەرمانی مام جەلالی سەرکردایەتی یەکێتی نەبووە:

١- کە ئێوەم بەجێ هێشت‌و چوومەوە بۆ ناو یەکێتی سەعات (٨)ی شەو چوومە ژوورەکەی د. فوئاد مەعصوم لەبەرگەڵو د. فوئادو کاك کۆسرەت نانیان دەخوارد خەریك بوو دەستیان دەکشاندەوە، کە چاویان بە من کەوت بە پێشمەرگەیەکیان وت برۆ خواردنی تری بۆ بهێنە با نان بخوات. پێم وتن کات‌و شوێنمان دیاری کردووە بۆ ئەوەی نوێنەری هەردوولا لە پلەی مەکتەبی سیاسیدا بەیەکەوە دابنیشن بۆ گۆڕینەوەی بیروڕای خۆیان‌و دوای ئەوە مام جەلال‌و مەسعود بارزانی چاویان بەیەك دەکەوێت بۆ دەرکردنی بڕیاری کۆتایی، زۆر خۆشحاڵ بوون بەو هەواڵە کە کاتی نوستن هات ویستم بچمە ژوورێکی تر بنووم چونکە ژووری تایبەتی د. فوئاد مەعصوم بوو، و تەنها دوو قەرەوێڵەی لێ بوو بۆ حەوانەوەیان، بەڵام کاك کۆسرەت هەستایە سەرپێ‌و دەستی برد بۆ قەرەوێڵەکەی خۆی‌و فەرمووی: ئەم جێگایە شوێنی تۆیە من بۆم نییە لێرە بنووم، چونکە ئەوەی تۆ ئەنجامت داوە کەس نەیتوانیوە تا ئێستا ئەنجامی بدات.

٢- من ئێستا لێرە دانیشتووم‌و دەتوانن خۆتان دڵنیا بکەن لەوەی کە کاك د. فوئاد مەعصوم و کاك فەرەیدون عبدالقادر بەناوی جەولەوە بەرەو قەڵاتوکان بەرێ کەوتوون، بەڵام دەیانەوێت لە رێگایەکی دوورەوە بچن بۆ ئەوەی کەس پێیان نەزانێ بۆ ئەو دانیشتنە دەچن‌و دانیشتنەکە سەرکەوتوو بێت.

٣- بەڵگەی سێیەمم کاك نەوشیروان فەرموی چەند پارەت پێویستە بۆ

ڕێکخستن‌و بەڕێوەبردنی دانیشتنەکە بڕۆ بەزیادەوە وەری بگرە، من ئێستا (٣٠٠٠) سێ هەزار دینارم پێیە بۆ مەسرەفی ئەو (٣٠٠) سێ سەد پێشمەرگەیەیە کە لەوێ ئامادە دەبن.

٤- بەڵگەی چوارەمیشم کە لە هەمووی گرنگترە وەکو خۆتان ئاگادارن ئەم چوار دەوڵەتە ئیقلیمیەیە، هەر چواریان ئەم ڕێکەوتنەیان پێ ناخۆشە، ئایا لەهەموو کوردستاندا بەهەر چواریان خاوەنی مەفرەزەیەك نین کە بەهۆیەوە ئەم ڕێکەوتنە تێك بدەن، بۆیە من دەڵێم هیچ شتێکی وا ڕووی نەداوەو ئەمە نابێت بەهۆکارێك کە دوا ڕۆژی میللەتی کورد بخەنە مەترسیەوە بە هەڵوەشاندنەوەی ڕێکەوتنەکە، ماوەیەکی دوورو درێژە من میوانم لەلای ئێوە لەبەر ئەوە سبەینێ هەر هەمووتان میوانن لەلای من‌و خواردنەکانتان بە دەستی خۆم بۆ دروست دەکەم، و بزانن من چاکتر خواردن دروست دەکەم یان عبدالرحمن کە چێشت لێنەری بارزانی‌و بووە ئێستا خواردن بۆ ئێوە دروست دەکات؟ بۆ سبەی نیوەڕۆ خواردنەکەم بەدەستی خۆم دروست کرد کە پێك هاتبوو لە (دوو قەلەمون‌و حەیوانێك‌و پێنج مریشك) کاتێك دەستمان کرد بەنان خواردن وەفدێکی حزبی شیوعیش ئامادەی نان خواردنەکە بوون لەگەڵماندا بەبێ ئەوەی هۆکاری میوانداریەکە بزانن، یەکێکیان برای بەڕێزو دڵسۆزو کورد پەروەر کاك (محمود حاجی فەقێ خدر) بوو کە خەڵکی قەلادزێیە دۆستێکی باوەڕ پێکراوو نزیکی منە.

بۆ ڕۆژی دوایی کاك مەسعود فەرمووی نەمزانیوە خواردنی وا خۆش دروست دەکەیت‌و منیشتان بەشدار نەکرد، منیش وتم خوا بکات تۆ بەنانی من ڕازی بیت هەموو ڕۆژێك بەدەستی خۆم خواردنت بۆ دروست دەکەم، لەماوەی ئەو سێ ڕۆژەدا کە من لەوێ بووم هەموو هەستۆ بیرو هۆشێکم لەوەدا بەکار دەهێنا ئەم ڕێکەوتنە هەڵنەوەشێتەوە، چی لە توانامدا بوو لە دبلۆماسیەت بەکارم هێنا، ئەوەبوو هەموویانم گەیاندە باوەڕ کە مام جەلال ئاگاداری ئەو ڕووداوە نەبووەو لەگەڵ کاك مەسعود دا گەیشتینە ئەو

چارەسەری مام جەلال تەنها بە بروسکەیەك مەکتەبی سیاسی پارتی ئاگادار بکاتەوە لەوەی کە ئاگاداری ئەو شەڕە نەبووە بۆ ئەوەی مەکتەبی سیاسی پارتی بتوانێت ئەو شەڕە پینە بکات، لەناو ئەندامانو لایەنگرانی خۆیاند.

بە هەلم زانی کە پارەم زۆر پێیە پێش ئەوەی بگەڕێمەوە بۆ لای مام جەلال سەردانی ئەو ١٣ بریندارەی یەکێتیم کرد کە لە نەخۆشخانەکانی ئێران بوونو هەر یەکە بڕێك پارەم بۆ خستنە ژێر سەرینەکانیانەوە لە (١٥٠) دینارەوە تا (٥٠٠) دینار بە پێی زامداری و باری ئابووری پێشمەرگە بریندارەکان ئەو پارەیە زۆر بێ منەت بوو چونکە پارەی یەکێتی بوو، کە ئەم کارەم گێڕایەوە بۆ ئەندامانی سەرکردایەتی یەکێتی بەتایبەتی کاك نەوشیروانو د. فوئاد مەعصوم زۆریان پێ باش بوو دەستخۆشیان لێ کردم.

هەوڵم دا مام جەلال ببینم، بەلام چاوم پێ نەکەوت، چوومە لای کاك نەوشیروان، ئەوەی کردبووم لەگەڵ پارتی دا هەموویم بۆ گێڕایەوە، ئینجا ئاگادارم کرد ئەوە بۆ چەند رۆژێك دەچێت چاوەڕوانم مام جەلال ببینم بەلام وەلامی نەداومەتەوە، خۆت باش ئاگاداریت هەرچی لە توانامدایە بەکارم هێناوە، ئەو کارەتان بۆ بەمن ئەنجام دا کە بەتەمای رێکەوتن نەبوون. من بلاو کراوەیەکتان لەسەر بلاو دەکەمەوە؛ دوای ئەوەی من زۆر هەوڵم دا لەگەڵ کاك نەوشیرواندا هەر دەبێ مام جەلال ببینم، هەواڵی لێ گێڕامەوە کە بۆ رۆژی دوایی لەکاتی دیاری کراودا بچۆ چاوت پێی بکەوێت.

ئەو رۆژەی چووم بۆ خزمەت مام جەلال رۆژێکی زۆر سارد بوو، هاتوچۆ کردن زۆر کەم بوو لەبەر سەرماو بۆردومانی رژێم، چونکە لەهەمو (١٠) دەقیقەیەکدا دوو تۆپی دەنا بە رێگاو دەوروبەری بارەگاکەی (مام جەلال)ەوە، لە کاتی دیاریکراودا گەیشتمە خزمەتی، هەموو ئەو هەوڵانەی کە دابووم لەگەڵ پارتیدا بۆ ئەوەی پەشیمان نەبنەوە لە رێکەوتنەکە بۆ مام جەلالم گێڕایەوە، هەردووکمان زۆر بە گرژی لەگەڵ یەکتردا دەدواین، مام جەلال وتی: لەیەکەم رۆژەوە کە لەگەڵ سەرکردایەتی یەکێتی دادەنیشتین باس لەوە

دەكرا كە رێك بكەوین لەگەڵ پارتی دا، تاكە كەس (محضر)ەكەی ئیمزا نەكرد من بووم، كاك رەفیق خۆ جاریٚ ئێمـە رێكەوتن نامەكـەمان ئێمـزا نـەكردووە ئەو جۆرە شتانە ئاسایی‌یە.

زۆر قسەم پێ بـوو بـۆ وەڵام دانـەوەی بـەڵام لەبـەر ئـەوەی هیـچ توانایـەكم نەبوو بەناچاری یەكسەر گەڕامەوە بۆ سەرگەڵو بـەنیازی ئـەوەی لـەو رێگایـە تۆپێكم بەركەوێت‌و نـەجاتم بێت لەدەست ئـەو دوو سـەركردەیە، ئـەو كاتـە دەیانووت شەهیدی رێگای رێكەوتنەو هەردوولا دەیـان وت شـەهیدی ئێمەیـە، مام رۆستەم زۆر بەلایەوە سـەیر بـوو كە لـەو رۆژە ساردەدا بـەناو ئـەو تـۆپ بارانەدا دەگەڕێمەوەو لەویٚ نامێنمەوەو بەرەو مردن دەچم بەقاچی خۆم.

بەڵام سوپاس بۆ یەزدان كە ماوم بۆ ئەوەی ئەم راستی‌یە لە سالّی (٢٠٠٠)دا بلاو بكەمەوە، ئەوەی من ئاگادار بووم كـاك فـەرەیدون عبدالقـادرو د. فوئـاد مەعصوم بەرەو (قەلاتوكان) بەڕیٚ كەوتبوون‌و رەنگە ئەوانیش ئاگاداری ئەوە نەبووبن مەفرەزەیەكی پارتی بەغەدر لەناو براوە.

## كورتە باسێك لەسەر ئەو یانزە مانگەی كە هاتوچۆم دەكرد لەنێوان یـەكێتی‌و پارتی‌دا :

كـاتێك لـەلای یەكێتی‌یـەوە دەهـاتم بـۆ لای پـارتی‌و بـە پێچەوانـەوە، كـە دەگەیشـتمە بارەگاكانیـان بـەناوی پشـوودانەوە چـەند سـەعاتێك دەرگـام لەسـەرخۆم دادەخسـت، بەتەنـها راپۆرتێكـم ئامـادە دەكـرد لەسـەر ئـەو رووداوانەی رووی داوەو هاوپێچ لەگەڵ نامەكەدا كە دەیاندامیٚ تەسلیم بە سەركردەی هەردوولام دەكرد. لەبەر ئەوەی نـەوەك لـە رێگا راپۆرتەكـەم پیٚ بگیرێت‌و توشی تەم‌و چەڵەمە ببم لەمێشكمدا راپۆرتەكەم هەڵدەگرت هەتا دەگەیشتمە بارەگاكـانی هـەردوولاو هـەر كـاتێك ویسـتبێتم چـاوم بـە كـاك مەسعود یان مام جەلال بكەوێت، دەرگایان لەسەر پشت بووە بۆ من‌و هەرگیز

سەعاتێك رایان نەگرتووم بۆ چاوپێکەوتن‌و رێزێکی زۆر تایبەتیم لیٚ دەگیر لەلایەم سەرکردایەتی‌و ئەندامانی هەردوولا، هەروەها ئەو شارانەی کە بەناویاندا هاتوچۆم دەکرد بەنهێنی یان بە ئاشکرا بەهەموو شێوەیەك هاوکارییان دەکردم‌و خزمەتیان دەکردم، کادرانی حزبی دیموکراتی کوردستان لەهەر شوێنێکدا منیان چاو پیٚ بکەوتایە دەهاتن بە پیرمەوەو خزمەتیان دەکردم‌و لەماوەی ئەو یانزە مانگەدا توشی هیچ گرفتێك نەهاتم‌و زۆر جار رووی داوە کە ئەو شوێنەی پیایدا تێپەڕدەبووم بۆردومانی تۆپی لەسەر بووە بەڵام سوپاس بۆ خوا هیچ زیانێکم توش نەهاتووە.

بارەگای مەکتەبی سیاسی پارتی دیموکراتی کوردستان لە قوتابخانەیەکی گوندی (راژان[20]) بوو کە خۆشیان بە بلۆك نزیکەی ۳۰ ژووری تریان تیادا دروست کردبوو بۆ رێکخراوی هەموو ناوچەکانی کوردستان‌و لەم کۆشکەدا

---

[20] گوندی راژان لەناوچەی تەرگەوەرو مەرگەوەر لەسەر سنووری کوردستانی ئێران دوور لە کوردستان باکوور بە (۳) کم، ئابووری ئەم دێیە لەسەر بەخێو کردنی ئاژەڵ‌و کشتوکاڵ بەرێوە دەچوو، لە ساڵی ۱۹۸۵دا خاوەنی زیاتر لە ۲٦٤۰۰ سەرمەڕ و (۱۲۰۰) مانگا بوون، خەڵکی ئەم گوندە دەوڵەمەندترین‌و کاسب ترین خەڵکی ئەو ناوچەیە بوون لەهەموو روویەکەوە.

ساردترین ئاو هەوای هەیە لە کوردستاندا، زستانەکەی زیاتر لە (٦) مانگەو زۆر ساڵ بە بەفر پەڵە دەدات لەم ناوچەیەدا، یەکێك لەو کەسایەتییانەی کە لەدایك بووی ئەم گوندەیەو هەموو کوردستان دەیناسن بەڕێز سید موسایە کە نەوەی شێخ عبدالله نەهرییە) و خەزووری د. عزت شەمزینییە، ئەم بنەماڵەیە یەکێکن لەو بنەماڵانەی کە گەورەترین فیدارکاریان پێشکەش بە کوردو کوردستان کردووە، سەرانسەری مێژوویان بەراستی شانازیان پێوە دەکرێت چونکە چاویان لە ماڵی میللەت (بیت المال) نەبووە.

جارێکیان لە دانیشتنێکدا لە کاك مەسعود بارزانیم پرسی هۆی چییە گوندی راژانت هەڵبژاردووە بۆ ئەوەی بارەگاکەتی لیٚ دانێیت، کە ساردترین‌و ناخۆشترین گوندە لە کوردستاندا؟ فەرمووی چەند باسی ساردی‌و زریانی ئێرە بکەیت هەر کەمە، بەڵام ئەوەندە نزیکم لە کوردستان باکورو باشوو هەر کاتێك پێویست بکات بە (۲-۳) سەعات دەگەمە کوردستانی باکوورو بەهەمان کات دەگەمە کوردستانی باشووریش.

کاك (علی عبدالله ژوورێکی تایبەتی خۆی هەبوو تیایدا دەحەوانەوە، لەو خانووەدا کە ٥٠٠ مەتر دوور بوو لە کۆشکی مەکتەبی سیاسییەوە کاك فازل میرانیو د. رۆژو چەند کەسانێکی تر لەویّ دەخەوتن، بەڵام کاك وشیار زێباری هەر لە یەکێك لەو ٣٠ ژوورانەدا دەخەون کە دروستیان کردبووو هەروەها منیش یەکێك بووم لەو کەسانەی کە بە تەنها ژورێکم بۆ تەرخان کرابوو لەناو مەکتەبی سیاسی، بەڵام گەرماویان نەبوو کاتێك کە بیستیان مام جەلال نیازی هەیە بێت بۆ ئەوی بڕیاریان دا حەمامێك بۆ بیناکە دروست بکەن سێ ژوور کرابوو بەیەك بۆ چێشتخانەکەو کەس بۆی نەبوو بچێتە ژووریّ، بەرامبەر بینای مەکتەبی سیاسی بینایەکی تر هەبوو شوێنی (لاسلکی) بوو کە راستەوخۆ پەیوەندی بەهەموو لقەکانی حزبەوە هەبوو. دوو تەنوریان هەبوو هەموو بەیانیەك هەر نەفەرەی دوو کولێرەیان دەدایە لەگەڵ ماستو پەنیردا، بەڵام چا دەبوایە خۆت لێت بنایەو خواردنی نیومڕۆیان دوو جۆر بوو، جۆرێکیان تایبەت بوو بە ئەندامانی مەکتەبی سیاسیو جۆرەکەی تریش بۆ گشتی بوو، هەفتەی دوو جار گۆشت هەبوو هەموو رۆژێکیش برنجیان هەبوو، زۆر بەرێكو پێکی دابەشیان دەکرد بە سەر ئەندامەکانیانداو من یەکێك بووم لەو کەسانەی کە لە خواردنە تایبەتییەکەی ئەندامانی مەکتەبی سیاسییان بۆ دەهێنام، سێ کەس خواردنی دروست دەکرد کە لەلایەن پارتییەوە جێی باوەڕ بوون، یەکێکیان لەوانە ناوی (عبدالرحمن) بوو لە ئەمریکاوە هێنابوویانەوە لەبەر ئەوەی چێشت لێنەری خودی مەلا مصطفی بووە. سەیارەکانیان هەمووی بریتی بوون لە چەند جێبێکی ئیسپانیو چەنك مێك زەمینییەك، کاك مەسعود جێبێکی تایبەتی هەبوو، بەهەمان شێوە کاك علی عبدالله، بەڵام کاك فازلو د. رۆژ بەهەردووکیان جێبێکیان هەبوو، کاك شەوکەت شێخ یەزدین جێبێکی هەبوو، (مەسرورو مەقصود) کە کوڕانی کاك مەسعود بوون بەهەردووکیان رینۆ پێنجێکی نارنجیان هەبوو، لە رێکخستنو بەڕێوەبردنی کاروباری

ناوخۆی پارتیدا واته (ئیداره) هیچ گروپێکی سیاسی لەو رۆژەدا نەیان دەتوانی موناقەسەی ئەمان بکەن لەرێك پێکیانداو ئازایەتیەکەشی دەگەڕایەوە بۆ خودی کاك علی عبدالله، بۆنموونە بە شێوەیەك ئەم پیاوە زاڵ بوو بەسەر کاروباری ئابووری ناوخۆی خۆیاندا ئەگەر بێتو نیو تەنەکە نەوتت پێویست بوایە بەبێ نوسراوی کاك علی عبدالله نەیان دەدایی (حیزب فەقیر میللەت دەوڵەمەند).

لەماوەی ئەو یانزە مانگەدا چەند جارێك چوومە سەردانی مەزاری خوالێخۆشبوو باوکی گەلی کورد مەلا مصطفی بارزانی کە لە ژێر دەوارێکدا بوو لە گوندی (هەلەج)و دوا جاریان وا رێکەوت جەژنی قوربان بوو، زستان بوو بەفرێکی زۆر دەباری کە سەرنجم دا خەڵکێکی زۆر لەقەبرستانەکە کۆ بووبوونەوە بەبێ ئەوەی تەماشای ئەم لاو ئەولای خۆم بکەمو کەس ئاگادار بکاتەوە، منو بازیانی کوڕم یەکسەر چوینە ژێر ئەو دەوارەی کە مەزاری خوالێخۆشبوو بارزانی لێ بوو، سەیرم کرد کاك مەسعود لەبەردەمی مەزارەکەدا بە چۆکدا هاتبوو چاوەکانی سوور بووبوونەوە، یەکسەر رابردووی ئەو پیاوە مەزنەی کە عێراق و ئێران و تورکیای هێنابووە لەرزین، دەهاتەوە بەرچاو کە دەوت کورد یەعنی بارزانی و بارزانی یەعنی کورد دەهاتەوە بەرچاو، لەتاوا خۆمم بۆ نەگیراو دەستم کرد بە گریان و دوای پێنج دەقیقە لە هاتنی من کاك مەسعود بارزانی چووە دەرەوەو کاك سداد بارزانی برا بچووکی کاك مەسعود بارزانی‌یە هاتە ژوورەوە ئینجا دوای (٥) دەقیقە لە هاتنی ئەم بەڕێزە من مەزارەکەم بەجێ هێشت و چوومە دەرەوە، کە سەیرم کرد کاك مەسعود چاوەڕوانی دەکردم، خوا حافیزی لێ کردم و بەرەو گۆڕستانی شەهیدانی زێوێ بەڕێ کەوت، شەوێ کاك علی عبدالله فەرمووی عادەتی ئەمان وایە مەسعود بارزانی دەبێ یەکەم کەس بچێتە سەر مەزارەکە دوا بەدوای ئەم براکانی تری بە پێی تەمەنیان ئینجا منو مەکتەبی سیاسی و دوای ئەمان لجنەی مەرکەزی و لێپرسراوان و دوای ئەمان بە گشتی

خەڵك دەچێتە ئەوێ، بەڵام بۆیە کەس ڕێگای لە تۆ نەگرت کە لەگەڵ کاك مەسعوددا بچیت چونکە تۆ نوێنەری (ی.ن.ك)ی تووبە میوان دەبژێردرێیتو ئافرەتانیش لەدوای نوێژی نیوەڕۆوە دێنە ئەوێ بەهەمان شێوە یەکەم کەس دایکی کاك مەسعود دێتە سەر مەزارەکە بە تەنها دوا بە دوای ئەم بە پلە دێتە خوارەوە.

پەیوەندی پارتی دیموکراتی کوردستان بە کۆماری ئیسلامی ئێران

١- پارتی دەبوایە ڕۆژانە کۆماری ئیسلامی بەراپۆرت ئاگادار بکاتەوە لەهەموو ڕووداوێك کە لەناو عێراقدا ڕووی دەدا.

٢- کۆماری ئیسلامی مانگانە وەکو سوپای ئێرانی خواردنو نەوتو پارەی دەدا بە پارتی دیموکراتی کوردستانو ئەو کاتە چەکی بەسەریاندا دابەش دەکرد کە دەیبردن لەگەڵ سوپاکەدا بۆ جەنگ، جاری وا هەبووە چەند مانگێك موچەکانیان دوا دەکەوتو کە دەشی دانی ئێرانییەکان خۆیان پارەکەیان دابەش دەکردو دەبوایە ئەو کەسەی پارە وەردەگرێت ئیمزا بکات ئینجا پارەکە وەربگرێتو ئەو پارەیەی کە بۆیان دەهێنان کۆکراوەی بانقەکانی ئێران بوو لە پارەی (١٠) تومەنی دڕاو.

٣- کێشەی هەر گەورەی پارتی ئازادی هاتووچۆکردن بوو لەناو ئێراندا چونکە من خۆم بە چاوی خۆم بینیم لەدووری (٥) کم لە بارەگای (م.س)یەوە ئەندامانی مەکتەبی سیاسییان رادەگرت داوای کارتی شوناسنامەیان لێ دەکردن، ڕۆژێکیان بەڕێز (شوکت نێرۆیی) بۆی گێڕامەوە کە بەبەردەوامی ڕۆژانە (٥٠٠) ئەندامی پارتی لە زیندانەکانی کۆماری ئیسلامیدا ڕۆژ دەبەنە سەرو زۆربەیان لەسەر ئەوە دەگیرێن کە لە شارێکەوە چوونەتە شارێکی تر بەبێ ئاگادار کردنەوەی (قەرارگا) یان بەرواری (عدم تعرض)ەکەیان ڕۆژێك یان دوو ڕۆژی بەسەردا تێپەڕیوە، بۆیان گێڕامەوە کە جارێکیان کاك علی عبدالله لە پشووی خۆیدا دەچێتە ماڵەکەی خۆی لە

کەرەج، دوو پاسەوانی خودی خۆی لەبەر دەرگاکەیدا پاسەوانییان دەکرد چەك دەکرێن لەلایەن کۆماری ئیسلامی ئێران لەسەر ئەوەی (عدم تعرض)ەکەیان دوو رۆژی بەسەردا چووبوو.

لەو دانیشتنانەدا کە لەگەڵ حاجی مصطفوی دا دادەنیشتین لەرووی بارودۆخی کوردو کوردستانەوە بۆچوونی من بۆ سیاسەتەکانی دەرەوە باشتر بوو، و هەستم دەکرد لەناخی خۆیدا بەو توانایەی من پێی خۆشحاڵ نەبوو. وەکو لە پێشتردا باسم کردووە، رۆژانە خۆی دەهات بە شوێنمدا منی دەبردە لای خۆیان، رۆژێکیان زۆر دواکەوت لەو کاتەی کە دامان نابوو، لە جیاتی سەعات (٩) بێت بە دوامدا سەعات (١١) تەلەفونی بۆ کردمو وتی ببورە سەعات (١) دێم بە شوێنتاو سەعات (٢) تەلەفونی بۆ کردمەوە وتی سەعات (٤) دێمو سەعات (٥) تەلەفونی بۆ کردمەوە وتی ببورە لەبەر ئەوەی زۆر سەرقاڵم سبەینێ سەعات (٩) دێم بە شوێنتا، بەیانییەکەی لە لێپرسراوی بارەگاکەی پارتیم پرسی کە ناوی نادر خۆشناو بوو زەحمەت نەبێت سەعات چەندە وتی (٩,٠٥) نۆو پێنج دەقیقەیە، ئیتر منیش رۆیشتمو ئەوێم بەجێ هێشت هەتا کاتژمێر (١١)ی شەو نەگەڕامەوە ئەوێ، کە هاتمەوە کاك (نادر خۆشناو) پێی وتم: ماڵ خراو ئەوە تۆ لەکوێی ئێمەو کۆماری ئیسلامی لە بەیانییەوە شوێن نەماوە بە دوات دا نەگەڕێین، ئەی تۆ مەوعدت نەبوو لەگەڵ حاجی مصطفویدا؟ منیش لەوەڵامدا وتم: کاك نادر ئەی من بەیانی پرسیارم لێ نەکردیت تۆ وتت کات ژمێر (٩,٠٥) دەقیقەیە، وتی: راستە، لێت پرسیم، ئینجا وتم: وام دەزانی وەکو دوێنێ ئیشی هەیە بۆیە منیش چوومە دەرەوە، ئیتر لەدوای ئەو رۆژەوە حاجی مصطفوی تەنها یەك دەقیقەش دوا نەدەکەوت لەوکاتەی کە دیاریمان دەکرد.

لە ئەنجامی ئەو هەموو دانیشتنانەدا لەگەڵ کۆماری ئیسلامیدا سازم دەدا، بۆم دەرکەوت کە لە جانتای دبلۆماسی ئەواندا مافی کوردی تێدا نییە، بۆ نموونە جارێکیان منو مامۆستا علی عبداللەو مامۆستا کریم احمد سکرتێری

حزبی شیوعی، هەرسێکمان دانیشتبووین لە بارەگای مەکتەبی سیاسی پارتی دیموکراتی کوردستانداو بەراوردمان دەکرد لەنێوان کۆماری ئیسلامیو رژێمی بەغدا بەرامبەر بەکورد، بەمنیان وت: تۆ رژێمی بەغدامان بۆ هەڵسەنگێنە چونکە تۆ شارەزاتریت لێیان، منیش وتم: نەخێر من کۆماری ئیسلامیتان بۆ هەڵدەسەنگێنم، وتیان کوا تۆ بەو رادەیە شارەزاییت هەیە لەسەر کۆماری ئیسلامی، وتم لەماوەی دوو مانگدا (٧) جار دانیشتنم لەگەڵدا کردوونو ئەو شارەزاییەی لەسەر کۆماری ئیسلامی هەمە ئێستا، ئەو شارەزاییەم نییە لەسەر بەغداو بۆچوونی (صدام) بەرامبەر بە کورد روونو ئاشکرایەو لێکۆڵینەوەی ناوێت، و بەدەستەواژەیەك کۆتایی پێ دەهێنم (صدام دەڵێ: یەك بن ئەگینا بڕیارم داوە کورد لە عێراقدا نەهێڵمو بەوەش لێتان خۆش نابم کە نەتەوەی خۆتان بگۆڕن بە (عەرەب) هەر رناتان هێڵم لە عێراقدا، پیاو بنو یەك بگرنو بەرامبەرم بوەستن هەتا لەناوم نەبردوون).

بەڵام ئێران کە قسەیان لەگەڵدا دەکەیت دەڵێن ئێمە هەموومان ئیسلامینو ئیلامیش سنووری نییە، بەراستی باشیان پێ وتوون (بەشەکر دوژمنی خۆیان دەخنکێنن). گفتی هەموو شتێکت پێ دەدەن بەڵام هیچیشت بۆ ناکەنو کە دەچیتە لایان بۆ پەنا هەندەیی یەکەم پرسیار کە لێت دەکەن دەڵێن: (کوردیت یان اسلام).

بۆ بەڕێز کاك کەریم احمدم گێڕایەوە لەهەمان دانیشتندا جارێکیان لەشام پەیوەندیم کرد بە باڵیۆزخانەی ئێرانەوە بۆ ئەوەی چاوم بە (موحتەشەمی) بکەوێت کە باڵیۆزی ئێران بوو لە شام دەمویست فیزەم بداتێ بچم بۆتاران، کە چاوم پێی کەوت وتی بەسەرچاو بەڵام بۆی نەکردم، بەتەلەفون کاتێکمان دیاری دەکر بۆ چاوپێکەوتن لە کاتی دیاریکراودا لەبەردەرگای ژوورەکەی خۆیدا چاوەڕوانی دەکردمو ئەو خەڵکەی لەوێ دانیشتبوون ئیشیان هەبوو کە چاویان بەم پێشوازییە گەرمیەی موحتەشەمی دەکەوت بۆ من وایان دەزانی سیخوڕی ئێرانیمو پێیان دەوتم بەڵکو ئەو ئیشەمان بۆ تەواو بکەیت، بەڵام

لەگەڵ ئەو هەموو موجامەلەیەدا هیچ شتێکی بۆ نەدەکردم، و ئەم کابرە گەورەترین دوژمنی کوردبوو لە پاش ماوەیەك کرا بە وەزیری ناوخۆ ـ ئێران.

دوای ئەوەی کە بەهۆی (خامەنەئی)یەوە ڕێکەوتن نامەکەی نێوان یەکێتی پارتی مۆرکرا، چاوم کەوت بە د. فوئاد مەعصومو مامۆستا عەلی عبد... هەریەکەیان بەجیا، پێیان وتم: راستە بە فشاری (علی خامەنەئی) ئێمە ڕێ کەوتین، بەڵام ئەوە بەرهەمی ئەو هەوڵانە بوو کەلەگەڵ کۆماری ئیسلامی دابوت بۆ یەك خستنەوەی ئەم دوو حزبە، چونکە وەکو بیستومانەتەوە لە کۆبوونەوانەدا کە لەگەڵ مصطفـویدا ئەنجامت دەدا، کۆماری ئیسلامیت گەیاندبووە ئەو قەناعەتەی کە ڕێکەوتنی یەکێتیو پارتی سودی هەیە بۆ ئەوان نەك زیان.

هەموو ئەو هەوڵانەی کە دابووم لەنێوان یەکێتیو پارتیداو ئەو کۆبوونەوانەی کە لەگەڵ کۆماری ئیسلامیدا ئەنجامم دەدا هەموویم لە مێشکی خۆمدا هەلگرتو چاوەڕانی باروودۆخێکم دەکرد کە بتوانم بڵاویان بکەمەوە،ئەوا خوا درێژەی بە تەمەنم داوەو لە ساڵی ٢٠٠٠دا راستیەکان بە ئەمانەتەوە بڵاو دەکەمەوە.

لەو دوو هەوڵە دڵسۆزانەیەدا کە دابووم بۆ یەك خستنەوەی ئەو دوو گرووپە بە جەنگ هاتووەی گەلی کوردی یەك دەخستەوە لە ساڵی ١٩٦٣و لە ساڵی ١٩٨٥دا بۆم دەرکەوت کە شێخ ئەحمەدی بارزانی هەزار رەحمەت لە گۆڕی راستی فەرموو (ئیشی کوردان پوچە)، هاتمەوە سەر گەڵو لەوێ نیشتەجێ بووم، پاش ماوەیەك وەکو کەسێکی سەرگەڵویی مامەڵەم لەگەڵدا دەکرا لەلایەن دانیشتوانی ئەم دێیەوە، بە جۆرێك ڕێزیان لێ دەگرتم، کە بەروبوومیان دەردەچوو ئەوەندەیان بەدیاری بۆ دەهێنام دەتووت خۆم خاوەن رەزو باخم، لەم باروودۆخەی مندا بەشێوەیەکی گشتی پەیوەندیم لەگەڵ ئەندامانی یەکێتی باش بوو، بەتایبەتی لەگەڵ د. فوئاد مەعصومو کاك

نەوشیروان‌و کاك دلێرو کاك مصطفی چاورەش‌و کاك کۆسرەت کە دەهات بۆ سەرگەڵو بەبەردەوامی سەردانی دەکردم‌و دەرگای ماڵەکەم ئاواڵە بوو هەموو کاتێك بۆ هاولاتی‌و پێشمەرگەو سەرکردەکان، پاش ماوەیەك کاك نەشیروان پێی وتم: دەتکەم بە ئەندام مەڵبەند، بە ئەدەبێکەوە وەلامم دایەوەو وتم: من بەجۆرێکی تر خزمەتی ئەم ڕێبازە دەکەم، جارێکیان د. فوئاد مەعصوم چەند برادەرێکی نانی نیوەڕۆیان لای من دەخوارد (لەکاتی نان خواردندا بروسکەیەکی مام جەلال هات کە دەبێ د. فوئاد وەکو نوێنەری یەکێتی بچێت بۆ ئێران دوا بەدوای ئەوە یەکێتی‌و کۆماری ئیسلامی لەیەك نزیك بوونەوە، کۆمەڵێك پاسداری ئێرانی هاتن لەسەرگەڵو نیشتەجێ بوون‌و پاش ماوەیەك یەکێتی شان بەشانی کۆماری ئیسلامی هێرشێکیان بردە سەر کۆمپیانیای نەوتی کەرکوك‌و هەموو کارەکە پێشمەرگەکانی یەکێتی بە سەرکردایەتی کاك نەوشیروان موستەفا ئەنجام درا، بەلام کۆماری ئیسلامی بەناوی خۆیانەوە بلاویان کردەوە، ئەوەی جێی سەرسوڕمان بوو ئەم هێزە گەورەیە بەهەموو چەك‌و تفاقێکیانەوە چوونە ناو کۆمپانیای کەرکوکەوە بەمەرجێك چواردەورەی کۆمپانیاکە بە سوپا تەندرابوو و لەناو کۆمپانیاکەشدا تیمی هەوالگری بە بەردەوامی هاتوچۆی دەکردو یەك دێی کوردی لەدەوری کۆمپانیاکە نەمابوو هەموو دانیشتوانی دێکانیان گۆڕی بوو بە عەرەب، کاتێك یەکێك لە مەفرەزەکان دەگاتە ناوەڕاستی کۆمپیانیاکەوە کە پێی دەوترێت (ستاپلاین) نزیك پرۆسێسەکەیە کە نەوتەکە دەپاڵێوێت، ئەفسەرێکی سوپای عێراقی بە پلەی نەقیب روو دەکاتە سەرۆك مەفرەزەکەو پێ دەڵێ: (ولك شتسوی هنا) واتە ئەوە چی دەکەی لێرەو چەك بە، چونکە ئەو بە فرسان تێگەیشتبوو، کورد بۆی نەبوو بچێتە ئەو جێگایە، ئەگەر (جاشیش بێت)، ئامر مەفرەزە نیشتمان پەروەرەکە بەهێمنی وەلامی دەداتەوەو دەڵێت: ئاقڵ ئێرە کوردستانەو ئەوەش نەوتی کوردستانە داگیرتان کردووەو دەستتان بەسەر خێرو خێراتەکەی دا گرتووە، ئەمە خاکی ئێمەیەو تۆ بێگانەیت لێرە،

وولاتەکەمت داگیر کردووەو قسەشم پێ دەڵێیت، چاك بزانە مـن جاش نیـم بەڵکو پێشمەرگەی یەکێتی بو هاتووم ئەم خاکە پاك بکەمەوە لە داگیرکـەر ئینجا زەحمەت نەبێ تۆ چەکەکەتمان بەرێ، بە فەرمانی صدام لەسـەر ئـەم کارەی یـەکێتی پـێی هەستابوو، لـە چـوون و گەڕانـەوەیاند هیـچ کەسێك لـە پیاوانی رژێم هەستیان پێ نەکردبوو، کۆبوونەوەی بەهـەموو کارەبەدەسـتانی پارێزگای کەرکوك کردوو لەگەڵ بەڕێوەبـەری ئاسایش و هەوالگری سلێمانی بەڕێوەبەرایـەتی ئاسایش و هـەوالگری گشـتی‌دا، لـە کۆتـایی کۆبوونەوەکـەدا بڕیاری دابـوو بـە لـە سێدارە دانـی هـەندێکیان و گرتنـی هـەندێکیان و دوور خستنەوەی هەندێکی تریان، هەر یەکەو بە پێی پلـەو پایـەی خۆیـی و دوورو نزیکی لە رووداوەکە.

پێی وتبوون ئەو هەموو پارەیـەی کـە سـەرفی دەکـەن بـە نـاوی پاراسـتنی ولاتەوە یەکێك لەناو شۆڕشەوە نەهات هەوالێکتان بـۆ بهێنێت، کەواتـە ئێـوە چـەند کاتـە چـالاکی چیتـان ئـەنجام داوە؟ بێجگـە لـە راپۆرتـی درۆو دەلەسـە. بـەلام لـە جیـاتی ئـەوەی کـە صدام بـەخۆیدا بچێتـەوە بـۆ چارەسـەر کردنـی کێشەی کورد کەچی زیاتر رق و کینەی بۆ دروست بـوو لـە دوای ئـەو رووداوە ووردە وردە دەستی کـرد بـە گوێزانـەوەی هـەموو دێهاتـەکانی چـواردەوری کـەرکوك، هـەزار رەحمـەت لـە بـاوو باپیری ئـەو پێشمەرگانەی ئـەو کارەیـان ئـەنجام داوە، ئەمـە خـۆی بەلگەیـەکی گەورەیـە لەسـەر پـاکی و دڵسـۆزی و فیداکاری ئەو پیاوانە، ئافەرین سەرکردە بۆ رۆژێك سەربازیت نەکردبێت ئەو پیلانە رێك و پێکە دابنێیت و بەسەرکەوتوویی بگەڕێیتەوە، ئەمە یەکێکە لەو نموونانەی کە دەری دەخات هەموو شۆڕشەکانی کورد لە سەرانسـەری مێـژوودا بە جەنگ نەیان دۆڕاندووە، تەنها بە سیاسەت دۆڕاندوویانە، بـە تایبـەتی لـە کاتێکدا سـوور بـوون لەسـەر ئـەوەی واز لـە دووبـەرەکی براکـوژی نـەهێنن لەناوخۆیاندا، ئەمـە یـەکێك بـوو لـەو خەنجـەرە ژەهراویانـەی کـرا بەپشـتی بەرەو پێش چوونی بزووتنەوەی کوردایەتی لە کوردستانی باشوورو برینـدار

کردنی دەورونی هەموو نیشتمان پەروەرێك لە ساحەکەدا.

لە ڕێگای ڕێکخـراوەوە (تنظیـم)ەوە ئاگاداری کاك قادری حـاجی عـەلیان کردبوو قائد فەیلەقێك لە کۆتەڵ رادەوەستێت بە دووربین سـەیری سورداش دەکاتو دەڵێت (اشوف القم بعینی) واتە قم بەچاوی خـۆم دەبینـم، وا هـەواڵ گەیشـتبووە رژێمـی بـەعس کە هـێزێکی گـەورەی سوپای ئـێرانی لەناوچـەی سـەرگەڵو جێ نشین بـوون بـە یارمـەتی یـەکێتی، بـەڵام ئـەو هـێزەی رژێمـی بەغدا باسـی لێوە دەکـرد تەنـها لـە ٧٠ سەرباز زیـاتر هیچی تـر نـەبوون کـە چەند ماتۆڕێکی سووریان پێ بوو هاتوچۆیان پێ دەکرد، بـەڵام بـۆ مەبەسـتی تورەکردنـی رژێمـی بـەغدا لــە یـەکێتی دەهـاتن بـە کۆمـەڵی ماتۆڕەکانیـان رادەگـرتو هاتوچۆیـان دەکـرد بـەناو خـەڵکدا، ئـەوەبوو رژێـم ئـەم کـارەی بـۆ هەرس نەکراو بـە ٩ فڕۆکە بۆردومـانی سـەرگەڵوی کـرد، مـن ئـەو نیوەڕۆیـە میوان بوونم لە ماڵی کاك عبدالرحمن سەرگەڵویی، دوای نـان خـواردن بـەرەو سەرگەڵو هاتمەوە، کە فرۆکەکان دەستیان کرد بـە بۆردومـان بـەناچاری مـنو عبدالرحمـن لـە پـەنا بـەردێکدا خۆمـان شـاردەو تـا بۆردومانەکە تـەواو بـوو، ئینجا کەوتینـەوە ڕێ بـۆ ماڵـەوە، چاوم بـە خـەڵکێکی زۆر کـەوت کـە رایـان دەکرد بە پێچەوانەی ئاراستەی منەوە بـەرەو بەرگـەڵو، لـە کۆمـەڵی یەکـەمم پرسی کوێ بەرکەوتووە؟ وتیان مـاڵی رەفیـق پشـدەری کەسـی نـەماوە، توشـی کۆمەڵی دوەم هاتم لێم پرسین کوێ بۆردومان کـراوە؟ وتیـان بارەگـای رەفیـق پشدەری وێران بووە، خەریك بـوو هـەردوو قـاچم لـە ئیش بکـەوێت، ئەگـەر لەبەر عەیبـە نەبوایـە نـەم دەتوانـی بـڕۆم، کابرایـەك رووبـەرووم هـات نـاوی (عبدول حـاجی محمـود) بـوو وتـی مـژدەم بـەرێ کوڕەکـانتو برازاکـەت هـەر هـەموویان سـەلامەتن، بـەڵام ئـەو خـانووە کە تـۆی تیـا دەژیـت بـە تــەواوەی روخـاوەو تەنـها زیـانی ماڵیـان بـووە، لـەو کاتـەدا دەسـتم هـەڵبڕی بــۆ خــوای گەورەو مـەزنو پـڕ بـەدڵ سوپاسـم کـرد کـە منداڵـەکانمو هـەموو دانیشـتوانی سەرگەڵو سەلامەتن، بەرەو نـاو دێ هـاتم تـا گەیشـتمە سـەرچاوەی کانـییـەك،

لەوێ کاك (حامیدی حاجی غالی)م دی کە ئەو کاتە ئەندامی مەڵبەند بوو. ـ
دووری ١٠ مەتر لەوەوە پاسداری ئێرانی دووماتۆرسایکلیان پێ بـ
راوەستابوون، کاك حامید وتی منالەکانت سەلامەتن، وتم سوپاس بۆ خوا ئەمـ
جارەش نەجاتمان بوو، ئەو پاسدارە پاڵەوانانەی کە بەسەر ئێمەدا خۆیان ـ
دەدەن بۆ لەناو دێکەدا ماونەتەوە ئەگەر ئەوان راست دەکەن ئەوە رژێم نـ
کۆتەڵەو ٢ سەعات لێرەوە دوورە، بە پێ بۆ ناچن بەرامبەر ئەوان بوەستـ
لێیان بدەن، پێم ناڵێیت ئەمانە خێرو بەرەکەتیان چییە بۆ ئێمە؟ کە کاـ
حامید گوێی لەم قسانەی من بوو دیار بوو دڵخۆش بوو، هەر بۆیە پیاوانـ
تراکتۆرێکی هێناو هەموو پاسدارەکانی سواری تراکتۆرەکە کردو لە گوندەکـ
دووری خستنەوە، کە گەیشتمەوە ماڵەوە هەزار جار سوپاس بۆ خوا کـ
بازیان‌و رەوەزی کورم‌و ئارازی برازام سەلامەت بوون، بەڵام دەم‌و چاویـ
رەش هەڵگەرابوو بەباروتی ناپاڵمەکەو لایەکی خانووەکە رووخابوو
فرۆکەکان ئەوەندە بە کت‌و پڕی دایان بە سەرماندا کە لەناودێکەدا تەنـ
(وەهابە کەچەڵ) فریا کەوت بە رەشاشێکی دۆشکەوە تەقە لە تەیارەکا
بکات، بەڵام دۆشکەیەك بەرامبەر (٩) فرۆکە چی پێ دەکرێت، بۆ رۆژی دواییـ
کات ژمێر (٤)ی سەر لەبەیانی من‌و هەموو خەڵکی دێکە چووینە دەرەوەی
دێ بۆ خۆحەشاردان لە فرۆکەکانی رژێم‌و لەدەورەی کات ژمێر (١١) دا گوێـ
لە بڵنگۆی مزگەوتی سەرگەڵو بوو هاواری دەکرد رەفیق پشدەری بگەرێتەوە
بۆ ناو دێ میوانی ژنان‌تان هاتووە، چووم سەیرم کرد دایکی بازیان‌و خوشکمـ
لەگەڵ چەند خزمانێکدا برازاکەی خۆمیان بە بوکی هێنابوو بۆ بازیانی
کورم، کاتێك کە دێکە بەمەیان زانی دەستیان کرد بە پێکەنین‌و توانج گرتن‌و
وتیان وەختی بووك گواستنەوەیە، خانوەکەتان رووخاوەو وێران بووە، منیش
داوام لە بوکێ کرد بگەرێتەوە بۆ سلێمانی، بەڵام وتی بۆ من لە ئامۆزاکەم
زیاترم چارەنووسی هەردووکمان بە یەکەوەیە، دوای مانگێك بازیان‌و بەیان‌و
رەوەزم نارد بۆ لای کاك مەسعود لەسەر داوای خۆی کە گفتی پێ دابووم چی

بکات بۆ مەسروری کوڕی ئەوەش دەکات بۆ بازیان‌و ڕەومز، دوای چەند مانگێك لە ڕۆیشتنی ئەوان بۆ ئێران کاك قادری حاجی عەلی هات بە شوێنمدا بەیەکەوە چووین بۆ لای مام جەلال، دوای نان خواردنی نیوەڕۆ دوو بەدوو دانیشتین بۆم دەرکەوت لە شێوازی قسەکانی‌یەوە دەیەوێت بچم بۆ دەرەوەی وڵات، بەڵام بەشی زۆری کادرانی یەکێتی وا لەم مەسەلەیە حاڵی بوو بوون گوایە من دەچم بۆ (لندن) پەیوەندی بە دەوڵەتەکانی دەرەوە دەکەم، هەندێکیان پێیان دەوتم بەهەر (١٠) پەنجەکەت ئیمزمان بۆ بکە بۆ هاریکاری کردن لەگەڵ (CIA)دا ئەوان وایان دەزانی من سیخوری نێودەوڵەتیم، بەڵام تەنها من‌و مام جەلال دەمانزانی ئەم چوونەم بۆ دەرەوە بۆچی‌یە؟ کادیران هەرچی قسەیەکیان بۆ دەکردم لەو بارەیەوە من هەر سەرم دەلەقاند چونکە هیچ کام لەوانە ڕاستی‌یەکانیان نەدەزانی.

لەسەرەتای ساڵی ١٩٨٧ هەواڵم پێ گەیشت کە کاك ئیدریس بارزانی کۆچی دوایی کردووە، مانگێك تێپەڕی بەسەر پرسەکەدا، ئینجا چوومە گوندی سلیڤانە بۆ بەشداری کردنمان لە پرسەکەدا لەگەڵ بازیان‌و ڕەومزو بەیاندا، بەیانم نارد بۆلای دایکی کاك مەسعود بۆ بەشداری کردن لە پرسەکەداو خۆمان بەهەمان شێوە چووینە پرسەی پیاوان، لەو کاتەدا کاك مەسعود لەناوچەی بادینان بوو تەنها کاك دلشاد بارزانی سەرپەرشتی پرسەکەی دەکرد (٣) ڕۆژ ئێمەیان هێشتەوە لەسەری سێ‌هەم ڕۆژدا ڕوخسەتی ڕۆیشتنمان وەرگرت، چووینە ڕاژان بۆ سەردانی مامۆستای بەڕێز کاك علی عبدالله، لە دانیشتنەکەدا ئاگاداری کردم لەوەی کە سەرداری حەمەی ئەورەحمان ئاغاو محسن دزەیی لە لەندەنەوە هاتوون بۆ پرسەکەی خوالێخۆشبوو کاك ئیدریس بارزانی‌و بیستویانە کە تۆ لەم ناوەیت حەز دەکەن چاویان پێت بکەویت، گەڕامەوە سلیڤانە چەند سەعاتێك لە خزمەتیاندا دانیشتم، لێم پرسین کەی دەگەڕێنەوە؟ وتیان نزیکەی هەفتەیەکی تر، منیش بە پەلە نامەیەکم نوسی بۆ مامۆستا ابراهیم احمدو

دامه دهستی، ئینجا خۆم و منالهکانم گەڕاینهوه بۆ نەغەدەو ئەو مایەی بیستم له سەرچاوەیەکی باوەڕپێکراوەوه که کاك دلشاد بارزانی دادەمەزرێت به ئەندامی مەکتەبی سیاسی له جێگای ئیدریس بارزانی، پرسیارم له کاك دلشاد کرد لەم بارەیەوه وتم: (بیستومه تۆ دەچیته جێگای کاك ئیدریس؟ لەوەلامدا وتی: من دەخوێنم و کۆلیج تەواو دەکەم و من ناتوانم ئەو کاره بگرمه دەست، نێچیر لەسەرتادا هیچ نەبوو وەکو هەموو نەوەکانی تری مەلا مصطفی ئەمیش نەوەی مەلا مصطفی بوو، دوای نەمانی مەلا مصطفی تەنیا دوان لە کوڕەکانی مەلا مصطفی سەرپەشتی بنەماڵی مەلا مصطفی و پارتییان دەکرد، که ئیدریس نەما نێچیری کوڕی یەکەم جار تەعین کرا به لێپرسراوی پاراستن، دوایی تەعین کرا به ئەندامی مەکتەبی سیاسی پارتی.

دوای شەش مانگ پرسیارم کرد له مامۆستا جەرجیس فتح الله له کەرەج هۆی چییه محسن دزەیی شەش مانگه لێره ماوەتەوه له کاتێکدا بە منی وت دوای یەك هەفته دەگەڕێمەوه بۆ لەندەن؟ لەوەلامدا وتی سەروەت و سامانی بارزانی تەنها ئەم ئاگاداره کە برەکەی چەندەو لەچ بانقێك هەلگیراوه، بۆ ئەوەی بزانن که بەشی ئیدریس چەندە دوای (فائزی) ئەو سالانه که چووەته سەری.

هاتمه تاران له میوانخانەی فردەوسی دابەزیم، دوای ئەوه چاوم کەوت به کاك رفعەت که لێپرسراوی یەکێتی بوو له تاران، بۆ ئەوەی پارمەتیم بدات بچم بۆ (لندن) کاربەدەستێکی کۆماری ئیسلامی دیاری کرابوو بۆ چاوپێکەوتن لەگەڵ ئەو پەناهەندانەی که دەیانەوێت له ئێرانەوه بچن بۆ هەندەران، کاك رفعەت شێوازی چاوپێکەوتنەکەی بۆ دیاری کردم لەگەل ئەو دەزگایەدا، که چوومه ئەوێ زۆر بە ساردییەوه مامەڵەیان لەگەڵدا کردم و هاتوچۆیەکی بێ سوودیان پێ کردم، ماوەی شەش رۆژمان بە خۆشی بردە سەر له ماڵی مامۆستا هەژاری شاعیر له کەرەج بەو نیازەی من کوڕەکانم و بوکەکەم هەر هەموومان بەیەکەوه بچین بۆ هەندەران، بەلام که زانیمان ئەم

چاوەڕانییە زۆری پێ دەچێت داوامـان لـە مامۆسـتا هـەژار کـرد ماڵێکمان بـۆ بگرێت، ئەوەبو لە (گەوهەردەشـت) خانویەکی بـۆ گرتـین‌و سێ مـانگ لـەوێ مایەوە، بەهۆی مامۆستا هەژارەوە (د. شیرازی)مان ناسی‌و سەردانمان دەکرد لە ماڵەکەی لە (تجریش).

ڕۆژێکیان د. کمال خۆشناو هات بۆ لامـان، لـە بەیانیـەوە تـا ئێـوارە لـەلامان مایەوە، فەرمووی کـورد داوای حوکمـی زاتـی دەکـات بـەڵام ئـەم ژیانـەی ئێ ەوە تیایدا دەژین سەربەخۆی زاتی‌یە نەوەك حوکمی زاتی.

لـەدوای دوو مـانگ بـە (ابوعلی)یـان ناسـاندم کـە لـە نوسـینگەی سـەرۆك وەزیـران بوو، بەهۆی ئەم پیاوەوە وورده ورده کاربەدەستانی ئێرانم دەناسـی‌و هەتا دەهات زیاتر هاتوچۆیان دەکردم‌و زۆر لێـم نزیـك بوونـەوە، کارگەیشتە ئەوەی کە لە هەفتەیەکدا چـوار دانیشتنیان لەگـەڵم دا ئـەنجام دەداو هـەموو وتووێژەکانیشـمان لەسـەر عـێراق بـوو بــە گشـتی‌و کـورد بــە تایبــەتی، پرسیاری‌یان لەوە دەکرد ئایا چـۆن سـەرۆکی عـێراق دەروخێـت؟ چـۆن نزیـك بینـەوە لە میللەتی کورد؟ کەی ئەو ڕۆژە دێت کە گەلی کورد باوەڕی بـە ئێمـە بێت؟

لەماوەی ئەو چەند مانگەدا چاووم بەبەشێکی زۆری لێپرسـراوانی ئـێرانی کـەوت، هەرچی‌یـەکم لەگـەڵ (مصطفـوی) دا بـاس کردبـوو دەربـارەی کێشـەی کورد، بەهەمان شێوە لەگەڵ ئەمانیشدا دووبارەم کردەوە، بەڵام ئەم جارەیـان دوای گفتوگۆیەکی زۆر گەیشتمە یـەقین بـە تـەواوەتی کە کۆمـاری ئیسـلامی بەئەندازەی تاڵە موویەك نیازی یارمەتیدانی کوردیان نی‌یە، زۆر نەرم‌و نیان بـوون لەگـەڵمداو بــە هـەموو شـێوەیەك دەیانویسـت چـی پێویسـتی‌یەکمان هەبووایـە بۆیـان دابـین بکردینایـەو ڕێزێکـی تایبـەتی‌یان لێ دەگـرتم، منیــش بەهەمان شێوە ڕێزم لێ دەگرتنەوە بەڵام من لە ناخی خۆمدا دەمزانـی ئـەوان بە چ نیازێك ئەو ڕێزە زۆرەم لێ دەگرن، هەموو هەوڵێکی ئـەوان لەگـەڵ منـدا بـۆ ئـەوەبوو کـە بمکـەن بــە (ئەلقەلـەگوێ)ی خۆیـان‌و چۆنیـان بوێـت ئـاوا

هەڵسوڕێم و منیش هەمو هەوڵێکم لەگەڵ ئەواندا بۆ ئەوە بوو کە بزانن چییان پێیە بۆ کورد بە گشتیو لەسەر یەکێتی پارتی بەتایبەتی، ئەم بێنەو بەردەیەی من لەگەڵ کۆماری ئیسلامیدا (٧) مانگی خایاند.

دوای ئەوەی توانیم هەندێك زانیاییان لێ وەرگرم لەسەر یەکێتیو پارتی ئینجا نامەیەکم نوسیی بۆ کاك (مسعود) دەمەوێت چاوم بە خۆت یان بەیەکێکی باوەڕپێکراوی خۆت بکەوێت هەندێك زانیاری زۆر گرنگم پێیە ئەمەوێت جەنابتانی لێ ئاگادار بکەمەوە، بۆ رۆژی دوایی تر مامۆستا (هەژار) پێی راگەیاندنم کە سبەینێ سەعات (٤)ی عەسر مامۆستا (علی عبدالله) لە کەرەج لەماڵی خۆیان چاوەڕێت دەکات، یەکترمان بینی بۆ ماوەی چەند سەعاتێك، لە هەموو ئەو هەڵوێستو پیلانانەی کە کۆماری ئیسلامی نیازی جێ بەجێ کردنی هەیە ئاگادارم کردەوەو وتی: رایان چی بوو بەرامبەر بە مردنی کاك ئیدریس؟ وتم: وتویانە الحمدلله کە رزگارمان بوو لە دەستی، ... ئینجا هەواڵم نارد بۆ مام جەلال کە چاوم پێ بکەوێت، بەڵام پێی وتم: د.فوئاد لە تارانە، منیش تەلەفونم لەگەڵ کرد بەڵام نەمان توانی یەکتر ببینین چونکە ئەو لەسەر گەڕانەوە بوو، دوای کەوتم بۆ بارەگای یەکێتی لە (دۆڵە کۆگێ) ئەوێشی بەجێ هێشتبوو، لەوێ هەرچی زانیارییەکم لەلا بوو کردم بە راپۆرتێك و لەسەر فەرمانی مام جەلال دامە دەست نێردراوێکی مام جەلال.

کە زانیم کۆماری ئیسلامی بەرامبەر کورد هیچی باشی پێ نییەو هەروەها دەیانەوێ رامبکێشنە ناو تۆڕە سیخوڕییەکانی خۆیانەوە، داوام لە خێزانە تازەکەم و کوڕوکان و بوکەکەم کرد بگەڕێینەوە بۆ سەقز بە نیازی راکردن لە دەستی کۆماری ئیسلامیو پێم وتن کە گەیشتنەوە ئەوێ خۆتان حازر بکەن و چاوەڕوانی من بکەن تا دەگەمە لاتان و هەوڵ بدەن خانوویەکتان دەست کەوێت بەرامبەر (ئیتلاعات) بۆ ئەوەی راستەوخۆ لە ژێر چاودێری ئەواندا بن نەوەك لە رێی بەکرێ گیراوەکانیانەوە هەواڵی ئێمەیان پێ بگات، کە

ئەوان گەیشتنە ئەوێو دڵنیا بووم لە جێ بەجێ کردنی ئەو پیلانەی بۆم دانابوون ئینجا خۆشم سەیارەیەکی تایبەتیم گرتو بەرەو سەقز بەڕێ کەوتم، دوای (١٢) سەعات لە گەیشتنم بۆ لای ئەوان، لە سەقز دەستگیرکرام لەلایەن کۆماری ئیسلامییەوەو لە ژورێك دایان نام (حەمام بوو)، ئینجا دوای (٦) سەعات منیان بەچاو بەستراوی لەوێ هێنایە دەرەوەو لێکۆڵینەوەیان لەگەڵ دا کردم وتیان.

* تۆ پەیوەندیت بە نوسینگەی سەرۆك وەزیرانەوە هەیەو دەبوایە پێش ئەوەی تاران بە جێ بهێڵی نوسینگەی سەرۆك وەزیرانت بە تەلەفون ئاگادار بکردایتەوەو بە (ابو علی)یت بوتایە رێگام بدەن بۆ سێ چوار رۆژ بچم بۆ سەقزو ئێستاش تۆمان دەست گیر کردووە بەتاوانی راکردن لەدەست دەسەڵاتی کۆماری ئیسلامی بە (خائن) لەقەڵەم دراوی؟

- بەڵام من هەر لە تاران وەڵامی ئەم لێکۆڵینەوەیەم ئامادە کردبوو چونکە ئەوە یەکەم جار نەبوو کە توشی لێکۆڵینەوە ببم لە ژیانمدا، هەر بۆیە وەڵامم دایەوەو وتم: من عەشق هەڵی گرتووم چونکە من لەم تەمەنەدا ئافرەتێکم دەست کەوتووە کە (١٨) ساڵ لەخۆم منداڵ ترەو دوای (١٢) رۆژ لە گواستنەوە منی بەجێ هێشت بەناچاری هاتەوە بۆ ئێرە چونکە لێرە مامۆستایە، من بەم کارە دنیام لێ هاتەوە یەك هەر بۆیە خۆمم بۆ نەگیراو ناچار بووم بەبێ ئەوەی پەیوەندیتان پێوە بکەم ئۆتۆمبیلێکم گرت بە تایبەتیو هاتم بۆ سەقزو ئەوە ملی منو چەقۆی ئێوە، ئەگەر دەڵێن ئێستا دەگەڕێمەوە بۆ تاران، راست دەفەرموون من هەڵەم کردووەو بەند کردنم مافی خۆتانەو ئێستاش هەرچی مامەڵەیەکم لەگەڵدا دەکەن من پێی رازیم، ئەوانیش هەموو قسەکانی منیان بە تەلەفون گەیاندە تارانو لەوەڵامدا وتیان: دەبێ سبەینێ بە زووترین کات بگەڕێتەوە بۆ تاران، منیش وتم: مادام وایە حەز دەکەم خزمەتێکتان بکەم سبەی شەو هەر هەمووتان لای من میوان دەبنو دوو سبەی بەیانییەکەی دەگەڕێمە تاران، وتیان ئێمە زۆرین، وتم خۆ

٣٠٠٠ کەس نابن، وەڵامیان دایەوە نەخێر (٣٠٠) کەسین، وتم زۆر ئاسایی
ئینجا چاویان کردمەوەو هەتا دەرگاکەی دەرەوە بەرێیان کردمو پێیان وت
سبەی شەو هەموو لەلای تۆ میوانین، وەڵامم دانەوە (چەشم)، کە بەجێ
هێشتن ڕەومزی کوڕم وتی ئەو ناپیاوانە بەندیشیان کردوویتو کەچی تۆ
میوانداریان دەکەیت، وتم کوڕم ئەوە ئیشی تۆ نییەو نایزانیت.

گەیشتمەوە ماڵەوە، ئەو شەوە هەموو پێویستییەکانی خۆمانمان پێچایەوە
کە ڕۆژ بووەوە هاوسەرەکەم زۆر ئاسایی دەوامی قوتابخانەکەی کرد کە لێی
مامۆستا بوو، ئینجا دوای ئەوەی کە هاتەوە ماڵەوە، پێکەوە چووین ١٢ پاکەت
شیرینیمان کڕیو کۆستەرێکمان ڕاسپارد عەسرێکی درەنگ بێت بە دوامان
لە کاتی دیارکراودا هەموو سواری پاسەکە بووینو بەرەو مەهابات
کەوتینەڕێو وا خۆمان نیشاندا کە خێزانەکەمو بووکەکەم تازە بووکن و
دەیانبەیت بۆ مەهاباد بە بوکی، کە دەگەیشتین بە خاڵی پشکنین پێش
ئەوەی پرسیارمان لێ بکەن دەست بەجێ چەند پاکەتێك لەو شیرینییانەمان
دەدانێو دەمان وت: ئەوە شیرینی ئەو بوکانەیە ئەوانیش لەخۆشی
شیرینییەکان هیچیان لێ نەدەپرسین، شەو گەیشتینە مەهادو چووینە ماڵی
دۆستێکی خۆم، ئینجا دوای پشوودانێك کات ژمێر (١٢)ی شەو کەوتینەوە ڕێگا
بەرەو ڕەزائییە کە گەیشتینە ئەوێ هێشتا بانگی بەیانی نەدابوو، نانێکی
چاکمان خوارد لە چێشتخانەیەكو نوێژەکانمان کردو کەوتینەوە ڕێ بۆ
سلیڤانە، کە گەیشتینە ئەوێ تازە خۆر خەریك بوو دەردەکەوت، دەست
بەجێ خۆم بە برا بارزانییەکان ناساندو ئەوانیش ئێمەیان بردە بارەگایەکی
تایبەتی خۆیان، ئینجا هاتینە خوارەوە شتو مەکەکانمان لە پاسەکەدا
داگرتو بە برا شوفێرەکەم وت: کرێی ئاسایی خۆت چەندە؟ وتی
(ئەوەندەیە) منیش چەندی وت دوو ئەوەندەم دایە، وتی ئەوە بۆ؟ وتم ئێمە
ڕامان کردووە لەدەست کۆماری ئیسلامیو بۆیە ئەو پارە زیادەت دەدەمێ کە
نەخۆتو نەئێمە توشی کێشەو گرفت نەکەیتو ناوت ناهێنمو ناوم مەهێنە،

ئەگەر ناوم بهێنیت تەنها خۆت زەرەر دەکەیت، لەوەڵامدا وتی: مادام تۆ رات کردووە لەدەست ئێران بە قاچاغی هاتویتە ئێرە من کرێیەکەی خۆشمت لێ وەرناگرم و ناویشت ناهێنم و بەقاچاغی دەگەرێمەوە (لە شنۆوە)، بەڵام من رازی نەبووم و کرێکەی خۆیم بە زیادەوە دایە.

هەواڵم نارد بۆ کاک مەسعود کە رام کردووەو پەنام بۆ تۆ هێناوە، کاک نێچیرڤان و کاک دلشاد بارزانی هاتن بۆ لام، ئەوان وا تێگەیشتبوون کە من لەدەست یەکێتی رام کردووە، بەڵام من بۆم روون کردنەوە کە لەدەست کۆماری ئیسلامی رام کردووە، چونکە ئەو سیاسەتەی ئەوانم بەلاوە پەسەند نەبوو، راستە من لەگەڵ حکومەتی عراقیدا (بەعس) هاوکاریم کردووەو ئەمە ئاساییە چونکە من هاوڵاتییەکی عێراقیم بەڵام لەگەڵ کۆماری ئیسلامیدا هاوکاری بکەم بە سیخوری نێودەوڵەتی لەقەڵەم دەدرێم، ئینجا کاک نەوچیرڤان و کاک دلشاد بە جێبەکەی کاک مەسعود کە لە خاڵی پشکنینەکاندا راناگیرێت ئێمەیان گواستەوە بۆ ئەو بارەگایەی کە تەنها هاوینان لێ دادەنیشتن، چونکە زستانان سەرماکەی زۆر سەخت بوو، بە خەڵکی دێکەیان وت ئەوە ماڵەشێخە هاتۆتە ئێرە، من نەدەهاتمە ناو دێیەکە بۆ ئەوەی کەس چاوی پێم نەکەوێت، تا ماوەی ١٥ رۆژ خواردنیان بە ئامادەکراوی بۆ دەناردین لەو خواردنانەی کە ئەندامانی مەکتەبی سیاسی دەیانخوارد، دوای ١٥ رۆژەکە پێیان وتین هەموو شتێکتان دەدەینێ و خۆتان ئامادەی بکەن، لەماوەی ئەو چوارمانگ و نیوەدا کە لەوێ بووین بۆمان هەبوو بە هەموو شێوەیەك چیمان پێویست بوایە لە گەنجینەی مەکتەبی سیاسی بمان هێنایە بەبێ حساب، بۆ نمونە هەموو پێشمەرگەیەکی پارتی تەنها یەك تەنەکە نەوتی هەبوو بۆ مانگێك، بەڵام هەفتەی یەك بەرمیل نەوتیان دەدا بە ئێمە، بەشێوەیەکی زۆر دۆستانەو برایانە رێزیان لێ دەگرتین، وەکو یەکێك بین لەبنەماڵەی بارزانی، بەڵام لە بارەی رامیاریدا ئێمە بۆیە چووبووینە ئەوێ بۆ ئەوەی لەدەست کۆماری ئیسلامی رابکەین و بچین بۆ

تورکیا، چونکە ئەمان دەتوانی چی تر لە ئێراندا بمێنینەوەو پارتی سنوورەکەی بە تورکیاوە بوو بۆیە چوینە ناو ئەمانەوە، لەماوەی ئەم چوار مانگو نیوەدا، ئەوەی بە مێشکمدا هاتبێت خستومەتە سەر کاغەزو وەکو پێشنیارێك ناردومەتە بەردەم کاك مەسعود، شەوێکیان کاك عمر دەبابە هاتە لامان بۆ ئەوەی قەناعەتم پێ بکات ئێران بەجێ نەهێڵم، منیش پێم وت هاتووینەتە دەرەوە بە نیازی تورکیا بەڕێ کەوتوینو لەوێشەوە بۆ دەرەوەی وڵات، هەروەها کاك علی عبدالله‌ش خۆی دەشاردەوە لێم بۆ ئەوەی باسی ڕۆیشتنەکەی خۆمی لەگەڵدا نەکەمەوە، پاش ماوەیەك کە گەیشتمە ئەو باوەڕەی کاك مەسعودو کاك نەوچیرڤان بەڕێمان ناکەنو پێشکەش بە کۆماری ئیسلامی‌یمان دەکەنو لە ڕێگای ئەوانەوە دەبینە ئامێرێك بەدەست کۆماری ئیسلامی‌یەوە، لە ١٩٨٧/١١/١٩دا وەڵامم نارد لە ڕێگای بازیانی کورمەوە بۆ چەند دۆستێك لە گوندی ڕاژان کە بێن بە نهێنی چاویان بەمن بکەوێت باسی ئەوەم لەگەڵ کردن کە دەمەوێت ڕابکەم، ئەوانیش مەردانە هەموو شتێکیان بۆ ئامادە کردم کە چۆن بکەوینە ڕێگا، پرسیاری ماوەی ڕێگاکەمان لێ کردن؟ وتیان لە ڕاژانەوە بۆ تورکیا بە پێ (٨) سەعاتەو ئەو شوێنەی کە لێوەی دەکەوتینە ڕێ سێگۆشەکەی نێوان ئێرانو تورکیاو عێراق بوو، ژیان لەم ناوچەیەدا لە (٦/١٥)ەوە تا ٨/١ بەردەوامە، چونکە لە ٨/٥ەوە بەفر دەبارێت تا کۆتایی مانگی سێو هیچ کەسێك ناتوانێت لەدوای ئەم بەروارەوە لەوێ بژی، لەگەل دوانزە کەسی دێیەکەدا بەنهێنی ڕێککەوتین کە لەم گەشتەماندا لەگەڵماندا بنو ئاگادارمان بن بۆ ئەوەی بە نهێنی بڕۆین، بڕیار وابوو کە چوار لەوانە لەگەل خۆماندا هەشتیشیان لە پێشمانەوە بە ماوەیەك بڕۆن.

١٠ی شەو بەڕێ کەوتینو ماڵەکەمان وەکو خۆی بەجێ هێشتو پەتویەکی گەورەمان کرد بە دەرگای دەرەوەو وامان نیشان دا کە ئێمە لە ژوورەوەین، دوای سێ سەعات لە ڕێگا بڕین زریانێکی توند بەرەو ڕوومان هاتو چاو

چاوی نەدەبینی، بەناچاری ئێمەو ئەو چوار کەسەی لەگەڵماندا بوون دانیشتین‌و من دەم ووت: دەگەڕێمەوە قاچاخ نیم لە کۆماری ئیسلامی‌و ئەگەر قاچاخیش بم خۆ ماڵۆ منداڵەکەم قاچاخ نین، هیچ کام لەماڵۆ منالەکانم قسەکەی منیان پەسەند نەکرد، لە دوای دوو سەعات زریانەکە هێور بووەوە، کە روانیمان سەیر دەکەین ئەو هەشت کەسەی لە پێشمانەوە دەرۆیشتن لێمان دابڕابوو، کەوتینەوە رێ لە هەندێ جێگادا یەك مەتر بەفر باری بوو، لە هەندێکی تردا نیو مەترو لەهەندێك شوێن ٥ سم باریبوو، هەندێك جار بە شوێنێکدا دەرۆیشتین بەفرەکەی ئامادە بوو بۆ هەرەس هێنان و پاش ماوەیەك بۆ جاری دووەم زریان دەستی پێ کردەوە، ئەم جارەیان هەریەکەو لەلای خۆیەوە شایەتمانی هێناو گەردنی یەکترمان ئازاد کرد، رۆژ بووەو لەناکاو کابرایەك پەیدابوو لەو چۆڵەوانی‌یەدا وامان دەزانی پاسدارە، نزیك بووەو پێشمەرگەیەکی دیموکرات بوو ناوی کاك خالد بوو، منی دەناسی‌و دوور بە دوور گوێی لە مشت‌و مڕمان بوو کە دەمانەوێت بگەڕێینەوەو وتی: رێگەتان نادەم تازە بگەڕێنەوەو ئەوەندەی ئاگادار بم تۆ کوردێکی نیشتمان پەروەریت بۆیە چەند لە توانامابێت یارمەتی‌تان دەدەم‌و ئەوەی کێشەی بۆ ئێوە دروست کردووە ئەو ئافرەتانەیەو من یارمەتیتان دەدەم لە گوێزانەوەیانداو قسەکەی خۆی بردە سەر.

ئینجا زریانەکە وردە وردە هێور بووەو دانیشتین نانی نیوەڕۆمان لەسەر ئەو بەفرە خوارد، یەکێك لەو گونیانەی کە پێمان بوو سوتاندمان‌و بە بەفرەکە چامان لێناو پشوویەکی تەواومان داو ئێوارەکەی لە کات ژمێر (٥)دا بۆ جاری سێیەم زریان دەستی پێ کردەوە، بەڵام پێش زریانەکە بە نیو سەعات کاك خالد بەجێی هێشتین لەسەر رەزامەندی خۆمان، زریانی ئەمجارەیان لەهەردوو جارەکەی تر توند تر بوو، چوار کەسەکەی لەگەڵماندا بوون بەجێیان نەدەهێشتین لەبەر ئەوەی شارەزا نەبوون‌و دەیان وت: ئەگەر مردن لەرێگاماندا بێت ئەوا با پێکەوە بمرین، بەهۆی توندو ساردی

زریانەکەوە ئەم جارەیان بە تەواوەتی خۆمان حازر کرد بۆ مردنو سات ـ ساتێك دەمان وت ئێستا رەق دەبینەوەو خۆشم بە بەردەوامی دەمـوت تاوانباری گەورە منم سوپاس بۆ یەزادنی مەزن ئەم جارەشیان نەمردین زریانەکە هێور بووەو دەستمان کرد بەرۆیشتن بەرەو کوردستانی باکور (٣٠٠) مەتر دوور لە گوندەکە سەیرم کرد ئەو چوار کەسەی کە لەگەڵماند بوون رایان دەکێشاین بۆ ئەوەی لەو شێونەدا کە پیای دەرۆین نەوەستین چونکە تواناماں نەمابوو هەموو (دە) هەنگاوێکیش دەبوایە رابوەستین تۆزێك پشو بدەین، دوایی کە گەیشتین پێیان وتم ئەو مەسافەیە سەرەکەی بەستوویەتی بەڵام لەناوەوە ئاوە، بۆیە نەماندەهێشت لەوێ بوەستن چونکە ئەگەر بشکایە دەکەوتنە ناو ئاوەکەو دەخنکان، کات ژمێر (٨)ی شەو گەیشتینە گوندی ئەشکەوتان، ١٠٠٠ ملیۆن جار الحمد لله کە بە سەلامەتی سێ جار لە مردن رزگارمان بوو، یەکەم شت کە لەگەڵیان کردین دەترسان کە قاچمان رەش بوبێتەوە سەرما بردبێتی، سوژنێکیان هێناو کردیان بە قاچماندا کە زانیان هەمووماں هەستی پێ دەکەین، ئاوێکی شلەتێنیان هێنا دەموو چاوو دەستو قاچمانیان شت، ئینجا چایەکی زۆریان بەزۆر دەرخوارد داین، ئەو ماوەیەی نێوان راژانو ئەشکەوتانمان بری بە (٢٢) کات ژمێرو پێش ئێمە ئەوانەی گەیشتبوونە ئەوێ سێ کەس بوون تەنها یەکێکیان مابوو دوای ئێمەش بەچوار رۆژ دوو کەس بە رێگاکەی ئێمەدا دێن بەڵام یەکێکیان رەق دەبێتەوەو ئەو رێگایە ساڵانە چەندەها کەسی تیا رەق دەبێتەوە، یان دەستی رەش دەبێت، منیش لە خۆشی ئەوەی کە بە سەلامەتی رزگارمان بوو حەیوانێکم کرد بە قوربانی، دوای یەك رۆژ حەسانەوە بە پەلە گواستمانەوە بۆ گوندی شێخان لە ترسی کوڕانی مەلا مصطفی.

دانیشتوانی ئەو ناوچەیە، هەموو سۆزیان هەبوو بۆ PKK کە زانیان بنەماڵەیەکین و لە پێنج کەس پێك هاتووینو لێمان قەوماوەو لەدەست حکومەتی عێراق رامان کردووەو لە ئێرانیش قاچاخینو بەبێ ئاگاداری کاك

مەسعود راژاننمان بەجیٚ هیٚشتووە، خەڵکی ئەم ناوچەیە بەهەموو شیٚوەیەك پشتگیریان لیٚ دەکردین‌و یارمەتییان دەداین، تەنانەت شەوان پاسەوانیان دەکردین ئەگەر بمانویستایە لەماڵیٚکەوە بچین بۆ ماڵیٚکی تر بەهیچ شیٚوەیەك سڵیان لەو بازگەیە نەدەکردەوە کە کیلۆمەتریٚك لیٚمانەوە دوور بوو، ئەم هەڵویٚستە مەردانەیەی خەڵکی ئەم ناوچەیە متمانەیەکی زۆری بۆ دروست کردم بەرامبەر بە خەڵکی ئەو ناوچەیەو بۆم دەرکەوت ئەگەر یەکیٚك راست بکات لەگەڵ خوای خۆی‌و نیشتمانەکەیدا بەبیٚ بەرامبەر هەوڵیان بۆ بدات لەهەر پارچەیەکی کوردستان دابنیشیٚت خوا سەرفرازو خۆشەویستی دەکات لەناو ئەو خەڵکەداو ریٚزیٚکی زۆری لیٚ دەگیریٚت‌و بۆم دەرکەوت کە کوردستان هیٚشتا یەك پارچەیە بەڵام بۆکی؟ بۆ ئەو کەسەی بە دڵیٚکی فراوان‌و بیٚ فرت‌و فیٚڵ هەوڵ دەدات بۆ سەربەرزی نیشتمانەکەی خۆی کە رۆژو شەوی خۆی تەرخان بکات بۆ سەروەری میللەتەکەی.

دوای تیٚپەڕ بوونی (١٢) سەعات بەسەر گەیشتنماندا بۆ دیٚیەکە بۆمان روون بووەوە کە ئیٚمە هەموو سەلامەتین، ئینجا بە تەنها منیان بردە ژووریٚك چاوم بە پیاویٚك کەوت کە تەمەنی چل ساڵ دەبووو خەڵکی ئەو ماڵە نەبوو، دانیشتین ماوەی سەعاتیٚك دوو بەدوو گفتوگۆو لیٚکۆڵینەوەمان ئەنجام داو لە کۆتاییدا بۆم دەرکەوت ئەم پیاوە کادریٚکی پیٚشکەوتووی پارتی کریٚکارانی کوردستانە، هەرچەندە خۆی وا پیشان نەدەداو بۆم دەرکەوت کە ئەویش قاچاخە لە تورکیا باسی رابردووی زۆرم بو کرد بۆم گیٚڕایەوە کە لە ساڵی ١٩٨١ لە شام بەهۆی کاك عزیز عەقراوییەوە کە پەناهەندە بوو لەلای حکومەتی سوریاو جیٚ نیشتنیان کردبوو لە یانەیەکی سەربازی لە شام، لە کاتی میوانداری کردنی مندا بەریٚز (عبدالله ئوج ئالان)م لە هەمان میوانداریدا ناسی، دوای ئەوە چەند جاریٚکی تر لەو یانەیەدا چاومان بە یەکتر کەوتەوە، دوای ئەم باسەی من بۆ ئەو پیاوە ئەو خزمەتە گەرمو گوڕە کراین کە لەسەرەوە باسم کرد، (١٣) رۆژیشمان (لە شەمدینان) بردە سەر بە

بێ ئەوەی کەسێك ئاگاداری حکومەتی تورکیا لە ئێمە بکاتەوەو بۆم روون بووەوە لەو ماوەیەدا دوور تا نزیك ئەمانە پارتێکن لەناوخۆیاندا زۆر دڵسۆزن و باوەڕیان بەجەماوەر زۆرەو جەماوەری سەرانسەری کوردستانی باکوور باوەشیان بۆ کردۆتەوەو بەهەموو شێوەیەك هاوکارییان دەکەن چونکە وەکو پرسیارم کرد لەو خەڵکە دەیانوت: ئێمە زۆر دڵنیاین لەوەی کە سەرکردەکانمان ئەڵقەلە گوێ نین و خیانەتمان لێ ناکەن، بۆیە ئێمە خۆمان و ماڵ و منداڵمان لەم ڕێبازەدا بەخت دەکەین، بەراستی ئەم هەڵوێستەی هەردوولا جێی سەرنج بوو لەلای من و لەناخی خۆمدا بۆچوونێکم بۆ دروست بوو ئەویش ئەوەبوو ئەگەر پارچەیەکی کوردستان رزگار بێت بە تەواوەتی کوردستانی باکوورە چونکە جەماوەرو سەرکردە یەك گفتارو رەفتاریان هەیەو ئەگەر لە کوردێکی بەشی سەرووی کوردستانی باکوور لەگەڵ کوردێکی خوارووی کوردستانی باکوورو لە کوردێکی رۆژهەڵات و رۆژئاوای کوردستانی باکوور بپرسیت کێ سەرکردەی کوردەو کێ کورد رزگار دەکات؟ هەر هەموویان دەڵێن عبدالله ئۆج ئالان. بۆنموونە لە سەرەتای مانگی تشرینی دووەمی ساڵی ١٩٩٩دا بە برادەرانی مەکتەبی سیاسی حزبی دیموکراتی کوردستانی ئێرانم وت: لە (کوردی) ئێرانم پرسی کە خەڵکی مەهاباد بوون باوەڕتان بەکێیە کوردستان رزگار بکات (٩)یان وتیان عبدالله ئۆج ئالان، و ئەگەر خۆتان چاك نەکەن ئەو تەنها کەسەشتان لەگەڵدا نامێنێت. لە ساڵی ١٩٩٦ لە شێخ محمد خالد بارزانیم پرسی لە دێی رێزان، پەکەکە لەکوێیە؟ دەستی درێژ کردو وتی ئەوەتا لەو شاخەن، وتم نەخێر، لە زێی گەورەوە (الزاب الکبیر) کە دێی بەرەو بادینان لە ٩٠٪ لەگەڵ پەکەکەن.

دوای تێپەڕ بوونی (١٤) رۆژ لە شەمدینان بەڵگەنامەی دروست کراویان بۆ دروست کردین بۆ ئەوەی بتوانین پێی بگەینە ئەستەمبول، بەقاچاغی لەشار دەرچووین لە شار دەرچووین (میت) ئێمەیان گرت، هەندێك پرسیارو وەڵامیان لەمن کردو هەندێك ئازاری بازیانی کوڕمیان دا، ئینجا منیان بردە

بەڕێوەبەرێتی پۆلیس لەوێ بەڕێوەبەر چەند پرسیارێکی ئاراستە کردم لەکاتی وەڵام دانەوەدا بەدەستی ئەنقەست ٦٠٠ دۆلارم لە گیرفانی کراسەکەمەوە بەردایەوە سەرمێزەکەی، چونکە وام بیستبوو هەموو کارمەندانی تورکیا بەرتیل دەخۆن، کە چاوی بە پارەکە کەوت بۆی هەڵگرتمەوەو وتی: بەرۆژوی؟ وتم انشاءالله، وتی تۆ لەباوکم دەکەیت من پێم وایە ئێوە خێزانێکی خراپ نین بەو جل و بەرگەی کە لەبەرتانایە بەو پارەیەی کەویستت بیدەی بەمن دەتەوێ منداڵەکانت رزگار بکەیت، ئەو ئیفادەیەی کە لەتۆ وەرگیراوە رای میت هەمووی دژ بەتۆیەو راستە بەڵام بۆ خواو لەبەر خاتری دەم و چاوی تۆو ئەو دو ئافرەتەی کە لەگەڵتایە پارەکەتم لێ وەرگرەوەو ئیشەکەشت بۆ ئاسان دەکەم لەبەر ئەوەی کە مانگی رەمەزانەو لێقەوماوی، لەدوای تێپەڕبوونی سەعاتێک ناردی لەسەر حسابی خۆمان سەیارەیەکی فۆردی ستێشنی سوری بۆ بانگ کردین، شتومەکەنیان خستە ناوەوە، خەریك بوو سوار بین منیان گەڕاندەوە بۆ لای بەڕێوەبەری پۆلیس کە ئەم جارە چوومەوە کابرای میت لای دانیشتبوو وتی: خاڵی خۆشەویستم تۆ بەیاسا هیچت لەسەر نییەو ئەم سەیارەیە تا (وان)ت دەبات، بەدەست ئەم (میت)انە بێت تۆ دەبێ لێرە بمێنیتەوەو رەنگە مانگێکیشتان زیاتر پێ بچێت، خوا قبوڵ ناکات ئێوە ئافرەتتان لەگەڵەو ئێوە تووشی ئەو ئەشکەنجەیە ببن، بەڵام کابرای (میت) زۆر هەوڵیدا ئێمە بمێنینەوە، بەڕێوەبەری پۆلیسەکە بە گوێی نەکرد، ئینجا وتم یەك داواکاریم هەیە ئەگەر بکرێت جەنابتان لە جێی خۆتان نەجوڵێن چونکە ئێمە ئەگەر لە رێگای (وان) بگیرێینەوە ئەوا تەلەفون بۆ تۆ دەکەن بۆ ئەوەی تۆش ئاگادارمان بیت نەگیرێین و دوامان نەخەن، ئەفسەرەکە لەوەڵامدا فەرمووی: انشاءالله درێغی ناکەم، سواری سەیارەکە بووین و رۆیشتین، سوپاسی یەزدانم کرد کە خوا ئەو کابرایەی بۆ کردین بە هۆکارێك بۆ رزگار بوونمان، کاتێك گەیشتینە ناوچەی هەکاری، جارێکی تر پۆلیسی تورکی دەست گیریان

کردینەوە لە ژوورێك دایان ناین و ئێمە لە ترسی ئەوەی لە پشکنیندا هیچمان پێ نەگرن هەرچی بەڵگەنامەیەکی (عێراقی)مان پێ بوو لە پاسپۆرت و ناسنامە هەمویمان فڕێ دایە ئاودەستەوەو کونە مشکمان لێ بوو بەقەیسەری ئەفسەرێك هات کاغەزێکی بە دەستەوە بوو پرسیاری لێ کردین کامتان رەفیقن و وەکو دەقی خۆی ناوی هەموومانی هێنا، لەوەڵامدا وتمان ئێمە ئەو ناوانە نین هەر پێنجمان دوای ئەمە دەستمان کرد بە نوێژکردن و نزاو پاڕانەوە لە خوای مەزن لەم کێشەیەشدا فریامان بکەوێت و رزگارمان بکات (تا ئێستاش نازانین ئەو ناوانەیان چۆن بەراستی دەست کەوتبوو) ماوەی دوو سەعات دایان ناین کەس لێی نەپرسینەوەو هەر هەموومان قورئانەکانی بەرباخەڵمان دەرهێناو دەستمان کرد بە قورئان خوێندنەوە، لەم کاتەدا یەکێك لە ئەفسەرەکانی پۆلیس هاتە ژوورەوەو پێی وتین هەستن خۆتان حازر کەن و بڕۆن، هەموویان هەستان بەڵام من هەر بەردەوام بووم و سوورەتی (یس)م دەخوێندو نەمبڕی، کە بینی من ئەوەندە سورم لەسەر تەواو کردنی سورەتەکە یەکسەر دەستی کرد بە گریان و ئێمەش دوا بەدوای ئەو هەموو دەستمان کرد بە گریان، بەراستی ئەو ساتە زۆر زەحمەتە دەربڕینی بەنووسین، دەسلاتی خوا زۆر روون و ئاشکرابوو کە دیویست ئێمە رزگار بکات لەو تەنگ و چەڵەمانەی کە دێنە رێگامان.

ئەوەی من تێبینیم کرد لەو رێگایەدا ئەوەیە لەناو هەموو کۆمەڵێکدا چاك و خراپ هەیە، ئەگەر دوژمنیش ئێمە بەناو کوردەکاندا رۆیشتین یەکەکە یارمەتی داین چونکە کورد بوون، بەڵام کە هاتینە ناو دەسەڵاتی تورکەکانەوە دوو بەش دەسەڵاتدار بوون یەکێکیان پۆلیس و ئەوەی تریان میت ، هەردووکیان تورك بوون بێجگە لە خوا گیانیش کەسی ترمان شك نەدەبرد یارمەتیمان بدات و پارەیەکی زۆریشمان پێ بوو، بەڵام کەس پارەی وەرنەدەگرت و ئەگەر بەدەست میت بووایە کە دوژمنی هەموو مرۆڤایەتین بە گشتی و کوردیش بە تایبەتی چونکە بەلای ئەوانەوە خوا کوردی بۆ

کوشتن دروست کردووە، حەزیان دەکرد لەیەکەم ساتەوە هەر پێنجمان لەناو بەرن، بەڵام پۆلیسەکان وانەبوون کە چاویان پێمان دەکەون بەزەییان پێماندا دەهاتەوە ئازادیان دەکردین.

سوپاس بۆ یەزدانی مەزن بە سەلامەتی گەیشتینە (وان) شەوێك لەوێ ماینەوەو بەیانییەکەی بەڕێ کەوتین بۆ ئەستەمبول دوای ماوەیەك، لەبەر ئەوەی جەوازەکانمان نەما بوو کوڕکان‌و بووکەکەم ناردەوە بۆ عێراق چونکە بڕیاری لێبوردنی گشتی دەرچووبوو لەلایەن ڕژێمەوە لە ساڵی ١٩٨٨، کە لەوەدەچوو بەبێ جواز دەرچوونیان بۆ هەندەران سەرکەوتوو نەبو بێت. ئەو ماوەیە زۆرمان هەوڵدا لەڕێی قاچاخ چییەوە جواز دروست بکەین، بەڵام چەند جارێك دەستیان بڕین‌و پارەکانیان دەخوارد، هەر بۆیە من پێم باش بوو منالەکانم بگەڕێنەوە بەتەنیا خۆم‌و خێزانم ماینەوەو ئەستەمبولمان بەجێ هێشت‌و چووین لە ئەنقەرە دانیشتین، چونکە لەوێ خزمێکی دایکی بازیانی کوڕمی لێ بوو کە لە ساڵی ١٩٥٨ هاتبوونە لامان، ئەم ماڵە زۆر یارمەتیان دەداین بۆ ڕاپەراندنی کارەکانمان‌و چی تر دەستمان نەبڕن، بەڵام لە ڕێگای ئەمانیشەوە هیچمان بۆ نەکرا، ئینجا بە ناچاری لەگەڵ خێزانەکەمدا لە بەرواری ١٩٨٨/٢/٩ دا چووینە بارەگای UNو وەستاین لە ئەنقەرە زۆر زۆر چاوەڕوانمان کرد ئەوەبوو لێپرسراوەکەیان لە ژوورێکی سەرەوە چاوی بە خێزانەکەم کەوتبوو کە لەبەردەم دەرگاکەدا لەسەرماندا هاتوچۆی دەکرد، نوێنەرێکی نارد بۆ لای‌و پێی وت: وەرە ژوورەوە داوات دەکەن، ووتی من هاوسەرەکەشم لەگەڵدایە، ئینجا چووینە ژووری، ئافرەتێکی ئەڵمانی ناوی ئەنگریت بوو نوسراوێکی داینێ کە تیایدا نوسرابوو بەیانی کات ژمێر (٩) چاومان پێتان دەکەوێت، چونکە زۆر درەنگ بوو، لە ٨ی بەیانییەوە تا ١،٣٠ چاوەڕوانمان کردبوو ئینجا وەڵامی داینەوە، بە دەم‌و چاوماندا دیار بوو کە زۆر ماندووین.

کە گەیشتینەوە ماڵەوە یەکی دوو ڕکات نوێژی سوپاس گوزاریمان بۆ خوا

كرد كه شەونخوونیو شەونوێژو قورئـان خوێندنـی شـەوی پێشـووتری ێ وەرگرتبووینو بـەو شـێوازە ئێمـە چووینـە ژوورەوە، چونكـە ئێمـە هیـچ بەڵگەنامەیـەكی عراقیمـان پـێ نـەمابوو، ئەگـەر بـەزەیی خـوا نەبوایـە و بەئاسانی چاومان پێیان نەدەكەوت.

بەیانیـیەكەی كـات ژمـێر (٩) چووینـە ژوورەوە بـەو كارمەتـەی كـە كچـە ئەڵمانییەكە پێی دابووین لەهۆڵێكی گەورە دانیشتین نزیكەی ٤٠ كەسی تری لێ بوو كە بەشی زۆربەیان ئێرانیو عـەرەبی سوریا بـوون، تەنـها دوو كـوردی ئێرانیـان تیـادابوو، سـەعات (١٠) بانگیـان كـردم بـۆ ژوورەوەو پێیـان وتە (مترجمت دەوێت یـان نـا؟ وتم خـۆم ئینگلیزی دەزانم، بـەڵام ترجمەكە هـەر بەدیارمانەوە مایەوە. چەند پرسیارێكیان لێ كردم هۆی چییە هاتویتە ئێرە؟ بۆ لەعێراق رات كردووە؟ ئەی بۆ لە ئێران نەمایتـەوە؟ چۆن گەیشـتیتە لای من بەو لیزە پاسە دروست كراوە؟

منیش باسی بەسەرهاتەكانی خۆمم بۆ كردن لەگەڵ عێراقداو باسی ئـەوەم كرد كە لەبەندیخانەی عێراق بەربووەمو كاتێك صدام بـوو بەسـەرۆك كۆمـار. من چووم لە لەندن دانیشتمو لە دەزگای مافی مرۆڤ لـەوێ بـە دوورو درێـژی هەموو ئەو ئازارو ئەشكەنجەیەی درابووم لە عێراقدا بۆم باس كـردن، لەسـەر ئەمە لە ئێزگەی (BBC) بەشی پانۆرامـا چاوپێكەوتنێكیان لەگـەڵدا كـردمو بـەبێ ئـەوەی داوای پەناهـەندەییان لێ بكـەم لەلایـەن دەزگایـەكی رەسمـی بەریتانییەوە نامەیەكیان ئاراستە كردم دەڵێن: خۆشحاڵین بەوەی كە بچیت لە (Home Office) خۆت بناسێنیت بۆ ئەوەی پەناهەندەییت بدەنێ، بەڵام دوای ١١ مـانگو بیست رۆژ چوومـەوە كوردسـتانی رزگـارو كـراو، پـەیوەندیم كرد بـە یـەكێتی نیشـتمانی كوردستانەوە هـەوڵێكی زۆرم دا پـارتیو یـەكێتی رێـك بخەمـەوە، گۆڤـاری (Economest)ی ئینگلـیزی لـە سـاڵی ١٩٨٦ دا ئـەم هەواڵەی منی بڵاو كردبووەوە كە وەفدێك بە سەرۆكایەتی (رەفیق پشدەری) لە هەوڵدایە بۆ رێكخستنی یەكێتیو پارتیو خۆشی یەكێتییـە. ئەمـە بـوو

هۆكارێك كه كۆماری ئیسلامی هەوڵ بدەن كاریان لەگەڵ بكەم بەڵام من رازی نەبووم‌و رام كردو پەنام برد بۆ پارتی دیموكراتی كوردستان‌و چوار مانگ‌و نیویش لای ئەوان مامەوە، كە هەستم كرد لەوانەیە تەسلیم بە ئێرانم بكەنەوە لەوێش رام كردو بە قاچاخ هاتم بۆ توركیا، لەوێ بە ٢٢ سەعات گەیشتینە یەكەم دێی توركی ئینجا بەڕێ كەوتین، ئەگەر پیاوەتی ئەفسەری پۆلیسەكەی شەمدینان نەبوایە مییت دەیان گرتین‌و تەسلیم بە ئێران یان عێراق دەكراینەوە؛ لە ئەستەمبولیش سێ جار قاچاخ چی ئێمەیان هەڵخەڵەتاندو لەبەر ئەوەی هیچمان پارەمان پێ نەمابوو هەروەها لە عێراق لێبوردنی گشتی دەرچوو بوو، و من باوەڕم بە حكومەتی عێراق نییە كوڕەكانم‌و بوكەكەم ناردەوەو خۆم‌و خێزانەكەم ماینەوە، چونكە لام یەقین بوو ئەگەر بگەڕێمەوە بەغدا صدام دەمكوژێت، بۆیە لەبەر ئەوەی كە قاچاخم لە ئێران‌و عێراق‌و توركیاو خێزانەكەشم خەڵكی ئێرانە، هانام بۆ ئێوە هێناوە، بەڵكو یارمەتیم بدەن، لە كاتێكدا دەستم كرد بە كفتوگۆ كردن لە سەرەتاوە تەلەفونی بۆ دوو كەسی تر كردو وتی (وەرن ئێوەش ئاگاداری قسەكانی ئەم پیاوە بن) كە لە قسەكانم بوومەوە بە تەواوەتی یەكسەر وتیان ئەوە تۆمان وەكو پەناهەندەیەكی UN قبوڵ كرد، بەڵام یەك مەرجم هەیە، دەمەوێت كتێبێك لەسەر كورد دەربكەم‌و مادام تۆ ئەو هەموو زانیاریەیەت لەلایە پێم باشە ئەو كتێبە بەیەكەوە دەربكەین، لەوەڵامدا وتم: كاتێك لە لەندەن لە تەلەفزیۆنی BBC دا دەركەوتبووم خاوەن كتێبخانەیەكی دەوڵەمەند بەهۆی كوردێكەوە هاتە لام بۆ شوقەكەم كە لە (نیل گوین هاوس) دابەزیبووم، لەناوچەی (چێلسی) وتیان كرێی شوقەكەت یەك ساڵ لە پێشەوە دەدەین‌و مانگانەش ئەو مقدارە پارەیەت دەدەینێ كەخۆت دیاری دەكەیت، تەنها ئەو زانیاریانەی كە لەلاتە بیانووسە، بەهەر زمانێك بێت‌و ئیتر بەجێی بێڵە بۆ ئێمەو خۆمان وەریدەگێڕین بۆ ئەو زمانەی كە بمانەوێت، ٦٠٪ی قازانجەكەی بۆ تۆو ٤٠٪ی بۆ ئێمە، بەڵام من رازی نەبووم

بەو کارەو هەروەها لە ئێران شاعیرێکی بەناوبانگمان هەیە کە ناوی هەژارە بەهەمان شێوە هەوڵی لەگەڵدام بەڵام هەر نەمکردو لەگەڵ تۆشدا هەر نایکەم، هەرچەندە کە ئێتا ئیشەکەشم لەبەردەستی تۆدایە، چونکە ئەو کتێبە بۆ بارودۆخی ئێستای کورد باش نییە.

دوای ئەوەی لێکۆڵینەوەکەیان لەگەڵماندا نزیکەی (٢) سەعاتی خایاند ئینجا کارتێکی پەناهەندییان بۆ کردم کە مانای ئەوەبوو وەرگیراوین لە UNو ١٠٠ دۆلاریشیان دامیٚو وتیان ئەمە کرێی خانووەکەتە، ئافرەتە ئەڵمانییەکە کارتیتایبەتی خۆی دامیٚو پیٚی وتم بۆت هەیە هەموو رۆژێك سەردانی UN بکەی، ژمارەیەکی تەلەفونیان دامیٚ بۆ ئەوەی ئەگەر توشی کێشە هاتم تەلەفونیان بۆ بکەمو وتیان پێویست ناکات لەگەڵ خێزانەکەتدا گفتوگۆ بکەین چونکە بەهۆی هاوسەرێتی تۆوە ئەویشمان وەرگرتو نوسراوێکیشت دەدەینیٚ بۆ بەرێوەبەرایەتی ئەنقەرە کە ئەم پیاوەو خێزانەکەی پەناهەندەن لەلای UN.

وتم: ئەگەر دەتانەویٚ یارمەتیم بدەنو رزگارم بکەن لەدەست عێراقو ئێرانو تورکیا ئەم نوسراوەی کە داوتانە بەمن بۆ پۆلیس ناوەکەی منی لەسەر لایەنو ناوێکی دروست کراوم بۆ لەسەر بنووسن، زۆرم هەوڵ لەگەڵ دان بەڵام وتیان ئێمە (UN)ینو کەس ناتوانێت حساب بۆ نوسراوی ئێمە نەکاتو نوسراوەکانمان لەهەموو شوێنێك دەخوات.

ئینجا لای ئەوان هاتمە دەرەوە چووم بەرەو هۆڵەکە بۆ چاوەڕوانی کردنی تەواو بوونی نوسراوەکانمان لەویٚ چاوم بە هاوسەرەکەم کەوت زۆر گرژ بوو بوو، و لێوی ووشك بوو بوو لە ترسا چونکە من لە ژوورەوە زۆرم پیٚ چوو، بەڵام کە منی بینی بە پێکەنینەوە بەرەو رووی رۆیشتمو پێم وت: (لەخوا بەزیاد بێت وەرگیراین) ئینجا هاتەوە سەرخۆیو رەنگی کرایەوە، لەم کاتەدا ژنێکی فارس لێمان هاتە پێشەوەو وتی: (اقا خوا هش می کنم باهم حرف نزنید) واتە بەیەکەوە مەدوێن چاویان لێتانەو گوێشیان لێتانە، دەستی

ڕاکێشا بۆ سەقفەکە بینیم کامێرای تەلەفزیۆنیان دانابوو بۆ چاودێری کردنی وێنەو دەنگی ئەو خەڵکەی کە لەوێ دادەنیشن منیش وەڵامم دایەوە تازە وەرگیراین، ئەوەی لەوێ بوو هەمووی سەری سوڕما چونکە هەندێکیان بۆ دوو ساڵ دەچوو لەوێ بوون هێشتا وەرنەگیرابوون، کاتێك ئێمەیان نارد بۆ بەڕێوەبەرایەتی پۆلیسی ئەنقەرەبەشی پەناهەندەیی لێکۆڵینەوەیەکی یەکجار زۆریان لەگەڵدا کردم، لە هاتنە دەرەوەم لەوێ لەو نوسراوە کەوتمە گومانەو، ووتم ئەمەشم پێ بێت ئەگەر بیانەوێت بمگرن هەر دەمگرن، لەوێ پێیان وتم دەبێ هەفتەی دوو جار سەردانمان بکەیت و خۆشیان هاتن لەگەڵما خانوویان بۆ گرتم، بۆ ئەوەی ئەدرەسەکەم بزانن و بە بەردەوامی لە ژێرچاودێری ئەوان بم، هەر بۆیە من گەڕامەوە بۆ (UN) لەم هەڵوێستەی تورکیا ئاگادارم کردنەوەو دووپاتم کردەوە بۆیان کە دەمان گرن، ئەوەبوو UN بەڵگەنامەکانیان بۆ تەواو کردین کە بەڕێمان بکەن بۆ هەندەران، بەڵام لەلایەن تورکیاوە دوای تێپەڕ بوونی چەند مانگێك دەستگیر کراین و ماوەی پێنج ڕۆژ منیان بەند کرد، من هاوسەرەکەم تێگەیاندبوو کە نەڵی کوردی ئێرانم و زمان دەزانم، بەڵکو وا خۆت پیشان بدە کە کوردییەکەش بە تەواوەتی نازانی هەر ئەوەیە کەڕو لاڵ نیت، من بەندیخانەم زۆر بینیوە زۆر دەستگیر کراوم، بەڵام یەکەم جار بووم بەندکردنی ئاواهی ببینم، ئەویش ئەوە بوو بەیانیان کات ژمێر (٧) دەهاتن بە شوێنما دەیان بردمە میوانخانەیەك لە ژوورێکی میوانخانەکە گفتوگۆیان لەگەڵ دەکردم و ئازارو ئەشکەنجەیان دەدام تا سەعات (١)ی شەو دوای ئەوە دەیانبردمەوە ماڵەوەو پێیان دەوتم نابێت بێیتە دەرەوەو دەرگا لەکەس بکەیتەوە. چاوم لێبوو سەیارەیەکی بیجۆی سور بەرامبەر شوقەکەم ڕاوەستابوو بۆ چاودێری کردنی من، لەماوەی ئەم پێنج ڕۆژە خێزانەکەم توشی نەخۆشییەکی ژنانە بوو، بۆیە بەناچاری ئێمەیان بردە نەخۆشخانەیەکی سەربازی، لە چوونە ژوورەوەدا پرسگەکە نەیهێشت چاودێرەکان بێنە ژوورەوە لەگەڵماندا و یەکێك

لە پرسگەکە لە گەڵماندا هاتو ئێمەی بردە نهۆمی چوارەم بۆ لای ئەو پزیشکەی کە لەم بوارەدا شارەزایە، بە تورکی پێم وت دەتوانم بە تەلەفون لێرەوە قسە بکەم لەگەڵ ئەو لێپرسراوەی UN کە پەیوەندی پێمانەوە هەیە؟ وتی فەرموو، کە پەیوەندیم پێوە کردن کچە ئەڵمانییەکە (ئەنگریت) وتی: وەرنە لام بەهەر شێوەیەك بێت، من چارەسەری کێشەکەتان دەکەم. پزیشکەکە لە دوای چارەسەر کردنی خێزانەکەم رووی تێکردمو وتی: ئێوە چینو چۆن گەیشتونەتە ئەم نەخۆشخانەیە؟ منیش بەسەرهاتەکەی ناو تورکیام بۆ گێڕایەوە، ئینجا پێی وتین راکەن، ئەمە قاتی چوارەمە، بچنەوە ژێر زەمینەکە چایخانەیەکی لێیە، ئێوە لە دەرگای راستەوە هاتوون، بەڵام ئەمجارە لە دەرگای چەپەوە برۆنە دەرەوەو کەس ناتانبینێت بۆ کوێ دەچن بچن، وتمان: ئەی تۆ چی دەکەی؟ وتی من چوزانم ئێوە کێن بەتەنها هاتوونو بە تەنها رۆیشتوونەتە دەرەوە، سواری تەکسییەك بووینو سەعات (١٠) گەیشتینە بارەگای UNو ئەنگریتمان بینی بەسەرهاتی خۆمان بۆ گێڕایەوە، ئینجا (دە) دەقیقەیەك وون بوو دوایی هاتەوەو وتی: ئێستا بالێوزی UN دەچێتە وەزارەتی دەرەوەی تورکیا بۆ چارەسەر کردنی کێشەکەی ئێوەو رێتان پێ بدەن برۆن بۆ هەندەرانو تا کاتژمێر (٤)ی پاش نیوەرۆ لە هۆڵی پرسگە دانیشتین، کە وەڵامیان نەدامەوە زانیم هیچیان بۆ نەکراوە، بۆیە بەیەکەوە هاتینە دەرەوە، زۆر بەبێ تاقەتیو دڵتەنگیو راشکاوانە تەلەفونم بۆ مامۆستا ابراهیم احمد کرد لەلەندەن، بەڵام لەوێ نەبوو، ئینجا تەلەفونم لەگەڵ کاك صباح حەمە سعید کرد باسی خۆمم بە دوروودرێژی گێڕایەوەو پێم وت بەناچاری دەچم خۆم تەسلیمی سەفارەتی عێراق دەکەم چونکە بڕیارێکی لێبوردنی تری دەرکردووە، تەنها مام جەلال ناگرێتەوە، بەڵام ئەم پیاوە باشە زۆری پێ ناخۆش بوو دەسەڵاتیشی نەبوو، هەربۆیە دوای داخستنەوەی تەلەفونەکە زانیم هەموو دەرگاکانم لێ داخراوە بەرەو سەفارەتی عێراقی رۆیشتینو لەوێ خۆم پێ ناساندن، زۆر بە ساردییەوە مامەڵەیان لەگەڵدا

دەکردمو ئینجا تەلەفونی بۆ سەروو خۆیەوە کردوو دوای داخستنەوەی تەلەفونەکەی، لێی پرسیم تۆ کام رەفیق پشدەریت؟ وتم ئەوەندەی بزانم تەنها یەك رەفیق پشدەری هەیە ئەویش منم، ئەو کەسانەی کە لە باڵیۆزخانەدا کاریان دەکرد بێجگە لەدوانیان هەر هەموویان هاتن بۆ سەیرمان، بەماوەی چارەکە سەعاتێك (لیزە پاس)یان بۆ کردینو بردیاننە ژوورەوە، بەڵام باڵیۆز گەڕابۆوە بۆ عێراق، لێپرسراوەکە وتی: هۆی چییە خۆت تەسلیم دەکەیتەوە؟ وتم وەکو بیستومە بڕیاری لێبوردنی گشتیتان دەرکردووەو منیش لە (UN) وەرگیرابوو، بەڵام تورکیا دەیویست تەسلیم بە ئێرانم بکاتەوەو لەدەست تورکەکان رام کردووەو خۆم هاوێشتۆتە باڵیۆزخانەکەتانەوە بۆ ئەوەی یارمەتیم بدەنو دەست ئەمان نەکەوم، کابرای لێپرسراو وتی بەیانی سەیارەیەکی پاسی گەورەی (٤٤) نەفەری لە عەرەبو تورکمانو دوو کوردو تۆش لەگەڵ ئەمانە بەڕێ بکەوە بۆ عێراقو پێی وتم: ئەو پۆلیسە تورکەی کە لەدەرەوە راوەستاوە ئەفسەرێکی سیخوری تورکە ئێمە ئێستا بەسەیارەی باڵیۆزخانەکە دەتنێرینەوە ماڵەوە، جانتایەك بێنە لەگەڵ خۆتدا بۆ ئەوەی سیخوڕە تورکەکان بزانن کە خۆت تەسلیم بە ئێمە کردۆتەوەو لەدواییدا خۆمان دەتبەینەوە، ئەم شەو لەماڵەوە بە بەیانی سەعات (٨)ی بەیانی وەرن بۆ ئێرە کاتێك لەبەر دەرگای ماڵەوە دایانگرتم وتیان ئەگەر سبەینێ هەتا (٨,٣٠) نەگەیتە لامان مانای ئەوەیە تووشی گرفت هاتویتو ئەو کاتە خۆمان بەدوات دا دەگەڕێین، دوای دوو سەعات لە رۆیشتنی ئەوان، ٣ ئۆتۆمبیلی سپی بەرامبەر ماڵەکەمان راوەستانو زەنگیان بۆ لێداین، بە گەرمییەوە سڵاویان کردو داوایان لێ کردم لەگەڵیاندا بچمە دەرەوەو بە خێزانەکەشمیان وت هیچ مەترسە ئێستا دەیهێنینەوە، ئینجا منیان لەگەڵ خۆیاندا برد بۆ میوانخانەیەك بۆ لێکۆڵینەوەو لە ژوورێکدا دایان نامو پێنج کەس دانیشتبوونو دەوری (١٠) کەسێکیش راوەستا بوون لەدەرەوەی ژوورەکە، لەدوای دانیشتنی من پسکیتو شیریان بۆ هێنامو

یەکێکیان وا خۆی نیشان دا کە زۆر گەورەیە بەڵام تەنها لە گوێ درێژێك گەورەتر بوو، زۆر بە فیزەوە قسەی دەکردو وتی: بگەڕێیتەوە عێراق لەسێدارەت دەدەن، بەڵام لێرە بمێنیتەوە دوای (٢٤) سەعاتی تر حکومەتی تورکیا شوقەیەکت بۆ دەگرێت و سەیارەیەکت دەداتێ و بەمامۆستای سیخوڕی دادەمەزرێنن بۆ ئەوەی وانەی سیخوڕی بڵێیتەوە بە میتی تورکیی، وەکو ئێمە تێبینی تۆمان کردووە لەم چەند وەختەدا تۆ شارەزایت لەم بوارەدا.

وتم: لەکەیەوە ئاوا نەرمو نیانن لەگەڵمدا، من (٥) رۆژ لە خزمەتی ئێوەدا بووم، جار بەجار بەدەست هەڵتان دەواسیمو هەندێك جار بە قاچو هەندێ جاریش فەلاقەتان دەکردم، کە ماندووش دەبوون سواری سەیارەتان دەکردمو بە وئەنقەرەدا دەتانگێڕام، ئەوا بۆ (٤٨) سەعات دەچێت لەخوا بەزیاد بێ کۆماری عێراق بڕیاری لێخۆشبوونی گشتی دەرکردووە بۆ هەموو ئەوانەی چەکیان بەرامبەر هەڵگرتووە تەنها یەك کەس نەبێت، ئەویش جەلال تالەبانییە، ئەو لێخۆشبوونە منیش دەگرێتەوە.

کاتێك بەسەیارەکە منیان دەبردەوە، یەکێکیان لەناو سەیارەکەدا دوو مشتەکۆڵەی دا بەسەرماو وتی بگەیتە ئەوسەری زاخۆش دەتهێنینەوە.

بەیانییەکەی سەعات (٦)ی سەر لەبەیانی چووینە دەرەوە، لە باخچەیەکی نزیك باڵیۆزخانەی عێراق دانیشتین، کە دەرگا کرایەوە ئێمەش لەگەڵ خەڵکەکەدا چووینە ژوورەوەو دەستمان لەسەر دڵمان بوو، هەتا بەسەلامەتی گەیشتینە سەر پردەکەی زاخۆ، کە پەڕینەوە وتم سوپاس بۆ یەزادنی مەزن کە دەست میتی تورکی نەکەوتین و رزگارمان بوو، انشاءالله رۆژێك دێت هەموو دانیشتوانی تورکیا بە گشتی و کورد بەتایبەتی رزگاریان دەبێت لە میت و لەدەست ئەو شەش ئەفسەرە تورکیانەی هەموو میت دەبەن بەڕێوەو لەدەسەڵاتی تورکیا دا.

بسم الله الرحمن الرحيم

(ولاتقولن لشيء اني فاعل ذلك غدا الا ان يشاء الله)

**هاتمەوە بۆ عێراق:**

لەجیاتی بڵێم لە کوردستانی باکوورەوە هاتومەتوە کوردستانی باشوور دەبێت لەبەر خاتری دوژمنان بڵێم لە سلۆپییەوە هاتمەوە زاخۆ، پەڕینەوە ناو عێراقو لەوێ تەسلیمی بەشی جەوازاتیان کردین، لەسەر ئەو روانگەیەی کە ئێمە خۆمان تەسلیم بە باڵیۆزخانەی عێراقی کردووە لە ئەنقەرەوە لەوێشەوە دەبێ تەسلیم بە ئاسایشی زاخۆ بکرێین، بەڵام لە کاتێکدا لەوێ وەستابووین لێکۆڵینەوە دەستی پێ کرد، ئیفادەیان وەرگرتینو ناونیشانی سلێمانییان لێ وەرگرتین بۆ ئەوەی لە کاتی پێویست دا پەیوەندیمان پێوە بکەن، کە هاتمە دەرەوە سەیرم کرد کوڕەکانم لەسەر ئەو تەلەفونەی بۆم کردبوون لە تورکیاوە لە کاتی دیاری کراودا چاوەڕوانیان دەکردم، کە چاومان بەمان کەوت هاوسەرەکەم بەگریانەوە باوەشی کرد بە کوڕە گەورەکەمدا لەخۆشی ئەوەی رزگارمان بوو لەدەست تورکەکان، شەو گەیشتینەوە سلێمانی، شەش ساڵ بوو چاوم پێی نەکەتبوو، ئینجا چووینە ماڵی کەمالی برام، دوای سێ رۆژ لە گەیشتنم، ئاسایشی سلێمانی ئاگاداریان کردمەوە کە دەبێ رۆژی شەممە بچمە خزمەت ئاسایشی گشتی لە بەغداو لەهەمان کاتدا هەوالگری سلێمانی وتیان دەبێ شەممە چاوت بە (منظومة)ی کەرکوک بکەوێت، بەڵام من لەوە ئاگادارم کردنەوە کە لە هەمان رۆژدا دەبێت لە ئاسایشی گشتی بم لە بەغدا، وتیان ئێمە رۆژی هەینی کات ژمێر (١٠)ی بەیانی چاوەڕوا نت دەکەین.

رۆژی هەینی کاتژمێر (١٠)ی سەربەلەیانی خۆمو رەوەزی کوڕم گەیشتینە پرسگەی (منظومة)ی کەرکوك، دوای خۆ ناساندن پێیان وتم بچۆ ژوورەوە، کە چوومە ژوورەوە چاوم بە چوار کەس کەوت بەیەکەوە دانیشتبوون، لەبەر ئەوەی هەموویان جلی مەدەنییان لەبەردا بوو نەمزانی کامیان ئەو عەقیدەیە ناردوویەتی بە شوێنما، چەند پرسیارێکیان لێ کردمو وتیان: بۆ چوویتو بۆ هاتیتەوە؟ ئیدریس بەچی مرد؟ فایلێکیان خستە بەردەستم ناوی

ئەڵقە لەگوێکانی (CIA) تیا تۆمار کرابوو، وتیان ڕای خۆت دەربڕە بەرامبەر ئەم ناوانە، خۆت لەمەودوا نیازت وایە چی بکەیت؟ لەوەڵامدا وتم: تەنها من ئەم بەرو ئەوبەرم نەکردووە، ئیدریس بارزانی ڕۆژێکیان بەچاوی خۆی چاوی بە ئەفسەرەکانی کۆماری ئیسلامی دەکەوێت کە زۆر بە خراپی مامەڵە لەگەل دیلە کوردە عێراقییەکان دەکەن بەهۆیئەوەی سونی مەزهەبن، ئەم مامەڵەیەی کۆماری ئیسلامی کاردانەوەیەکی سلبی دروست دەکات لەسەر باری تەندروستی ئیدریس بارزانیو کاتێك دەگەڕێتەوە ماڵەوە دەست نوێژ تازە بکاتەوە (جەڵدەی دڵ) لێی دەداتو دەمرێت چونکە خۆی لەوەوپێش نەخۆشی دڵی هەبوو، کە چاوم کەوت بەناوی کاك ئیدریسو کاك مەسعود ئەندامانی مەکتەبی سیاسی پارتی لیژنەی مەرکەزی لەو فایلەی کە دایانە دەستم وتم: توشەرەفتان کەس باوەڕ دەکات ئەگەر بڵێن (قصی و عدي) سیخوڕی (CIA)ین؟ ئەی چۆن باوەڕ دەکەن کە کوڕانی مەلا مصطفی بارزانی سیخوڕی (CIA) بن، بەڵام ئێوە خۆتان پاڵتان بە کوردەوە نا بچنە شاخو دژایەتی ئێوە بکەن، ئینجا بەسەرهاتێکم بۆ گێڕانەوە وتم: گومان لەوەدا نییە هەریەکە لە ئێوە ناوی یانەی سەلاح الدینی بیستووە لە بەغدا، دوای ئاشبەتاڵەکە شەوێکیان نزیکەی ٤٠٠ کەسێك لە ژنو پیاوی کورد لەوێ بووین، هەندێکیان لەمانە هەڵدەپەڕینو هەندێکیان بە قسەوە خۆی خەریك کردبوو، و هەندێکی تریان بە گۆرانی ووتنەوە بەم شێوەیە هەریەکە خۆی بەشتێکەوە خەریك کردبوو، لەناکاو (١٠-١٢) ئەفسەرو پۆلیسی فریاکەوتن خۆیان کرد بەناو یانەکەداو وتیان کوا سەرۆکی یانەکە؟ (ئەو کاتە سەرۆکی یانەکە کاك فایەق وشیار بوو کە لەهەمان کاتدا بەڕێوەبەری تاپۆی گشتی بوو، بەڵام لەو کاتەدا لەوێ نەبوو).

وتم: لێرە نییە چیتان دەوێت؟ یەکێکیان کە موقەدەمێك بوو وتی: ئەوە چییە ئێوە ناچن بنوونو بەتەما نین ئێرە چۆڵ کەن بەم سەعات ١٢ی شەوە؟ هەستن فەرموون یانەکە داخەنو بڕۆنەوە ماڵەوە، منیش لە داخا

دەست بەجێ تەلەفونم کرد (بۆ هەموو ئەو شوێنانەی کە دەمزانی لە شەودا ئێشکگری لێیە)، بۆ وەزارەتی بەرگری‌و وەزارەتی ناوخۆ، بەڕێوەبەرایەتی ئاشسایشی گشتی‌و بەڕێوەبەرایەتی سیخوڕ گشتی‌و بەڕێوەبەرایەتی هەوالگری گشتی‌و بەڕێوەبەرایەتی گشتی پۆلیس‌و بەڕێوەبەرایەتی گشتی فریاکەوتن، و بەهەموویانم وت: نازانم ئێمەی کورد چۆن بجولێینەوە دەچینە شاخ توانجمان لێ دەگرن دێینەوە شارو دەست دەکەین بە گۆرانی‌و هەڵپەرکێ پێمان دەڵێن ئەوەش قەدەغەیە، رێگا چارەیەکمان بۆ بدۆزنەوە نازانین ئێمە چی بکەین باشە؟ منیش ناوم رەفیق پشدەرییە ئێستا کۆمەلێك ئەفسەرو پۆلیس داویانە بەسەر یانەی سەلاحەدین کە لە عرصاتی هندییەیەو دەڵێن یانەکە داخەن‌و برۆنەوە ماڵەوە، پاش تێپەڕبوونی سەعاتێك کۆمەلێکی تر هاتنە ژوورەوەو وتیان کوا رەفیق پشدەری؟ وتم: فەرموون وتیان ئەوەی ئەو کارەی لەگەڵ ئێوە ئەنجام داوە لەخۆیەوە هاتووەو بۆتان هەیە تا بەیانی هەڵپەرکێ بکەن.

ئێستا ئێمە زانین لەگەڵ ئێوەدا چۆن بجولێینەوەو دەستیشمان ناگاتە سەرکردایەتی‌یەکانتان، لەگەڵ رێزم بۆ ئەێوە هەر چەندە نازانم کامتان عقید (فلان)ە تۆ بەمن دەڵێیت لەمەودوا چی دەکەیت؟ لەوانەیە سبەینێش بەڕێوەبەری ئاسایشی گشتی هەمان پرسیارم لێ بکاتەوە؟ منیش دەڵێم زانیارییەکی باشم پەیداکردووە بەرامبەر حکومەتەکانی ئێران‌و تورکیاو سوریاو لێرەش رەنگە خودی ئێوە نەناسم بەلام سەرکردایەتی باش دەناسم ئەگەر لێم بگەڕێن‌و بەو راپۆرتانەم لەگەڵ نەکەن کە سیخورەکانتان لەسەر من لەمەودوا بۆتان دەنێرن لەماڵێ خۆم دادەنیشم، ئینجا دوای ئەوەی بە تەواوەتی لێ بوومەوە لە قسەکانم وتیان ئێمە بە سەیارەی خۆمان بەرێت دەکەین بۆ بەغدا، یان تا گەراجی بەغدات دەگەیەنین ئەگەر رازی بیت‌و رەحمەت لە دایك‌و باوکت پەیمانت دەدەمێ هەتا من لێرەبم نایەڵم جارێکی تر بانگت بکەنەوە بۆ ئێرە، یەکێ لەم پیاوانە گەیاندمی بۆ گەراجی بەغداو لەوێ خۆی جانتاکەی بۆ هەلگرتم تا لای سەیارەکەو وتی: حەز دەکەم خۆمت

پێ بناسێنم (مقدم کریم)، منیش وتم تۆ بۆ ئەمە لەگەل من دەکەیت؟ وتی شایەنی ئەوەی، ئینجا سواری سەیارە بووین چووم بۆ بەغداو لە میوانخانەی باخان دابەزیم، کە گەیشتمە ئەوێ کورێکی گەنج لەبەر دەرگای میوانخانەکە دا وەستابوو، وتی من چاوەڕوانی تۆم دەکرد، بەخێربێیت سەرچاو، لە کاتی گەیشتنەکەت دوا کەوتویت، من ناوم شێخ لەتیفەو خاوەنی ئێرەم، کاك کەمالی برات پرادەرێکی زۆر خۆشەویستمەو رای سپاردووم کە چاوەڕوانی جەنابتان بکەمو بەبیری هێنامەوە کە جارێکیان لۆرییەك شتومەکی گیراود کاتی خۆی من یۆم بەرداوە، بەلام من هەر ئەو بەسەرهاتەم نەدەهاتە یاد، ئەو پیاوە ئێستا کە چاوی پێم دەکەوێت زۆر رێزم لێ دەگریت، خۆزگە ئەوانەی لەبیر منو لە سێدارە رزگارم کردوون بەنیوەی ئەم پیاوە منیان لەبیر بوایە، پاش ماوەیەك کەمالی براشم گەیشتە ئەوێو ئەو شەوەمان پێکەوە بردە سەرو بەیانییەکەی بەکارێکی خۆی چووە دەرەوەو کە بۆ نیوەڕۆ هاتەوە پرسیاری لێ کردمو وتی چاوت بەبەرێوەبەری ئاسایشی گشتی کەوت؟ وتم دوو جار تەلەفونم بۆ بەدالەی گشتی ئاسایش کرد وتم دەمەوێت قسە لەگەڵ بەرێوەبەری گشتی بکەم، وەلامیان دامەوەو وتیان لەوێ نییە، بۆم دەرکەوت ئەو کابرایە نایەوێت چاوی پێم بکەوێت، لەبەر ئەوە من سبەینێ دەڕۆمەوە.

ئێوارەکەی چوینە مالی کابرایەکی عەرەب ناوی ناهێنم لەبەر ئەوەی ئێستا لێپرسراوێکی گەورەیە لە بەغدا کە گەیشتنە ئەوێ بانگی ئێوارەی دابوو، خۆیو مالو منالەکەی خەریکی نان خواردن بوون کە ئاگاداریان کردەوە هەموویان بە گەورەو بچووکەوە بە پیرمان هاتن، منیش بەرۆژو بووم لەبەر ئەوە دانیشتم لەگەل ئەواندا دەستم کرد بەنان خواردن، ئینجا باسی ئەوەم کرد هاتووم بەرێوەبەری ئاسایشی گشتی ببینمو پێیان وتم لەوێ نییە، لەبەر ئەوە سبەینێ دەگەڕێمەوە وتی: من ئەو مالو منالانەم کە ئێستا دانیشتوون نانیان لەگەلدا دەخۆم دلنیام کردوون لەوەی من لەگەل ئەو

رژێمەدا نیم بەڵام من استقالە بکەم دەست بەجێ دەمکوژن‌و ئەگەر رابکەم کەس‌و کارم لەناو دەبەن، تەنها چاوەڕوانی قاپی رەحمەتی خوا دەکەم کە بە سەلامەتی رزگارمان بێت لەمانە، تۆ بەر لێخۆشبوونەکە کەوتویت، شت بەدەستەوە مەدە، کەس ناتگرێت چونکە باجی خۆت داوە، بەیانی بڕۆرەوە سلێمانی لەماڵی خۆت دانیشەو کاسبی خۆت بکە، پەیوەندی بە هیچ شتێکەوە مەکە، ئینجا وتی: بەتەمای چ جۆرە کاسبی‌یەکی؟ وتم زۆر ماندووم چەند مانگێك هەروا دادەنیشم بۆ حەوانەوە، ئینجا یان لە هەولێر یان لەبەسرە نیشتەجێ دەبم، وتی ئەی منالەکان؟ وتم بۆیان نی‌یە لە هیچ دائرەیەك دابمەزرێن چونکە پێشمەرگەبوون‌و هاتونەتووە، بەڵام دایکیان بەهۆی کەمالی برامو (شێخ جەعفەری محامضە)وە رێپێدانی نانەوەخانەیەکیان وەرگرتووە نان دەفرۆشن، وتی دوای ئەو هەموو هەوڵەی تۆ دات بۆ کرد کەسێك نەبوو بڕێك پارەیان بداتێ کاسبی‌یەك بکەن، ئاخر زەمانە خێزانی رەفیق پشدەری واسطە دەکات بۆ وەرگرتنی رێپێدانی نانەواخانە! وتم بەمەش لێمان رازی نەبوون، ئەوەبوو شتێکیان بۆ دروست کرد بەهۆی ئەوەوە رێپێدانەکە بەناوی ئەمەوەیە ١٢ سەعات دەیخەنە بەندیخانەوە، شێخ جەعفەر کە ئەمە دەبیستێتەوە پێیان دەڵێت ویژدانتان بێت خراپە گەیشتە ئەو رادەیەش.

گەڕامەوە سلێمانی، دوای سێ مانگ‌و نیو چوم لەهەولێر جێ نیشن بووم بەو نیازەی لەوێ کارگەی (علف) دابنێم کە (٥٠-٦٠) هەزار دینار تێ دەچێت، بەڵام چەند کەسانێکی دڵسۆز هانیان دام لە جیاتی ئەوە (پرۆژەی بەخێو کردنی جوجە سازی کامل-مشروع متکال للدواجن[٦١]) دابنێم، منیش لەسەر

[٦١] شەش کەس بووین لە هەولێر موافەقەتی کردنەوەی ئەم پرۆژەیەمان بۆ هاتەوە، یەکەم کەس من تەواوم کرد بە (١٤) مانگ، کە شەڕی عێراق‌و ئەمریکا دەستی پێ کرد پێش ئەوەی بیکەمەوە رام وەستان، کە راپەڕینەکە روویدا سەلامەت بوو، کە سوپا هاتەوە روویان کردبووە ئەو پرۆژەیەی من‌و ئامێرێکی زۆریان تالان کردبوو، لە دوای ئەواندا هێزی فەرهوود هەندێك شتی تریان بردبوو، ئینجا کە هەولێر کەوتبووە ژێر چنگی

بەرەی کوردستانییەوە، نیشتمان پەروەرەکانمان لە جیاتی پارێزگاری بکەن ئەوانیش بەشێکی تریان تالان کردبوو، هانام بۆ مام جەلال برد ئەویش فەرمووی: (١٦) پێشمەرگەت بۆ دەنێرم پارێزگاری پرۆژەکەت بۆ بکەن، منیش وتم من خۆم بۆ بەخێو ناکرێت ئێنجا ئێستا دەتوانم (١٦) پێشمەرگە بەخێو بکەم، ئینجا هانام بۆ کوردی بەغدا برد، فوئاد عارف و مامۆستا مسعود محمدو د. کمال مەزهەر بڕیاریان دا پارمەتیم بدەن، کاک مەسعود محمد هات بۆ هەولێر، چاوی کەوت بە کاک مەسعود بۆ ئەم مەبەستە، کاک مەسعود بەڵێنی دا ئەم پرۆژەیەم بۆ ئاوەدان بکاتەوەو کاک محسن دزەیی لە پرسەیەکدا لەهولێر پێ راگەیاندم کە ئەم پرۆژەیەت بۆ ئاوەدان دەکەنەوە، دوای شەش مانگ (کاک شێرکۆی عمری عەولا شەل) هاتە لام، وتی: چەند رۆژێکە هەواڵێکم پێیە دەمەوێت پێت رابگەیەنم مامم (مامۆستا علی عبدالله) سکرتێری پارتی دیموکراتی کوردستان پێی راگەیاندبووم کە پێت بڵێم کاک مەسعود بارزانی فەرموویەتی ئێستا پارەمان نییە کەی بوومان بۆی ئاوەدان دەکەینەوە، وتم راست دەکەیت نییەتی، کە مەلا مصطفی باوکی مرد تەنها (٩٧) ملیۆن دۆلاری بەجێ هێشتووە، ئەوەی لە نێوانماندا راوەستابوو گوێی لەم قسەیە بوو، ئەندازیار (عبدالخالق حویزی) بوو وتی: ناتریست بتکوژن؟ وتم زۆرم بۆ کردوون ئەوان من ناکوژن، رۆژێکیان مام جەلال پێش هەڵبژاردنەکەی (٩٢) بەچەند رۆژێك بەمامۆستا مسعود محمدی وتبوو با رەفیق بێت چاوم پێی بکەوێت بۆ مەسەلەی پرۆژەکەی، چووم بۆ لای مام جەلال بۆ خانووەکەی عزت دووری، کە چوومە ژوورەوە کاک سعدی پیرە هات بۆ لام و وتی: فەرموو مام جەلال لەسەربان چاوەڕوانت دەکات، ئینجا چوومە سەربانەکە لەوێ چاوم بە بەڕێز مام جەلال کەوت، قۆڵی کرد بە قۆڵماو وتی ئێستا چیت بۆ بکەم؟ وتم تەنها یەك قاعەم بۆ تازە بکەنەوە لەگەڵ بیرەکەدا هیچی ترم ناوێت، فەرمووی زۆر ئاسانە بۆت دەکەم، ئینجا زۆر سوپاسم کردو بەجێم هێشت، لەسەر ئەم بەڵێنەی مام جەلال ئەوەندە هاتوچۆم کرد لە ئەنجامدا خەمی ئەوەم نەبوو کە پرۆژەکەم بۆ ئاوەدان ناکەنەوە، بەڵکو خەمی ئەوەم بوو کە پێڵاوەکانم لەو رێگایەدا بدڕێت و پارەم پێنەبوو پێڵاوی تازە بکڕمەوە.

کاتێك پارتی دەستی گرت بەسەر هەولێردا، لە ساڵی ١٩٩٧ وەزارەتی کشتوکاڵ هەستا بە بەستنی کۆنگرەیەکی گەورەو فراوان بۆ باس کردن لە کارەکانی ئەو ساڵەی کە تێپەڕ بووەو دانانی پیلانێك بۆ سەرخستنی پرۆژەی کشتوکاڵی لەو ناوچەیەدا بۆ ساڵانی داهاتوو، هاتن تەنها بۆ خاوەن پرۆژە گەورەکان بوو، بەڵام راستی شانۆگەرییەکی زۆر بەهێزو سەرنج راکێش بوو، بەڵام بەداخەوە ئەگەر ١٠٪ی ئەو بەڵێنانەی کە دایان بۆ

قسەی ئـەوان دەسـتم کـرد بـە دانـانی، دووجـار لـە بەڕێوەبەرایـەتی ئاسایشـی گشتیو سیخوڕی گشـتی بـانگ کـرام بـۆ لێکۆڵینـەوەو وتیـان: تـۆ ئـەو هـەموو پارەیەت لەکوێ بوو کە ئەو پرۆژەیەی پێ دابمەزرێنیت؟ ئـەم پـارە زۆرە یـان

---

سەرخستنی کشتوکاڵ لەناوچەکەدا بێردایەتە سەر ئەو خەڵکە زۆر سوودمەند دەبوو، بـە نامەیـەك ئاگاداری سەرپەرشـتیاری کۆنگرەکـەم کـردەوە دەمەوێتباسـێك لەسـەر پـرۆژەی بەخێو کردنی جوجەڵە دابمەزێنم، وەزیـری کشـتوکاڵ (ابـو حکمـت) وەڵامـی دامـەوە وتـی: دوای ئەوەی کە د. رۆژ ووتەکانی خۆی تەواو دەکات سـەرە دێتـە سـەر لێکۆڵینـەوە لەسـەر پرۆژەکان، کـە گەیشـتینە سـەر لێکۆڵینـەوە لەسـەر پـرۆژەی بـەخێوکردنی جوجەڵـە تـۆش چیت پێیە بیڵێ، دوای ئەوەی رێگایان دام، هەستام بۆ قسە کـردنو پێشـەکی خـۆم ناسـاند بە جەماوەرەکـەو وتم: ئێمـە تەنـها ٦ کـەس بوویـن لەهـەولێردا رێپێدانـی کردنـەوەی ئـەو پرۆژەیـەمان وەرگـرت، مـن توانیـم بـە (١٤) مـانگ ٨ قاعـەو مەفقـەسو کارگـەی عـەلفو بـیرێكو شـەش خـانوو بـۆ کرێکـارو خانوویـەك بـۆ نوسـینگەی خـۆمو گەنجینەیـەكو جادەیەکی ٣ کم تەواو بکەمو کارەبای بۆ رابکێشم، ئەو کاتە لەسەر ئەم کارەم سێ سـوپاس نامەم بۆ هاتەوە لە وەزارەتی کشتوکاڵی رژێمەوە لەسەر تەواو کردنی پرۆژەکەم بـەم مـاوە کەمـە، ئینجا بـە سـەرەهاتی پرۆژەکـەم بـە دوورودرێـژی بـۆ گێڕاینـەوەو وتم: دوێنـێ دوو فایلی گەورەتان دا بەمن کە باسی لە ئایندەی وەزارەتی کشتوکاڵ دەکرد، کە سـەرنجم دایـە ئێوە نیازتان هەیە لە ئایندەدا کیانێکی سیاسـی دابنێـن بـۆ وڵاتو ئەمـەش لەبـەرژەوەندی دەوڵەتە ئیقلیمیەکاندا نیـیە. بەڵام جارێ ئێمە پێش دانانی کیانێکی سیاسـی بـۆ خۆمـان پێویستیمان بـە پێکهاتەیـەکی پـرۆژەی دانـانی ژێرخـانێکی ئـابووری هەیـە بـۆ ئـەم وڵاتـە بەیـەك ملیـار دینـار سویسـری هـەموو پرۆژەکـان ئـاوەدا دەکەنـەوە، یـەکێکیان لەوانـە پرۆژەکەی منە با لە ٨٠٪ی قازانجەکەی بۆ ئێوە بێتو لـە ٢٠٪ی بـدەن بـە مـن، دوای یـەك ساڵ وارداتی وەزارەتی کشتوکاڵ مانگانـە نزیکـەی (١٠) ملیـۆن دینـار دەبێـتو ٥٠٠ کرێکـار ئیش دەکات، وەزیـری کشـتوکاڵ نوسـراوێکی ئاراسـتەی ئەنجومـەنی وەزیـران بـۆ کـردم، لـە ساڵی ١٩٩٧ دا ئێچربارزانیو د. رۆژ گفتیان دامێ کە بۆم ئاوەدان بکەنـەوە، لـە مـانگی (٧)ی سـاڵی ١٩٩٩ د. رۆژ شـاویس وتـی ئـەی پرۆژەکـەت؟ وتم ئیـتر مـن کاسـبی ناکـەم، سیاسـەت دەکەم.

جەلال تالەبانی یان مەسعود بارزانی یان دەوڵەتێکی بێگانە داویانە بەتۆ چونکە تۆ هاتیتەوە تەنها (١٠٠) دۆلارت پێبوو، منیش یەکە یەکە ناوی ئەو بازرگانانەم پێ وت کە ئەو پارەیەیان دامێ و وتم: لەوانە (جەنابی سەردار جاف، بڕی (٢٠٠) هەزار دیناری داومەتێ، عقید محمود احمد بڕی (٢٥) هەزاری دیناری داومەتێ، و هەروەها کەس و کارم هەریەکە لە (١٠-١٥) هەزار دیناریان دامێ و هەروەها (٧٠) هەزار دیناریشم لە بانقی کشتوکاڵی وەرگرتووە)، ئینجا وتیان: ئەی ئەو سەیارە (بەرازیلی)یەت لەکوێ بوو، وتم شەوکەت بەگی جاف دۆستێکی خۆشەویستم بووەو بەسەر یەکەوە زۆرمان هەبوو کوڕەکەی ناوی (سەرتیپ جاف)ە ئەم سەیارەیەی پێشکەش کردم.

## کورد کوژە

کورد کوژەی ئەو سەدەیەی کە تێپەڕی لە نێوان ئەو دوو لایەنە زلهێزەدا خۆی دەبینێتەوە لە سێ جەولەدا

جەولەی یەکەم: لە ساڵی ١٩٦٣ دەستی پێ کردو لە ١١ ئازاری ١٩٧٠ کۆتایی پێهات.

جەولەی دووەم: لە ساڵی ١٩٧٧ دەستی پێ کردو ١٩٨٨ کۆتایی پێ هات.

جەولەی سێهەم: ئەنجامی کۆتایی هەڵبژاردنەکەی ساڵی (١٩٩٢) بەلای منەوە گرنگ نەبوو بەڵام ئەوەی بەلامەوە گرنگ بوو چۆنیەتی پیادە کردنی هەڵبژاردنەکە بوو، بەبێ ئاژاوەو کوشتار، چونکە ئەمە گەورەترین دەست کەوت بوو بۆ گەلی کورد، من زۆر مەترسی ئەوەم هەبوو کە تەنها عێراق ببێت بە هۆکارێك ئەم ئەزموونە هەڵوەشێتەوە لەنێوان ئەو چوار دەوڵەتە ئیقلیمییە کە کوردستانی تیا پارچە پارچە کراوە، چونکە ئێران و تورکیاو سوریا ئەو کاتە هیچ جۆرە بنەمایەکی جەماوەری ئەوتۆیان نەبوو لەناو کوردستانی باشووردا، هەربۆیە چووم بۆ بەغدا بۆ لای ئەو کوردە نیشتمان

پەروەرانــەی دانشــتووی ئــەوێن‌و چـاوم بەبەشـێکی زۆریـان کـەوت‌و دوای وتووێژ کردن لەگەڵیاندا تەنها سێ بەڕێزیان بەڵێنیان دامێ ئەگەر هاتوو ئەم هەڵبژاردنە ئاژاوەیەکی تیا رووبدات لەهەچ لایەنێکیانەوە بێت ئەوان بە پەلە بگەنەوە ئێرە بۆ چارەسەر کردنی ئەو کێشەیەو نەهێشتنی روودانی براکوژی جارێکی تـر لـە کوردسـتاندا، چونکە ئـەوان دۆسـتێکی نزیکی بــەڕێزان مـام جەلال‌و کاك مەسعودن‌و دڵسۆزی میللەتی کوردن، ئەوەی هاندەری من بوو بۆ هەسـتان بـەو کــارەو بزوێنــەری هەسـتی نەتەوایـەتی ئـەو بەڕێزانــە بــوو، چـاوەڕوانی کردنــی ٤٠ ملیـۆن کـورد بـوو بـۆ سـەرکەوتنی میللـەتی کـورد بەسەرکەوتنی ئەم ئەزموونە.

زۆر بەدڵنیایی‌و خۆشحاڵی‌یەوە گەڕامەوە هەولێر، نامەیـەکم لـەرێگای کـاك فەرمنسۆ حەریری‌یەوە ئاراستەی بەڕێز کاك مەسعود بارزانی کردو بەدوورو درێژی ئەم چاوپێکەوتنە سەربەخۆیەی خۆمم تیا تۆمار کرد لەگەڵ ئەو سێ بەڕێزەدا، دوای ماوەیەك ویستم چـاوم بکەوێتـەوە بـە کـاك فەرەنسۆ، کـاتێك لێپرسـراوی پرسـگەکە چاوی بـەمن کــەوت یەکسـەر وتــی: فــەرموو بچــۆرە ژوورەوە، وەڵامـم دایـەوە نـەخێر ئاگاداری بکــە، بەپــەرتاو رۆیشــت‌و زۆر بــە لەسەر خۆیی گەڕایەوەو وتی: لەوێ نی‌یە، دوای چوار ساڵ بۆم دەرکەوت کاك فەرمنسۆ هەر لە بنەڕەتەوە ئەو کارەی منیـان پەسـەند نـەکردبوو، دیـار بــوو بڕیاری تێکدانەوەی ئەزموونەکەیان دەرکردبوو لەنێوان خۆیاندا بەهۆی ئـەو دەستە ناپاکانەوە کە سەر بە رژێمن‌و لەدەوری کاك مەسعود کۆبوونەتـەوە و زاڵن بەسـەریدا، بـەڵام ویستی جـەماوەرو هـێزێکی نێودەوڵـەتی لـەم بڕیــارە بەهێزتر بوون‌و نەیانهێشت ئەو نیازانە بـۆ مـاوەیك سـەربگرێت، دوا بـەدوای ئەمـە سـەردانێکی سلێمانیم کـردوو چوومـە خزمــەت کـاك نەوشـیروان کــە گەیشتمە ئەوێ لە رێگەوە فەرمووی: دەمێکە دیار نیت، وتم: لەبەغدا بوومو کارەکـەی کــە پــێی هەسـتابووم بــە دوورو درێــژی بــۆم گێڕایــەوە، ئینجــا فــەرمووی: زانیــم شــتێکت لــەبن ســەردایەو شــتی باشــیش نــەبێت لــەتۆ

ناوەشێتەوە، من دڵنیات دەکەم شەڕ نابێتەوەو ئەوانیش بیکەن ئێمە نایکەین. جا کاك رەفیق پێشم خۆشە دەورت هەبێتو خۆت ساغ کەیتەوە بەلایەکدا. وتم: هەروا دەمێنمەوە، وتی: ئەوە هەڵبژاردنە بۆ سەرۆكو حیزب بەرای تۆ کێ دەردەچێت؟ وتم پێم خۆشە وەکو حزب یەکێتی دەرچێتو وەکو سەرۆك مسعود بارزانی دەرچێت، بەڵام یارەبی خوایە مام جەلال دەرچێت. وتی: ئەوە یەعنی چی؟ وتم حەز دەکەم یەکێتی دەرچێت لەبەر ئەوەی حیزبێکی چالاكو رێکخراوە، حەزدەکەم کاك مەسعود دەرچێت لەبەر ئەوەی پیاوێکی ئارامو لەسەرخۆیە، بەڵام دەڵێم خوایە مام جەلال دەرچێت چونکە ئەگەر کاك مەسعود نەمێنێت (دلشاد لەدوای دێتو بەدوایدا نەهادو سودادو وەجیهو... هتد)، بەڵام ئەگەر مام جەلال نەمێنێت ئیتر کەسی لەدوای خۆی دانەناوە.

قۆناغی یەکەمی ناکۆکیەکان بە پەرۆ راوەشاندن دەستی پێکرد، کاتێك لە بەهاری ١٩٩٤دا ئەگەر بچویتایە بۆ هەوارگەو سەیرانگاکانی کوردستان کە ئەو بەهارە یەکەم بەهاربوو خەڵك بەو شێوە ئازادیو کامەرانیە روو بکاتە سەیرانگاکان، چاوت دەکەوت بەو خەڵکە چۆن بە وشەی ناشرین توانجیان لە حزبەکەی بەرامبەری خۆیان دەداو پروپاگەندەی بۆ حزبەکەی خۆی دەکرد، سەرئەنجامی ئەو زیاد رەویە لە دڵسۆزی هەریەکە بۆ حیزبەکەی خۆی چەندەها جار کارەکان نزیك بوونەوە لەیەکتر کوشتن، بەڵام کە هەردوو سەرکردە بەمەیان زانی دوای ماوەیەکی زۆر ئەم دیاردەیەیان قەدەغە کرد.

قۆناغی دووەم لە هێرش بردنە سەر یەکتر لە دەزگاکانی راگەیاندنەوە دەستی پێ کرد بەشێوەیەکی زۆر توندو تیژ، یەکەم کەس کە پروپاگەندەی بۆ حزبەکەی خۆی دەکردو هێرشی دەبردە سەر حزبەکەی بەرامبەری، لە تەلەفزیۆندا (مامۆستا حاجی محیالدین معروف) بەڕێوەبەری پەیمانگای مەڵبەندی مامۆستایان بەشێوەیەکی زۆر ناشرین لەسەر کەناڵی تەلەفزیۆنی پارتیەوە پروپاگەندەی دژی یەکێتی دەکرد لە هەولێر، دوا بەدوای ئەو

بەماوەیەك مامۆستا (ناظم عومەر) بریکاری وەزارەتی پێگەیاندن لە تەلەفزیۆنی یەکێتی‌یەوە وەڵامی دەداتەوە بەهەمان شێوە.

قۆناغی سێ هەمی رووداوەکان بەشەڕی کورد کوژە دەستی پێکرد چونکە کاتێك حەسۆ میرخان لێپرسراوی پشدەرو مەنگوڕو مامەش بوو لە ساڵی ۱۹٦٤ دا چەند مولکێکی دەبێت لەو ناوچانە، نازانم چۆن‌و بە چ شێوەیەك بوو بوو بە مولکی، لە نیسانی ساڵی ۱۹۹٤ دا علی کوڕی حەسۆ میرخان خۆی و چەند بارزانی‌یەك چوون بۆ قەلادزێ بەو نیازەی دوکانەکانی باوکی وەرگرێتەوە، لە ئەنجامی ململانێ کردنی نێوانیان فتیلی شەڕی براکوژی داگیرسا.

ئەوەبوو لەسەرەتای شەڕی براکوژی‌کەدا هێزەکانی یەکێتی پارتی‌یان لە هەولێر دەرکرد، لەو ماوەیەشدا کە هەولێری بەدەستەوە بوو رێگای بە ئێران دا هێرش بکاتە سەر بارەگاکانی دیموکراتی ئێران کە نزیکەی ۲ کم لە خاڵی پشکنینی کۆیەوە دوورە، من بەهۆی چەند دۆستێکمەوە لەناویاندا سەر لەبەیانی‌یەکەی دەست بەجێ بە هەواڵەکەم زانی، وە بۆ دڵنیا بوونم لە سەلامەتی‌یان سەردانی بارەگاکانم کرد لە هەولێرو گەیشتمە بەردەمی بارەگاکە بە پاسەوانەکەم وت من رەفیق پشدەریم‌و ئەم بەیانی‌یە هەواڵی هێرش کردنی هێزەکانی کۆماری ئیسلامیم بیستووە بۆ سەر بارەگاکانتان لە کۆیە، ماڵی من ماڵی دیموکراتە، پێیان رابگەیەنە کە دەرگای ماڵم ئاواڵەیە بۆ پێشوازی کردن‌و میوانداری کردنتان، ئەوەبوو کۆمەڵە کەسانێکم لە دیموکرات (۱۳) رۆژ لەماڵەکەی خۆمدا خزمەت کرد، بە شانازی‌یەوە چی لە توانامدا بوو درێغیم نەکردو بۆم ئەنجام دان. هەموویان لە قوتابخانەیەك بوون‌و ژمارەیان زیاتر لە ۵۰۰ کەس بوو، چەند جارێك سەردانم کردن بۆ ئەوەی لە خزمەتیاندا بم، داوام لێ کردن کە دەمەوێت خواردنیان بۆ دروست بکەم، وتیان ئەوا بۆ (۷) رۆژ دەچێت چامان نەخواردۆتەوە، تەنها میوانداری چامان بکە بۆ رۆژی دوایی دوو شاگردم لە بازارەوە هێناو خۆم‌و بازیانی کوڕم چامان بۆ لێنان، یەکێك لە کارمەندانی (UN) پرسیاری لێ کردم‌و وتی تۆ لە

چ گروپێکی سیاسیو سەر بەکێ، وتم من ناوم ڕەفیق پشدەری یە سەر بەهیچ گروپێکی سیاسی نیم، کوردم دانیشتوی کوردستان ئەمانەش کوردن و ئەو کارەی من پێی هەستاوم (Tea Party) واتە ئاهەنگی چا خواردنەوەیە ئێمەی کورد هەموو برای یەکترین لەهەر چوار پارچەکەدا، کارمەندەکەی (UN) زۆر خۆشحاڵ بوو بە قسەکانی منو وتی کەوابێ منیش چایەك دەخۆمەوە، بۆ ئاگاداریتان UN سەرپەرشتی دەکردنو بەشی زۆری گروپە سیاسیەکان خزمەتیان کردن.

لە کاتی سەردانی ئەم حیزبە بۆ حزبو لایەنەکان بەناوی سوپاس گوزاری کردنیان لەسەر یارمەتی یارمەتی دانیان لە کاتی لێقەومانەکەیاندا سەردانی منیشیان کرد بۆ ئەو مەبەستە.

پاش تێپەڕبوونی ماوەیەك بەسەر کارەساتەکەدا سەردانی دەفتەری سیاسییانم کرد لەهەولێرو پێم وتن: پێش ئەوەی کۆماری ئیسلامی لێتان بدات بە دوو سەعات د. فوئاد مەعصوم ئاگاداری کردبوونەوە لەو هێرشەو ئەمەش هۆکارێك بوو بۆ ئەوەی تەنها مرداربوونەوەی چەند مریشکێکتان نەبێت هیچ زیانێکی گیانی ترتان توش نەیەت، و ئەگەر یەکێتی مەبەستی لەناو بردنی ئێوە بوایە کەمێکتان رزگارتان دەبوو لەدەست سوپای کۆماری ئیسلامی باشتر وایە کە لەگەڵ یەکێتیدا تێکی نەدەن، چونکە لەگەڵ لێرە ترازان یان دەبێت لەناو پارتیدا بتوێنەوە یان هەتا (دوز خورماتوو) نەوەستنەوە پارتی ناتان گرێتە خۆیو لەناو بەعسیشدا وەك موجاهیدینی خەلقتان لێ دێت، ئەوەی چارەسەرە بۆ ئێوە ئەگەر یەکێتی وتوێژی لەگەڵدا کردن زۆر توندو تیژ مەبن چونکە ئەگەر بگەڕێنەوە بارەگاکەتان لە کۆیە وەکو لەهەردوو حیزبەکەدا بن وایە.

لەسەردانێکمدا بۆ مەکتەبی سیاسی یەکێتی نیشتمانی کوردستان لەهەولێر، دوو بەدوو لەگەڵ جەنابی د. فوئاد مەعصومدا دانیشتینو بە دوورو درێژی باسی هەڵوێستی خۆمو سەردانەکەم بۆ دەفتەری سیاسی

دیموکرات کردو پێم وت: دوژمنانی ئێوه بـه تێکڕایی باسی نا بـەجێی ئـەو کارەی ئێوه دەکەن‌و دۆستانیشـتان هیچ بەڵگەیـەکی دروسـتیان پـێ نـیـیـه بـۆ بەرگری کردن له ئێوه، خەڵکی بەوه قایل نابێت کە پێیان بڵێن لەبەر ئەوەی هیـــچ ســـنورێکمان بەدەســـەتەوه نـــەماوه ناچـــارین لەگـــەڵ ئـــێراندا بەرژەوەندیـیـەکانمان یـەك بخـەین بـۆ سـوود وەرگرتـن لـە سـنوورەکەیان، هەرگیز جـەماوەری کورد بـەوه ڕازی نـابێت کـه لـه ژێـر سێبەری حـیزبێکی کوردیدا سوپای ئێرانی دەست درێژ بکاته سەر حزبێکی کوردی تر.

سـوپاس بـۆ خـوا پـاش ماوەیـەك لـە سـەر ئـەنجامی ووتـوێـژ کـردن لـەنێوان یەکێتی‌و دیموکراتدا، برا دیموکراتـەکان گەڕانـەوه بارەگاکانی خۆیـان‌و تەنـها ئێران لەم نێوانەدا سوودمەند بوو، چونکه توانی بەهۆی ئەم کارەیەوه ساردی دروست بکات لـەنێوان کوردەکـانی ئـێران کوردەکـانی عـێراقدا، هێشتا بریـنی هێرشەکەی پارتی‌و کۆماری ئیسلامی بۆ سەر دیموکراتەکان سارێژ نەبوو بوو، بەهۆی یەکێتییەوه جارێکی تر بریندار کرانەوه، بەڵام بـەراستی هەڵوێستی جـەماوەر بەرامبـەر دیموکراتـەکان جـێی سـەرنجدان بـوو، بـه تایبـەتی دانیشتوانی کۆیـه، خەڵکەکـه زۆر بـه دڵسۆزانەوه دەرگـای ماڵەکانیان خسـتـه سەر پشت بۆ پێشوازی کرد لێیان، ئەمەش کاردانەوەی ئەو بەدەمەوه هاتنەی خـەڵکی کوردسـتانی ئـێران بـوو کـه لـه ڕەوەکەدا لەسـەر داواکـاری دیموکـرات دەرگاکانیـان بـۆ خـەڵکی کوردسـتانی باشـوور خسـته سـەر پشـت‌و بەهـەموو شێوەیەك کۆمەکیان دەکردن.

ئەوەی ئەرکی سەرشـانی دیموکراتـه لـەم بارودۆخـەدا هێنانـەوه جـێی دڵـی کوڕەکـانی ئێرانـەو لـه ڕێگـای بـڵاو کراوەکانیانـەوه بـۆ ئـەو خەڵکـەی ڕوون بکەنەوه که ساردی نێوان کوردی ئێران‌و کوردی عێراق تەنها له بەرژەوەندی حکومەتی عێراق‌و ئێرندایەو هیچی تر.

کاتێك که هەولێر بەدەست یەکێتیی نیشتمانیی کوردستانەوه بوو زۆرێـك لـه نیشـتمان پـەروەران‌و خـێرخوازانی دەرەوەو نـاوەوەی وڵات هـەولیان

لەگەڵدادا بەبێ شەڕو كوشتار هەولێر لە هێزە چەكدارەكان چۆڵ بكات بۆ ئەوەی لەگەڵ پارتیدا دانیشن‌و وتووێژ لەسەر چۆنیەتی بەڕێوەبردنی هەولێر بكەن بەهەردوولا، بەڵام یەكێتی بەم چارەسەرە قایل نەبوو بەڵكو دەیوت دەبێ پارتی چارەسەر بۆ هەموو كێشەكانمان دابنێت ئینجا ئێمە هەولێر لە هێزی چەكدار چۆڵ دەكەین، كاتێك بەڕێز مام جەلال فەرمووی (پارتی دەبێ بە دووربین سەیری هەولێر بكات) وای لە پارتی كرد كە هەموو رێگا چارەیەك پەسەند بكات بۆ ئەوەی دەست بگرێتەوە بەسەر هەولێردا، ئەوەبوو لە ٣١/ئاب/١٩٩٦ سوپای رژێمی بەعسی هێنایە سەر هەولێر بە بەرچاوی ٩٥٪ دانیشتوانەكەوە بۆ لێدانی هێزەكانی یەكێتی.

كاك خورشید شێرە كە پارێزگاری هەولێر بوو لە ٣٠/ئاب/١٩٩٦ لە هاوینە هەواری صلاح الدین كۆبوونەوەی بە زۆربەی كادیرانی پارتی دەكات‌و دەڵێت: ئێمە مەبەستمان لەم هێرشە بۆ سەر هەولێر گرتنەوەیەتی بەهەرچی شێوەیەك بێت، هەتا ٧٢ سەعاتی تر ماڵ بۆ ئێوەو سەر بۆ ئێمە، ئەوەبوو توانیان بەهۆی یارمەتی تانكەكانی سوپای عێراقیەوە سەركەوتوو بن لە هێرشەكەیاندو هەولێر بگرنەوە، ئەو هێزە كە هاتەوە ناو هەولێر بەجۆرێك مامەڵەیان لەگەڵ خەڵكی هەولێردا كرد بەتایبەتی لەگەڵ ئەو كەسانەدا كە سەر بەیەكێتی بوون، مەگەر تەنها صدام حسین لەگەڵ كوێت‌و خەڵكی كوێت دا كردبێتی، لەماوەی ئەو ٧٢ سەعاتەدا كە بۆیان دیاری كرابوو هەرچی خوا پێی ناخۆش بێت ئەنجامیان دا لە تاڵان كردن‌و دزی‌و كوشتن‌و فرانـدن‌و تەعەدای ناموس، ئینجا لێپرسراوانیان خۆشبەختانە توانیان دوای ٧٢ سەعاتەكە كۆنترۆڵی بەرەڵڵاییەكەی ناو هەولێر بكەن، بەڵام وەكو عەرەب دەڵێ (بعد خراب البصرە) دوای وێران كردنی بصرە!

كاك فەرەنسۆ حەریری لەوتارێكیدا لەسەر تەلەفزیۆن بە شانازیەوە وتی: سوپای عێراقیمان بۆ حەوت رۆژ بەكرێ گرتبوو، رژێمیش لە ئێزگەو تەلەفزیۆن‌و رۆژنامەكانی دا بڵاویان كردەوە كە سوپای عێراقی

بەسەرکردایەتی قصی صدام حسین بەهۆی یارمەتی کوردە دڵسۆزەکانی (شمال)ەوە توانیان هەولێر پاك بکەنەوە لە ئەلقە لەگوێکانی ئێران و ئەم کارەمان جێی پێشوازی کردن بوو لەلایەن جەماوەرەوەو لە ئەنجامدا ئەو ئەفسەرانەی کە بەم کارە هەستابوون (نوط شجاعة)یان درایە.

ئەوەی جێی سەرنج بوو تالآن چییەکان کە ماڵێکیان تالآن دەکرد دەیانووت فەرمانی کاك مەسعودمان پێیە، بۆ نموونە لە ١٩٩٦/٩/١ (نادر لەق لەق) کە ئامر مەفرەزەیەکی جاش بوو هەڵدەکوتێتە سەر ماڵی مەلا (مەجید گوێزی) بۆ تالآن کردنی، ئەویش لە تاوا هانا دەبات بۆ باوکی مامۆستا سەعد مەلا عبدالله، ئەمیش روو دەکاتە نادر لەق لەق و پێی دەڵێت: کوڕە شەرم ناکەیت، تۆ نازانیت ئەمە ماڵی کێیە؟ ئەویش لەوەڵامدا دەڵێت: باش دەزانم، بەڵام من بە فرمانی کاك مەسعود ئەو کارەم ئەنجام داوە، لە چەند رووداوێکی ئاوادا خەڵك بۆی روون بووەوە کە ئەو خراپەکارییانە هەمووی بە فەرمانی بنەماڵەی مەلا مصطفی بارزانی ئەنجام درابوو.

حزبەکەی بارزانی پەیتا پەیتا لە بڵاوکراوەکانیدا پروپاگەندەی بۆ ئەوە دەکرد کە رژێم دان بە مافەکانی کورد دادەنێت و بەم زووانە بەیانێك لە نێوانماندا دەردەچێت لەم بارەیەوە، بەڵام ئەوە ساڵی (٢٠٠٠)ەو هێشتا ئەو بەیانە دەرنەچووە!!

حزبەکەی بارزانی تەنها بەوەوە نەوەستایەوە کە هەولێر بگرێتەوە، بەڵکو شکاندنی هێزەکانی یەکێتی بەهەل زانی و هەتاسونووری ئێران دوایان کەوتن، مانەوەی هێزەکانی یەکێتی بۆ ماوەی ئەو (٤٠) شەوەی کە مانەوە لە نزیك سنووری ئێران، هۆکارێك بوو بۆ خۆ کۆکردنەوەو پیلان دانان و هێرش بردنە سەر هێزەکانی پارتی دوای گەڕانەوەی هێزەکانی رژێم بۆ شوێنەکانی خۆیان، ئەگەر یەکێتی فشاری نێو دەوڵەتی لەسەر نەبوایە ئەوا دڵنیا بووم نەك هەولێر بەڵکو هاوینە هەواری سەلاحەدین و زۆر شوێنی تریشی لە پارتی پاك دەکردەوەو تەنها بە کۆیە قایل نەدەبوون.

ئەم باسەم بۆ ٣١/ئاب تەنها ئەو زانیارییانەن کە خۆم بە شەخسی ئاگاداربووم‌و لە داهاتوودا بۆچوونی چەند کەسایەتیەك دەخەمە بەرچاوتان لەسەر ئەم رووداوە.

لە دوای تێپەڕ بوونی ٢٠ رۆژ بەسەر کارەساتی ٣١/ئاب سەردانێکی سکرتێری پارتی دیموکراتی کوردستان (مامۆستا علی عبدالله)م کرد، پرسیاری لێ کردم ئایا خەڵك چۆن باسمان دەکات؟ بارودۆخی ئێستای هەولێر چۆنە؟ کاتێ یەکێتی لێرە بوو باشتر بوو یان ئێستا؟ دوا رۆژمان چۆن دەبێت؟

لەوەڵامدا وتم: یەکێتی نیشتمانیی بەهۆی سلبیاتەکانیانەوە لە ٣٥٪ی دانیشتوانی هەولێریان لەگەڵدا مابووە، لایەنگرانی ئێوە نزیکەی ٦٥٪ بوو. بەڵام ئێستاکە ٦٪ی جەماوەرتان لەگەڵ نەماوەو هیچ کوردێکی نیشتمان پەروەر لەو باوەڕەدا نەبوو ئێوە دەست بخەنەوە دەستی صەدام‌و بەیەکەوە بێنەوە هەولێرو تاڵانی حەڵاڵ بکەن بۆ دەست‌و دایرەکانتان، ئەم کارانەتان زۆر زەحمەتە سڕینەوەی لە مێشکی خەڵکداو دوا رۆژتان زۆر تاریکە، بەڵام سیاسەت بەرو پشتی نییەو ئەگەر لەکاتی ئەم شکستەکەی یەکێتیدا ئێوە دەستی ئاشتی درێژ کەن بۆ مام جەلال سەرمایەیەکی گەورە دەبێت بۆ ئێوە چونکە ئەگەر وا نەکەن بارودۆخەکە بەم شێوەیە بمێنێتەوە سەرئەنجامەکەی بەنەمانی کورد تەواو دەبێت.

مامۆستا یونس رۆژبەیانی بەبێ دەنگی دانیشتبوو تەنها گوێی دەگرت‌و هیچ بەشداری نەکردین، کە کۆتاییم بەم قسانە هێنا مامۆستا علی عبدالله وەڵامەکەی ئەوەندەبوو تەنها هەردوو دەستی بەنزمی پان کردەوە ئەدووت سواڵکەرەکەی بەر مزگەوتی گەورەیە، کە ئەمە دوو مانا دەبەخشێت (یان ئاگام لێ نەبووە، یان بێ دەسەڵاتم).

هەفتەیەك دوای ئەم سەردانەم جارێکی تر چوومەوە خزمەتی مامۆستا علی عبداللەو باسی نەبەزی برازام بۆ کرد کە بە بیانووی ئەوەی جەلالییە ئاسایشی هەولێر بردوویانە، زۆر ئازارو ئەشکەنجەیان داوەو ٩٠٠ دۆلارو شەش

سەد دیناریان لێ سەندووە، لە کاتێکدا ئەو تەنها کوڕێکی کاسبەو لە بازاڕی دۆلارەکە ئیش دەکات، لە ئەنجامدا نامەکەی منی ئاراستە کرد بۆ کاك مەسعودو پاش ماوەیەك لە ئاسایشی گشتییەوە ناردیان بە شوێنماو وتیان بچۆ لە (مصیف) چاوت بە مامۆستا کریم سنجاری بکەوێت.

کە گەیشتمە ئەوێ ئەو لێپرسراوەم نەدەناسی کە بردیانم بۆلای، پێی وتم کاك مەسعود نامەیەکی ئاراستەی ئێرە کردووە، بەڵام ئێمە بێ بەریین لە ئەنجام دانی ئەو کارە، منیش وتم لەگەڵ ئەوەشدا دەبابەتان هێناوەتە شارەکەوەو خاوەنی ابراهیم خەلیلیشن کەچی هێشتا خەڵکی رووت دەکەنەوە، ئینجا کە زانی قسەکانم زۆر رەقو قورسن پێی وتم: وا باشترە چاوت بە کاك کەریم سنجاری بکەوێت.

کاتێك چاوم بە بەڕێز کریم سنجاری کەوت بەهەمان شێوە ئەمیش فەرمووی ئێمە ئاگاداری ئەو دەست درێژیە نین کە کراوەتە سەر برازاکەی جەنابتان، ئیتر من لەمە زیاتر لەسەر ئەو مەسەلەیە نەرۆیشتمو ئەمە هۆکارێك بوو بۆ ئەوەی بتوانم چەند جارێکی تر چاوم بەم پیاوە بەڕێزە بکەوێتەوە و لەهەموو چاوپێکەوتنەکانیشمدا باسم لەو هۆکارانە دەکرد کە دەبنە هۆی بەدەست هێنانی خۆشەویستیو نزیك بوونەوەی جەماوەر لە پارتییەوە، جەختم لەسەر ئەوە دەکرد بیر لە کوشتنی (مام جەلال) نەکەنەوە کە بەهەمان شێوە یەکێتیشم ئاگادار کردۆتەوە بیر لە کوشتنی کاك مەسعود نەکەنەوە)و بۆم دوویات دەکردەوە رزگار کردنی کوردستان بەبێ یەکبوونەوەتان زۆر زەحمەتە؛ لەدوای ۳۱ی ئابەوە زۆر بەگەرمی هاتوچۆی دەزگای پاراستنی پارتی و دەزگای زانیاری یەکێتیم دەکرد لەئەنجامی هاتوچۆ کردنم و نزیك بوونەوەم بۆم دەرکەووت پاراستن دەزگایەکە لەڕێزەی دەزگاکانی موخابەراتی عیراقی میتی تورکی دایە وەئەم دەزگایە لە ۹۰٪ لەخزمەت کوڕانی مەلا مصطفی و نەوچیرڤان بارزانیدا بەتایبەتی دوای ئەوەی کەبەڕێز کاك مسرور بارزانی تەعین کرا بەسەرۆکی

ئەم دەزگایە لە ١٠٪ ی لەبەرژەوەندی خەڵك و میللەت دا بەکار دەهێنرێت بەڵام دەزگای زانیاری ٤٩٪ ی لەبەرژەوەندی یەکێتی نیشتیمانی دایە و لە ٥١٪ی لەبەرژەوەندی میللەتەکەدایە.

**تێبینی :**

لەسەرانسەری جیهاندا ئەم دەزگایانە هەیە بەتایبەتی لەدەوڵەتە پێشکەوتوەکاندا ئومیدەوارم کەی سنوری کوردستانی باشور گەیشتە جبل حمرین لەبەر شارەزاییم لەم دەزگایانەدا وەکو کارمەندێکی پرسگە لەم دەزگایە کار بکەم بۆ خزمەتی کوردو کوردستان.

گەیشتمە ماڵی شێخ محمد خالدی کوڕی شێخ احمد بارزانی لە گوندی رێزان و بە پاسەوانەکەم راگەیاند دەمەوێ چاوم بە جەنابی شێخ بکەوێت، بەڵام پاسەوانەکە ماوەیەك لەبەر دەرگا رای گرتم، ئینجا چووە ژوورەوە بۆ لای جەنابی شێخ و پێی راگەیاند رەفیق پشدەری دەیەوێ چاوی پێت بکەوێت، بە پەلە خۆی هات بۆ پێشوازیم و لەپاسەوانەکە توورە بوو، منیش وتم گلەیی لەو مەکە ئەو چوزانێت من کێم، ئینجا دوو بەدوو چوینە ژوورەوە بۆ ناو کۆشکەکەی لەوێ چەند بارزانییەکی بە تەمەنی بانگ کردو باسی پەیوەندییەکەی منی بەو بنەماڵەیەوە بۆ کردن و وتی: ئەم پیاوە هەر کاتێك کورد دوچاری مەترسی بووبێت هانای بۆ من هێناوەو دڵنیام لەوەی کە مام جەلال ناردویەتی، وتم سێ چوار ساڵیش دەبێت لە تەلەفزیۆندا نەبێت چاوم بە مام جەلال نەکەوتووە، وتی ئەی مەسعود؟ وتم ئەویش هەروەها، فەرمووی من هەواڵتم لە مەسعود پرسیوە دەیوت دەیبینم، وتم عبیداللە خەونی بەرێزانەوە دەدیو صدام لەناوی بردوو چاوی نەکەوتەوە بە رێزان، بەراستی شوێنەکەت زۆر خۆشە، چاکت رازاندۆتەوە، لە کێڵگە ئەوروپییەکان دەچێت، وتم ئایا تۆ ئاگات لەبارودۆخی ئێستای کورد نییە؟ رۆژ نییە چەند جارێك رەحمەت بۆ شێخ ئەحمەدی باوکت نەنێرم کە دەیفەرموو: (ئیشی

کوردان پوچە)، هێشتا ئێمە کیانێکی سیاسی‌مان نی‌یە مام جەلال‌و کاك مەسعود ئەم شەڕە براکوژی‌یەیان بۆ هەڵگیرساندین؟ ئەگەر بەردەوام بن لەم دووبەرەکییەدا لەوە دەچێ زۆر لەم شوێنە خۆشەدا نەمێنیتەوە چونکە ئەم سیاسەتەی کاك مەسعود پیادەی دەکات، یاری کردنە بە ئاگر، نەدەکرا رێگات لە کاك مەسعود بگرتایەو نەتهێشتایە (حسین ئاغای سورچی)[٣٢] بکوژێت‌و

[٣٢] حسین ئاغای سورچی: پێش هێرش بردنیان بۆ سەر حسین ئاغا بەچەند مانگێك چوومە گوندی کەڵەکین، بۆی گێڕامەوە چەند رۆژێك بەر لە دانیشتنەکەمان فەرەنسۆ حەریری هاتبوو بۆ لامان، ئاگاداری کردمەوە کە زۆر چاودێری ئەو ٢٠ ماڵە بارزانی‌یە بکەم کە لێرەن، منیش پێم وت ئێمە شاخین کێو نین؟
من لەو رۆژەوە هەستم بە ناکۆکی کرد لەنێوان هۆزی سورچی و بنەماڵەی بارزانی‌دا، ئەوە بوو بە فەرمانی کاك مەسعود هێرشیان بردە سەر دێی کەڵەکین‌و حسین ئاغایان کوشت‌و هەموو دێکەشیان تالان کرد، بەلام عمر ئاغایان بەردەست نەکەوتبوو چونکە لە تاران بوو.
کاتێك عمر ئاغا گەڕایەوە بۆ هەولێر چومە خزمەتی بۆ سەرخۆشی کردن، باسی ئەو ستەمەی بۆ کردم کە لێیان کراوە، وتم راستە ئێوە کێشەی هۆزگەرایەتی‌تان هەبوو بەلام ئەوە ئاشکرایە کە ئەم کارە لەسەر فەرمانی سەرۆك کۆماری عێراق لەلایەن کاك مەسعودەوە ئەنجام دراوە لەسەر ئەوەی بارزان تکریتی کە پەیوەندی پێوە کردبوویت بەنامە لە دوای تەواو بوونی دانیشتنەکەی ڤیەننا پێی وتبووی کاغەزی سپێت بۆ ئیمزا دەکەین بەمەرجێك واز لەم کوردایەتی و حزبایەتی‌یە بێنە، وەلامت دابوەوە و: من چەند کاتە خزمەتی ئێوەم کردووە بەلام لە ئێستا بەدواوەوە بڕیارم داوە تا مردن خزمەتی گەل‌و نیشتمانەکەی خۆم بکەم
لە ساڵی ١٩٨٣ لە سەر فەرمانی مام جەلال من‌و بازبانی کوڕم‌و دوو پێشمەرگە بەنهێنی چووینە دێی کەڵەکین بۆ لای حسین ئاغاو عمر ئاغا، لەماوەی ئەو پێنج رۆژەدا کە لەوێ ماینەوە داواکاری‌یەکانی مام جەلالمان بۆ خستنە روو، ئەوانیش فەرموویان ئەگەر بێت‌و مام جەلال‌و کاك مەسعود رێك بکەون ئەوا ئێمە ٣ ملیۆن دیناریان پێشکەش دەکەین، ئینجا پێش گەڕانەوەمان کلاشینکۆفێکی تازەیان پێشکەش بە بازیان کرد کردو ٢٥٠٠٠ دینارو دەمانچەیەکی تازەیان دامێ بە دیاری بۆ مام جەلال، بەلام من تەنها دەمانچەکەم لێ وەرگرتن‌و وتم مام جەلال پێی راگەیاندووم پارە وەرنەگرم‌و دەمانچەکەم تەسلیم بە مام

ماڵەكانیان تاڵان بكرێت، ئەنجام دانی ئـەم كاره رەنگدانەوەیـەكی زۆر خراپـی دەبێت بۆ هۆزی بارزان‌و دوژمنتان بۆ خۆتان زیاد كـردو چواردەوری خۆتـان كردووه به دوژمن، جەنابی شێخ لەوەڵامدا فەرمووی: من ئاگادار نەبووم لـەو كارەو دەبوایه پێـش روودانـی ئاگادارت بكردمایەتـەوە، چونكـه نەمدەهێشت بیان كوشتایه، وتم ئەی چۆن رێگات دا كاك مەسعود دەست بخاتـەوه دەستی صدام حسـێن كـه تاوانبـاره بـه كوشـتنی ۸۲۰۰ بـارزانی (۳٦)یـان بـراو ئـامۆزاو كەس‌و كاری خۆتان بوون ئەی بیرتان چووەوه بەعسییەكان چییـان كـرد بـه ئافرەته بارزانییەكانی قوشتەپه، بارزان بەلای خەڵكەوه هەمیشه مەشخەڵی رزگـار كردنـی كوردسـتان بـووه بـەڵام ئێسـتا لـه ۷۰٪ی جـەماوەرتان لێ تەكیوەتەوەو ئەگەر رێگا چارەیـەك نەدۆزنـەوه بـۆ ئـەم بارودۆخـەی ئێستای كوردستان ئەوا ئەم ئەزموونی ئازادییه لەناودەچێت لەهەموو كوردێك‌و ئـەو كاته ئێوەش نـاتوانن لـه بـارزان بمێننـەوە، راسـته ئێسـتا پـارەو دەسـەڵات لای ئێـوەی بارزانییـه بـەڵام زۆربـەی جـەماوەرتان لێ تەكیوەتـەوه بـه تایبـەتی نزیكەكانی خۆتـان، وتـی مـن هیـچ پەیوەندییـەكی سیاسیم بـه مەسـعودەوه نییەو خەڵكێكی زۆر خراپ لەدەوری كۆبوونەتەوەو (نهادی) بـرای لـه ژیانیـا دوو تەقەی نەكردووه ئێستا هەموو شتێك بەدەست ئەوە، بەشێوەیەك باسی (عبد المهیمن بارزانی) كـرد كـه رووم نایـه بینوسـم، ئـەو شـەوه لـه خزمـەتی شێخ محمد مامەوەو به حەوت بارزانییەكەی فەرموو ئاگاتان له خۆتـان بێت مێشكتان تێك نەدات، وتم ئەو قسەیەیان بۆ دەگێڕمەوە كه لـه ساڵی ۱۹٦۳ بـه شێخ احمد بارزانیم وت: ئەگەر بارزانی بچێته سەر ئیمپراتۆریەتی ماوەت بۆ لەناو بردنی جەماعەتی ابراهیم احمـد، دووبـەرەكی بـەرپا دەبێـت‌و پـاش ۲۰

---

جەلال كرد.

ئـەم هەڵوێسته برایانـەیـەی عمر ئاغاو حسین ئاغـام بەهـەمان شێوه بـۆ كـاك مەسـعود گێڕایەوه لەكاتی هاتوچۆ كردنم له نێوان یەكێتی‌و پارتی.

رۆژی تر یان ٢٠ هەفتەی تر یان ٢٠ مانگی تر یان ٢٠ ساڵی تر یان ١٠٠ ساڵی ئەگەر کابرایەك جەمەدانییەکی سووری لەسەر بێت هەموو خەڵك نەفرەتی لێ دەکەن‌و لەتاوا دەیشارێتەوە.

ئەوەی جێی سەرنجە من لە ساڵی ١٩٦٣ دا ئەم پێشبینییەی خۆمم بە شێخ ئحمەد بارزانی وتووەو ئێستا ساڵی (٢٠٠٠)ەو تەنها ٣٧ ساڵ بەسەر ئەو قسەیەم تێپەڕ بوە کەچی لە لەهەندێ شوێنی کوردستان جامانەی سوور نابینیت‌و لەبەشێکی زۆریشیدا زۆربەی خەڵك لێیان بێزارە، ئاخۆ دوای ٥٠ ساڵی تر چارەنووسی جامانەی سوور لە کوردستاندا چی بێت؟

لە دوای ٣١ی ئاب بە چەند مانگێك سەردانی برای دڵسۆزو نیشتمان پەروەر کاك وشیار زێباریم کردو هەموو سەردانێکم بۆ لای ئەم بەرێزە زیاتر لە ٣ سەعات دەخایاند کە تیایدا باس لە بارودۆخی ئەو رۆژەی کوردستان دەکەین هەر یەکە بە بۆچوون‌و لێکدانەوەی خۆمان لەم سەردانەدا، باسم لەوە کرد کە هەرگیز لە ژێر سێبەری صدام دا کێشەی کورد چارەسەر ناکرێت‌و ئێوە تا ئاوا ناکۆك بن بەهیچ شێوەیەك رژێمی بەغدا ئاورتان لێ ناداتەوە بایەختان پێ نادات‌و ئێوەش بەبێ یەکتر کێشەی کوردتان بۆ چارەسەر ناکرێت.

لەسەردانێکی ترمدا بۆ لای ئەم پیاوە وتم: من دەزانم کەی رێك دەکەون؟ هەر کاتێك یەکگرتووی ئیسلامی‌و بزووتنەوە بوون بەیەك ئێوە لە ترسدا رێك دەکەون چونکە ئەگەر ئەو دوانە بوون بەیەك ئێوە لاواز دەبن.

لەوەلامدا فەرمووی: راست دەکەیت.

ئینجا پێم وت کەی صدام روخا ئێوە رێك دەکەون‌و ئەو دوو حزبە بوون بەیەك رێك دەکەون.

وتی: راست دەکەیت.

وتم چاکترین رێگا چارە بۆ ئێوە ئەوەیە کە لەسەر بەرژەوەندی گەلی کورد رێك بکەون، چۆن لەنێوان کۆشکی سپی‌و کرێملن دا تەلەفونێك هەبوو پێیان

دەوت (هێڵی سوور)[٣٣] بەهەمان شێوە وا پێویست دەکات لەنێوان مام جەلال و کاك مەسعوددا هێڵی سوور هەبێت بۆ ئەوەی لە کاتێکدا صدام رووخا پەیوەندیان بەیەکەوە هەبێت بۆ دەست بەسەراگرتنی (خانەقین و کەرکوك و سنجارو شێخان و زەممارو تەلەعفەر) لەماوەی ئەو ٦-٧ رۆژەدا کە ولات وروژاوەو هێشتا کۆنترۆڵی بارودۆخەکە نەکراوە لەلایەن حکومەتی تازەوە، بۆ ئەوەی حکومەتی تازە کە جێی خۆی بەتەواوەتی کردەوەو بارودۆخەکە هێور بووەوە وتوێژتان لەسەر ئەم ناوچە تازە ئازاد کراوانە لەگەڵدا بکات نەك لەسەر ئەو شارانەی کە خۆتان لە ساڵی ١٩٩١ەوە بە دەستانەوەیەو من دڵنیام لەوەی کە جارێکی تر شەڕ نابێتەوە لەنێون یەکێتی و پارتی چونکە بۆتان روون بووەوە بەشەڕ کێشەکان کۆتایی نایەت، ئەوەتا ئێوە توانیتان بە یارمەتی سوپای عێراق یەکێتی راو بنێنە سەر سنوور بەلام ئەوان توانیان بەدەست و بازی خۆیان و بەیارمەتی راجیمەی ئێرانی وەلامتان بدەنەوەو ئەگەر فشاری نێو دەوڵەتییان لەسەر نەبوایە هەولێریشیان لێ دەسەندنەوەو ئەگەر حلفی ناتۆ (ترکیا) نەبوایە لەم هێرشەی دوایی یەکێتیدا هەتا دهۆك و زاخۆ نەدەوەستانەوە، ئێستا هەردوولاتان تاقەتتان لەشەڕ چووەو بۆتان دەرکەوتووە کە صدامیش کێشەی کورد چارەسەر ناکات، جا بۆیە باشتر وایە پێش رووخانی صدام ئێوە لە نێوان خۆتاندا رێك بکەون و ببنەوە بەیەك، چونکە ئەگەر صدام روخاو مام جەلال لە قەلاچوالان و کاك مەسعودیش لە هاوینەهەواری سەلاحەدین بێت هەر ئاواهی نارێك بن ئەو کاتە دەبێ بڵێین

---

[٣٣] سەرۆکی هەردوو دەوڵەتی روسیاو ئەمریکا بەهۆی ئەم هێڵە نهێنییەوە راستەوخۆ پەیوەندییان بەیەکترەوە دەکرد، ئەوەکو لە پڕ فڕۆکەوانێك یان هەر هێزێکی سەربازی تر لە خۆیەوە بەکارێکی نابەجێ هەستێت و ولاتەکەی بەرامبەری بەبێ ئاگایانە وەلامی بداتەوە لە ئەنجامدا جەنگی سێیەمی جیهانی بەرپا بێت.

لە کوردستانی باشووردا ئێمە چەند ناوچەیەکی ئازادکراومان بەدەستەوە بوو کاتی خۆی.. لەبەر ئەوەی من دڵنیام لەوەی جەنابتان رێزێکی تایبەتی‌یان هەیە لەلای کاک مەسعود، داوات لێ دەکەم ئەم پێشنیارەی من بخەیتە بەردەم کاک مەسعود بەڵکو پەسەندی بکات چونکە ئەو کارە لەبەرژەوەندی هەموو گەلی کوردە.

جەژنێك لە ساڵی ۱۹۹۸ دا چوومە خزمەت کاک مەسعود بۆ جەژنە پیرۆزە، پێی وتم : ئەوە بۆ وا سەرت سپی بووە؟ وتم لە خەفەتو مەراقی تۆدا چونکە ئەوەندە خەفەتت لێ دەخۆم، ئینجا پاش تۆزێك ویستم بچمە دەرەوە کاک عبدالله ئاگرین پێی وتم: کاک مەسعود دەفەرموێت نەڕوات با بێت لەلامان دانیشێت، ۲۰ دەقیقەیەك لە خزمەتی مامەوە دوای ئەوە روخسەتم لێ وەرگرتو هاتمە دەرەوەو چوومە خزمەت کاك وشیار زێباری، بەڵام هێشتا لەخەو هەڵنەستابوو، منیش لە دیوەخانەکەی دانیشتم کۆمەڵێك خەڵکی تریشی لێ بوو، لەپڕ وتیان جەنابی شێخ هات، پیاوێکی چوار شانە بوو عەگالێکی رەش‌و جامانەیەکی سوری بەسەرەوە بوو، عەبایەکی رەشیشی دابوو بەسەر شانیدا، کە هاتە ژوورەوە بە کوردی قسەی کرد، منیش چووم بەخێرهاتنم کردو پێم وت: (لەلای ئێمە کابرایەك هەبوو ناوی عەلی حەسەن ئاغای مانگور بوو، سەرۆك هۆزی مانگور بوو، لە خاڵی پشکنینی شارۆچکەی رانیە لە پۆلیسێك دەدات، کە قایمقام بەمە دەزانێت دەچێتە لای عەلی ئاغاو پێی دەڵێت: تۆ لەم رۆژانەدا وێنەت لەگەڵ سەرۆك صدامدا دەرچووە، بۆ تۆ جوان نییە لە پۆلیسێك بدەیت، ئەویش دەڵێت: شێخ حسێنی بۆسکێن گەورەترین پیاوە لەناوچەی رانیەو پشدەردا لەبەنزین خانەیەکی بەغدا پۆلیسێکی عەرەب لەسەر بەنزین لێی داوە منیش تۆڵەی شێخ حسین لێرە دەکەمەوە) کابرای عەرەب وتی: قوربان تۆ من ناناسی‌و نازانی من کێم‌و بۆچی هاتووم و چی رووی داوە؟ من نوێنەری صدام‌و

هاتووم لەگەڵ کاك وشیاردا چاوم بەکاك مەسعود بکەوێت، چونکە بارودۆخی صدام ترسناکەو لەوانەیە لەم رۆژانەدا ئەمریکا بە فڕۆکە لێی بداتو دژایەتی تریشی بکات، دەمەوێت بزانم ئێوە هەڵوێستتان چی دەبێت؟ چونکە بەیارمەتی سەرۆك صدام حسین هەولێرتان گرتەوە ئەگەر سوپای ئەو نەبوایە جلال هاوینە هەواری سەلاحەدینیشی دەگرت،

منیش وتم: یارەبی لە جیاتی جارێك ئەمریکا ملیۆنێك جار لەصدام بدات. بەڵام ماڵە کوردەکان پارێزراوبێت، مەسعود بارزانی سەرۆکی کوردەو ئێمە هەمووومان لە ژێر فەرمانی ئەوداین، تاکە هەڵە کە هەیبێت ئەوەبوو کە دەستی خستەوە ناو دەستی صدام حسین، مام جەلالو کاك مەسعود برانو صدام بەتەمای ئەوە نەبێت دوژمنایەتی یەکتر بکەن.

لەم کاتەدا پاسەوانەکانی کاك هوشیار بە پەلە دیوەخانەکەیان بەجێ هێشتو چوو بوون بە کاك وشیاریان وتبوو، شێخمان میوانەو کاك رەفیق تێکی داوە، سەیرم کرد کاك وشیار بە پەلە هات، بە دەستێکی تەوقەی لەگەڵ شێخدا کردو دەستەکەی تریشی خستبووە سەرشانی من، وتم جەنابی شێخ من سکرتێری ئەم پیاوەم، من سیاسی نیمو من قسەکانی ئەم لەبەر دەکەمو دەیلێمەوەو ئەو بەمنی وتووە کە دۆستانی حکومەتت بینی وایان پێ بڵێو ئەو لەلای تۆ ئێستا قسەکان دەگۆڕێت، کاك وشیار فەرمووی: دوێنێ شەو کاك مەسعود و باسی تۆی دەکردو سەلامی لێ دەکردیت.

وتم ناوێرێتو نایەوێت من ببینێت چونکە بەرامبەر من (مادە)ی پێ نییە بەرگری لەخۆی بکات.

زیاتر لە پانزە کەس لەوێ دانیشتبوونو زۆربەیان بە تەمەن بوون یەکێکیش لەوانە کاتی خۆی مامۆستای کاك وشیار بوو، بەشێکی تریان خەڵکی عەقر بوونو بە سۆرانیو بادینانیش وتوێژیان دەکرد، من بە عەرەبی قسەکانم بۆ جەنابی شێخ دەکرد وتم بۆ ئەوەی باش تێبگات خۆی گێل نەکات، ئاگاداربووم کە ئامادەبووان تێکڕا زۆر خۆشحاڵ بوون بە

قسەکانم.

رۆژێکی هەینی سەردانی حاکم رشید عبدالقادر (سەرۆکی دادگای تەمیزی هەرێمی کوردستان)م کرد لەماڵەوە، باسمان لە بارودۆخی ئەو رۆژەی کوردستان دەکرد بە تایبەتی رووداوی ٣١/ئاب، حاکم رشید زۆر خۆی بەبێ دەسەڵات نیشان داو وتی: سەد خۆزگە هەردوو دەستم ببڕدرایەتەوەو لەدامەزراندنی پارتی دیموکراتی کوردستاندا بەشدار نەبوومایە.

کاتی خۆی من زیاتر لە ٢٢ ساڵ ماڵم لەبەغدا بوو، دۆستایەتیم لەهەموو روویەکەوە لەگەل خەڵکدا زۆر باش بوو، بۆیە چوومە بەغداو بەو نیازەی سەردانی ئەو برا کوردانەی ئەوێ بکەمو لە نزیکەوە بۆچونیان وەرگرم لەسەر بارودۆخی کوردستان بە تایبەتی لەسەر رووداوەکەی ٣١ی ئاب، چونکە کوردەکانی بەغداد بەهەموو شێوەیەك دەوری بەرچاویان هەبوو لە زۆربەی گۆڕانکاریەکاندا، بەڵام کە چوومە لایان بەشی زۆریان نەیان دەوێرا لە ترسی دەزگای ئاسایش رای خۆیان بەرامبەر ئەو رووداوە دەربڕن لەگەل ئەوەشدا لە هەمو کۆڕێکدا باس لەو رووداوە بوو کە چۆن مسعود بارزانی دەستی خستە دەستی صدامەوە بۆ لاواز کردنی کورد. چاوم بە کاك فوئاد عارف کەوتو پرسیارم لێ کرد چۆن دەڕوانیتە رووداوی ٣١/ئاب؟ چونکە تۆ لەمن باشتر مەلا مصطفی دەناسیت، ئایا ئەوەی مەسعود بارزانیو نێچیر بارزانی پێی هەستان جێی سەرسوڕمان نیە کە دەستیان خستە دەستی رژێمەوە بۆ کۆنترۆڵ کردنی هەولێر؟ ئێستا ئەگەر هەڵبژاردن بکەیت لە کوردستانی باشووردا بە تایبەتی لەهەولێر کە بەچاوی خۆیان دەبابەکانی رژێمیان بینی لەوانەیە پارتی ٦٪ بهێنێت، بەڵام لەگەڵ ئەمانەش هەموویدا ئەگەر دانیشنەوە بەیەکەوە بۆ چاککردنی بارودۆخی کوردستان هێشتا هەر ئەوان سەرکەوتوون.

راستە مام جەلال لەسەر سنوورەو خێمەکەی ٥ کم لە سنووری ئێرانەوە دوورە، بەڵام ئەمە ئەوە ناگەیەنێت کە جەماوەری بەدەستەوە نەماوە، کاك

فوئاد عارف وتی: تۆ پشتگیری لەکامیان دەکەیت؟ وتم: من بەهیچ جۆرێك پشتگیری لە صدامو دۆستانی صدام ناکەم، وتی: مسعود بە ناچاری ئەو کاردی ئەنجام داوەو ئەگەر وای نەکردایە ئەمانی مسۆگەر بوو، وتم کاك فوئاد تۆ دوای هەرەسەکە بۆت گێرامەوە گلەییت لە مەلا مصطفی کردووە کە لەسەرەتای شۆڕش لە ساڵی (١٩٧٤)ەوە منتان گلدایەوە تا ئێستا، لە کاتێکدا بۆ سەفەری یەك ڕۆژی هاتبوومو هەتا هەرەس چاوت بەمن نەکەوت لەگەڵ ئەوەشدا ژوورەکانمان بە تەنیشت یەکەوە بوون، لەوەڵامدا مەلا مصطفی دەڵێت خەتای کوڕەکانم بوو وەرە دوو تفم لێکە. ئێستا زۆر لام سەیرە کە تۆ بەو شێوەیە پشتگیری لە کارێك دەکەیت کە بەسەرۆکایەتی نێچیرو قوصەی ئەنجام دراوە، بەڵام بەداخەوە منو تۆ لەمێژەوە دۆستین بەڵام من تۆم نەناسیبوو، بەو شێوە توندو تۆڵە سەر بەرژێمیو پشتگیری لێ دەکەیت.

ئینجا لە کۆتایی وتووێژەکەماندا پێم وت: بەو بۆنەیەوە کە ئاوا لەگەڵ مەسعود بارزانیدا نێوانتان خۆشە، نامەیەکم بۆ مەسعود بارزانی بۆ بنووسە بەڵکو پرۆژەکەم بۆ چاك بکاتەوە، وتی زۆر سەیرە تۆ لەوساکەوە قسەی پێ دەڵێیتو ئێستا داوای چاك کردنەوەی پرۆژەکەتی لێ دەکەیت.

منیش وتم: ئەو لە پارەی خۆی بۆم چاك ناکاتەوە بەڵکو لە پارەی (بیت المال) بۆم چاك دەکاتەوە منیش یەکێکم لەو میللەتە.

پاش ماوەیەك چاوم بە برایەکی دڵسۆزو کورد پەروەر کەوت کە یەکێکە لە دکتۆرەکانی بەغدا، فەرمووی: زۆر بە ناشرینی لەگەڵ کاك فوئاددا قسەت کردووە، لەگەڵ ئەوەشدا کە ئێوە چەند شەوێك لەماڵیاندا میوان بوونو خزمەتی زۆری کردوون، وتم: لەمەش زیاتری بۆ کردووم، دوو ساڵ پێش ئێستا کە هاتم نەشتەرگەری چاوم کرد پارەی هەموو ئەو ماوەیەی بۆ دابووم کە لە ئوتێلەکە دا مابوومەوە، بەڵام ئەمانە هەمووی لەلایەكو ٣١ی ئاب لەلایەك، نازانم ئەمانە چۆن بەزەییان بەو ڕەنجەی باوکی میللەتی کورد(مەلا مصطفی)دا نایەتەوەو بەبێ بیرکردنەوە ئەو کارە نابەجێیانە

ئەنجام دەدەن.

لە ساڵی (١٩٥٨)ەوە کە چوومەتە ریزەکانی خەباتەوە، هاوەڵەکانی بەندیخانەو ئەو برا پێشمەرگانەی کە لەشاخ پێکەوە بووین شاهیدن کە من لە ئاشتیو لەشەڕدا لەبەسەلاتیو بێ دەسەلاتیمدا هەموو مەبەستێکم خزمەت کردنی ئەم گەلو نیشتمانە بووە بەێ جیاوازی، بەلگەم بۆ قسەکانم هەموو ئەو نامەو پێشنیارو راپۆرتانەیە کە پێشکەشم کردووە بە زۆربەی دەزگاکانی پارتی بەتایبەتی دوای ٣١ ئاب کە هیچ شێوازێك نەما بەکاری نەهێنم لە پاڕانەوە لە سکاڵاو لە پێشنیار کردنو لەخۆ بردنە پێشوە بەڵام بێ سوود بوو، تا ئێستاش نامەکانم ماوە لەلایان بێجگە لەمانەش چەندەها راپۆرتی جۆراوجۆرم دەنوسی کە شێوازی نزیك بوونەوەیانم لەجەماوەرەوە تیا روون دەکردەوە، هەروەها بەرزکردنەوەی باری ئابووری ئەو خەلکەی لەژێر دەسەلاتیاندایە، بۆ نموونە پێشنیارم کرد بە چەند ملیۆن دینارێك (کە هیچ ناکات بۆ ئەوان) هەموو ئەو زیانانەی کە لە دانیشتوانی هەولێر کەوتووە لە مادیو گیانی چارەسەر دەکەن، سەرئەنجام گەیشتمە ئەوەی کە من دوای کلاوی بابردوو کەوتوومو ئەمان میوانن‌و میوان دوای ساتێکی تر بێت یان چەند ساڵێك هەر دەڕواتو دڵنیابووم لەوەی کە کوڕانی مەلا مصطفی بارزانی بارگەی نەتەوایەتی (الشحنة الوطنية) یان تیادا نەماوە بەهیچ شێوەیەك، بۆیە بڕیارم دا لەسەریان بنووسم.

لەگەڵ ئەوەشدا کە چاوم بە زۆرێك لە لێپرسراوانی پارتی کەوتووە بەهەمان شێوە چاویشم کەوتووە بە برادەرانی یەکێتیو زۆر بە دوورو درێژی بەتایبەتی لەگەل برای بەڕێز د. فوئاد مەعصوم دا باسی ئەوەم بۆ کردوون بەبێ پارتی ئێوە ناتوانن فیدراڵی بەدەست بێنن لە عیراقداو چارەسەری ئێوە بۆ بەکامەرانی ژیان لە کوردستاندا هەڵدانەوەی پەڕەیەکی سپییە لە نێوانتانداو چاوپۆشی کردنتان لەو کارەی کاك مەسعودو بەجێ هێشتنی بۆ مێژوو، ئێستا وەکو برا بەبێ رقو کینە دەست بخەنە ناو دەستی

یەکتر چونکە ئەگەر ئەم جارە هێرشیان بۆ بەرن لەوانەیە سوپای فەرەنسی یان ئەڵمانی بەرەو رووتان بێتەوە. ئەگەر بمەوێت هەموو ئەو چاوپێکەوتنانەی لەگەڵ لێپرسراوان و خەڵکدا ئەنجامم داوە لەسەر ئەم رووداوە بەدوو کتێب کۆتایی نایەت، هەر بۆیە بەم رووداوە کۆتایی پێ دێنم:

جارێکیان کەسایەتی عەرەبی ناسراو (مامۆستا عمر جلیل پەرتۆ) لەزەمانی پادشایەتیدا دەچێتە خزمەت عبداللالە (وەصی) سکرتێرەکەی وەصی یەکسەر باسی بارودۆخی ئەو رۆژەی عێراقی بۆ دەکات و دەڵێت: ئەو دزی و واسطة و کاسبی حەرامەو بەرتیل خواردنەی ئێستا هەیە هەرگیز لە پێشتردا نەبووەو کەس ئەم وڵاتە بەهی خۆی نازانێت و هەموو هەوڵێکی ئەو خەڵکە بۆ گیرفان پر کردنەو بەس، مامۆستا جلیل بەرتۆ کە گوێی لەم قسانە دەبێت هەڵدەستێت بڕوات و سکرتێرەکە پێی دەڵێت دوای پێنج دەقیقەی تر کاتی ئەوە دێت بچیتە لای خاوەن شکۆ جوان نییە ئێرە بەجێ دەهێڵیت و دەچیتە دەرەوە، مامۆستا عبدالجلیل لەوەڵامدا دەڵێت: بڕوات هەبێت ئەو قسانەی کە جەنابت کردت من لەوە زیاترم پێ نییە بەخاوەن شکۆی بڵێم و نێوان ژوورەکەی تۆو ژوورەکەی (وصی) تەنها یەك مەترە ئیتر چ پێویست دەکات من بچمە لای و کاتی لێ بگرم.

## باسێکی پارێزگای هەولێر

هەولێر بەیەکێك لە کۆنترین شار دادەنرێت لە جیهانداو لە ساڵی ١٩٩٩دا بڕیارێك دەرچوو لەلایەن (الامم المتحده) کە دەبێت پارێزگاری ئەم شارە بکرێت و بەیەکێك لە شارە مێژووییەکانی جیهان تەماشا بکرێت، لە کاتێکدا کە عوسمانییەکان دەسەڵاتدار بوون لەناوچەی کوردستاندا چەند موچە خۆرێکی خۆیان دامەزراند بۆ پارێزگاری کردنی بەرژەوەندییەکانیان لەم ناوچانە، کە دەوڵەتی عوسمانی نەما بەشێکیان گەڕانەوە تورکیاو بەشێکیان مانەوە، هەولێریش یەکێك بوو لەو ناوچانەی کە بەشێکی تیادا مایەوە، بە

درێژایی مێژوو هیچ ناکۆکی‌یەك رووی نەداوە لەنێوان ئەو تورکمانانەو کورد، چونکە کورد ئەوانی بەمیوان زانیوەو لەخورەوشتی کوردا وایە کە رێز لەمیوان بگیرێت، لەسەرەتای دامەزراندنی حکومەتی عێراق لە ساڵی ١٩٢٢ لەسەرژمێری‌یەکدا روون بووە کە تەنها (٧) خێزانی تورکمان لە هەولێر هەبووە، دوای راپەرینە مەزنەکە بە چەند مانگێك هەندێك لەو کەمایەتی‌یە تورکمانانەی کە لەهەولێرن دەچنە لای کاك مەسعودو داوای ماف تورکمانی لێ دەکەن، ئەویش لەوەلامدا هەموو مافێکتان دەدەینێ، بەلام ئەمە خاکی کوردستانە، یەکێك لەبرادەرە تورکمانەکانی هەولێر بەناوی (؟؟؟؟) قەصاب پێی وتم نەدەبوو کاك مەسعود وای پێ بوتینایە، سەیر لەوەدابوو ئەم پیاوە بەرەچەڵەك کورد بوو، تورکیا بەناوی خزمەت کردنی تورکمانەکانەوە (١٣) ملیۆن دۆلاری بەسەر تورکمانەکان دابەش کرد لە رێگای (خاجی سووری تورکی) کە مییت دەیبات بەرێوە، ئەم کارە هانی زۆرێك لە خەڵکانی دا لەبەر پارەکەو کەم درامەتی‌یان خۆیان بە تورکمان بنوسینو لەسەرئەنجامدا تانسۆچیلەر لەچاوپێکەوتنێکی تەلەفزیۆنی‌دا وتی: ئێمە خاوەنی ٣ ملیۆن تورکمانین لە باکوری عێراق.

### ئەو هۆکارانەی کە یارمەتی سەرخستنی ئەم پیلانەی تورکیای دا :

١- برسێتی‌و نەداری.

٢- ئەو خەڵکە لەتاو رۆحی خۆی‌و خۆپاراستن لەدەست چەکدارەکانی کوردستان دەچووە پاڵ تورکمانەکان چونکە کەس نەیدەتوانی‌و ناتوانێت بەرامبەر ئەمان بوەستێت.

٣- زۆرێك لە چڵکاو خۆرەکانی رژێم بۆ پاراستنی خۆیان پەنایان بردە بەر حزبی تورکمان.

٤- سەرەکی ترین هۆکار دەگەرێتەوە بۆ ئەم دوو حزبە بالا دەستەی لە کوردستاندان، خۆم دانیشتوانی هەولێر بووم (١٢) ساڵ لەماوەی ئەو چەند

ساڵەدا ئاگادار بووم لەدوای راپەرینەکە مافی خەڵك لەلایەن ئەم دوو حزبەوە پێشێل دەکراو لەلایەکی تریشەوە ئەو پارە زۆرەی کە لە ابراهیم خلیل‌و لەدەرەوەی وڵات بۆیان دەهات لەسەر وتەکەی کاك نەوشیروان (لەنێوان خۆیاندا بەشیان دەکرد نیوە بەنیوە)، بەڵام ئەم بەش کردنە لەنێوان خۆیاندا تەنها بۆ گیرفان پڕ کردنی خۆیان بوو بەبێ ئەوەی بیر لە میللەت بکەنەوەو بەم پارە زۆرە دەیانتوانی نەیەڵن (میبت) پارە لەدەرەوەی وڵاتەوە بێنێت‌و لێرە خەڵکی پێ بکڕێت‌و خۆیان هەموو ئەو پارەیەیان هەڵنەگرتبا بۆ خۆیان‌و بەشی ئەو خەڵکەشیان لێ بدایە ئەوسا کەس وەڵامی تورکمانەکانی نەدەدایەوە، وەکو ئاشکرایە ئەوە ماوەی چەند ساڵێکە تورکیا بەشێکی لە قوبرص داگیر کردووەو لێی ناکشێتەوە، هەولێریش بەهەمان شێوە تازە بوو بە قاعدەیەکی پتەوی تورکمان لە کوردستان دا کە هۆکارەکەی سەرکردەکانی خۆمانن‌و ئێستا تورکمانەکان ئەوەندە پشت ئەستورن، دەڵێن ئەگەر بێت‌و پارتی یان یەکێتی ئازارمان بدەن سوپای تورکیا لەسەر ئێمە دێتە وەڵام‌و دادەبزێتە شارەکانی کوردستان بۆ بەرگری کردن لێمان، ئەوەبوو لە ساڵی ١٩٩٩ دا پارتی بەنیو سەعات هەموو هەولێری لەمیبت پاك کردەوە، بەڵام ئەم کارە ٢٤ سەعاتی نەخایاندو لەوەزارەتی ناوخۆی پارتی‌یەوە وتیان هەموو ئەو کەسانەی کە بەم کارە هەستاون سزا دەدرێن، بەڵام رەنگە ئەگەر پارتی پاشگەز نەبوایەتەوە لەو کارەی رووداوەکەی ٣١/ئابی لەبیر خەڵك دەبردەوە، مام جەلال لە وتارێکیدا فەرمووی(پێش ئەوەی هێرش بکرێتە سەر عێراق داوام کرد تورکیا بەشدار نەبێت لە شەڕی کەنداودا چونکە تورکیا ناکشێتەوە)، لەگەڵ ئەوەشدا زۆرێك لە تورکمانەکان ناوێرن پەیوەندی بکەن بە (میبت)ەوەو دەڵێن دوا رۆژێکی رەش چاوەڕوانی‌یان دەکات، بەڵام بەجۆرێك (ئاڵۆزو بلۆز) بووە ئەوانەی نیشتمان پەروەرو دڵسۆزن‌و خزمەتکاری کەس قبووڵ ناکەن دوور خراونەتەوە یان دەربەدەر کراون وەکو نموونەی پارێزەری کورد پەروەردو بەڕێز کاك محمود ئەحمەد کە ئێستا لە هەندەرانە.

## هەڵوێستی چوار دەوڵەتی داگیرکەری کوردستان بەرامبەر بەکورد

## عێراق و بەعس

رووداوی ٣١/ئاب باری سیاسی رژێمی بەعسی بەهێزتر کرد لەجاران و کەوتنە جمو جۆڵ لە کوردستانی باشوورداو بریکارەکانی بەعس هەوڵیان دەدا یەکێتی رابکێشن بەلای خۆیانداو بانگەوازیان بۆ ئاشتبوونەوەی هەردوو حزبەکە دەکرد بە پاساوی ئەوەی دوای ئاشتبوونەوەتان کێشەی کورد چارەسەر دەکەین و لەم کارەشدا مەبەستیان ئەوەبوو کە:

١- سۆزی ئەمریکاو بەریتانیاو دەوڵەتەکانی تری جیهان کەم بکەنەوە بەرامبەر بەکورد.

٢- بەجەماوەری کورد بڵێن سەرکردەکانتان ناتوانن بەبێ ئێمە وڵات بەرێوە بەرن.

٣- چەوساندنەوەی کوردی شارە ئازاد نەکراوەکان حەلاڵ بکەن. دەزگا ئاسایشی‌یەکانی رژێم وەکو جاران کەوتەوە گەڕ لەناو کوردستاندا بەتایبەتی لەهەولێر، لەوانەیە هێزەکانی صدام ئەوەندەیان توانا پێ مابێت چۆن هەولێریان گرتەوە بەچەند سەعاتێك سلێمانیش بەو شێوەیە بگرنەوە، بەلام تازە سیخوڕی عەرەبی شۆفینی ناتوانێت ئۆقرە بگرێت لە کوردستانداو وەکو جاران تیایدا بژی‌و، فەرمان بکات بەسەر خەڵکی‌دا، بەلام هەموو هەوڵێکیان بۆ ئەوە دەبێت ئاژاوە بخەنە ناومانەوە.

## تورکیا

عوسمانی‌یەکان بەهۆی ئەو خەلافەتە ئیسلامی‌یەی کە لەباو باپیرانیانەوە گوێزرایەوە بۆ ئەمان توانیان هەموو دەوڵەتە عەرەبی‌یەکان و کوردستانی خۆمان بخەنە ژێر دەسەلاتی خۆیانەوە، ئەو کەلتورە مێژووە ئیسلامی‌یەی لە مۆزەخانەکەی ئەستەمبولدا هەیە لە هیچ دەوڵەتێکی ئیسلامی تردا نی‌یە،

کەواتە کوردیش بەهەمان شێوە لە ژێر دەسەڵاتی تۆرانییەکاندا بووەو لەورۆژەوە کە کەمال ئەتاتورك دەسەڵاتی گرتە دەست هەتا ئیمڕۆ کورد بەرهەڵستی ئەو ستەمەیان کردووە کە لەلایەن ئەم دەسەڵاتەوە لێی کراوەو لەدەرئەنجامی ئەو دژایەتییەیاندا بۆ کورد ئێستا تورکیا بەیەکێك لەدەوڵەتە فەرزارەکان دەژمێردرێتو ئەمە نەبۆتە پەند بۆی، تائەو جەنەڕاڵانە تورکیا بەڕێوەبەرن بەبەردەوامی بەرهەڵستی دەکرێن لەلایەن کورد و خوشەویستانی کوردستانەوە. بڵند ئەجەویدی زمان حاڵی ئەو جەنەڕاڵانە بەبەردەوامی لەوتارەکانیدا بە ئاشکراو بە نهێنی نارەزایی خۆی دەردەبڕێت بەرامبەر بە کوردو هیچ پێشنیارێکیان قبوڵ نییە کە بەرژەوەندی کوردی تیا بێت.

سەیر لەوەدایە کاتێك هانی پارتی دەدات بۆ لێدانی یەکێتی بانگەواز بۆ ئاشتبوونەوەیان دەکات، بەڵام ئەوەی ئێمە دەبێ رەچاوی بکەین ئەوەیە کە تورکیا رازی نابێت کورد لە کوردستانی باشووردا خاوەنی فیدرالی بێتو بەشداری کردنی بەمەرج بگرێت بۆ دانیشتنەوەی ئەو دوو حزبە بەشەرهاتووەو بەعالەمی ئاشکرا بڵێت نە حکومەتی کوردیمان بیستووەو نە میللەتی کورد، ئیتر چۆن دەبێت دڵی پێ خۆش بکرێتو متمانەی بدرێتێ.

**سوریا :**

لەگەڵ ئەوەدا کە بارودۆخی کورد لە سوریا زۆر جیاوازە لە تورکیا بەڵام هەتا ئێستاش بە مهاجر ناو دەبرێن بەمەرجێك زیاتر لە (٢) ملیۆن کورد لە سوریادا دەژین.

بانگێشتی کردنی کاك مەسعود لەلایەن (حافظ الاسد)ەوە بۆ سوریا جێی سەرنجی هەموو جیهان بوو، ئەوەی جێ باس بوو ئەو پێشوازی کردنە گەرمە بوو لەلایەن جەماوەرەوە بە فەرمانی سەرۆکی سوریا چونکە ئەمە یەکەم جارە سەرکردەیەکی کورد بەو جۆرە پێشوازی لێ بکرێت لەلایەن سوریاوە، کاك فلك الدین کاکەیی لە لێدوانێکیدا بۆ کەناڵەکانی تەلەفزیۆن لە

گەڕانەوەیاندا فەرمووی: من لە خزمەت كاك مەسعوددا بووم بەچاوی خۆم ئەو پێشوازییە گەرمەی جەماوەری سوریام بینی بۆ خودی كاك مەسعود بارزانی. بەڵام من كاك فلك الدين بناسم سیاسەت مەدارێكی كۆنەو زۆر چاك دەیزانی سوریا مەبەستی دوور خستنەوەی كاك مەسعودە لە توركیاو ئەمریكاو ئیسرائیل، ئەم كارەی ئەنجام دا دەیویست كاك مەسعود بخاتەوە ریزی ئۆپۆزیسیۆنی عێراقی چیتر لەگەڵ توركیادا لە پەكەكە نەدات، چونكە سەرۆكی سوریا مەترسی لە سیاسەتی توركیاو ئیسرائیل هەیە وەك دەوڵەتێكی عەرەبیو لەهەمان كاتدا دۆستایەتییەكی زۆری هەبوو لەگەڵ عبدالله ئۆج ئالاندا، بەڵام ئەوەی جێی سەرسوڕمانە ئەو هەموو داكۆكییە لە مافی كورد دەكاتو تا ئێستا ماف نەداوە بە كوردەكانی سوریا.

### ئێران:

كە خومەینی دەسەڵاتی گرتە دەست جەماوەری كوردستانی رۆژهەڵات چاوەڕوانی دانپیانانی مافەكانیان بوون، بەڵام نەك دان بەمافەكانی كورددا نەنرا، بەڵكو بڕیاری جەنگی لەگەڵیانداو زۆر بەداخەوە محمد خاتەمیش هیچ بایەخێكی نەدا بە چارەسەر كردنی كێشەی كورد لە ئێراندا، كەچی هەوڵی رێكخستنەوەی یەكێتی و پارتی گرتبووە ئەستۆی خۆی، ئێستا بەناوی سیاسەتو بەرژەوەندی كوردی باشوورەوە یەكێتی دۆستایەتییەكی زۆر بەهێزی هەیە لەگەڵ كۆماری ئیسلامیدا.

### دەوڵەتە عەرەبییەكان

هەموو دەوڵەتە عەرەبییەكان زۆر چاك دەزانن كە لەسەر دەستی سەركردەی كورد (صلاح الدين ئەیوبی) فەلەستین ئازاد كراوە، بەڵام تاكە سەركردەیەكی عەرەب كە دانی نابێت بەوەی كورد لە ساڵی ١٩٢٢ بەزۆر

بەستراونەتەوە بە عەرەبەوەو پێویست دەکات کە کورد خاوەنی دەوڵەتێکی سەربەخۆی خۆی بێت بەڕێز سەرۆکی لیبیا (معمر قەزافی)یە کە دژ بە بۆچوونی هەموو ئەو سیاسەتمەدارە عەرەبانەیە لەگەل چەوساندنەوەی کورددان، لەناو کۆمەڵەی وڵاتانی عەرەبی تەنها (قەزافی و ئەسەد) وتیان: گوێزانەوەی کورد لەلایەن صدام حسین دوە گەورەترین شەرمەزاریە بۆ عەرەبو هەروەها سیاسەتمەداری بەڕێزو بەناوبانگ (مشعان الجبوری) وتی: پەسەندترین کار ئەوەیە دەسەڵاتی عێراق مافی سەربەخۆیی بدات بە کورد چونکە دەبنە گەورەترین پاڵپشت بۆمان لەسەر پاداشتی ئەو کارەمان.

دانیشتوانی کوردستانی باشوور بە تێکرا بیروبۆچوونی رای ئۆپۆسیزیۆنی عێراقی (عەرەب)ی لا ئاشکرایە کە دەیانەوێت کورد چەك هەلگرێتو حکومەت بروخێنن‌و بەسەر لاشەی کوردە بچنە سەر تەختو بە ئێمەش بڵێن ئێمە هەموو ئیسلامین‌و دۆستایەتیمان زۆر کۆنەو ئەوە صدام نەما ئیتر چیتان دەوێت بۆخۆتان لە ماڵەوە دانیشن ئێمە خزمەتتان دەکەین، ئەگەر خوانەخواستە پێیان بڵێیت ئێمە دەمانەوێ حکومەتێکی کوردی سەربەخۆ دابمەزرێنین ئەو کاتە پیاوەکانیان بۆیمباخی رەش دەبەستن‌و ئافرەتەکانیشان جلی رەش دەپۆشن‌و دەڵێن: (ئەی ئەوە نییە صدام حوکمی زاتی داونەتێ بۆ شوکری خوا ناکەن بڕۆن سەیری کوردی ئێران بکەن بزانە دەوێرن ناوی منالەکانیان بە کوردی بنێن، لەتورکیا ئاگاتان لێیە چۆن مافی کورد پێشێل کراوە) ئەوسا ناچارمان دەکەن بڵێین بە فیدرالیش رازین، ئینجا پێمان دەڵێن ئێوە ناتوانن ئیدارەی خۆتان بکەن، ئەوە چەند ساڵە دوو پارچەن، بەراستی جێی مەترسی دەبن بۆ عێراق، چونکە ئەگەر یەکێکتان دەرەقەتی ئەوی تر نەهات ئەو کاتە هێزی بێگانە دێنێتە ناوەوە بۆ پارێزگاری کردن لە خۆتان بەو شێوەیە دەسەڵاتتان بەسەر پارێزگاری سنوورەکاندا نامێنێت‌و هەر سوپایەك پێی خۆش بوو دێتە ناوەوە بەبێ ترس.

بەشی زۆری ئەو برا عەرەبانەی کە لەدەست صدام رایان کردووە لە ژوورێکی ئوتێل دا لە شام یان لە ئێران و ئەوروپادا خەبات دەکات، کە هاتە سەر حسابیش دەیەوێت حوکمی زاتیش نەدات بە کورد، لەگەڵ رێزمدا بۆیان زۆرێك لەو حزبە ئۆپۆزیسیۆنە عێراقیانە بەو شێوەیە بیر دەکەنەوە لە ماڤی کورد، وا دەزانن هێشتا نوری سەعید ماوە، من لەم کتێبەدا بەتایبەت سوپاسی تەنها سێ کەسم کردووە لە عەرەب ئەوانیش (الاسد و قەزاڤی) کە هەموو کورد قەرزاری ئەم دوو بەرێزەن، هەروەها سیاسەت مەداری عێراقیش (مشعان الجبوری).

هەرکاتێك ئێوە لە بڵاوکراوەکانتاندا بەیانێکتان دەرکرد کە کورد میللەتێکی سەربەخۆیەو ماڤی ئەوەی هەیە خاوەنی دەوڵەتی خۆی بێت ئەو کاتە هەموو کوردێك دەستان بە سنگەوە بۆ دەگرێت، ئێمەی کورد هیچ کێشەیەکمان لەگەڵ نەتەوەی عەرەب نییە، بەڵام ئێمە رەخنەمان لە هەلوێستی ئەو عەرەبانە هەیە کە شۆفێنیانە بیر دەکەنەوە بەرامبەر بەکورد، ئێستا ئێوە خاوەنی یەك بست خاکی رزگارکراو نین لە عێراقدا بە ئاشکرا، هەرکاتێك گلۆپی سەوزتان بۆ داگیرسێنرا بۆ لەناو بردنی صدام ئەگەر نیەتتان پاك بێت لەگەڵ کورد ئەو کاتە دەتوانن خاکی کوردستان وەکو پێگەیەکی سەربازی خۆتان بەکاربهێنن و شان بەشانی شۆرشگێرە قارەمانەکانی کوردستان بەرەو لەناو بردنی رژێم بکەونە رێ و سەرئەنجام هەموومان دەبین بە خاوەنی عێراقێکی دیموکراتی پێشکەوتوو، هەر یەکەمان لەناوچەکانی خۆماندا وەکو دوو دراوسێی دڵسۆزی یەکتر رۆژگار دەبەینە سەر.

ئەگەر بەهەوڵی هەموو گروپە سیاسییە کوردەکان نەبوایە بە تێکرا ئەو راپەرینە مەزنە سەرنەدەکەوت بەتایبەت پارتی و یەکێتی، بەڵام ئەمە ئەوە ناگەیەنێت کە ئەوانی تر هیچیان نەکردووە، بەڵکو هەر هەموویان جێی باوەڕو متمانەی گەلی کوردن و دەستێکی باڵایان هەبووە لەسەقامگیربوونی

ئاسایشی شارەکاندا بەڵام لەگەل ڕێزمدا بۆ هەندێکیان لە جیاتی لەکاتی شەڕەکەی یەکێتیو پارتی هەریەکەیان خۆی بداتە پاڵ یەکێك لەم دوو زلهێزانە بۆ گەرم کردنی شەڕەکە ئەگەر بهاتنایە هەر هەموویان بەیەکەوە هێزی سێهەمیان دروست بکردایە، لە ئەوپەڕی راستەوە بۆ ئەوپەڕی چەپ هەروەها حزبە ئیسلامییەکانیش پێکەوە، ئەو کاتە کێشێکی دیارو بەرچاویان دەبوو، دەیانتوانی بەهەرهەموویان نەیەڵن ئەو ئاگرە بەو شێوەیە کڵپە بسێنێت، ئێستا من نازانم (یەکگرتوو یەکبوون) گوێ لە پێشنیارەکانی من دەگرن بۆ یەکگرتن؟ یان ئەوانیش وەکو یەکێتیو پارتی هەرچەندە بۆچوونەکانیشیان لەیەك نزیکە بەڵام لە ساڵی ١٩٦٣ەوە تا ئێمرۆ هەر بە جیا کاردەکەنو گوێ لە پێشنیاری کەس ناکرن، چونکە ئەگەر ئەو دوانە یەك بگرن کوتلەی سێهەمی ساحەی کوردستان دروست دەکەن، زۆرێك لەو ئاژاوەو شەڕو شۆڕە دەتوان بە حکمەتی ئیسلام چارەسەر بکەن، بونموونە: پێش هەرەسەکە مامۆستا ابراهیم احمدو (علی عەسکەری) پێشنیار دەکەن بۆ مەلا مصطفیی بارزانیو دەڵێن: تۆ دانیشەو ئاشبەتاڵ مەکە سەرپەرشتی ئەم شۆڕشە دەکەین دوای دوو ساڵی تر ئەم شۆڕشە دەبێتە گەورەترین شۆڕش لە جیهاندا، بەڵام بەڕێز مەلا مصطفی پیشنارەکەی پشت گوێ خستو قسەکەی شای پەسەند کرد، ئەم بارودۆخەی کە ئێستا کوردی تیایە سەرەنجامی پیادە کردنی پیلانەکانی شای ئێرانە تیایدا دەژین.

### ئینگلیزو ئەمریکا:

لە ساڵی ١٩٨١دا لە حکومەتی بەریتانیام پرسی لە لەندەن: بۆ کوردستانتان کردە چوار پارچە؟ وتیان باپیرمان ئەوەی کردووە، وتم: وەکو خۆی لێ بکەنەوە، وتیان جارێ زەحمەتە، وتم صدام دەمێنی؟ وتیان: نامێنێ: وتم ئێمە دەبین بە حکومەت؟ وتیان دوای چارەسەر کردنی کێشەی فەلەستین.

ئەم دوو دەوڵەتە زلهێزە بەزۆر لە ساڵی ١٩٢٢ کوردستانی باشوریان لکاند بە

حکومەتی عێراقەوەو لە ساڵی ١٩٤٦ دا (ترومان)ی سەرۆك کۆماری ئەمریکا ئینزاری روسیای کرد کە لەماوەی چەند رۆژێك سوپای روسیا لە ئازەربایجانی رۆژئاوا (کوردستان) نەکشێنێتەوە ئەوا بەهەموو شێوەیەك لێی دەدرێت، ئەوەبوو ئاش بەتاڵی بەکۆماری مەهابات کردو هەروەها هەر ئەمان بوون ئاشبەتاڵیان بە شۆرشەکەی مەلا مصطفی کرد، کوردستان بە ئاشکرا (تعریبو تەبعیسو ئەنفالو کیمیا باران) دەکرا، کەس دەنگی نارەزایەتی بەرز نەدەکردەوە، هەر ئەمان بوون نەیانهێشت دوای جەنگی کەنداو صدام بروخێت، بەبەرچاوی ئەمریکاوە صدام دوای راپەرینەکە بەهەموو هێزێکەوە هاتەوە کوردستان هەر هەڵوێستیان نەگرتو (بۆش) تا لە پشوەکەیدا گوێی لە ئاژانسی دەنگو باسی رۆیتەر نەبوو کە سێ ملیۆن کورد بەرەو لەناوچوون دەچنو، بۆشیش لە پشودانو گەشتو گوزاردایە، حکومەتی ئەمریکی هەڵوێستی نەگرت، دوای ئەمە پشتگیرییان لە کورد کرد بەلایەنی مرۆڤایەتییەوە هێزی ئەنجەرلیکیان بۆ دانایین کە بمان پارێزن لەگەل ئەوەشدا بەریتانیا داوای کرد هێڵەکە لە ٣٤دا بێت بەلام ئەمریکا لەبەر ئەوەی بەرژەوەندی لەوەدا بوو کە نەوتەکە بکەوێتە لای صدام هێڵەکەی لە ٣٦ دانا، لەو روانگەیەوە کە ئەمریکا دەڵێت (ئێمە کێشەکان دەبەین بەرێوە چارەسەریان ناکەین) مادلین ئۆلبرایت بانگێشتی بۆ ئاشتبوونەوەی یەکێتیو پارتی کردو وتی: دەبێ نوێنەری تورکیا بەشدار بێت لە دانیشتنەکاندا، چونکە خۆیان دەیانزانی بەشداری کردنی تورك مانای سەرنەکەوتنی ئاشتییە لەناوچەکەدا، هەروەها هەفتانەو مانگانەو بەبەردەوام لەدەزگاکانی راگەیاندنەوە دووپاتی پارچە پارچە نەکردنی خاکی عێراق دەکەنەوە بۆ ئەوەی کورد بیر لە سەربەخۆیی خۆی نەکاتەوە. سەیر لەوەدایە لە کوردستانی باشووردا ئاوەدانی بەرپا کردووە، کەچی یارمەتی تورکیا دەدات بۆ وێران کردنی کوردستانی باکوورو دەستگیرکردنی عبداللە ئۆج ئالانو پشتگوێ خستنی ماف (٢٥) ملیۆن کوردو ئێستا تەواوی کورد چاوەروانی ئەوە

دهكات كه ئهمريكا واز لهو سياسهته دوو فليقانهيه بێنێتو لهگهڵ كوردستانی باكورو باشوور ههوڵ بدات بۆ يارمهتی دانی ههموو كورد بهيهك چاو.

## سياسهتی نێودهوڵهتی بهرامبهر كورد له ساڵی ۲۰۰۰ دا

ههتا نهوت له عێراقدا ههبێت روسياو صينو فهرهنسا بههۆی بهرژهوهندييهكانی خۆيانهوه لهگهڵ رژێمی بهغدا ئهو پهيوهندييه بازرگانیيه بههێزهی نێوانيان بههيچ جۆرێك پشتی صدام بهرنادهنو ههموو ههوڵێكيان بۆ مانهوهی صدام دهبێت، بهڵام ئهگهر صدام ئهو پهيوهندييه بازرگانیيه رهت بكاتهوه ئهو كاته لهماوهيهكی كهمدا صدام لهناو دهبهنو ئهمريكا نهوتهكه دهخاته ژێر دهسهڵاتی خۆيهوه بهشهريكايهتی بهريتانيا، بهكورديش دهڵێن ئهوا صدام نهماوهو حكومهتی بهغدامان بۆ روخاندن برۆن بۆ خۆتان لهماڵهوه دانيشن.

ئهم راستیيانهی كه دهرم خستووه لهسهر دهورهبهرهكانمان ئهوه دهگهيهنن كه دوور تا نزيك كهم تا زۆر ههموويان لهسهر كوردنهبوونی بهدهوڵهت رێك كهوتوون لهگهڵ ئهوهشدا زۆرێكيان لهناو خۆياندا لهسهر زۆر شت نارێكن.

ئهو خهڵكه دڵسۆزهی كوردستانی باشوور ههموو بهيهك دهستو يهك بۆچوون بۆ لهناوبردنی رژێمی ديكتاتۆری، له كوردستاندا راپهرينه مهزنهكهی (۱۹۹۱)يان برهپا كرد، بۆ ئهوهی بتوانن به ئازادیو كامهرانی لهولاتهكهی خۆيان بژينو جهماوهر بهگشتی باوهشيان بۆ يهكێتیو پارتی كردهوهو له ساڵی (۱۹۹۲)دا ههمو خهڵك به پهرۆشهوه بهرهو سهندوقهكانی دهنگ دان بهرێ كهوتن بۆ ئهوهی بيانكهن بهدهم راستی ئهم ميللهته، بهڵام زۆر بهداخهوه بههۆی دووبهرهكی نێوانيانهوه كوردستانی باشوور بوو به كالايهكو كرينو فرۆشتنی بهسهروه كراو خهڵكێكی تازه ناسراو له هيچهوه بهماوهيهكی كهم بوون به خاوهن پارهيهكی زۆرو چارهنووسی ئابووری

کوردستانی باشوور کەوتە ژێر دەستی چەند بازرگانێکی جەنگ‌و چەندەهایان بەناوی سەرکردایەتی و لێپراسراوێتیەوە هەرچی سەرچاوە ئابوری‌یە گرنگەکانی وڵاتەکە هەبوو دەستیان گرت بەسەری‌داو هەندێکیان گەیشتونەتە ومزعێکەوە کە بەهیچ شێوەیەك لە نرخی (جل‌و بەرگ‌و خواردن‌و کرێی خانوو)و باری ئابووری ئەو خەڵکە داماوە ئاگادارنین، ئەوەتا زۆرێك لە چینی گەنجانمان کە لە هەموو وڵاتێکدا ئەو چینە بنیادنەرەی پێشکەوتنی شارستانی‌یەتە لەلای ئێمە لەبەر نەبوونی‌و بێ ئیشی‌و نائارامی بارودۆخەکە پۆل پۆل ئەم شارە بەنرخە بەجێ دەهێڵن‌و روو دەکەنە هەندەران بۆ ئەوەی بتوانن تۆزێك لەو مافانەی کە خۆیان هەیانە لەوێ دەستە بەری بکەن، بەگوێرەی سەرژمێری خۆراك لە (UN) دانیشتوانی سنووری هەرێمەکەمان ٣,٣٤٠,٩٣٣ کەسەو لە باشوورو ناوەندا ٣,٥ ملیۆن هەیە، زۆر راستە ژیان لە هەرێمەکانی کوردستاندا جێی بەراورد کردن نی‌یە لەگەڵ ژیان لە ژێر دەسەڵاتی بەغدا، بەڵام ئەو خەڵکە بۆ بەراورد کردنێکی بچووك لەگەڵ رژێمدا ئەم راپەرینەی ئەنجام نەدا بەڵکو بۆ گۆرانکاری‌یەکی گەورە لەهەموو لایەنەکانی ژیانەوە ئەنجامی دا، دووبەرەکی‌یەکان تەنها بەیەکێتی‌و پارتی‌یەوە نەوەستا بەڵکو سەریشی کێشاوە بۆ نیوان پارتی‌و پەکەکە لەسەرئەنجامی خۆ بەزل زانین‌و لەبەرچاو گرتنی بەرژەوەندی تایبەتی‌و گوێ نەدان بەبەرژەوەندی کوردستان دا چونکە پارتی هەستی بە زوو گەورەبوونی حزبی پەکەکە کردو مەترسی‌یەکی گەورەی بۆ دروست بوو کە کەس باسی ئەم نەکات‌و متمانەی جەماوەر لەدەست بدات، هێرشی کردە سەر هەموو بارەگاکانیان کە زانی خەڵکێکی زۆر لەناوچەی بادینانداا بەگشتی پشتگیریان لێ دەکەن‌و لە بارزانی‌یەکانیشدا دوو بارزانی گەیشتبوونە پلەی سەرکردایەتی لەناویاندا، لە کاتێکدا دەیتوانی کەس ناو بارەگاکانیان دا نەکوژێت‌و ئاوو کارەباو ئازوقەی لی ببرینایە هەر هەموویان بە ناچاری خۆیان تەسلیم دەکردو خوێن لەنێوانیاندا نەدەرژا، لە دەستگیر کردنەکەی

عبدالله ئۆج ئالان کە مادلین ئۆلبرایت سەری سوڕما بوو لەو هەموو نارەزایی دەربڕینەی خەڵك بەرامبەر گرتنی عبدالله ئۆج ئالان، کاك نێچیریش ئەو ڕۆژەی کرد بە پشووی ڕەسمی بەناوی دامەزراندنی قوتابیانەوە بۆ خۆ بردنە پێشەوە لە تورکیا، هەروەها کاك سەفین دزەیی بەرامبەر بە گەشت پێ کردنی ٤٤ کەس لە خزمانی خۆی بۆ تورکیا بەبێ لێپرسینەوە، هەرچی زانیارییەك کە دەستی کەوتبوو لەسەر دانیشتنەکەی فرانسۆ میتران و حزبە کوردستانییەکان بۆ چارەسەر کردنی کێشەی کورد هەمووی دابوو بە تورکیا.

لە کاتێکدا کە ئەریتریا لە ئەسیوبیا جیا دەبێتەوە ڕۆژنامەنوسێکی جیهانی دەچێ بۆ ئەریتریا بۆ ڕاپرسی کردن، چاوی بەهاوڵاتییەك دەکەوێت و پێی دەڵێت: ئیستاتان باشترە یان ئەوسا؟ هاوڵاتییەکەش دەڵێ جیاوازییەکی وامان نییە بەڵام ئەوەی دڵخۆش کەرە، دراوسێکەم بۆتە وەزیرو کاتی خۆی بە پاسکیل هاتوچۆی دەکردو سەیارەی نەبوو، بەهەمان شێوە ئێستاش لەخۆی نەگۆڕاوەو هەر بە پاسکیل ئیشی شەخسی خۆی و ماڵ و منالی ئەنجام دەدات، لەگەڵ ئەوەشدا کە سەیارەیەکی حکومی دەیهێنێت و دەیبات بۆ دەوام، بەڵام بۆی نییە بۆ کاری خۆی بەکاری بهێنێت لەبەر ئەوەی بە (بیت المال) کردراوە.

هەروەها ملك فیصلی یەکەم کە لە بنەماڵەیەکی هاشمییە حەز ناکات ئەو سەیارەیەی کە دەیبات بۆ کۆشکی پاشایەتی و دەیهێنێتەوە ماڵەوە بەکار بهێنێت بۆ کاری خۆی، لەگەشتێکدا بۆ لەندەن لەبەر بێ پارەیی سەیارەیەکی نیوداش بە (فیست) دەکرێ و وەزارەتی دەرەوەی بەریتانیا دەبێتە کەفیلی، ئەوەی من ئاگادارییم کوڕە بچوکەکەی مسعود بارزانی کە لەسەرەتاییە ئەو سەیارەیەی هاتوچۆی پێ دەکات نرخەکەی (٢) ملیۆن دینارە.

ڕۆژگارێك بوو تاکە ڕۆژنامەیەك نەمابوو لە جیهاندا باسی ئازایەتی و قارەمانێتی باوکی گەلی کورد مەلا مصطفی بەوێنەوە بڵاو نەکاتەوە، کارامەیی و توانای ئەم پیاوە جێی باسی هەموو جیهان بوو، لە ساڵی ١٩٦٩ دا

لە هەنگاریا بووم بە یەکێکیانم وت: کوردستان نەیزانی، کەرکوك هەر نەیزانی وتم: بارزانی، ئینجا سەری بۆ راوەشاندمو پێکەنیو تەوقەی لەگەڵ کردم، زۆرێك لەخەڵك لەسەر ئازایەتی پەڕینەوەی بارزانیو ٥٠٠ کەس بەسەر روباری ئاراسدا بۆ روسیا مناڵەکانیان ناو دەنا ئاراس، تەرمەکەی بارزانی کە بەهەر شارو شارۆچکەو ناوچەیەکدا تێدەپەڕی لە کوردستاندا گەورەو بچووكو ژنو پیاو پەککەوتە هەر هەموویان دەهاتنە سەرجادەکان بۆ پێشوازی کردن لە تەرمی بارزانی هەزارەها کەس خۆی بە قوربان دەکرد، من خۆم ئەو رۆژە پارەم قەرز کرد بۆ بەشداری کردن لە سپاردە کردنەکەیدا لە بارزان.

کاك مەسعود کاك نێچیر بارزانی ئێوە نەوەی ئەو زاتە شۆڕش گێڕەن، بەهۆی ئەوەوە خاوەنی ئەو هەموو سامانو سەروەتە نەبراوەیەنو بەشی زۆری کوردستانی باشوور لە ژێر دەسەڵاتی ئێوە دایەو بەهۆی بارزانییەوە خاوەنی گەورەترین سەرمایەی جەماوەری بوون لە کوردستانی باکوورو رۆژهەڵاتو رۆژئاوادا، بۆنەتاتوانی پارێزگاری لەو سەرمایە جەماوەرییەی خۆتان بکەن، خەباتگێڕانی هەرچوار پارچەکە لە ژێر ئاڵاکەی بارزانیدا کە لەلایەن پێشەوا قازی محمدەوە پێی سپێردرابوو، خوێنی خۆیان دەرشت لە پێناوی سەروەری کوردستاندا، لەبیرتان چووەوە کاتێك تەرمی بارزانیتان بە تەیارە لە ئەمریکاوە برد بۆ ئێران تەواوی کوردی ئێران چۆن بەدڵسۆزانە بە پیرتانەوە هاتن، چۆن دەستان تێی چوو دوای بەخاك سپاردنی باوکتان لەوێ، بەماوەیەکی کەم پێش سوپای ئێران کەوتن بۆ لەناو بردنی شۆڕشی کوردی لە ئێران، بەراستی باوکتان بەو کارە شەرمەزار کرد لە مەزارەکەیدا، ئینجا دوای ئەمان هێرشتان بردە سەر خەباتگێڕانی کوردستانی تورکیا لەگەڵ سوپای تورکیادا لە کاتێکدا رۆژگارێك بووە گەورەترین پاڵپشتو داڵدەبوو بۆ شێخ سەلام بارزانی لەو رۆژەدا کە دژایەتی حکومەتی بەغدای دەکردو بێجگە لەمان داڵدەی تری نەبووە، لەوە دەچێ ئاگاداری ئەوەنەبن کە دژایەتی

کردنتان بۆ پەکەکە دژایەتی کردنتانە بۆ (٢٥) ملیۆن کوردی کوردستانی باکوور.

ئەوەی جێی سەرنج و سەرسوڕمانە هەتا خۆم دەبابەکانی حکومەتی عیراقم نەبینی ٣١/ئاب لە هەولێر بەهیچ شێوەیەك بڕوام نەدەکرد کە ڕۆژێك لە ڕۆژان ئەوەی باوکی گەلی کورد مەلا مصطفی بارزانی دەست بخەنە ناو دەستی صدام حسینی تاوانبارەوە بەناوی بەرژەوەندی گشتییەوە، هەرگیز باوەڕم نەدەکرد کاك نێچیری کوڕەزای باوکی گەلی کورد مەلا مصطفی لەگەل قوصەی صدام حسین دوژمنی مەلامصطفی بارزانی بەیەکەوە بێنەوە هەولێر بۆ لێدانی حیزبێکی کوردستانی تر.

ئەوەی جێی داخە خۆ بەزل زانین هەلی خەڵەتاندن و بەمانەشەوەنەوەستان بەڵکو گەورەترین دوژمنی کوردتان هێنایە ناو خاکی پیرۆزی کوردستانی باشوورەوە کە حلفی ناتۆیەو لە ڕاگەیاندنەکانیشتانەوە بەشانازییەوە باستان دەکرد، بەکردەوەکانتان هەرچی باوکتان بەهەموو تەمەنی خۆی دروستی کرد بوو ئێوە لەماوەی چەند ساڵێکی کەمدا هەمووتان روخاند، ئێستا کە باسی سەرکردە پایە بەرزەکانی کورد دەکرێت لەناوەو دەرەوەی وڵات ناوی شێخ مەحمودی نەمرو شێخ سەعیدی پیران و قازی محمدو عبدالله ئۆج ئالان بەنموونە دەهێنرێنەوە، بەکردەوەکانتان ناوی باوکتان سڕیوەتەوە لەو لیستە پیرۆزەدا، توخوا گوناهتان نەگەیشت واتان لەناوی ئەم زاتە پیرۆزە کرد، ئەوە پاداشتی ئەو سەربەرزییەیە کە بۆ ئێوەو هۆزی بارزانی بەجێ هێشت؟

لە ساڵی ١٩٩٩دا سەردانی سکرتێری تایبەتی کاك مەسعود، بەڕێز کاك مەسرور بارزانیم کرد، لە سەردانەکەدا وتی: کاك ڕەفیق لەبیرتە لە ساڵی ١٩٨٦دا باوکم پێی وتیت: چی بۆ مەسروری کوڕم بکەم ئەوەش بۆ بازیان و ڕەوەزی کوڕت دەکەم، وتم: منیش لەوەڵامدا بە باوکتم وت نەهیچ بۆ مەسرور دەکەیت و نە هیچ بۆ بازیان و ڕەوەزیش دەکەیت، ئینجا بە کاك

مەسرورم وت: دەترسم تۆش وەکو باوکت بیت چەند جارێك تا ئێستا بیستومە چاوم پێتان بکەوێت نەمتوانیوە، وتی بەگۆڕی بارزانی نەمزانیوە تۆ لەهەولێریت (لەم قسانەدا کاك سەروەری سکرتێری کاك مەسرور هاتە ژوورەوەو وتی: کاتەکەت تەواو بووە تەنها ٢٠ دەقیقە بوو، وتم ئەم ژوورە بەجێ ناهێڵم تا قسەکانم تەواو نەکەم) بەم شێوەیە سەعاتو نیوێك لەگەڵ کاك مەسروردا باسی دوو شتی سەرەکیم کرد، یەکەمیان باسم لەگرنکی ئاشتبوونەوەیان لەگەڵ یەکێتیدا بوو، دووەمیان پێم وت: من بە مافێکی شەرعی خۆمی دەزانم کە بەسەرهاتی ژیانی خۆم بنوسم، وتی چی دەڵێیت بۆت بکەم، وتم پارێزگاریم بکە، وتی: برۆ بینوسە لەسەر من بەلام ئەولا لەسەر خۆتو دوای هەفتەیەکی تر تەلەفونم بۆ بکەرەوە چاپەکەشی ئێمە بۆت دەکەین، بەلام هەتا ئێستا وەلامیان نەداوەمەتەوە.

زۆر سوپاسی مامۆستای تێکۆشەرو کورد پەروەر مامۆستا جمال عبدول دەکەم کە زەمینەسازی بۆ کردم بۆ دەرکردنی بەشی یەکەم لە کتێبەکە، دوای دەرچوون ١٠٠ دانەم لە سلێمانی دابەش کرد، ئینجا چوومەوە هەولێر، ١٠٠ دانەشم لەوێ بەسەر کادرانی پارتیو هەندێك لایەنە سیاسیەکانی تر دابەش کرد، بازیانی کوڕم لە هاوینەهەواری صلاح الدین‌دوە دەستی بە دابەش کردن کرد، رەوەزی کوڕیشم لە ئەنجومەنی وەزیرانو دادگاوە دەستی پێکرد، ماوەیەك چاوەڕوانیم کرد دوای دابەش کردن ئینجا دەستم کرد بە چاوپێکەوتن لەگەڵ ئەو کەسانەدا کە کتێبەکەیان خوێندۆتەوە.

رووم کردە دەزگایەکی پارتی لەگەڵ ئەوەشدا کە لێپرسراوی دەزگاکە دۆستێکی دێرینمە ئەگەر جاران پێنج خولەك رایان بگرتمایە ئەم جارە نیو سەعات زیاتر مامەوە، یەکێکیان لەو دوانەی کە پرسگەکەیان دەبرد بەرێوە لەبەر ئەوەی ناسیاو بوو لە تەریقیدا خۆی شاردەوە، بەرێیان کردم بۆ ژوورێك یەکەم جار بوو بچم، تەوقەم لەگەل کردن، سەری پەنجەیان دامیو زۆر بە ساردیەوە بەخێرهاتنیان کردم، چەند لاپەرەیەك پرسیاریان ئامادە

کردبوو بۆ ئەوەی چاویان بەمن کەوت لێم بپرسن، زۆر بە گرژی پرسیاری لەسەر عبدالرحمن زبیحی کرد دەتووت توتنیان خواردووە، هەڵسام وتم: ئێوە پاراستنن؟ وتیان نەخێر، لەگەڵ ئەوەشدا کە تەمەنیان لە نێوان ٢٥-٣٠ ساڵی دەبوو بەڵام وا دۆگما کرابوون وایان دەزانی مەلیکە بچکۆل ماوە، کە دەست کرد بە وتوێژ کردن لە گەڵیانداو باسی شوێنی ئێستای کوردم بۆ کردن لە دنیای سیاسەتدا، زۆرێك لەمەترسی‌یەکانی سەر کوردستانم بۆ شی کردنەوە باروودۆخیان لە گرژی‌یەوە گۆڕا بۆ پێکەنین، هەر چەندە چەند لاوێکی پارتی رۆشنبیر بوو بەڵام لەعنەت لەبێ دەسەڵاتی چونکە ئەوانە خاوەنی قەڵەمن و ئیمڕۆش چەك و پارە دەسەڵاتدارە.

دوای ئەوەی شارەزایی‌یەکی باشیان لەو ماوەکەمەدا لەسەر من پەیدا کرد. وتیان: تۆ ئەوەندە پەیوەندیت باشە لەگەڵ کاك مەسعودو مام جەلال بۆ هەڵناسی بە ئاشت کردنەوەیان؟ وتم من لە کۆتایی ئەو کتێبەدا کە لەبەردەستاندایە نوسراوێکم ئاراستەی بەڕێز کاك مەسعودو بەڕێز مام جەلال کردووە بۆ ئەو کارە، ئێستاش خۆشحاڵ دەبم کە بنێرن بە شوێنمداو هەردووکیان دوو بەدوو بە تەنها لە ژورێکدا دانیشن و لە ئێستاوە بۆ شەش مانگی تر و کەسیان لەگەڵ نەبێت، منیش لەوماوەیەدا وەکو برا بچووکێك ژوورەکەیان بۆ پاك دەکەمەوەو خواردنی باشیشیان بۆ دروست دەکەم و ئێوەش تەنها دەوری تەتەر (پۆستەچی) ببینن دوای تەواو بوونی ماوەکە ئێمە سنوورمان دەچێتە (جبل حمرین) و (کەرکوك و سنجارو تەلعفەرو دوبسو شێخان و زەممار) رزگار دەکەین، ئەوکاتە بەچاوێکی رێزەوە سەیرمان دەکرێت لەلایەن هەرچوار دەوڵەتە ئیقلیمی‌یەکەو ئەمریکاوە، بەڵام دەزانم ئەمان رێك ناکەون و ئەوەی لەدڵی ئەو خەڵکەدا پەنگی خواردۆتەوەو ناوێرێت دەریبڕێت من هەوڵ دەدەم لەبەشی دووەم و سێ‌هەم و چوارەم و پێنجەمی زنجیرە باسەکانی کورد، دوژمنی خۆت بناسەدا بیخەمە بەرچاو بە پشتیوانی خودا، وتیان: حەز دەکەین هەندێك لەو زانیاری‌یانەی لەلاتە وەکو

ریپۆرتاجێك لەبەر كامێرادا باسی لێ بكەیت، وتم شتێكی باشە بەمەرجێك بۆ تەلەفزیۆن بێتو پەخشەكەش راستەوخۆ بێت، وتیان تۆ لێرە ئەو هەموو قسانە دەكەیت ئاخۆ لەوێ چی بڵێی؟ ئینجا بەرێیان كردم بەگەرمو گوڕی، كابرای پرسگەكە سەری سوڕمابوو لەوخواحافیزیە گەرمو گوڕە. لە هاتنە دەرەوەمدا لە رارەوەكەدا چاوم كەوت بە لێپرسراوی دەزگاكە، وتم خزم ئەو تەڵەیەت بۆ نابوومەوە خۆشت دوور خستبووەوە.

چوومە هاوینە هەواری صلاح الدین بیرم كردەوەو وتم: ئەگەر بمەوێت چاوم بە كاك مەسعودو كاك نێچیر بكەویت بە پێنج ساڵی تر بەرم ناكەوێت هەر بۆیە بڕیارم دا چاوم بەو لێپرسراوانە بكەوێت كە جێی متمانەی بەڕێز كاك مەسعودنو ئاوێنەی ئەوانن.

سەردانی برای بەڕێز كاك كەریم سنجاریم كرد، وتیان لێرە نییە، ئینجا تەلەفونم كرد بۆ (مەكتەبی سیاسی) پارتی لەگەل مامۆستایەكی بەڕێزو رۆشنبیردا قسەم كرد كە ئەندامی لیژنەی مەركەزییەو داوای دیاری كردنی كاتێكم لێ كرد بۆ چاوپێكەوتنی، لەوەلامدا فەرمووی دوای سەعاتێكی تر وەرە لام، بڕیارم دا لەماوەی ئەو سەعاتەدا سەردانێكی ئەندامێكی تری مەكتەبی سیاسی بكەم، بەلام قەدەر وابوو كە ئەویش لەوێ نەبوو، ناچار لەلای سكرتێرەكەی دانیشتم وتی: دوێنێ باسی كتێبەكەی تۆم كردووە، وتم چۆن؟ وتی كابرایەك هاتبوو بۆ ئێرە خاوەنی پێنج شەهید بوو، دەیوت زۆر بێ ئیشمو داواكارم لەلای خۆتان بەفەراشیش دامەزرێنن هەر باشە، چونكە من زەلامێكی ناسراوم لەناو خەلكدا سوالم پێ ناكرێت، فەرمووی كتێبەكەی تۆم نیشان داو وتم: ساحێبی ئەم كتێبە باس لە ئازارەكانی تۆ دەكاتو بەرگری لەمافەكانت كردووە وەكو هاولاتییەك.

ئینجا وتی كاك رەفیق تۆ دوو ساڵە هاتوچۆی ئێرە دەكەیت، گوێم لە قسەت بووەو زۆر ئاسایی بوو بەلامەوە، بەلام ئێستاكە گرنگی قسەكانت لەوەدایە كە بووە بە كتێب، رەحمەت لە دایكو باوكت.

ئینجا هەستام بەرەو نوسینگەی ئەو بەڕێزەی کە مەوعدم هەبوو لەگەڵیداو کەوتمە ڕێ، لەوێ سەیرم کرد مامۆستا عبدالله ئاگرین چاوەڕوانی دەکردم دوای باس کردنی هەندێك یادەوەری فەرمووی ئەو کتێبەت چۆن دەرکرد؟ وتم لە سلێمانی بەهۆی مامۆستا (جمال عبدول)و توانیم دەری بکەم.

وتی: دوێنی کۆبوونەوەی مەکتەبی سیاسی‌مان هەبوو لەگەڵ کاك مەسعود دا باسێکی کتێبەکەی تۆشمان کرد، ڕاستە نوسینەوەی مێژووی خۆت مافی خۆتە بەڵام ئێستا کاتی نییە بۆیە حەزدەکەم وەکو برایەکی دڵسۆز پێت بڵێم کتێبی تر مەنووس، وتم بڕیارم داوەو دەینوسم‌و کتێبی دووەم ئامادەیە بۆ چاپ، وتی: وەکو دڵسۆزێك بەرجا رجات لێ دەکەم ئیتر مەنوسە، وتم: ئەگەر خۆشم نەمێنم هەر دەردەچێت چونکە ئامادەم کردووە، وتی: کاك رەفیق کاك مەسعود سەلامت لێ دەکات‌و دەڵی با هیچی تر نەنوسیت، وتم: لە کتێبی یەکەمدا پێم ڕاگەیاندوون ئەگەر ڕێك نەکەون کتێبی دووەم دەردەکەم‌و هەموو ڕاستییەکان دەخەمە بەرچاو، چ ئەوەی خۆم پێی هەستاوم و چ ئەوەی لە نزیکەوە ئاگادارم، وتی: ئەگەر هەر دەینوسی باسی کاك مەسعودو مەلا مصطفی مەکەو تەنها باسی پارتی بکە، وتم من پارتی نەبووم من بارزانی بووم، بەڵێنم داوە بە خوای خۆم کە ڕاستییەکان بخەمە بەرچاوی میلەت، وتی ئایا جەلالییەکان لێت خۆش دەبن تۆ ئەوە دەردەکەی؟ وتم مێژوو مافی میللەتەو دەبێ بگات دەستیان، وتی: من لە ڕۆژنامەدا دەربارەی ئاشتبوونەوە نوسیومە. وتم من ڕای خۆم بەرامبەر بەتۆ ئەوەیە کە کوردێکی نیشتمان پەروەرو پاکی‌و گومان لەوەدا نییە کەشتی چاك دەنوسی، ئینجا وتی: لەسەر چی دەنوسی..؟، منیش لەوەلامدا باسی پێشەکی کتێبەکەم بۆ کردو وتم: لەسەر ٣١/ ئاب بەتایبەتی زۆر بەزەقی دەنوسم، وتی ناگاتە (٦٦)ی جەلالییەکان، وتم: خۆم تیایدا ژیاوم، وەکو سلبیاتی هەبوو ئیجابیاتیشی زۆر بوو، لەبەشی سێ‌هەمدا لەسەری دەنووسم، ئینجا وتم: ئەی حلفی ناتۆ چی لێ دەکەن؟ ئەی ئەو هەموو خروقاتانەی کە هەتان بووە؟ وتی: ئەگەر هەر

بڕیارت ١٠_ٍ كه بنووسی باسی ئەودیویش بكه كه سوپای ئێرانیان هێنایه سەر دیموكرات، وتم: ئەو ڕووداوانه بەبێ زیادو كەم وەكو خۆی دەنوسمو چاویشت بە كتێبەكه دەكەوێت، وتی: ئەی بەسەرهاتەكانی عمر دەبابەو سەرەتای دروست كردنی یەكێتی؟ وتم: ئەوە چاك ڕوون دەكەمەوە چونكه ئێوە ڕاستیەكەی نازانن‌و ڕاستیەكەی لەلای منەو هەروەها ڕووداوەكەی ١١ی ئازارو ناردنی مەلاكان لەلایەن صدامەوە بۆ تیرۆر كردنی مەلا مصطفی دەخەمە بەرچاو.

لەناوەڕاستی وتووێژەكەماندا وا هەستم كرد ئەو پیاوەی بەرامبەرم دانیشتبوو دانراوە بۆ تۆمار كردنی قسەكانمان، هەر بۆیە ڕووم كردە مامۆستا عبدالله ئاگرین و وتم: كارێكی نهێنیم پێته حەز دەكەم بازیانی كوڕم گوێی لێ نەبێت، ئینجا مامۆستا عبدالله ئاگرین ڕووی كردە كابراو وتی: ئەوە پێی خۆش نییە كوڕەكەی خۆشی گوێی لەو قسانە بێت، ئینجا بازیان‌و ئەو پیاوە هەردوكیان دانیشتنەكەیان بەجێ هێشت، لە كۆتایی دانیشتنەكەدا ویستم بڕۆم، بەڵام ڕێگای نەدام‌و وتی: نیوەڕۆ لەلای منی، وتم ئێوە خاوەنی ابراهیم خەلیلن لەبەر ئەوە ئامادەنیم برنج‌و شلەی سادە بخۆم، وتی ئێوە میوانی من‌و كەبابتان بۆ دەهێنم، كە چوینە دەرەوە بازیانی كوڕم وتی: كەباب‌و نانمان خوارد نەوەك نان‌و كەباب.

**تێبینی:**

تكام لەمامۆستا عبدالله ئاگرین كرد چۆن كتێبەكەم لەسلێمانی بەئاشكرا دەفرۆشرێت، مەمكەن بەسلمان ڕۆژدی و ڕێگە بدە لێرەش بەئازادی بفرۆشرێت.

نیوەڕۆیەكیان لە كاتژمێر (١٢)دا بەڕێزێك هات بۆ ماڵەوە فەرمووی سكرتێری سەرۆكی ئەنجومەنی وەزیران كاك رەفیق فتح الله داوای كردووە تەلەفونی بۆ بكەیت، پەیوەندیم پێوە كرد فەرمووی سبەینێ سەعات (١٠)

لەلای ئێمە مەوعدت هەیە، کە چووم بەڕێز د. ڕۆژ چاوەڕوانی دەکردم، کە چاوی بەمن کەوت لەجێی خۆی هەستاو هات بە پیرمەوە، هەردووکمان لەبەردەمی مێزەکەیدا دانیشتینو فەرمووی: ئەم کتێبەت چۆن دەرکردو لەکوێ چاپت کردووە؟ کێ پاڵنەرت بوو بۆ ئەو کارە؟ ئایا مام جەلال بوو؟ لەسەر ئێمە زۆرت نوسیوە کەچی لەسەر ئەوان شتت نەنوسیوە، بۆچی پێشتر ئێمەت نەبینی؟ کتێبی تر نەنوسی باشترە، خۆم حازر کرد وەڵامی پرسیارەکانی بدەمەوە، کاک خالدی سکرتێر هاتە ژوورەوەو وتی: کاك ڕەفیق کاتەکەت تەنها ١٥ دەقیقەیە ئاگادار بە، وتم من داوای چاوپێکەوتنم نەکردووە، ئەوە پەیوەندی بە د. ڕۆژ هەیە، ئەگەر دەڵێ ئێستا دەچمە دەرەوە، د. ڕۆژ فەرمووی: خالد پارەی بۆ سەرف بکە، وتم من قەساب نیم گۆشتەکەم فرۆشتبێتو پارەکەم بۆ سەرف کەیت، ئینجا بە کاك خالدی وت: مەوعدێکی (٩بۆ ١٠)ی بۆ دابنێ بۆ بەیانی.

بۆ ڕۆژی دوایی کە چوومەوەخزمەتی فەرمووی: دوێنێ زۆر بە گرژی قسەت لەگەڵدا کردمو زۆر توند بووی، وتم تۆ هاتبووی لە تەنیشتمەوە دانیشتبوویو من وام دەزانی لەگەڵ خوالێخۆشبوو (نوری شاوەیس)ی باوکت کە خاوەنی مێژوویەکی بێگەردە، قسە دەکەم، بەڵام ئەمڕۆ لە جێگاکەی خۆت دانیشە، منیش وەکو مرۆڤێکی ئاسایی لەگەل سەرۆك وەزیراندا قسە دەکەم، بانگی کاك (رفیق فتح الله)ی کرد: وتی چەند جار لەگەڵ کاك ڕەفیق دانیشتوم؟ وتم ئەوەی داوای تۆو کاك مەسعودو کاك نێچیر بکات تا دەگاتە لاتان لەبیری دەچێتەوە بۆچی هاتووە، من دوو ساڵ پێش ئێستا داوای چاوپێکەوتنم کردووە لەگەڵ تۆدا، وتی من تۆم دیوە لێرە، کاك ڕەفیق فتح الله بە ئەدەبێکەوە فەرمووی: نەخێر قوربان چاوت پێی نەکەوتووە، وتی: بڕۆن (١٠) دەهەوار دیناری بۆ سەرف بکەنو مانگی ٢٥٠٠ دیناری بۆ ببڕنەوە، وتم: نامەوێت. وتی (بیت المال)ە، بۆ ناتەوێتو من لە صلاحیاتی خۆمەوە دەیکەمو هی کەسی تر نییە.

ئینجا پرسیاری لێ کردم هۆی چییە ئەم کتێبە دەنوسیت؟ دوای ئەوەی گەیشتمە ئەوەی کە ئێوە ناگەنە یەکترو بەتەما نین ئاشت ببنەوە بەناچاری بڕیارم دا باسی ئەو ڕۆژگارانە بکەم کە خۆم بینیومەو تیایدا ژیاوم، وتی: منو تۆ لە ڕاژان یەکترمان ناسی، وتم ڕاستە بەڵام لە (٦٢)دا من تۆم جارێکی تر بینیوە لە خزمەت برای گەورەمان خوالێخۆشبوو (نوری شاوەیس) دابوویت، وتی نایەتەوە یادم، ڕاستییەکان دەنوسی؟ وتم لەبیرتە ئەو کاتە لە هەوڵدانی ئاشتیدا بووم لەنێوان یەکێتیو پارتیدا تۆ جێگری مامۆستا علی عبدالله بووی لە پشووەکەیدا لێت پرسیم لای مام جەلال دێیتەوە دەنگو باسمان بۆ ناهێنیت، وەڵامم دایتەوە: نە دەنگو باسی ئێوە دەبەم بۆ ئەوانو نەهی ئەوان دەهێنم بۆ ئێوە ئەوە کاری من نییە. بەڵام لە کتێبی داهاتووم ئەو ڕاستییانە دەخەمە ڕوو، پێم باشە دڵنیا بیت لەوەی کە ئەم کتێبەم بەیارمەتی هیچ کەسێك دەرنەکردووەو پەیوەندیم بە هیچ گروپێکی سیاسییەوە نییەو ڤینیشم لەهیچ کەسێك نییە، ئەوەی زۆر بەبەشی یەکەمم پەست بێت صدام حسێنە چونکە دوو نهێنی ئەوم بڵاو کردۆتەوە، یەکەمیان کە لە ١٩٧٦/٩/١١ داوای لێ کردم مام جەلالی بۆ بکوژمو دووەمیان لە کودەتاکەی ناظم کزار دا قەناعەتم پێ کرد کە من بەشدار نەبوو لە کوتەداکەدا، بەڵام لەم کتێبە دا دانم پیا ناوە، پێشبینی دەکەم لەدوای (١٥) ڕۆژی تر صدام حسین داوای فڕاندنی من بکات، لەبەر ئەوە من لەبەیانییەوە خۆم دەشارمەوە بۆ ئەوەی لەبەرچاو نەبمو بەشی دووەم بەرێكو پێکی دەربکەمو کاتێك ویستم بەشی یەکەم بنوسم شەش مانگ پێش دەست پێکردنم سەرنووسی باسەکانم بردە بەر دەستی کاك مەسرور بارزانی، وتی چیت دەوێت لە ئێمە بۆت بکەین؟ وتم پارێزگاریم بکەن، وتی ئێرە لەسەر خۆمو ئەولاش لەسەر خۆت.

ئینجا وتم لەبەشی دوەمدا بەدوورو درێژی بۆ جەماوەری ڕوون دەکەمەوە کە ئێمە نابین بەهیچ ئەگەر ئەم دوو حزبە نەبن بەیەكو ئاشت نەبنەوە،

هەروەها چەندێك بزانم لەسەر ٣٠/ئاب هەمووی دەنوسم، وتی ئەخێر ٣١ی ئاب، وتی (٦٦) یشت بەبیر نەچێو چۆن لەسەر ئێمە دەنوسیت لەسەر ئەوانیش بنوسەو هەروەها لەسەر سەفەرەکەی عمر دەبابەش بنووسە کە چووە سوریاو لەندەن پێش ئەوەی تەقە لە حکومەت بکەن، وتم ئەمە خۆم پێ هەستاوم زۆر چاکی دەنوسم، وتی براکانم کتێبەکەتیان خوێندۆتەوەو دەیانەوێت پێش ئەوەی بڕۆیت چاویان پێت بکەوێت، کە هاتنە ژووری خۆشحاڵی خۆم پشاندا بە بینیانو وتم: بازیانی کوڕم لە بازاڕی هەولێر چاوی کەوتووە بە خوشکی بەڕێزمان ناهیدە خانی دایکتانو چاكو چۆنی لەگەڵدا کردووە، ئەو دەفەرموێت تۆ کێیت؟ دەڵی من کوڕی رەفیق پشدەریم، بەساردیکەوە وەلامی سەلامەکەی دەداتەوە، لە کاتێکدا دایکی بازیان شیرینی کچی مارف رۆستەم بەگی بابان لەگەڵ دایکتاندا خزمی نزیکی یەکتر بوون، من سلاوو رێزم هەیە بۆ ناهیدەخان، ئەو گرژیەی هەیەتی بەرامبەر بەمن هی ئەوەیە کاتێك خانووەکەیان فرۆشت لەبەغدا من ئەشیای خەڵکی ترم کڕی بووەوە هی ئەوم نەکڕی بووەوە بەلام پێی رابگەیەنە لەوەزیاترم بۆ کردووە (کۆسیجینو برجنێف) هەریەکەیان نامەیەکیان ئاراستەی خوالێخۆشبوو نوری شاوەیش کردبوو، من ئەو دوو نامەیەو هەندێ شتی گرنگی ترم رەوانە کرد بۆ مەکتەبی بارزانی،و هەروەها لە کتێبی دووەمدا باسی خوشکە ناهیدەم کردووە کاتێك من چووم بۆ لای شێخ احمد بارزانی لە ساڵی ١٩٦٣دا رێکخراوی پارتی پارەیان نەبوو باوکیشت ئەو کاتە هاتبووەوە بۆ سلێمانی بەرێز ناهیدە خان لە گیرفانی خۆی پارەی ئەم سەرو ئەوسەری سەیارەکەی بۆ دام بۆ بارزان کە (٥٥) دینار بوو، ئینجا هەستام لە خزمەت د. رۆژداو وتم: من مەکەن بە (سلمان روشدی) با کتێبەکەم ئازادانە لەهەردوولا بفرۆشرێتو چاوەڕوانی بەشی دووەمی کتێبەکەم بن لەکۆتایی دا پرسیاری لێ کردم ئەی پڕۆژەکەت..؟ وتم لەمەو دوا سیاسەت ئەکەم کاسپی ناکەم.

رۆژێك دوای ئەوە پێیان راگەیاندنم کە سبەینێ پێنج شەممە کاتژمێر

(١٠)ی سەر لەبەیانی دەبێ چاوم بە کاك (؟؟؟) بکەوێت لەماڵەوە، منیش لەگەڵ بازیانی کوڕم دا پێشوەخت هاتینە دەرەوەو یەکەم جار روومان کردە پارێزگاو لە پرسگەکەم پرسی، من لە شەممەوە داوای چاوپێکەوتم کردووە لەگەڵ کاك فەرەنسۆ، وەڵامی نەبوو؟ وتیان نەخێر، ئینجا وتم نە دەیبینم‌و نە ئیشم پێیەتی‌و نە جارێکی تر دێمەوە بۆ ئێرە، ئەمە بەلگەیەك بوو بۆ نارەزایی دەربڕینی کاك فەرەنسۆ بۆ ئەو کتێبە.

کات ژمێر (١٠) گەیشتمە ماڵی ئەو بەڕێزە پێی وتین میوانم هەیە و لەو ماڵەی تەنیشتم دانیشن ئەنێرم بەشوێنتانا، پاش ماوەیەك خۆی هات بەشوێنما بردینی‌یەوە ماڵەکەی خۆی و بەخێرهاتنێکی گەرمی کردین ووتی دەمێکە موعجبم پێت بەڵام جێی متمانە نەبوویت لەلام، دوای ئەوەی ئەو کتێبەت دەرکرد ئێستا دەست خۆشیت لێ دەکەم چونکە شتێکت کردووە کەس پێش تۆ نەیکردووە وەئەم بنەماڵەیە بەتایبەتی کەس نەیوێراوە لەسەریان بنوسێت ڕوو بەڕوو، لەسەر ئەنجامدا بوون بەفەرعەون بەسەرمانەوەوەجێی تۆ لێرە نەماوە و برۆ لەدەرەوەی وولات باقی کتێبەکانی ترت بنووسە بۆ ئەوەی بەسەلامەتی ئەو ئەمانەتەی لەلاتە بیگەیەنیتە دەست ئەو میللەتە ئینجا ڕووی کردە کوڕەکەی ووتی: ئێمە فێڵمان لێکراوە با ئەمانە تێ نەکەوون وەکو ئێمە ،ووتم ئەوەی لامە وەکو خۆی بڵاوی دەکەمەوە لێرەو ناچمە دەرەوەی وولات، ووتی هەر دەنووسی و ناچیتە دەرەوەی وولات بچۆ بۆ سلێمانی لەوێ خەڵکێکی ئازاو باشی لێیە پشتگیریت دەکەن وەهەر چۆنێك بێت ئەوێ لێرە دیموکراتی‌ترە ووتم: من کوڕەکانم ماڵیان لێرەیەو خۆشم پرۆژەیەکی جوجە سازی (دواجن) م لێرە هەیە لەبەر ئەوە ئێرە بەجێ ناهێڵم، ئینجا ووتی کاك ڕەفیق: لەسێ شەممەوە کوڕانی مەلا مصطفى بڕیای تیرۆر کردنی تۆیان دەرکردووە ئەڵێم برۆ بۆ سلێمانی، ووتم پێری لەخزمەت د.ڕۆژ و دوێنی خزمەت عبدالله ئاگرین دا بووم لە(م.س)، ووتی:کاکە گیان ئەوانە و هەموو دام و دەزگای پارتی کاتین

لەلایکورانی مەلا مصطفیو هیچیان دەسەلات نیە، ووتم شەممە ئەڕۆم چونکە ئەبێ خۆم کۆبکەمەوە، ووتی: ئەبێ هە رئێستا لێرە چویتە دەرەوە یەکسەر بەرەو سلێمانی بەڕێ بکەوێت و نەچیتەوە ماڵەوە، ووتم: زۆر سوپاست ئەکەم ئێستا دەڕۆم بەلاّم کوڕەکانم بەتۆ دەسپێرم ئەگەر کێشەیەك هاتە ڕێگایان ئاگات لێیان بێت چونکە کەسابەتەکەیان لێرەیە، ووتی: منیش کاتبم ناتوانم و هیچم پێ ناکرێت.

ئینجا پێش ئەوەی بڕۆم لەگەڵ کوڕەکانمدا ڕێکەوتم کەمن بچم خۆم بشارمەوە لەشوێنێك، ئەوانیش بەشێوەیەکی ئاسایی خۆیان نیشان بدەن و ئەو موچەیەی د. ڕۆژ بۆی داناوون و وەری بگرن و لەماوەی دوو مانگدا ماڵەکەیان بکەن بەپارەو پرۆژەکەم بەجێ بهێڵن، وەپێم ووتن کەی خانووتان گرد لەسلێمانی هەواڵم بدەنێ دەگەمەوە لاتان ئینجا ڕوومان کردە ماڵی پیاوێکی نیشتیمان پەروەر دوای ئەوەی شێوازی خۆمم گۆڕی توانی لەناو پارتی دەرم کات ماوەی دوو مانگ و دە ڕۆژ خۆم وون کرد و نەمهێشت کەس بزانێت لەکوێم .

**بەڕێزان :**

دوای ئەوەی لەلاپەڕە (١٦٦) لەبەشی یەکەم دا ئەو خالانەم خستە ڕوو کەلەسەر ئەنجامی ئاشتبوونەوەی یەکێتی و پارتی دا دەستەبەر دەکرێت وەزۆر لەدڵسۆزانی کوردستان لەدەرەوەو ناوەوەی ووڵات هەوڵیان دا بۆ ئاشت بوونەوەیان یەکێك لەوانە د. علی قەرەداغی بوو کەیەکێکە لەو کەسایەتییە ناودارە نیشتیمان پەروەرانەی کەهەستی نەتەوایەتی پاڵی پێوە نا بۆ هەوڵ دانی نزیك خستنەوەی مام جەلال و کاك مسعود لەیەکتر وەکۆتایی هێنان بەکێشە سەر سەختەکەی نێوانیان، ئەوە بو چاوی کەووت بە بەڕێز مام جەلال، ڕاگەیاندنەکانی یەکێتی بەخۆش حاڵییەوە ئەو هەواڵەیان بەجەماوەر ڕاگەیاند و بەڕێز مام جەلال هەوڵ و کۆششی ئەم بەڕێزەی بەخۆشحاڵییەوە نرخاند، بەلاّم سێ ئەندامی سەرکردایەتی یەکێتی

نیشتیمانی کوردستان لەخزمەت د.علی قەراغی دا چوونە هاوینە هەواری صلاح الدین بۆ ئەوەی چاویان بەکاك مەسعود بکەوێت، کاك مسعود تەنها چاوی بە د.علی قەرەداغی کەووت وەدەزگاکانی بارزانی ئاماژەیان بەم هەواڵە نەکرد ئەوە ئەگەر عەریفێکی میبتی تورکی بووایە مەسعود بەرزانی چاوی پێی دەکەووت بەڵام چاوی بەو سێ ئەندامەی سەرکرادایەتی یەکێتی نەکەوت وەهەروەها لەسەردانێکی خاتوومیتەران و کۆشنەر بۆ کوردستانی باشوور لەکاتێکدا بەرەو هەڵبجەی شەهید دەکەوونە ڕێ ماموستا جەمال عەبدول کەپارێزگاری سلێمانی بوو ئەو کاتە پێیان دەڵێت بۆ شتێك بۆ کوردستان ناکەن کۆشنەر دەڵێت :ئەمە هاوسەری سەرۆك کۆماری فەرەنسایەو وەمنیش دوو وەزارەتم لەدەستدایە لەفەرەنسا وەئەم هاتنەی ئێمە مانای ئەوەیە ئێوە حکومەتن وەئەگەر بەم شێوەیە بەبێ ئاژاوە سەرپەرشتی وولاتەکەتان بکەن دوای شەش مانگی تر ئیعلانی حکومەتداری دەکەن .

ئەوەی بۆ مام جەلال و کاك مەسعود بارزانی ڕێکەوتووە ئەگەر بۆ شێخ مەحمودی نەمرو خوالێخۆش بوو قازی محمد ڕێ بکەوتایە کورد لەو کاتەوە حکومەت بوو، ئەمە تەنها قسەی من نیە بەڵکو قسەی زۆربەی سیاسەتمەدارنی کوردستانی گەورەیە بۆ نمونە، لەدانیشتنێکدا ئەو دوو بەڕێزو نیشتیمان پەروەرانەی کەبەشدار بوون لەکۆماری مهاباد دا جەنابی میرزا مەنافی کەریمی کەیەکێك لەوەزیرەکان بووە وەجەنابی سەعید خانی هەمایۆنی کەسکرتێرۆ سەرۆکی یاوەری قازی محمد بووە ئەم ووتەیەی سەرەوەیان فەرموو بوو هەروەها لەدانیشتنێکدا (کوڕی ڕەش) علی قازی کەکوڕی قازی محەمەدە لەگەڵ شێخ مالیك کەنەوەی شێخ سەعیدی میران هەمان بۆچونیان هەبوو.

منیش ئەڵێم یارەبی من و مام جەلال و مەسعود بارزانی و کاك نێچیر بەقوربانی کوردستان بین وەکو بەم شێوەیە بارو دۆخی کوردستانی باشووریان ئالۆز کرد.

وەلەم کتێبشدا ڕای هەموو دەوڵەتە ئقلیمیەکان و دەوڵەتە زل هێزەکانی جیهانم ڕوون کردۆتەوە بەرامبەر بەکورد وەئێستا کاتی ئەوە هاتووە چەند پێشنیارێکی خۆم بخەمە پێش چاوو بۆ چارە سەرکردنی کێشەی کورد لەکوردستانی باشوور دا چونکە بۆم دەرکەوتووە ئەگەر خۆمان خەمی نەخۆین کەس خەممان ناخوات..

دوو گوڵی مێخەك لەیەك زەوی و یەك سەرچاوە ئاو دەخۆنەوەو هەوا هەڵدەمژن وەکاتێك ئەو دوو گوڵە دەپشکوێت هەردووکیان یەك بۆنیان هەیە تەنها ڕەنگیان جیاوازە یەکێکیان سەوزە ئەوی تریشیان زەرد کەیەکێتی نیشتیمانی کوردستان و پارتی دیموکراتی کوردستاننن.

بەڕێزان مام جەلال و کاك مەسعود من خودی خۆم گەیشتومەتە ئەو باوەڕەی ئێوە جارێکی تر بەتەمانین ببنەوە بەیەك وەهەتا ئێوەش سەرپەرشتی کوردستانی باشوور بکەن هەر بەسێ پارچەیی دەمێنێتەوە ئەگەر زیاد نەکات کەپارچەکانیش بریتین لە هەرێمی پارتی و هەرێمی یەکێتی و ئەو بەشەی لەژێر دەسەڵاتی ڕژێم دا ماوەتەوە ئازاد نەکراوە.

**بەڕێزان :**

ئەگەر ئێوە بۆ بەرژەوەندی کوردستانی باشوور هەوڵ دەدەن دوو ڕێگا چارەتان لەبەر دەمدایە یا ئەوەتا ئاشت ببنەوە و هەردوو هەرێمەکە بکەنەوە بەیەك یا ئەوتا هەردووکتان ئیستیقالەی خۆتان پێشکەش بەحزبەکانتان بکەن ئەمە دەبێتە مایەی سەربەرزی بۆتان وەهەتا هەتایە مێژوو باستان دەکات چونکە بەئیستیقالە کردنی ئێوە دوای حەووت ڕۆژ پارتی و یەکێتی دەبنەوە بەیەك ئەمەش ڕێگە خۆشکەرێك دەبێت بۆیەك خستنی هەموو حزبە کوردستانییەکانی تر لەگەڵ یەکێتی و پارتی دا بەبێ جیاوازی وەبەمە بارو دۆخی کوردستان گۆڕانکارییەکی زۆری بەسەردا دێت لەباری سیاسییەوە چونکە ئەبێتە پاڵ پشتێك بۆ کوردستانی باکوورو و ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا، بەڵام ئێوە ئیستیقالە دەکەن..؟ نەخێر، چونکە هەندێك خەڵکی هەل پەرست

هەیە کە بەرژەوەندییەکانیان بەئێوە دەچێت بەرێوە خەڵك دەخەن سەر شەقامەکان بۆ خۆپیشان دان کەئێوە ئیستیقالە نەکەن.

بەرێز مام جەلال یەکێکی لەو کوردە رۆشنبیرو بەناوبانگانەی جیهان بەتایبەتی لەبواری رۆژنامەگەری دا دەستێکی بالآت هەیە، تۆ خۆت لەساڵی ١٩٧٥دا لەبەیروت بۆت گێرامەوە کەرۆژنامەی لیمۆندی فەرەنسی جیهانی داوایان لێ کردوویت کەبەشێکی گرنگی رۆژنامەکەیان بۆ بەریت بەرێوە وەئێستا دوای تێپەڕ بوونی٢٥ ساڵ کەسایەتییەکت لێ دروست بوو لەجیهاندا نەوەك لیمۆندی فەرەنسی بەڵکو ئەتوانیت (واشنتن پۆست) بەریت بەرێوە وەئەتوانیت یاداشتەکانی خۆت تۆمار بکەیت وەکو (چەرچل) ناو دەر بکەیت دڵنیام لەوەی دوای خوێندنەوەی بەرێز مام جەلال بۆ ئەم کتێبەی من هەندێك لەبۆ چونەکانی من بەگەن دەکات بەتایبەتی داواکاریەکەم بۆ ئیستیقالە کردنیان چونکە بەئیستیقالە کردنی ئەوان کوردستانی باشوور لەو بارو دۆخەی ئێستا تیایدا دەژین رزگاری دەبێت، وەشکم نیە لەوەی مام جەلال ئامادەیی تیایە بۆ ئیستیقالە کردن چونکە جێی خۆی کردۆتەوە لەناوەو دەرەوەی وولآت ـ بەلآم ئایا کاك مەسعود بارزانی ئیستیقالە دەکات..؟ لەوەلآمدا ئەڵێم نەخێر.. چونکە صدام و جەنەراڵە میتەکانی تورکیاو مۆسادی ئیسرائیلی و (C I A) ئەمریکی بەوە رازی نابن.

بەرێز کاك مەسعود لەمانگی ١٩٩١/٣دا لەقەزای صدیق لەماڵی عزەت بەگی دێگەڵە بەشاهێدی بازیانی کورم و عومەری مام رەزا و حاجی ابراهیمیشێرخۆر و فرانسۆ حەریری و وعبدالمهیمن بارزانی و وەجەنابی عزەت بەگ، پرسیارم لێ کردیت ئایا ئێوە چوار هەزار ملیۆن دۆلارتان پێیە...؟ دەستت خستت سەر جانتکەت و ووتت والله هی یەك دۆلارم پێ نیە ئێستا بەهۆی (بیت المال) ەوە یەکێکی لەدەوڵەمەندەکانی جیهان لەساڵی هەشتاکاندا دەلآلەکانت خەریك بوون کێڵگەیەکت بۆ بکرن لەئوستورالیا بەلآم ئێستا بەخۆت و کورەکانت و براکانت و نەوچیر بەو پارەیەی کەدەستان

کەووتوە لە (بيت المال) ئەتوانن بەشێك لەئوستوراليا بكرن .

بەڕێز كاك مەسعود والله هی ڕاستم لەگەڵتا چونكە بەسەر یەكمانەوە هەیە دوای ئەو كتێبەی كەدەرم كرد خەڵكێكی زۆرم دی لەوانەی كەپەیوەندی رۆژانەیان بەتۆوە هەیە كەبۆم نیە لەترسی خواو ژیانی ئەوان ناویان بهێنم پێم باشە بزانیت پارتی چیە..؟

### پارتی دیموكراتی كوردستان سێ بەشە :-

یەكەمیان بریتیە لەكوڕانی مەلا مصطفی بارزانی تەنها ئەوەندە هەیە بەكوردی دەدوێن و لەهۆزی بارزانن ئەگینا حەیفە كوڕی ئەو پیاوە نەمرە بن بەهۆی كردەوەكانتانەوە خۆتان سەیارە دەگرن بۆ قوتابیانی زانكۆو دەیانبەنە سەر مەزاری باوكی گەلی كورد مەلا مصطفى نانیشیان دەدەنێ ئینجا ئەو خەڵكە لەترسی ئەوە نەبێ كەئازاریان ئەدەن هیچیان بەڕەزای خۆیان نەدەهاتن، لەكاتێكدا ڕۆژێك بوو لەهەلەج خەڵك بەڕەزای خۆی لەبەر سەرماو بەفرو باراندا لەجەژنەكاندا سەرەیان دەگرد بۆ زیارەتی مەزاری خوالێخۆش بوو باوكی گەلی كورد مەلا مصطفی بارزانی ، هیوا هەبوو بەیانی زوو دەچوو نیوەڕۆ بەری دەكەووت، بەڵام ئێستا لەساڵێكدا چەند جارێك خەڵك كۆدەكەنەوە حەووت كەس و پانزە كەس و بیست كەس پارەیەكی زۆریان دەدەنێ لە( ٢٠٠٠- ٣٠٠٠) هەزار كەبە پێ لەهەولێرەوە بچنە سەر مەزاری مەلا مصطفى لەبارزان وەبەتەلەفزیۆن پیشانی ئەو خەڵكەی دەدەن، كاك نەوچیر لەكۆبونەوەیەكدا فەرمووی پارتی هی بنە بنەماڵەی بارزانیە بەكەیفی خۆمان هەڵی ئەسورێنین.

بەشی دووەم پێك هاتووە لەو كەسانەی كەدەستێكی باڵایان هەبووە لەئەنفال دا یان ئەوانەی كەلەلای ڕژێمی بەعس گەیشتبوونە پلەی وەزیر (أمناء) وەئەو هەلپەرستانەی كەخۆیان بە ئێوەدا هەڵواسیوە بۆ بەڕێوە

بردنی بەرژەوەندیەکانی خۆیان کە کورد نین و جامانەی سوریان بەسەروەیە وەبەهۆی جامانەکانیانەوە بوونەتە خاوەنی پلەو پایە وەئەم کۆنگرەیەی ئەخیرتان شاهێدە لەسەر قسەکانم.

بەشی سێیەم پێك دێت لەبەشە پاکەکەی پارتی دیموکراتی کوردستا کەشایەنی هەموو رێزو خزمەتێکن و ئەگەر ئێوە واز لەکوردستان و میللەتی کوردو حزبی پارتی بهێنن ئەچم وەك خزمەتکارێك لەخزمەت ئەو پیاوە بەرێزانەدا دەبم و بارەگاکەیان بۆ پاك دەکەمەوە چونکە هەموو هەولێکیان بۆ سەرفرازی گەلی کوردە، پانزە ساڵ پێش ئێستا ئەم کتێبەم بنوسیایە کەس نەی دەکڕی کەسیش نەیدەخوێندەوە چونکە ئێوە بتان وتایە ئەم پیاوە خائینە هەموو کوردستان پێیان دەووتم خائین، بەڵام ئێستا من و خەڵك بەتێگڕایی دەست ڕادەکێشین و ئەڵێن کوڕانی مەلا مصطفی بارزانی ڕەنجی باوکیان بەفیڕۆ دا بەبێ ئەوەی کەس بڵێ وانیە، ئێستا ئێوە خائینن.

دوای ڕوونبوونەوەی ڕاستیەکان، چارەسەرکردنی کێشەی کورد لەم سێ ڕایە بەدەر نیە یان ئەوەتا ئەو دوو بەڕێزە ڕێك دەکەوون بەهاریکاری هەموو حزبە کوردستانییەکانی تر ناوچەکە دەبەن بەرێوە بۆ بەرژەوەندی کورد و کوردستان نەك بۆ بەرژەوەندی حزبایەتی تەسك، وەیان ئەو دوو بەڕێزە ئیستیقالە دەکەن سەرئەنجامی ئەو کارەم دیاری کردووە وەیان ئیستیقالە ناکەن و لەم کاتەدا تاکە ڕێگەو باشترین بۆچوون بەلای منەوە بۆ چارەسەرکردنی ئەو بارودۆخە ئاڵۆزەی کەئێستا ڕۆژگاری تیا دەبەینە سەر ئەمەیە:

داوا دەکەین لە أمم متحده ( UN) هێزێکی نێو دەوڵی بێتە کوردستانەوە بۆ سەرپەرشتی کردن و ڕزگار بوونمان لەخروقاتەکانی سوپاکانی عیراق و ئیران و تورکیا، ڕزگار بوونمان لەدەست ئەو هێزە چەکدارانەی (ملشیات) کەدەستیان بەسەر کوردستانی باشووردا گرتووە وەهەر وەها تالان کردنی(بیت المال)ی میللەت و بەکارهێنانی لەمەرامە تایبەتییەکانی خۆیاندا بنەبڕ بکرێت.

ئەمە خاڵێکی گۆڕان دەبێت لەڕووی ئارامی و سیاسی و ئابووری و ئیداراری بەرەو کوردستانێکی بێ ئاژاوە بۆ دانیشتوانی کوردستانی باشوور بەتایبەتی وەئەمەش هۆکارێك دەبێت بۆ فشار خستنە سەر هێزە نێو دەوڵەتەکانی جیهان لەلایەن کورد پەروەرەکانی دەرەوەی وولات بۆ ئەوەی سنورەکەمان بچێتەوە شوێنی ئاسایی خۆی کە(جبل حمرین)ە ، وەلەهەمان کاتدا ئەو برایەتیەی نێوان ئێمەو کوردستانی باکور وەئێمەوە کوردستانی ڕۆژهەلات کەئێستا لەمەترسیدایە بەهۆی گرژی و بێ متمانەیی بەیەکتر، نامێنێت.

دوای تێپەڕبوونی چەند ساڵێك و دڵنیا بوون لەهێوەر بوونەوەو سەقام گیر بوونی ئارامی لەسەرانسەری کوردستانی باشووردا زەمینەسازی دەکرێت بۆ هەڵبژاردنێکی سەرتاسەری لەناوچەکەدا لەژێر سەرپەرشتی نەتەوە یەکرتووەکاندا ( الأمم المتحدة) بۆ ئەوەی وەکو کۆسۆڤۆ ئازادانە هەموو خەڵکی بەرەو سندوقەکانی دەنگدان بڕۆن و بێ غەل و خەش و تۆقاندن دەنگ بدەن بەو کەسەی کەخۆیان هەڵی دەبژێرن بەنوێنەری ڕاستەقینەی گەلەکەیان ئەو کاتە جەماوەر لەهەڵبژاردنەکەیدا خۆی چارەنووسی خۆی دیاری دەکات و سەربەخۆیی هەڵدەبژێرێت .

ئیتر هەتا کەی لەبەر بەرژەوەندییە تەسکەکانی خۆتان ئەو خەڵکە چەواشە دەکەن بەوەی لەبەرژەوەندی جەماوەری کوردستانی باشوردا نیە داواکردنی سەربەخۆیی ئیتر هەتاکەی ئەو خەڵکە لەڕاستیەکان گومڕا بکرێت، ئەم بارودۆخە ناهەموارەی کوردستان لەبەرژەوەندی ئێوەو ئەو چوار دەوڵەتە ئیقلیمیانەدا نەبێت لەبەرژەوەندی کەسی تردا نیە هەر بۆیە دەبێ جەماوەر خۆی هەوڵ بدات و سوور بێت لەسەر سەرخستنی ئەم پرۆژەیە وەهەر وەها دەبێت ئەو کوردە دڵسۆزو خەم خۆرو نیشتیمان پەروەرانەی کەلەهەندەرانن دەورێکی گەورەو سەرەکیان هەبێت لەم بوارە دا.

**تێبینی:**

لەوانەیە زۆرێك لەخەڵکی بەجۆرێکی ئاوەژوو سلبی لەم بۆچونەی من تێبگەن وەوا بزانن مەبەستم هێنانەوەی ئەمریکاو بەریتانیایە بەلام من

پێشتر هەڵوێستی ئەو پێنج دەوڵەتە زل هێزەم ڕوون کردۆتەوە بەرامبەر بە کورد و ئەگەر خوا بیکردایە و ئەوان ڕازی ببونایە بەم پێش نیارەی من ئەو کاتە وەکو بەشی زۆری دەوڵەت عەرەبییەکان و بەلقان و هۆنکۆنگ و کۆسۆفۆ لەدوا ڕۆژدا دەبوین بەحکومەت و بەئاسودەیی دەژیایین.

کۆتایی نوسینی کتێبەکەم هاوکات بوو لەگەڵ هەڵبژاردنەکەی شارەوانیدا لەشاری مەلیك محمود وەئەم کارە لەخودی خۆی دا شارستانییەو هەموو دین و بەرنامەیەك لەجیهاندا پشتگیری لێ دەکات وەك بیستراوە ١٥٪ئەو خەڵکە بەشداری هەڵبژاردنەکەی نەکردووە ئەمە مانای ئەوەیە دوای ئەو هەموو ڕووداوانەی ڕووی داوە لەدوای هەڵبژاردنەکەی ساڵی ١٩٩٢ دا هێشتا گەلی کوردبارگەی نەتەوایەتی (شحنة وطنية) تیادا ماوە .

ئەم هەڵبژاردنە ئەگەر لەهەولێریش ئەنجام بدرایەو کوڕانی مەلا مصطفیی بارزانی ڕازی بوونایە کارێکی زۆر پیرۆزو بەنرخ دەوبوو بەڵام هێشتا ئاواتەکانی من ناهێنێتە دی هەتا ئەم هەڵبژاردنە سەرتاسەری کوردستانی باشوور ناگرێتەوە واتە تاکو(جبل حمرين).

داواکارم لە (ی.ن.ك) کەزیاتر نزیك بێتەوە لەو حزبانەی بەژداری هەڵبژاردنەکەیان کردووە وەبەهەمان شێوە داوا لەو ڕێکخراوە سیاسییە بەژدارنەبووانە دەکەم کەهەڵوێستێکی دیارو لەبەر چاویان هەبێت بۆ بەدی هێنانی ئاواتەکانی گەلی کورد.

**لەکۆتایی دا:**

داوای بەخشین و لێ بوردن لەهەموو کوردێکی بەشەرف دەکەم ئەگەر کەم و کوڕیەك لەداڕشتن و بۆچونەکانم بەدی بکرێت، وەئەوەندەی لەتوانام دایە ئەوەیە کەبەهۆی ئەم کتێبەوە خوێنی خۆمم لەسەر دەستم داناوە بۆ خزمەتکردنی کورد و کوردستان .

٢٠٠٠/٢/٧

**کۆتایی**

**بنەماڵەی (سید ئەحمەد)ی خانەقای کەرکوك:**

جوامێریو لێوەشاوەیی و چاکەی ئەم بنەماڵەیە پاڵیان پێوە نام کەتۆزێك بەکورتی لەسەریان بنوسم:

پێم باشە لەباسی بەڕێز سید ئەحمەدی خانەقاوە دەست پێ بکەم، ئەم پیاوە یەکێك بوو لەو کوردە دیندارو تێکۆشەرو دڵسۆزانەی ئەگەر بەسەدان کتێبی لەسەر بنوسیت کەبەچ شێوەیەك وەلەچ بارودۆخێك دا ویستویەتی خزمەت بە بزوتنەوەی ڕزگاری خوازی کورد بکات هێشتا کەمە ئەم پیاوە لەکاتێکدا سەر گەرمی خزمەت کردن بووە کەبارودۆخی سیاسی ئەو ڕۆژە ئینگلیزەکان دەیان برد بەڕێوە، ومبەربەرەکانی زۆری ئەم پیاوەیان ئەکرد و ئەشکەنجەو ئازارێکی زۆریان دەدا بەڵام ئەم پیاوە بەهیچ شێوەیەك گوێی نەداونەتێ و بەمافێکی دینی و دنیایی خۆی زانیوە لەخزمەتی کوردو کوردستاندا بمێنێتەوە، ئەم بەڕێزە خاوەنی خانەقایەك بوو کەبەبەردەوامی جێگای هەژاران و لێقەوماوان و بێ لانەو بێ نەوایان بوو بەشێوەیەکی گشتی لەخزمەتی هەموو کەسێکدا بوو کەبیمواندارى تەکیەکە ڕازی بووبێت.

لەکودەتاکەی ١٩٤١دا کەئەڵمانییەکان چوونە ناو کەرکوکەوە هەوڵێکی زۆریان دا ئەو ئینگلیزانەی کە لەشەریکەی نەوت دا کار دەکەن هەموویان بگرن و بەدیلی بیانبەنەوە بۆ ئەڵمانیا بەڵام خوالێخۆش بوو (سید احمد)ی خانەقا ڕێگەی نەدا بەوەی کەئەڵمانیەکان ئەو ئینگلیزانە بەدیلی بەرن لەگەڵ خۆیاندا، بەوە قەناعەتی پێ کردن کەپێی ووتن ئێمەی عراقیش لەجەنگداین لەگەڵ ئینگلیزەکاندا وئێمەش بەبێ شك دیلمان دەبێت لەلای ئینگلیز ئەوسا دیل بەدیلیان پێ دەکەین و دەیانگۆڕینەوە، بەڵام کاتێك حوکمی پادشایی باڵا دەست بووەوە بەهۆی سەرنەکەوتنی کودەتاکەوە(میستر چاپمن) کەڕابەرێکی سیاسی

ئینگلیز...ان بوو لە کەرکوك، ئەنێرێت بەشوێن(سید احمد) داو لەسەرەتای چاوپێکەوتنەکەدا پێی دەڵێت، پێشەکی من زۆر سوپاست دەکەم لەسەر ئەوەی کەنەدهێشت ئەڵمانیەکان ئێمە بەدیلی لەگەڵ خۆیان بەرن، بەڵام سیاسەت واپێویست دەکات کەئێمە تۆ دوور بخەینەوە بۆ(بصرە) بەو تاوانەی کەتۆ سۆزت هەبووە بۆ ئەڵمانیەکان، وەلەئەنجامدا راشکاوانە ئەم پیاوە دیندارە کورد پەروەرە کەهەوڵێکی زۆری ئەدا بۆ ئەوەی حکومەتێکی کوردی دابمەزرێت، بۆ دووەمین جار دوور خرایەوە بۆ (بصرە) وەئاشنایەتی یەکەی بنەماڵەی ئێمەو بەڕێز(سید ئەحمەد) ی خانەقا لەوێوە دەست پێ دەکات کەبۆ یەکەم جار دوور دەخرێتەوە بۆ(بصرە)کاتێك باپیرم لەساڵانی سیەکاندا چۆتە(بصرە) بۆ بازرگانی کردنی توتن چاویان بەیەك دەکەوێت وەبەهۆی ئەوەی کەهەردوکیان کورد بوون لەو عەرەبستانەدا دۆستایەتیەکی زۆر بەهێز دروست بووە لەنێوانیاندا، وەئەو دۆستایەتییەی کەباپیرم پەیدای کرد بوو لەگەڵ(سید ئەحمەد) دا من هەوڵم دا نەفەوتێ بۆیە دۆستایەتیم بەهێز کرد لەگەڵ نەوەکانی )(سید ئەحمەد) دا، وەکاتێك کەفەرمان بەرێبووم لە کۆمپانیای نەوتی کەرکوك هەموو یەکشەممانێك لەوێ نانم دەخوارد، بنە ماڵەی (سید ئەحمەد)ی خانەقا خاوەنی باشترین و بەپیت ترین پارچە زەوی بوون لە هەموو ناوچەی کەرکوك دا وەناوچەی (مملحە)ی کەرکوك بەشێك بووە لەم زەوی و زارانە ئەو بەشە ناوچەیەکی خۆی یاوی بووە وبێجگە لەو کشتوکاڵەی کەلەزەوییەکانیاندا دەکرا دەست کەوتی خوێی ئەم ناوچەیە ئەگەر قورسایی مەسرەفی تەکیەکە نەبوایە زۆر بەچاکی بەشی دەکردن وپێی دەژیان، بەڵام هەرچییان دەست دەکەوت ساڵانە لە بەرو بومی ئەم زەوی و زارانە هەموویان بۆ ئەو خەڵکە سەرف دەکرد کەهاتو چۆی تەکییەکەیان دەکرد، هەر بەهۆی ئەم دەوڵەمەندی و نەفسیەت

بەرزیيانـەوە بـووە كەسـەريان بـۆ هيـچ حكومـەتێك دانەنـەوانووە و لەهـەموو بـارودۆخێكدا دەنگيـان نـێر بـووە و لەسـەر ئـەو نێرێتیيـەی خۆشيـان بـووە كـە دژايـەتی گـراون بەبـەردەوامی بـۆ نمونـە: كۆمپانيـای نەوتی كەركوك كەسەر بەحكومەتێكی سەربەخۆ بوو كە(بـەريتانيا)بـوو هەرچەند هەوڵيان دابوو كە(سيد ئەحمەد)بچێـت بۆلايـان و ميوانـداری بكەن ئەگەر بۆ خواردنی ژەمێكيش بێـت، بـەڵام ئـەو دەيفـەرموو نـاچم بۆلايان چونكە پێش ئـەوەی حكومـەتی عيراق دامەزرێت ئێمـە خۆمـان حكومەت بووين بەسەرۆكايەتی (مەليك شێخ مـەحمود)ی نـەمر، ئـەوان بەدەستی خۆيان ئەو حكومەتەيان لێ تێكداوين و ئێسـتا دەيانـەوێت مـن پچمە لايان و مەرحەبابيان بكەم.

وەكورەكانی(سيد ئەحمەد) كـەناويان كاكـە(حسين) و كاكـە (حەمـە) بـوون، بەراسـتی جێـی باوكيـان وون نـەكرد بـوو وەبەهـەمان شـێوەی رێبازەكەی باوكيان هەڵسوكەوتيان دەكرد و هەرچەندێك لەكوردايەتی و مەردايـەتيان بدوێـين هێشـتا كەمـەو وەبـەو چـەند دێـرەی كـە مـن لەسەريان نوسيومە تەوا نابێت، بۆيە پێم باشە كەهەندێك لەو نمونانەو لەو هەڵوێستە مەردانانەی ئەم پياوەتان بۆ باس بكەم كە هەيان بووە بەرامبەر خەڵكی.

لەو گرژيەدا كەڕوويدا لە كەركوك لـەنێوان توركومـان و شـيوعيەكاندا لەساڵی(١٩٦٠) دا نزيكەی (٣٠٠٠)توركمان پەنايان برد بوو بۆ تەكيەكەی (سيد ئەحمـەد)ی خانـەقا بـۆ ئـەوەی نەكەونـە دەسـتی شـيوعيەكان، كاكە(حسين) ڕەزامـەندی خـۆی پيشان دان وەمـاوەی ئـەو چـەند ڕۆژەی كەلەوێ مابونەوە بە چاكترين شێوە خزمەتی كردن،

كاكـە(حسـين) پيـاوێكی ڕۆشـنبيرو تێگەيشـتوو نوسـور بـوو وەشارەزاييەكی تەواوی هەبوو لەزمانەكانی فارسی و توركی و عـەرەبی دا، زيرەك و پاك و دەست و دڵ فـراوان بـوو. لەدانيشـتنێكدا لـە قـادر

کەرەم کەهەمووو گەورە پیاوان و شێخانی ئەو ناوچەیە لەوێ ئامادە ئەبن بۆ ئەوەی چاویان بە (عزمت دووری) بکەوێت وکاك(حسێن) یەکێك دەبێت لەو ئامادەبوانە، کاتێك(عزمت دووری)دەست دەکات بەباسی کورد زۆر بەشێوەیەکی نابەجێ دەڵێت هەمووتان ڕەگەزتان عەرەبییە، تاکە کەسێك کەلێی دێتە وەڵام و بەرپەرچی ووتەکەی دەداتەوە تەنها کاك(حسین) دەبێت.

کاتێك من بەند بووم لەبەندیخانەی کەرکوك لەساڵی( ١٩٦٢)دا وەڵامم بۆ ناردن کەحەز لە(کنر و ماست) دەکەم ئەوانیش (کنری کوڵاو و کنر بەماسی و کنر بەقاورمە)یان بۆ هەموو بەند کراوەکان نارد کەژمارەیان(١٥٠) بەند کراو بوو لەبەشی(محجر)، منیش لەسوپاس گوزاری ئەو کارەیاندا وەڵامم بۆ (کاکە حسین) نارد کە ئیمڕۆ تەکییەی(سید ئەحمەد)ی خانەقا بۆ نان خواردنی نیوەڕۆ گوێزدا بووەوە بۆ بەندیخانەی کەرکوك بەشی(محجر).

لەساڵی(١٩٥٢) دا یەکشەمان لەکۆمپانیای نەتەوە ئەچووم لەوێ نانم دەخوارد، زیاتر لە(٢٠) کەسم ئەبینی کەلەوێ خزمەتیان دەکرد وەزیاتر لە(٥٠) قوتابی کەلەکەرکوك دەیانخوێندو پارەیان نەبوو شوێن بگرن بەکرێ لەوێ بەبێ بەرامبەر ئەخەوتن و نانیان دەخوارد و بەبێ ئەوەی کەسیان بناسن، وەرێ کەوتووە کەهەینی چووم بۆ ئەوێ سەیرم کردووە لەبەر خەڵك جێگا نەماوە لەخزمەت شێخ دا کەس دابنیشێت، ئەوانەی کەلەگەڵ من و لەدوای من دەهاتن هەمویان بەپێوە ڕادەوەستان وەهەندێك جار لە نێوان ئەوانەی کەبەپێوە ڕادەوەستان کەسایەتی و گەورە پیاوانی شاری کەرکوکم ڕەچاو دەکرد.

هەتا حوکمی مەلەکی لەئارا دا بوو ئەم پیاوانە دژایەتی ئەکران لەلایەن مەلەکیەتەوە، بۆ ئەوەی نەوەکو جارێکی تر بزوتنەوەی کوردی لەمانەوە هەڵبداتەوە هەرچەندە کاك حسین ئەندامی پەرلەمان بوو لەو

کاتەدا وەیەکێك بوو لەوانەی کەسەرپەرشتی ئەو خەڵکانەی دەکرد کەچوونە بەغدا بۆ ئەوەی بیخەنە بەر چاوی حکومەت کەئەبێت میللەتی کوردیش وەکو هەموو میللەتانی دنیا سنورێکی دیاری کراو وسەربەخۆی خۆی هەبێت، چونکە(اتحادی هاشمی) کرابوو لەنێوان عیراق و ئوردن دا وەهیچی دیاری کراوی تیا نەبوو بۆ کورد، ئەم وەفدە کەگەیشتە بەغدا تەنها لەلایەن(سعید قەزاز)ەوە پێشوازی لێ کرا و میوانداریەکی گەورەی بۆ کردن، وەلەکۆتایی میوانداریەکەدا بەکاکە حسین دەڵێت بەڕاستی ئەو هەڵوێستەی تۆ سەرنجی ڕکێشام و پاڵی پێوە نام کەئەم میوانداریەتان لەلایەن خۆمەوە بۆ بکەم.

ئینجا دوای ئەوەی حزبی بەعس هاتە سەر حوکم چاویان کەوت بەدۆسیێی ژیانی ئەم بنەماڵەیە وەکەزانیان زۆر بەگەرمی باڵیان بۆ بزوتنەوەی کوردی کردۆتەوە و بەهەموو شێوەیەك لەگەڵیاندان ئەمانیش لە یەکەم ڕۆژی کاربەدەست بونیانەوە دژایەتیان کردن هەتا هەر یەکەیان بەلایەکدا پەرتەوازەکردن. کاکە حەمەی خانەقا برای بچوکی کاکە حسینە و دەرچووی کۆلێجی یاسا بووە و پیاوێکی نیشتیمان پەرورو دەست و دڵ فراوان و دەروون پاك بووە لە(١٩٦٣)دا ئەرکی ئەوەی پێ سپێردرا بوو کەهاتوچۆ بکات لەنێوان حکومەت و بارزانی دا بۆ پێك هێنانیان بەڵام ئەو (کۆپتەرە)ی هەڵی گرتبوو بەهۆی (خەلەلێکی فەنی) نەزانراوە وە تەنها ئەو گیانی لەدەست دا، وەئەم بەرێزە زمانێکی تورکی زۆر چاکی دەزانی بەڵام لەداخی تورانیەکان قسەی پێ نەدەکرد.

لە(١٩٦٩) دا کەسەرۆك هۆزی ئاکۆ (عباس ممند ئاغا) وەفاتی کرد لەبەغدا بەتەلەفون بەکاك (حسین) م ڕاگەیاند و پێم ووت کاکە حسین ئەوە جەنابی مام جەلال و کاك حیلمی ڕاوەستاون و سڵاوو ڕێزیان هەیە بۆت و سبەی نیوەڕۆ (١٥٠) کەس لەلای ئێوە نانی نیوەڕۆ ئەخۆن، کاتێك

گەیشتین ە ئەوێ خواردنی زیاترلە(٣٠٠) کەسی ئامادە کردبوو لەگەڵ ئەوەشدا کەباری ئابوری‌یان ئەو کاتە بەرەو خراپی دەڕۆیشت.

لەساڵی(١٩٧٤) دا لەگەڵ هاوسەرەکەمدا چوینە ماڵی سەید ئەحمەدی خانەقا کەبەرامبەر تەکیەی بوو کاتێك لەدەرگاکەی دەرەوە چوینە ژوورەوە لەبەر خۆمەوە ووتم(سبحان الله) من ئەم ماڵەم چۆن بینیوە و ئێستاش چۆنە، بێ دەنگی‌یەکی سامناك ماڵەکەی داگرتبووەوە و تۆزو خۆڵێکی زۆر لەسەر دارو پەنجەرە و دیواری ماڵەکە کەڵەکە ببوو تەنانەت ئەو ڕێگایەی کەپیای چوینە ژوورەوە چەند سانتی مەترێك تۆزو خۆڵی لەسەر بوو کەپیایدا دەڕۆیشتین جێ پێمان لەخۆڵەکەدا دەردەچوو، بۆم دەرکەووت کەزۆر دەمێکە ئەم دالانە کەس هاتوچۆی پیادا نەکردووە، کە چوینە ژووری چاومان کەووت بە(مریم) خان کەخوشکی کاکە(حسین)ەو کچی (سید ئەحمەد) ی خانەقایە وەئەم ئافرەتە یەکێکە لەئافرەتە ناودارەکانی کوردستان کەبەدین داری وژیری و لەسەر خۆیی مێژوویەکی بۆ خۆی دروست کردبوو وەئەتوانیت لەریزی(حەبسە خانی نەقیب دا) دایبنێت، فەرمووی کەس هاتوچۆم ناکات ئەو ئافرەتەی لەلامەوە بەناو خزمەتم دەکات سیخورە بەسەرمەوە، بەڵام دوو کەس هەن وەفادارن و خزمەتم دەکەن یەکێکیان( د. عمر دزەیی‌یەو ئەویتریشیان شێخێکی عەرەبی حەویجەیە)، وەئەوە بۆ ماوەیەك ئەچێت ( ئاسایشی گشتی کەرکوك) وازم لێ ناهێنن دێنە سەرم و پێم دەڵێن کەئەم ماڵە بەجێ بهێڵم، منیش کەگوێم لەمە بوو تەلەفونم بۆ بەرێوەبەری ئاسایشی گشتی کەرکوك کردوو پێم ووت( من نایەم بۆ نان خواردنەکەی نیوەڕۆ چونکە ئێوە دژایەتی یەکێك لەبنەماڵە گەورەکانی کورددەکەن کەهەموو تەمەنیان

لەخزمەت کردنی فەقیرو لێ قەوماواندا بەسەر بردووە بەبێ ئەوەی گوێیان دابێتە زەمان و ڕەگەزەکەی، ئێستا داوا لەم ئافرەتە بەتەمەنە دەکەن کەجێ نزرگەی باوو باپیرانی خۆی بەجێ بهێڵێت، لەوەڵامدا ووتی ئەگەر بێیت بۆلام و نانەکەمان بەیەکەوە بخۆین ئەوسا قسەی لەسەر ئەکەین؛ ماڵەوەم بەجێ هێشت و ڕووخسەتم لەمریەم خان وەرگرتوو چووم بۆ نان خواردن لەگەڵیدا، لەدوای گەڕانەوەم لەوێ بۆ مزێم خانم باس کرد ئەم بڕیارە لەئاسایشی کەرکوکەوەدەرنەچووە بەڵکو بەفەرمان لە سەرکردایەتی حزبی بەعسەوە دەرچووە بەلام پەیمانی داومەتێ کە وەکو ئاسایشی کەرکوك چەندێك لە توانایدا بێت جێبەجێ کردنی ئەم فەرمانە دوا دەخات هەتاکو من لەبەغدا ڕێگا چارەیەکتان بۆ دەدۆزمەوە مریەم خان بۆی گێڕامەوە کەڕۆژێك بووە (٩) ژن ئیشیان تەنها چێشت لێنان بووە، وەجەژنان زیاتر لە(٥٠٠) کەس نانی بەیانی چەژنیان لەتەکیەکەدا خواردووە، وەهەر وەها بۆی گێڕامەوە کەڕۆژێکیان کەکاکە حسینی خانەقا دەچێت بۆ پشدەر بۆ بەشداری کردن لەپرسەی (عباس ئاغای گەورەی پشدەریدا) ٤٠٠ سوارچاك لەگەڵ خۆی دەبات ، لەدوای ئەم باس و خواستانەدا لەگەڵ مریەم خاندا خواحافیزیمان کردوو هاتینە دەرەوە بەلام کەگەیشتمە دەرگای دەرەوە و ئاوڕم دایەوە بۆ ئەو ماڵە بێ نازە دڵم پڕ بوو بۆیان و ئەم ئایەتەم بەبیر کەوتەوە کەخوای گەورە دەفەرموێت: ( إن الملوك إذا دخلوا قرية أفسدوها وجعلوا أعزة أهلها أذلة وكذلك يفعلون) صدق الله العظيم.

برای تێکۆشەر (عارف تەیفور) کە لە بنەماڵەی (سید ئەحمەد)ی خانەقایە لەسەرەتای (١٩٩٩) دا لە پرسەیەکدا لەهەولێر چاومان بەیەکتر

.وت، دوای یاد کردنـــەوەی هـەندێك لەبیرەوەریـیــەکانمان بەیەکـەوە، ووتی: ئێمە تۆ بەنزیك ترین خزمـی بنەماڵەکە دەزانـین، منیـش ووتم: من خزمی ئێوە نیم بەڵام برایەکی پچوکی(کاکە حسین و کاکـە حەمـە) بووم وەهەردەم خۆم بە خزمەتکاری بنەماڵەی (سید ئەحمەد) زانیوە.

**تێبینی:**

سیداحمەدیخانەقا لەسـەخاوەت دا وێنـەی نـەبو وەزۆرێـك لەخـەڵك بە(حاتمیتەی) کورد ناوی دەبەن؛داوای لێبوردن لـەو بنەماڵەیـە ئەکەم کە بەو شێوە کورتییە لەسەرم نووسیون .